رەجائی فاید

# کوردەکانی عێراق

## هیوا و ئاوات لە نێوان بەدیهاتن و بەدینەهاتندا

### مێژووی نوێ و هاوچەرخی بزوتنەوەی کورد

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە

عەلی میرزا عارف هەورامی

وەزارەتی ڕۆشنبیری
بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان
xaneywergeran@hotmail.com

- ناوی کتێب: کوردەکانی عێراق
- نووسەر: ڕەجائی فاید
- وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: عەلی میرزا عارف
- بابەت: سیاسی
- پیتچنین: عەلی میرزا عارف
- هەڵەبڕی: عومەر ڕەسول
- دیزاینی ناوەرۆک: نزار نوری
- بەرگ: ئارام عەلی
- تیراژ: ٥٠٠
- زنجیرە: ٢٧٨
- چاپخانە: گەنج
- چاپ: چاپی یەکەم
- ژمارەی سپاردن: (١٥١٢) ساڵی (٢٠١٠)

# پێرست

# کوردستانی عێراق
# خەنجەرێکە بەلاکەمەری عێراقەوە یان.. فارگۆنی پێشکەوتنییەتی..؟

## پێشەکی وەرگێڕ

لە مێژە تامەزرۆی ئەوە بووم رێم لە نووسینێك بکەوێت ئەگەر کورتیش بێت باس لە مێژووی هاوچەرخی کوردو شۆڕشەکانی ئەو سەردەمانە بکات کەبزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردیان پیادا تێپەڕیوە، نووسینەوەی مێژوو پێویستی زۆری بە مادەی مێژوویی‌و پابەندبوون بە بەرنامەو توێژینەوەی زانستی هەیە کە مێژوونووس بە راست‌و دروستی باس لە سەنگ‌و بەهای ئەو سەردەمانە بکات دیارە ئەوەی نوێ ئەمڕۆ لە کوردستاندا دەگەڕێت بەدوای رابردووی گەلەکەیداو تێگەیشتن لە مێژووو جوگرافیای کوردستان. وەختێك ئەم نووسینەی بەڕێز (ڕەجائی فاید)م بەر دەستکەوت‌و بە وردی خوێندمەوە، ئەوەی چەند ساڵ بوو بە دوایدا دەگەڕام دۆزیمەوەو پڕاوپڕ نیازو مەبەستی منی تیادا بەدیدەکرا.. پاش جارێکی تر خوێندنەوەی، بە مەبەستی هێنانەدی ئامانجەکەم‌و پشتبەستن بە پەروەردگاری مەزن لە ٢٠٠٧/٧/٨ دەستم دایە وەرگێڕانی.. لەگەڵ سەرقاڵیم بە کارو ئەرکەتایبەتەکانم، هەر چەندە ماوەیەکی زۆری خایاند تا لە

رۆژی ۲۰۰۸/۸/۹ بە یەکجاری لە پاکنوسکردنی بومەوە.. ئەوەی زیاتر رایکێشام بۆ وەرگێڕانی ئەم نووسینە دیم بە تێروتەسەلی ئەو لایەنانەی گرتووەتە دووتوێ، خوێنەری کورد بە تایبەتی نەوەی نوێ، کە تا مەودایەکی فراوان لە مێژووی هاوچەرخی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد شارەزا دەکات، کە بەشێوەیەکی گشتگیر باس لە لایەنە گرنگەکانی دەکات، وەك لە خوارەوە خراوەتە بەردیدی خوێنەرانی ئازیزو خۆشەویست بە هیوای سوود لێوەرگرتنیو بەخشینی بەندەتان لە هەر کەمو کورتیەك تێبینی بکرێت.. کە هەر ئەوەندەم لە تواناداهەبووە بە خەیاڵی خۆم توانیبێتم لەم رێگایەوە کەمێك خزمەتم بەگەلە ستەمدیدەکەمان کردبێت.

دیارە ئەم نووسینەی بەڕێز (ڕەجائی فاید)(کوردەکانی عێراق هیواوئاوات لەنێوان بەدیهاتنو بەدینەهاتندا) لە دوو دەروازە پێکهاتووە : -

**دەروازەی یەکەم:** ئەم بەشانەی لە خۆگرتووە.

**بەشی یەکەم:** رەهەندی مێژوویی و جوگرافیو سیاسی کوردستان، کە باس لە مێژوو، شوێنو مرۆڤی کورد دەکات.

**بەشی دووەم:** باس لەلایەنی زمانو رۆشنبیریو باری کۆمەڵایەتیو ئایین دەکات.

**بەشی سێیەم:** گرنگی دەدات بە کوردستانو رەهەندی سیاسی.

**بەشی چوارەم:** راپەڕینی کورد دژ بە ستەمی دەوڵەتانی داگیرکەرانی کوردستان.

**بەشی پێنجەم:** مێژووی هاوچەرخی بزووتنەوەی کوردایەتیو خەباتی بەردەوام.

**دەروازەی دووەم:** لە دە بەشو کۆتایی پێکهاتووە کە ئەم لایەنانەی گرتووەتەوە:

**بەشی یەکەم:** گرنگی دەدات بە کوردەکانی عێراقو دەستکەوتەکانی.

**بەشی دووەم:** مێژووی پارتی دیموکراتی کوردستانو دامەزراندنیو خەباتی چەندین ساڵەی لە پێناوی گەلی کورد دا.

**بەشی سێەم:** شۆڕشی گولآنو کاردانەوەی لەسەر گۆڕەپانی هەرێمایەتیو ناوچەیی.

**بەشی چوارەم:** گەیشتنی بەعس بە دەسەلآتو دژایەتی کردنی گەلی کورد.

**بەشی پێنجەم:** ئۆتۆنۆمی کارتۆنیو نەبوونی کاریگەری لەسەر گەلی کوردو بێدەسەلآتی ئیدارەی ئۆتۆنۆمی.

**بەشی شەشەم:** باس لە رێکەوتنی شومی جەزایرو ئەو پرۆتۆکۆلآنە دەکات بە هاوکاری حکومەتی جەزایر لە نێوان حکومەتی بەغداو حکومەتی تاران مۆر کراون.

**بەشی حەوتەم:** باس لە دووبارە سەرهەڵدانەوەی شۆڕشو کاریگەری لەسەر گەلی کوردو رەنگدانەوەی لە ئاستی عێراقو دەوڵەتانی هەرێمەکە دەکات.

**بەشی هەشتەم:** بە تێروتەسەلی لە بزووتنەوەی کوردو شۆڕشی ئیسلامی ئێرانو شەڕی هەشت ساڵەی عێراقو ئێران دەکۆڵێتەوە.

**بەشی نۆیەم:**ئەزموونی پاش راپەڕینو هەڵبژاردنی پەرلەمانو دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستانو دابڕان لە حکومەتی بەغدا باس دەکات.

**بەشی دەیەم:** باس لە دەسەلآتو سەردەمی ئەمریکا دەکات لە ناوچەی رۆژهەلآتی ناوەڕاست.

دوابەش بەشی کۆتایی: خواستی کوردو گونجاندنی لەگەڵ پێشهاتو رووداوەکاندا.

وەرگێڕ

هەڵەبجەی شەهید

٢٠٠٨/٨/١٠

# وتەیەك

نووسەری ئەم كتێبە مێژووییە (ڕەجائی فاید) بە چاوی ویژدانەوە ڕوانیویەتیە كێشەی كوردو ڕووداوەكانی شیكردۆتەوە. لە بەرهەمەكەشیدا سۆزێكی جوڵاوی بۆ گەلەكەمان تێدایەو خۆی خستە ڕیزی ئەو پیاوە عەرەبانەوە كە مافیان بە كورد ڕەوا بینیوەو هەریەكەو لە بواری خۆیدا هەڵوێستێكی مەردانەی نواندووە، لەوانەش (جەمال عەبدولناسر، موعەمەر قەزافی، محەممەد مەهدی جەواهیری، مەعین بەسیسۆ، مەحموود دەروێش، هادی عەلەوی)و هی دیكە، كە ئەمانەش بوونە خۆشەویستی گەلی كوردو ڕێزیان لێدەگیرێ. ئەم ڕێزلێنانەشی لەو ڕووەوەیە كە لەناو ئەو هەموو جەنجاڵیەی عەرەبە ڕەگەزپەرستەكاندا كە هەرگیز بچووكترین مافی سەرەتاییان بەم گەلە ستەمدیدە ڕەوا نەبینیووە، بە پێچەوانەوە بیریان كردوەتەوەو دانیان بە ڕاستی مەسەلەكەدا ناوە. ئەمە جگە لەوەی كە هەڵوێستەكەیان لەناو هەندێ كەسی عەرەبدا بووەتە پتەوكردنی پردی برایەتی نێوان كوردو عەرەب. هەروەها بۆ گەلەكەی ئێمەش خۆشە كە خەڵكانی سەر بە گەلی داگیركار پێ لە ڕەوایی كێشەكەمان بنێن.

نموونەیەكی دیكە لەم بارەوە هێژا (ئیسماعیل بێشكەچی)یە كە بەوپەڕی لێبوردەییەوە كۆمەڵێك لێكۆڵینەوەی لەسەر گەلەكەمان نووسیوە، بە تایبەتی لەسەر ژیانی سیاسیو كۆمەڵایەتیو زمانەوانی كوردەكانی باكوور كە لەلایەن ڕژێمە یەك لە دوای یەكەكانی توركیاوە گەلی كورد هەر بە توركی چیایی

دانـراون و هـەرگیز هـیچ مافێکیـان پـێ رەوانـەبینیوون. هێـزا بێشکەچی ئێستا خۆشەویستێکی گەلەکەمانەو بە پێچەوانەوە لای دەسەلاتو گەلی خۆی کە تورکە بێزی لێدەکرێتەوە. ئەم پیاوە بەویژدانـە چەند جارێکو هـەرجارەی بـۆ مـاوەی چەند ساڵێك خراوەتە زیندانو سووکایەتی پێکراوە. بەلام ئەو بێباك لـە هـەموو دەردیسەرییەك هەر خەریکی کاری خۆیەتی، چونکە راستییەکەو پێی گەیشتووە.

ئیسماعیلی مرۆڤ ئەگەر کورد بوایەو سەد هێندەی بنووسیایەو سـەدهێندە ئازار بدرایە ئەو بایەخ و گرنگیـەی نـەدەبوو کەئێستە هەیـەتی. چونکە ئـەمیش هەر لە منداڵیەوە گۆش کراوە بە سیاسەتی چەوتی پان تورکیزم، بەلام پاشان کە بەدەم کارەوە دێتـە کوردستـانو مەسـەلەکە بـە شێوەیەکی دیکە دەبینـێ، هـەوڵ دەدات راسـتیەکان وەك خـۆی کـە هەیـە نیشـانیان بـدات. ئـەم کارەشـی کـردو مێژوویەکی درەخشانی بۆ خۆی دروست کرد.

نووسەری ئەم کتێبەش پاش ئـەوەی راستـیی مەسـەلەکەی بـۆ دەرکـەوتووە، هەستاوە چاکی مەردایـەتی لێکـردووە بـەلاداو ئەوەنـدەی ویـژدان قبـووڵی بکات نووسیویەتیو بەم کارەشی دەمی هەموو ئەو رەگەز پەرستانەی ناو عەرەب قوفڵ دەکاتو دەچرپێنێ بە گوێیانـدا کـە کێشـەی کـورد کێشـەیەکی مێژوویـیـەو دەبـێ دانی پێدابنرێت.

سەیر ئەوەیە هێـزا رەجـانی فایـد خەڵـکی وڵاتـی میسـرەو بەوشـێوە جوانـە بـیری لەچارەسـەرکردنی کێشـەی کـورد کردۆتـەوە، کەچـی ئـەمرۆ لـەناو سـەرانی عەرەبی عێراقدا بە دەیان رەگەزپەرستیان تێدایە کە چاویان ئـەو هەنـدە مافـە نـابینێ کـە ئەمـەریکا لـە کوردسـتانی عێراقـدا پێـی رەوا بینیـوین. خـۆ ئەگـەر دەستەڵاتی ئەمەریکا نـەبێت ئـەوا ئـەو رەگـەز پەرستانە دەچنەوە سەر کوتـانی دەهۆڵە شڕەکەی بەعسو پێ لە هیچ مافێکمان نانێن. خۆ ئەگەر نیـو ئەوەنـدەی ئەو تێگەیشتنە تەواوەی ئەم نووسەرە لای سەرانی عەرەبی عێراقیشدا هەبووایـە ئـەوا کێشـەکەمان بـێ گرفـت چارەسـەر دەکـراو دەبوویـە بنەمایـەکیش بـۆ

پارچەکانی دیکەی کوردستان.

بەڵام بەداخەوە ئەو تێگەشتنە نییەو ئەگەر لای یەك دوانێکیش هەبێت ئەوا کورد واتەنی بێ مەڵامەت نییەو ئەو کاسە بێ ژێر کاسە نییە.

رەجائی فاید لەم بەرهەمەیدا گەزێکی باشی گرتووە بەدەستەوەو راستیەکان وەك خۆی پێوانە دەکات. بە وردی چۆتە ناوکێشەی کوردەوەو دان بە راستیەکاندا دەنێت و، مافەکانمان دەدات لە بێژنگی مێژوو، هوشیارانە وردەکاریی لە کارەکەیدا کردووە. ئەوەندەی بۆی لوابێ بەڵگەی مێژوویی هێناوەتەوەو تۆماری کردووە. باسی هەوڵ و خەباتی گەلەکەمانی کردووە بۆ بەدەستهێنانی مافی چارەی خۆنووسین. لایەنی ئەرێنی و نەرێنی شۆڕشەکانمانی خستۆتە روو. لە ئەنجامدا بەوە گەیشتووە کە کێشەی کورد کێشەیەکی رەواو مرۆڤانەیەو پێویستە چارەسەر بکرێت. ئەم بەئەنجام گەیشتنەش بۆ ئێمەی کورد کارێکی ئێجگار پەسەندو شایستەیەو دەڵێین: کاشکێ هەموو عەرەب وەکو ئەمو هەموو تورکیش وەکو ئیسماعیل بێشکەچی بەحەق بگەیشتنایە.

لە کۆتاییدا زۆر سوپاسی کاك عەلی میرزا عارف دەکەم کە ئەوشانازییەی پێبەخشیم کە دەقە عەرەبی و کوردیەکەم بەراورد کردو لێشی خواستم کە ئەم وتە کورتە بۆ سەرەتای بەرهەمەکەی بکەم بە دیاری.

نووسەرو مێژونووس

حەکیم مەلا صالح

لێپرسراووی سەنتەری رۆشنبیری

هەڵەبجەی شەهید

٢٠٠٨/٩/١٤

بەناوی پەروەردگاری مەزن

# کوردستانی عێراق خەنجەرە بە کەمەری عێراقەوە یان فارگۆنی پێشکەوتنییەتی؟!!

## پێشەکی نووسەر

بارو دۆخی ناهەموارو دەستی ستەم پاڵی نا بە کوردەکانەوە ببنە پێشەنگی وێنەودیمەنی عێراق‌و رەگەزی سەر لەنوێ دارشتنەوەی پاشەرۆژ، ئیتر پەراوێز خستنیان لە توانادا نەماوە، بە تایبەتی لەوە ختێکداو لەئەنجامی پشتگوێ خستنیان، لە رابردوودا روو بەرووی چەندین کارەساتی ناهەموار بوونەتەوەو پێویستیان بە دەنگێکی ویژداندار هەبووە بەهانایانەوە بچێت‌و ستەمیان لەسەر نەهێڵێ، بەڵام لە ئێمە چنگیان نەکەوت‌و نەیاندۆزیەوە. بێگانە ئەو دەنگەی بۆبەرز کردنەوەو بەهانایانەوە هاتن.. دیارە ئەو هەنگاوە نواندنی میهرەبانی نەبووە، بەڵکوو زیاتر لە پێناوی بەرژەوەندییە تایبەتەکانی خۆیاندا بوو، بەرانبەر دابڕانی ئێمەو پشت لێکردنیان، پەیوەندی دۆستایەتی لە نێوان کوردەکان‌و بێگانانەدا درووستبوو، کەچی لەوەشدا روو بەرووی لۆمەو سەرزەنشتکردنی ئێمە بوونەتەوە.

لەسەردەمێکی تەواو دژوارو لە رێی کۆنگرەیەکی سنووردار لەژێر دروشمی (کۆنگرەی یەکەمی دیالۆگی عەرەبی کوردی لە مایسی ١٩٩٨ لە قاهیرە بەستراو لەگەڵ کوردەکاندا هەوڵی لێك نزیکبوونەوە درا، نووسەری ئەم کتێبە ئەندامی

لیژنەی ئامادەکاری کۆنگرە بوو).

یەکەمجاربوو بەو جۆرە لە قاهیرە دەنگی کورد بەرزببێتەوەو بە روون و ئاشکرا هاواربکەن بەگەل و خاکەوە عێراقین و خەتابار کردنیان بە جیاخواز تاوانێکە لێی بێبەرین و بەناڕەوا ستەمیان لێدەکرێت. یەکێك لەسەرکردە کوردەکان بە جۆرە گاڵتە ئامێزێکەوە وتی: (لەسەر هەموو کوردێك پێویستە هەمیشە قورئانێك لە گیرفانیدا هەڵگرێت هەتا سوێندی پێبخوات کە جیاخواز نییە).

چەند بڕیارێکی گرنگ لە کۆنگرەوە راگەیەنران، یەکێك لەو بڕیارانە، پشتیوانیکردنی گەلی فەلەستین و مافی رەوای بەدامەزرانـدنی دەوڵـەتی سەربەخۆو پایتەختەکەی قودس بێت.. لەگەڵ دڵنیا بەخشین بە ئاستی پاراستنی یەکپارچەیی خاکی عێراق و چەند بڕیارێکی تریش. بەڵام کۆنگرە لە بازنەیەکی داخراوی دوور لە راگەیاندنەکان، وەك شاردنەوەی کۆئەندامێکی هەستیارو شەرم ئامێزی لەش (عورە) پەردەپۆش کرابوو. هەمانکات لە هەموو کون و کەلەبەرێکەوە دژبەرێکخەرانی کۆنگرەکە هات و هاوار بەرزبوویەوەو بەخەمانەتکار لە ئاستی (عروبە) دا خەتابارکران لەڕاستتیدائەم حاڵەتە لە عەقلی عەرەبیدابوماوەیەکی دوورو درێژی هەیەوبنجی داکۆتاوەو جێگیر بووە. سەیرە تا ئێستایش عەرەب ئەوەیان خۆش دەوێت کە دەیبینن و دەیبیستن، لەشەستەکانی سەدەی بیستەمەوە لە بیرکردنەوەیەکدا وامان بە خەیاڵدا هاتووە نیشتیمانی عەرەب، بەتەنها ئەو بەشە ئاوەدانە گرنگەیە چیاکانی (توورووسی سنووری عێراق تورکیا، تاچیاکانی پشتکۆی- سنووری ئێران و عێراق و کەنداوی بەسرەو زەریای عەرەبی تا چیاکانی حەبەشەو بیابانەکان و زەریای ئەتڵەسی تا دەگاتە دەریای سپی، دەگرێتەوە). بەگوێرەی ئەو تێگەیشتنەی لە بەندی حەوتەمی پەیڕەوی بەعسی عەرەبیدا هاتووە دەڵێت: (نەتەوەو نیشتمانی عەرەب لە زەریاوە بۆ کەنداو دەریاو بیابانێکی پوختە) ئەم تێگەیشتنە چەوتە

بە ئەندازەیەك تەشەنەی کردووە، کاریکردوەتە سەر هەستو نەستی عەرەب، بەبیری هیچ کەسیکدا نەهاتووە گەلێکی دیکەی جگە لە عەرەب لەم ناوچەیەدا شانبەشانی ئێمەی زۆرینەدەژین، لەگەڵ ئەوەشدا راستیەکانی مێژوو جوگرافیا راستی بوونی کوردیان وەك نەتەوەو گەلێك سەلماندوەو بە درێژایی مێژوو لە تاڵیو شیرینیو خۆشیو ناخۆشیەکاندا بەشداریانکردووەو لەهەمان سەنگەری عەرەبیدا بنیادنەرو بەرگریکەربوون، جگە لەوەی لە پێکهاتەی سیاسی دا ئامادەبوونی بەر چاویان هەبووەو رۆڵی کاریگەریان لە رووداوە مێژووییەکاندا دیوە. هەڵەیەکی زۆر گەورەیە بەرانبەر بەوانە بەردەوام بین لەیاد کردنو پەراوێز خستنیان، کوردەکان مافی خۆیانە لە بەکارهێنانو قسەپێکردنی زمانەکەیانو زیندوو- کردنەوەی فەرهەنگو رۆشنبیریو سروودو سەماو گۆرانییەکانیان. بەڕاستی هێشتا عەقڵی عەرەبی هەستی بەو لایەنە نەکردووە، ئەگەر بە باشی ئەو هەموو گەنجینە دەوڵەمەندو هەمە جۆرو رەنگاو رەنگیەی هەیە بەکارهێنرا چ سوودێکی فراوانو گشتگیری لێدەخولقێت؟.. بەلام ئەگەر لەمەو دای خۆلێهەڵە کردنو خۆ نەزانکردنەوە بەخراپی بەکارهێنراو لە ئاسیتدا نەخوێنننەوەی ناشیاوکرا !!.. چی روو دەدات؟ جگە لە روو دانی ناکۆکیو سەرهەڵدانی بەربەرەکانێکردن وخوێنڕێژی تاڵی نەخوازراو لە نێوان خاوەن مافو لایەنی دەسەلاتی خۆ بەزۆر سەپێندا. لە واقع دا ژمارەیەکی کەمی رۆشنبیرانی عەرەب هەستیان بەو راستیە کردووەو لەوە گەیشتوون ئەوانە عەرەب نینو لەگەڵیاندا دەژین، لەگەڵ پێشکەوتنو پەرە سەندنی ئەم هەستەو بیرو رای کەسانێکیش بوونی گەلو نەتەوەکانی دیکە رەتدەکەنەوە. هەردوو بیرکردنەوەکە لە چوارچێوەی تێگەیشتنی تەسكو داخراوی نەتەوایەتی عەرەبو ئایدیۆلۆجیای یەکگرتنی عەرەبدا گەمارۆدراوە، لەو سۆنگەیەوە سەرنجیان دەدات تاج ئاستێك لەخزمەتی نەتەوایەتی عەرەبو بەرژەوەندیەکانیدا کار دەکەن. لەمەرجێکدا ئەگەر هەستکرا هەر نەتەوەیەك لەهەوڵی زیندوو کردنەوەو

یەکسانیکردنی مافە ڕۆشنبیریە کانییەتی لەگەڵ نەتەوەی عەرەبداهەرزوو تۆمەتی خەیانەتکاری‌و شەڕە نگێزی دژ بە عەرەب‌و بەو هەرێمە عەرەبیە تیایدا دەژی دەخریتە پاڵی‌و لە ئینتیمای نەتەوەیی خۆی رووت دەکرێتەوە، تەنها بەوە رازی دەبن بزووتنەوەو جموجووڵیەکانیان دەبێت تەنها لە چوار چێوەی خزمەتکردن بەئایدیۆلۆجیای نەتەوایەتی عەرەب‌و لە ژێر پەرچەمی (عروبة) دا بێت. جێی داخە لە چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەو کەمایەتیەکانی جگە لە عەرەب هەندێ ڕۆشنبیرە دیارەکانی عەرەب ئەم بیرۆکەیان خستوەتە بەردەست وەك تیایدا دەردەکەوێت: (هەر چارەسەرێکی کەمایەتیەکانی نیشتیمانی عەرەب ناگرێت لە چوارچێوەی نەتەوایەتی خۆیاندا بێت.. تەنها پەرەپێدانی بازنەی ڕۆشنبیری نەتەوەیی عەرەبە دەتوانێت ڕۆشنبیریە نەتەوایەتی‌و کەمایەتیەکانی دیکە لە بۆتەی خۆیدا یەك بخات. پەروەردەی تایبەت بە مەعریفەو زانستی عەرەبی تواناداره بەیەکخستن‌و پارێزگاریکردنی ئەو هەمە جۆری‌و هەمە ڕەنگیە.. ئەم نەتەوانە بە تێگەیشتنی تەواوەوە دژایەتی یەکێتی عەرەب دەکەن‌و هەندێ کات ڕاستەوخۆ دەچنە ناو ئەو دژایەتیکردنەوە. بێگومان یەکێتی بەرزترین‌و بەنرخترین پرۆسەیە دژبەدابەشبوونێکی ڕواڵەتی، پارێزگاریە لە پێکەوە ژیانێکی ژێر مینرێزکراو لەگەڵ ئەو نەتەوانەداهیواوئاواتە نەتەوایەتیەکانی عەرەبیان پێ قبووڵنەکرێت کە یەکێتی عەرەبە. ئەم تێگەیشتنە هۆکاربوو بەگۆڕانکاری ناوچەکانی کەمایەتیە ئەتنییەکانی دیکەی نیشتەجێ وابەستەکانی خاکی عەرەب بۆ سەرچاوەی هەمیشە ئاڵۆزو هەڕەشە بۆ سەر ئەو وڵاتە عەرەبیانەی ئەوانی لەگەڵدا دەژین، دەبنە مەترسی‌و هەڕەشە بۆ سەر ئاسایشی نەتەوایەتی عەرەب.. نموونەی دیاری ئەم ڕاستیە (ئەمازیغ لە جەزائرو دارفۆر لە سوودان‌و کوردەکان لە عێراق‌و دواجار لە سووریا).

**مەبەستی ئەم لێکۆڵینەوە کوردەکانی عێراقن، بە نیازی سەلماندنی ویژدان لێرەدا دەری دەخەین:**

١- لەگەڵ ئەوماڵوێرانیو سەرگەردانی کارەساتانەی بەسەر کوردەکانی عێراقدا هاتووە تا ئاستێك بەختو گوزەرانیان لە کوردەکانی دیکەی دەوڵەتانی دراوسێ لەیەك جیاوازەکان باشترو لەبارتربووە، لە کاتو شوێنی تایبەتی خۆیدا باسیان لێوەدەکەین.

٢- تەنها ژمارەیەکی سنوور دارلە رۆشنبیرانی عەرەب، هەستیان بە گرنگی ناسینو تێگەیشتن لە کورد وەك کەمایەتیەك لە خاکی وابەستەکراو بە عەرەبەوە کردووەو دانیان بەوە داناوە لە زۆر رووەوە پێویستە بە مافە نەتەوایەتیەکانی خۆیان بگەن، لە سەرووی هەموویانەوە سیاسەتمەدارو بیرمەندی نەتەوەخوازی عەرەب (د. جەمال ئەلئەتاسی) لە پێشەکی کتێبەکەی (منزر ئەلموسڵی ـ عەرەبو کوردەکان ـ العرب والاکراد) دا دەنووسێتو دەڵێت: (مەسەلەی کورد یەکێکە لە کێشە بنەڕەتیەکان لەم ناوچەیەدا، کردنەوەی دۆسیەکانیو بانگهێشتی هێزەسیاسیەکانی عەرەب بۆ دیالۆگ (الحوار) سەبارەت بەو مەسەلەیە نوێکردنەوەی هەڵوێستمانە لە گرنگیدانو باسکردنە لە کێشەی نەتەوایەتیان (نەتەوایەتی عەرەب)و بەهاو توانا بەرزەکانی پێکدادانو دژایەتیکردنی نێوان هەردوو نەتەوەی عەرەبو کورد پێکدادانە لەنێوان پرۆژەی رزگاریو یەکگرتنی عەرەب لە هەر سەردەمێکدابێت، لەگەڵ پرۆژە ی کوردیدا، کە بوونی نیشتیمانو گیانی کوردیە). لەگەڵ یەکەم ئەزموونو لە یەکەم روو بە روو بوو نەوەی لەگەڵ کوردو مەسەلەکەیدا (د. جەمال ئەلئەتاسی) دەڵێت: (یەکەم ئەزموونێك پیایدا تێپەڕمکردو

خستمیە هەڵوێستێك لەوەبگەم كورد لەهەر هەرێمێكی عەرەبیدا وەك هەر گەلێكی دیكەی ئەم سەرزەمینە بوونی خۆی هەیە).

لە كۆتایی بەهاری ١٩٤١و سەرەتای هاوینی تینداروگەرمو وشكی عێراق، وەختێك بە یاوەری كۆمەڵێك قوتابی عەرەبی زانكۆی دیمەشق پێكها تبووین لە (لوبنانییەكو فەلەستینی یەكو قوتابیەكی ئەردەنیو منی سووری).. بە نیازی هاوكاریكردنو پارمەتیدانی بزووتنەوەكەی (رشید عالی گەیلانی) كە لە سەردەمی جەنگی جیهانی دووەمدا دژ بە داگیركەرانی بەریتانیا بەرپاكرابوو گەیشتینە بەغدا، لەو تەمەنەدا هیوای رزگاربوونو بەدیهاتنی یەكگرتنو یەكێتی عەرەب تەواوی بیرو هەستو دەروونمانی داپۆشیبوو. لەگەڵ هیواو ئەندێشەكانماندا، دیمان سوپای ئینگلیز سنوورەكانی دەوروبەری بەغدای بەزاندو خستیە ژێر دەسەڵاتیەوەو هەرەسی بە شۆڕشەكە هێنا، ناچاربووین لەو پایتەختە عەرەبیە دەرچینو بەرەو باكور هەڵبێین، پاش ئاگاداربوونمان بەگرێنەدانی كۆبوونەوەی هێزەكانی بەرگری لە كەركوك. بەرە بەیانێكی زوو بەرەو شاری موسڵ دەزمان كردو ناشارەزا ڕێگای ناوچەكەمان گرتەپێشو زیاتر بەرەو باكوور ڕۆشتبووین، سەرەنجام سەرمان لە ناوچەی هەولێرەوە دەرچوو، بێ ئاگا گەیشتبووینە ناوچەیەكی دووری نێوان زێی گەورەو زێی بچووك. لەگەڵ سەرلێشێواویو ناشارەزایشدا تەواوی ڕواڵەتو دیاردەكانی خاكو دانیشتوانو پەرتو بڵاوی گوندەكانو جۆری پۆشاكو سیمای خەڵكەكەیمان لاشێوابوو، نەماندەزانی لە چ بارو دۆخێكدا دەگوزەرێنین. ئەوەندە تێگەیشتبووین ئەم ڕێگایە ڕێگای موسڵ نییە، بۆیە ناچاربووین بەڕاگرتنی خەڵكی ڕاگوزەرو پرسیارلێكردنیان. كەسانێك دەیانویست وەڵاممان بدەنەوە، لەنێوان خۆیاندا دەكەوتنە گفتوگۆ، بەجۆرێك قسەیان دەكرد ئێمە لێیان نەدەگەیشتین، لە ڕێی ئاماژەو هێمایشەوە ئەوان لە ئێمە تێنەدەگەیشتن، بە سەرسامیو دۆشداماەنەوە لێمان دەتەكینەوە، وەك ئێمە لە هەسارەیەكی ترەوە هاتبین. لە هەمووی

سەختترو دژوارتر تەنانەت هیچ زانیارییەکی جوگرافیشمان لە دەستدا نەبوو. بە پێی برینی ئەو ماوەیە، وامان بە خەیاڵدا دەهات چووبینە خاکی ئێرانەوە.

سەرەنجام رووبەڕووی پیرەژنێك بووینەوە لە کێڵگەیەکی کشتووکاڵیدا کاری دەکرد، بەهەرحاڵێك بوو توانیمان ئاگاداری بکەین ئێمە خەڵکی ئەم وڵاتە نینو رێگامان هەڵە کردووە، بێدەنگ دەستی بۆ دوور راکێشا، بە سەرنجدانێك لەسەر گردێکەوە خانوویەکمان بەدیکرد ئاڵای عێراق بە سەریەوە دەشەکایەوەو چەند خانوویەکیش لە پێشیەوە دیاربوون.. بەترسو لەرزو دڵە تەپێ لێی نزیکبووینەوە، بەگەیشتنمان چاومان بەئەفسەرێك کەوت، ئەو وەختە کەمێك بەخۆماندا هاتینەوەو زانیمان هێشتا لە خاکی عێراقینو لەناوچەی نیشتەجێبووی کوردەکانین). بە راستی شایە تیدانێکی دادپەروەرانەیە لە ئاستی گرنگترین رەگەزی جیا لە عەرەب، گرنگی زیاتری شایە تیدانەکە لەوەدایە، لە کەسێکی خاوەن رووگەی نەتەوەخوازی عەرەبەوە راگەیەنراوە، ئەویش (د. جەمال ئەلئەتاسی)یە.. بەوە کۆتایی پێدەهێنێو دەڵێت: (رۆژانێك بە سەرچوون، هێشتا وێنە لەناخ جێگیرەکانی باکوور (کوردستان)ی عێراق لە هەستو نەستو هزرمدا دەخولانەوە، گەلێکی لێدەژی جیاواز لەگەڵ بەغداو موسڵ، هەر چەند ئەو سەردەمە کێشەی ئەو گەلە بەو ئەندازەیە لە هزرمدا نەشو نمای نەکردبوو). لە شایەتیدا نەکەیدا (د. ئەلئەتاسی) بڕیاردەدات شوێنەکە جیاوازە، شێوەی گوندەکان جیاوازن، دانیشتوان جیاوازن، جلو بەرگو پۆشاك جیاوازە، سیماو روخساری خەڵکەکەی جیاوازە، زمان لە زمانی خەڵکی عێراقی جیاوازە، هەموو هاوجۆرەکانی لە عێراقدا جیاوازن – بڕیارێکی بوێرانەیە (ئەو گەلە لەگەڵ گەلەکەی دیکەی عێراق جیاوازە) – بە درێژایی مێژوو کوردەکان هەوڵەکانیان لە خزمەتکردنی جیهانی عەرەبیو ئیسلامیدا لە کاردا بووەو کاری بەرزو پیرۆزو مەزنیان پێشکەشکردوە، پێش هەموو کەسێك سەلاحەدینی ئەیووبی دێت، دلێرانە بە سەر خاچپەرستاندا سەرکەوتو (قودس)ی لە دەستیان

سەندەوەو رزگاریکرد. ئەوە بوو پێشتریش (ئەبو موسلیمی خوراسانی) دامەزرێنەری دەوڵەتی عەبباسی، پاش دامەزراندنی دەوڵەتەکەی (ئەبو جەعفەری مەنسوور) کوشتی، نموونەیەکی زیندووی ئەو خزمەتکردنانەن، لە لایەکی ترو لە چەندین بواری جۆراو جۆردا، کە سایەتیە کوردەکانی وەك خاوەنی شمشێرو پێنووس (مەحمود سامی ئەلباروودی)دا کۆکێکەر لە مافی قاسم ئەمین ومحەممەد عەبدەو (ئەحمەد تەیمورو عائیشە، تەیمووری ومحەممەد مەحمود تەیموری‌و محەممەد کورد عەلی)وفەرماندەی نیشتمانی سوری مەزن ئیبراهیم هەنانۆو فرماندەی نیشتمانیسوری ئیبراهیم هەنانۆ، هەردوو شاعیرانی مەزن‌و بەناوبانگ (جەمیل سدقی ئەلزەهاوی‌و بلند حەیدەری) بە رەگەز کوردە هەریەك لە بوارێکدا خزمەتی خۆیان پێشکەش کردووە. هەروەها لەو خێزانە بەرچەڵەك کوردانەی ئامادەیی بەرچاویان هەبووە، لە پەرەپێدان‌و پێشبردنی باری سیاسی‌و رۆشنبیری‌و فەرهەنگی‌و هونەری عەرەبیدا خێزانی (بەدرخان‌و خێزانی وانلی) بوون، کە هەتا هەتایە عەرەب منەتباریان دەبن، ئەگەر بەسەرنجەوە لەڕاستی واقعەکە وردببینەوە بارودۆخەکە کوردەکانی وەك خەنجەرێك ئاوێزانی کەمەری دەوڵەتی عێراق کردووەو کەوتوونەتە نێوان داواکاری مافەکانیان‌و دەست بەڕووە وە نانیان، لە جێ بەجێکردنیان لەلایەن حکومەتی ناوەندەوە، کە بوو نەهۆی سەرهەڵدانی چەندین کێشەو ناکۆکی لەنێوانی ئەوان‌و حکومەتەیەك بە دوایەکە هاتووەکانی عێراقدا.. وەلەئاکامدا بە (کێشەی کورد) ناسراوەو چەندین پەل‌و پۆی وەك کێشەی موسڵ‌و کێشەی سنووری نێوان عێراق‌و ئێرانی لێکەوتەوە. لەگەڵ بوونی کێشەیەکی لەو جۆرە، بزوتنەوەی کوردیش چەشنی بزووتنەوەکانی جیهان لە پێناوی درێژە پێدانی پەناببات بەر یارمەتیە دەرەکیەکان.. لەو ئاراستەیەوە کێشەی کورد هەلی دەستێوەردانی دەرەکی‌و هاتنەدی نیازی دراوسێکانی لەچاو برینەخاکی عێراقی رەخساند. دەگونجا لە پەرە پێدانی رۆشنبیری‌و فەرهەنگی‌و دیاریکردنی

چارەنووسی ناوچەکە کوردەکان هۆکارێکی گرنگ بن.. گومان لەوە دانییە لە چواچێوەی هاوڵاتیبوون و یەکسانیدا کورد توانا دارن بەڕابەتیکردنی دەسەڵاتی باڵا لە دەوڵەتانی عێراقیدا، هەروەها لە مێژووی رابردوو یاندا (سەلاحەدینی ئەیوبی) رابەرایەتیکردو قودسیشی رزگارکرد. لێرەوە ئەو راستیە دەردەکەوێت، ئەو خەنجەرە تواناداره بە هەڵتەکاندنی کەمەری وڵاتو بەرەو چارسەری نادیاریشی ببات لە هەل و مەرجی ئەم دواییەدا لەپێکهاتەی سیاسی عێراقی نوێدا کوردەکان رێو شوێنی شیاوو گرنگیان وەرگرتووەو لەزۆر بواردا رۆڵی سەرەکیان وەرگرتووەو دەسەڵاتیان لە دەستدایە. پێش رووخانی رژێم لەسەر خاکی عێراق تاکەلایەنی بەر هەڵستکار بوون، بوێرانە دژایەتیانکردووەو رووبەڕووی وەستاون.. راستەو نکولی لەوە ناکرێت ئەو رەوشە لەژێر کاریگەری بڕیاری (٦٨٨)ی ئەنجومەنی ئاسایش و دیاریکردنی هێڵی ئاسۆیی (٣٦) بە ناوچەی ئارام و پارێزگاری لێکردن و چاودێریکردنی ئەمەریکاو هێزە هاو پەیمانەکان بەڕێوەبرا، بەڵام گرنگی بەر هەڵستیکردنی رژێم لەسەر خاکی عێراقدا رۆڵی سەرەکی هەبووە، کە بۆ خۆی مانایەکی تایبەت دەبەخشێت. هەر وەك لە رابردوودا کوردستان لانکەو پارێزگاریکەری هەموو گروپ و دەستەولایەنە بەرهەڵستکارە جۆراو جۆرەکانی عێراق بووە وتیایدا هەماهەنگی یەکتریان لەکارەکانیاندا کردووەو کۆبوونەوەو کۆنگرەکانیان گرێداوە، وەك لە نزیکەوە فشاری کاریگەر بووە بۆ سەر حکومەتی بەغدا. بە ئامادەبوونی نوێنەری ئەمەریکا (زاڵمای خەلیلزاد).. پارتە کوردیەکان پێش هەر لایەنێکی تری بەر هەڵستکار ئامادەبوون لە کۆنگرەی لەندەنی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٢. دواتر بانگهێشتی هەموو پارت و لایەنە بەرهەڵستکارەکانی دیکەکرا بە مەبەستی گرێدانی کۆنگرەی سەلاحەدین. لەگەڵ هاتنەپێشەوەی شەڕی رزگاری عێراقدا، بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد هەموو تواناکانی لە یارمەتیدانی هێزەکانی ئەمەریکا خستە گەڕو بەکردەوە لە هەندێ سەردەمی شەڕدا هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان لە هێرشکردنە سەر

هێزەکانی رژێم لە موسڵو کەرکوكو خەریککردنو خلافاندنی سوپای عێراق رۆڵی مەزنو کاریگەریان گێڕاو سەر کەوتنی مەزنیان بەدەستهێنا. وەك ئاشکرایە دوای رووخانی رژێمیش کوردەکان ئامادەیی هەمیشەییو رۆڵیان لە گرێدانی هاوپەیمانییەکی تۆکمەدا هەبووە، لەگەڵ رێکخستنی کۆبوونەوەو گرێدانی کۆنگرەکانی سەبارەت پێکهێنانی ئەنجومەنی نیشتیمانی کاتی سەردەمی گواستنەوەو سپاردنی سەرۆکایەتیەکەی بە کەسایەتیەکی کورد (د.فوئاد مەعسوم)و پێکهێنانی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی عێراقی نوێ وئەنجومەنی وەزیران، لەگەڵ وەرگرتنو بەدەستهێنانی چەندین پۆستی گرنگ لەو ئەنجومەنانە. لە یاسای بەڕێوەبردنی قۆناغی گواستنەوە (المرحلە الانتقالیە)ی دەوڵەت، کوردەکان بوونەتە بەردی بناغەی ئەنجومەنەکانی (نیشتیمانی ــ سەرۆکایەتی ــ ئەنجومەنی وەزیران)و تیایاندا رێو شوێنی شیاوی خۆیان وەرگرتووە..تەنانەت سەرۆکایەتی ئەرکانی سوپای عێراق بە جەنەڕاڵێکی کوردسپێرراوە،

ئەمەش تەنها ئەو مانایە دەگەیەنێتو دەخوازێت بڵێن (ئێمەی کورد بە هێزو تواناوە بوونمان هەیە).

نکوولی لەوە ناکرێت کوردەکان رۆڵی گرنگی پێشڕەوایەتیکردنو سیماو وێنەی عێراقی نوێ دەگێڕن. لە کۆتاییدا بۆ ئێمە ناسینو لێگەیشتن لە دیدگاو مەبەستو ئامانجەکانیان گرنگیەکی زۆری هەیەو پەراوێز خستنیان ئەستەمە، بەتایبەتی لە هەلو مەجێکدا توانیویانە خۆیان بەسەر هەمواندا بسەپێنن.

لەو ئاراستەوە ئەم نووسینە هەوڵێکە لە ناسینی کوردو کوردستانی عێراق وەك (مرۆڤ – شوێن – تایبەتمەندی رۆشنبیری). وەك دەبینین لە رووی نیشتیمانییەوە کوردستانی عێراق لە چوارچێوەی دەوڵەتدا عێراقینو لەڕووی نەتەوایەتیشەوە لە چوارچێوەی کوردستانی گەورەدا خۆیان دەبیننەوە. ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە لەم پێشەکیەدا بە زۆربەی ئەو کارانەدا بچینەوە لە رابردوویەکی

نزیدا بوونەتە راستی؟.. ئایا ئەمە هەڵەیەکی گەورە نییە ناساندنی هەمە جۆری‌و هەمە رەنگی بەر پابوونی ناوچەکەمان رەت بکەینەوەو لە جێی بوونمان بە حاڵەتێکی دەوڵەمەند بیگۆڕین بۆ لە بن دەرهێنان‌و ریشەکێشکردنی تواناکانمان لە خوێن‌و لە سامان؟. بەو هۆیەوە نووسەر زیاتر لە نۆ ساڵ لە هەولێری پایتەختی کوردستان ژیانی بەسەر بردووە، لە هەشتاکانی سەدەی رابردوودا لە نزیکەوە ئاگادارو چاودێری هەوڵەکانی تواندنەوەو لەناوبردنی ئەم کوردانەم، لەرێی بەکارهێنانی شمشێری موعتەزو ئالتونەکەیەوە) وەك چۆن دوای لادانی خەلیفەی عەباسی (المستعین) موعتەزبەیعەتی پێدراو بەخەلیفەدانرا، لەکاتیکدا لەتەمەنی نۆزدەساڵیدابوو، وەیەکەم خلیفەبوو بەخشڵی زێڕەوەسواربوو، کەخلیفەکانی پێشتری خۆی بەخشڵی زیوەوە سواردەبوون. بەوچەشنە دیومە چۆن هەوڵێك دراوە بۆبە بەعسی کردنیان. چ حاڵەتێکی پێکەنین ئامێزبوو لەوە ختێکدا نەخشەو ئاڵای بەعسیان بە ناچاری بەرز دەکردەوەو بەزۆرداری هاواریان پێ دەگردن (أمة عربية واحدة ذات رسالة خالدة / وحدة ـ حرية ـ إشتراكية) جگە لەوە دەبوو بە زۆرداری خەڵکی کوردیان لەریزەکانی سوپای میللی (الجیش الشعبی) رێك بخستباو بە نارەوا پەلکێشی بەرەکانی شەڕی بەرگریکردن لە دەروازەی رۆژهەلاتی نیشتیمانی عەرەب (البوابە الشرقیه) لە شەڕی دژبە ئێران بکرانایە — کوردەکان بە ناخی دەروونی خۆیاندا دەیانچریاند (من چیمە بە سەر دەروازەی رۆژهەلاتی نیشتیمانی عەرەبەوە.. من لە کوێ‌و ئەولە کوێ؟). لە کاتێکدا نەخشەو ئاڵای کوردستان لە دەروونەکاندا دەپارێزراو بە دروشمی کوردستان یا نەمان (کوردستان اوالموت) نەخشێنرابوو، ئەوانەی بە زۆرەملێ کوردەکانیان دەکردە بەعسی نەزانانە گومانیان بەوە دەبرد، ئیتر تەواو عروو بەیان بەناخیاندا شۆڕکردوەتەوەو شرواڵی کوردی لەبەریاندا داکەنراوەو دزداشەی عەرەبیان بەباڵادا براوە، لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدات ـ ئایا ئەو کوردانە بەشی ئێمە دەبن.. یان بارگرانین بەسەر مانەوە؟. پرسیاری

تری پەیوەندیدار بە کوردەکانی عێراقەوە زۆرن.. وەك پێشتر ئاماژەی پێکرا (لەچوار چێوەی عێراقدا تائەم ساتەوەختە عێراقین و لەسەر ئاستی کوردستانی گەورە کوردن).

ئەمە هەوڵێکە بە هیوای ناسینی کوردو لێگەیشتنیان. مەسەلەی کورد لە کوردستانی گەورە وەك شوێن.. مرۆڤ – تایبەتمەندی نەتەوەیی دەستی پێکرد، لەوێشەوە گوێزرایەوە بۆ کوردستانی عێراق.

لە کۆتاییدا خودا کۆمەك و پشتیوان بێت

ڕەجائی فاید

قاهیرە شوباتی/٢٠٠٥

(مێژووی خەلیفەکان (جەلالەدینی سیوتی- ل/٢٢٧ یانەی ئیبن ئەلهەیسەم)

# بەشی یەکەم

# کوردستان .. مێژووو نیشتیمان و مرۆڤ

## مێژووی رۆچوون بە سەردەمێکی دێریندا

لەگەڵ ئەوەدا کورد دێرینترین گەلی ناوچەکەیە، کەچی تا ئێستا چەشنی گەلانی دیکە لەسەر هیچ بەشێکی کوردستان نەیانتوانیوە دەوڵەتی سەربەخۆ دابمەزرێنن. ئەم بارو دۆخە سەرنجی زانایان و توێژەرانی راکێشاو کەوتنە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی مێژوویان لەناوچەکەدا، ئایا رۆڵەی رەسەنی کوردستانن.. یان لە سەردەمە نزیکەکانەوە کۆچیان بۆ کردووە؟ زانایانی وەك (نۆلدکە – هارتمان – ویسیاخ – ستراب‌ۆن – مینۆ رسکی – لیهمان...هتد) گرنگیان خستوەتە سەر ئەو لایەنە مێژووییە، لە ئاستی نەژادی کورد چەندین دیدو بۆ چوونیان هەبووە، کە جیاوازیان تیادابەدی دەکرێت و لە کۆتاییدا یەك رادەبن لە بوونی تایبەتمەندی جیاکەرەوەی لەگەلانی دیکەی ناوچەکەو بەدێرینترین و کۆنترین گەلی نیشتەجێبووی هەردووناوچەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست و رۆژهەلاتی نزیك دەژمێررێت. هەندێ لەو لێکۆڵینەوانە دەریانخستووە، ریشەو نەژادی کورد ئەو کاردۆخیانەن لە (٤٠١ – ٤٠٠) ی پێش زاین دلێرانە بەرەنگاری (گەزنەفوون)ی سەرکردەی یۆنانی و دەهەزار سەربازەکەی بوو نەتەوەو بە پاشەکشەکردن ناچاریان کردوون، کاردۆخیەکان ئەوتیرە ئازاو دلێرەی نیشتەجێی ئەو ولاتەبوون کەئێستا کوردەکان تیایدا

نیشتەجێن. دیدو بۆ چوونێکی تر هەیە، گوایا نەتەوەی کورد لە هەردوو هۆزی لەیەکچووی (ماردۆیی‌و کیری تووین) پێکهاتبێت بۆ چوونێکی دیکەی پشت بەستوو بە زانست‌و بواری (ئەنسروبۆلۆژی) باس لەڕەسەنایەتی گەلی کوردو ڕۆچوونی بەناخی مێژووی دێرینی ناوچەکەدا دەکات – هەمان کات لە ئاستی نەژادی کوردەکان چیرۆکی ئەفسانەیی (زوحاك) لە ئەدەبی کوردیدا دەبینین، کە (میرشەرەفخانی بەدلیسی) لە کتێبی مێژوویی (شەرەفنامە) ی یەکەم سەرچاوەی مێژوویی نووسراو بە زمانی فارسی نووسیویەو بلاوکراوەتەوە، ریشەو بنەڕەتی گەلی کورد دەگرێتەوە بۆ ئەو کوردە هەلاتوانەی لە ترسی ستەمی (زوحاك)و لەناوبردنیان پەنایان بردوەتە بەر کۆساره بەرزوسەختەکان، زوحاك ئەوپاشایەی کەبەنخۆشیەکی سەیرتووشبوبو، لەچارەسەرکردنی پزیشکانی سەردەمەکەسەرسام ودەسەوسانبوون، وەك دەگێڕنەوە دوومارلەسەرشانی روابوون تووسی ئێشوئازارێکی زۆریانکردبوو، شەیتان دەچێتەبندەستی وئامۆژگاریدەکات بەبەکارهێنانی مەلهەمێك کەلەمۆخی لاوان دروستدەکرێت، بەفەرمانی ئەوپاشاستەمکارەڕۆژانەدوولاوی کوردیان سەردەبڕی ومۆخەکانیان بۆئەومەبەستەبەکاردەهێنا، بەڕێکەوت جەلادەکەلەگەل بەسەربردنی کاتدابەزەییکەوتەدلی وتەنهالاوێکی سەردەبڕی ولاوەکەی دیکەی دەربازدەکردوبەرەوشاخە کان هەلدەهات.لەگەلبەسەربردنی کاتداهەلهاتوان زۆربوون وپەریزادەی نیشتەجێبووی شاخەکانیان مارەدەکرد، بەوهۆیەوەپەرەیانسەندوفراوانبوون، بە تێپەڕاندنی وەخت‌و سەردەمەکان گەلی کوردیان پێکهێناوەو دەستیانداوەتە چاندن‌و کشتوکال‌و بەخێوکردنی ئاژەل‌و بەنەترس‌و ئازایەتی‌و دلێری‌و قارەمانی ناوبانگیان دەرکردووە، کە هەندێ نووسەری فارس‌و عەرەب بەجنۆکە ناویان بردووە. لەگەل بوونی چیرۆکی خەیالی وئەفسانەییدا، ئەوەی مەبەستمانەو لەدیدگاکانی دیکەوە دەردەکەوێ، کوردەکان لە دێر زەمانەوە نیشتەجێی ناوچەکەیان بوون، بەلام بەچەند

هۆیەکەوە وەك میللەتانی دیکە هەلی دامەزراندنی دەوڵەتیان بۆ نەڕەخساوە. لەوەختێکدا هەموو تاکێکی کورد لە قووڵایی خەیاڵو ئەندێشەی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کورددا دەژی، کە لەسایەیداو بەپێی تایبەتمەندیە رۆشنبیریەکانی هەست بەهاو وڵاتیبوونو ژیانی ئاسوودە بکات، بەتایبەتی دابەشبوونی کوردستان بەسەر چەند وڵاتو دەوڵەتێکدا کێشەیەکی مەترسیداری بۆ ئەو دەوڵەتانە ناوەتەوە، بەو هۆیەشەوە ناکۆکیو چەوساندنەوەو پارچە پارچە بوونی کوردو خاکی کوردستان بەردەوام دەبێت. شاعیری مەزنی کورد (ئەحمەدی خانی) لە داستانە شیعریەکەیدا (مەم وزین)- کوردستان وەك بەندکراوێکی کۆتو زنجیر کراو لەبەندیخانەی بێگانەدا وێنە دەکێشیو دەڵێت:

(سەراسیمەم بەو چارەنووسەی پەروەردگاری مەزن بە کوردیەوە تایبەت کردووە، کوردێك بەزەبری شمشێر گەیشتبوونە پلەی بەرزی سەرفرازی، بۆ دەبێت لەبەڕێوەبردنو حوکمرانی کردنی خۆیان بێبەش بکرێن؟).. وادیارە تورکو فارس بە شوورابەرزەکانی کورد گەمارۆ دراونو هەر جارێك سوپای عەرەبو تورك دەکەوتنە جموجوڵ، کوردەکانیان دەخستە مەلەکردن لە دەریای خوێنی خۆیاندا کە بە دەستی ئەوانە دەڕێژراو دەکوژرانو قەلاچۆدەکران. ئێمە لەناویەکدا هەمیشە دوورلەیەكو دابڕاوو ناکۆکینو کەسمان ملکەچی ئەویدیکەمان نابین، خۆ ئەگەر هەموومان یەکگرتووبین، ئیتر ئەوانە لەڕوو بەڕوو بوونەوەو دژایەتیکردنمان ناتوانا دەبن.

شاعیری گەورەی کوردیش (پیرەمێرد) دەڵێت: (تورکیا ئامێرێکی لە کاروەستاوەو کارناکات ئەگەر بە خوێنی گەلی کورد چەور نەکرێت).

## کوردستانی گەورە

کوردستان.. یان خاکی کورد.. ئەو ناوە دلگیرو خۆشەویستەیە هەستی نەتەوایەتی کورد دەهەژێنێ و هەمیشە هاندەریانە لەسەر بەردەوامی خەبات و تێکۆشان، لە پێناوی بە دەستهێنانی مافە نەتەوایەتیەکانیان. هەزاران ساڵە کورد لەسەر ئەم خاکە داژیان دەگوزەرێنن و هەست دەکەن بوونەتە قوربانی دەستی مێژووو جوگرافیاو گەمەسیاسیەکانی دەوڵەتان، لەوە دڵنیان هیچ گەل و نەتەوەیەکی ئەم سەرزەمینە وەك ئەوان تووشی چەوسانەوەو ستەم نەبووە، بەو هۆیەوە دەبینین چ لە ئێستاو چ لە رابردوودا لە راپەرین و بەرپاکردنی شۆڕشەکانیان نەوەستاون.بێگومان کوردەکانی پارچەکانی دیکەی کوردستان هەرستەمێك لە پاشە رۆژدا بەسەریاندا بسەپێنرێت ئەستەمە بتوانن وەك کوردەکانی عێراق رابمالن. کارێکی شیاوە کوردەکان لە کوردستانی گەورەدا چاوببڕنە کوردەکانی کوردستانی عێراق، دیارە لەو سۆنگەیەوە هەوڵ دەدەن چەشنی ئەوان بگەنە هەمان ئازادیو رزگاربوون و سەر لەنوێ یەکخستنەوەی بەشە لەیەك دابڕاوەکانی جەستەی کورد. وەك دەرکەوتووە، رۆژێك لە رۆژان، کوردەکان لە بەرپاکردنی شۆڕشەکانیان نکولیان نەکردووەو بەردەوام لە خەباتدا ئامادە بوونی تەواویان هەبووە. لەو بارەوە شاعیری مەزنی عەرەب (محەممەد مەهدی ئەلجەواهیری) وەسفێکی بەرزی خەباتی گەلی کوردی کردووەو بەردەوام وەك پشتیوانێکی دڵسۆز داکۆکیو بەرگری لە خەباتی کردووەو تێگەیشتنی تەواوی هەبووە لە ئاستی مەسەلەی کورد (جەواهیری) مەزن، ئەو کڵاوە بەناوبانگەی رابەرایەتی کوردو (شۆڕشی ئەیلولی مەزن — وەك) وەك دیاری پێشکەشیکردبوو.. بە دروشمی (کوردستان یانەمان) رازێنرابوویەوە، هیچ وەخت لەسەری نەداهاتە خوارەوە[1].

---

[1] ساڵی ١٩٦٣ بارزانی نەمر لەگەلآلە پێشکەشی جەواهیری مەزنی کرد. و.ك

## رووبەرو ژمارەی دانیشتوان

ڕووبەری کوردستان نزیکەی نیوملیۆن کیلۆمەتر چوار گۆشەیەو بە ئەندازەی نیوەی رووبەری خاکی میسر دەبێت، لەکاتێکدا خاکی کوردستان دەوڵەمەندە بە باراناوو رووبارو جۆگەلەو کانیاوو لەوەڕگای سروشتیو جۆرەکانی کشتوکاڵو بەرهەمی باخو بێستانو داهاتی کێڵگەکانی لۆکەو گەنمەشامیو گەنمو جۆو تووتن.. بەڵام بەشی هەرەزۆری رووبەری خاکی میسر بیابانی وشكو بێ ئاوە. سەبارەت بە ژمارەی وردی دانیشتوان دەستنیشانکردنی کارێکی گرانە، ئەوەیش دەگەڕێتەوە بۆئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە، کەبە هۆکاری سیاسیەوە ژمارەی وردی کورد لە چوارچێوەی سنووری سیاسیاندا بەڕاستو دروستی راناگەیەنن لە حاڵەتێکدا ئەگەر رایشگەیەنرابێت ژمارەیەکی زۆرکەمی لێ ئاشکرا کراوە، هەمانکات لە دەرخستنو راگەیاندنی ژمارەی تەواو وردیان دوورکەوتوونەتەوە. لەهەر وەختو سەردەمێکدا هەر توێژەرێك ویستبێتی سەبارەت بەو خاڵە بنووسێت پەنای بردووە تەبەر سەرچاوە کۆنەکانی ساڵانی رابردوو، کەلەڕاستیدا ژمارەی راگەیانراوی کوردەکان زۆر لەو ژمارەیەکەمتر بووە کە هەبووە. مانگی مایسی ۱۹۹۸ سەرو بەندی بەستنی کۆنگرەی دیالۆگی عەرەبی کوردی (الحوارالعربی الکوردی) لە قاهیرە لە لێدوانەکەیدا (جەلال تاڵەبانی) وتی: کاتێك هەندێ لە برایان سەبارەت بە ژمارەی کورد قسە دەکەن، راستەوخۆ روودەکەنە نوسراوە کۆنەکان، وەك کورد توانای زاو زێی نەبووبێت، بەتوندی دەست دەگرن بەسەر ژمێریەکانی پەنجاکانو چلەکانو سییەکانەوەو ئەوەیان لەبیر نامێنێ ئێستا ژمارەی دانیشتوانی خۆیان بە کوێ گەیشتووە، دیارە جیاوازی گەورە هەیە.. کەواتە پێویستە برایانمان ئەو راستیە لە یاد نەکەن، یەکێك لە برایان ئاماژەی بە ژمارەی کوردی عێراق کردکە (۳ - ٤) ملیۆن کەسە، ئەگەر دانیشتوانی ئەو ناوچەیەی ئێستا کوردەکان ئیدارەی هەڵدەسووڕێننو بەڕێوەی دەبەن لەو ژمارەیە پتر بێت، ئەبێ کوردەکانی

دەرەوەی سنووری ناوچەی کوردستان (موسڵ ـ شێخان ـ کەرکوك.. هتد) چەندبن؟ گومان لەوەدانییە بەغدا لە شارەکانی دیکە گەورەترین ژمارەی کوردی لە خۆگرتووە.. پێویستە لەسەر براکانمان لەم مەسەلەیەو لە کێشەی پەیوەندیدار بە سی تاچل ملیۆن مرۆڤ وردبین بن). بەگەڕانەوە بۆ هەندێ ئاماژەکاری ژمارەی نزیك لە راستی کوردەکان بەم شێوەیە دەردەکەوێت:

تورکیا (١٥ تا ٢٠) ملیۆن کورد لەسەر رووبەری لە (٢٩٪)ی خاکی تورکیا دەژین.

ئێران (٩ تا ١٢) ملیۆن کورد لەسەر رووبەری (١٢٪) ی خاکی ئێران دەژین.

عێراق (٦ تا ٨) ملیۆن کورد لەسەر رووبەری لە (٢٩٪)ی خاکی عێراق دەژین.

سووریا (٢تا ٢,٥)ملیۆن کوردی لێدەژی.

یەکێتی سۆڤیەتی جاران (١,٥ تا ٢,٥) ملیۆن کورد هەیە.

کوردەکانی تاراوگە بەدوو ملیۆن مەزندە دەکرێن بەم شێوەیە کۆی گشتی ئاماری کوردەکان دەگاتە (٢٥,٥ تا ٤٦,٥) ملیۆن کەس.

## ناوچە کوردنیشینەکان

لەئەنجامی ئەو دابەش بوونەی کوردستانی پێ دابەش بووەو لەداهاتوودا دەردەکەوێت، کورد دابەشکراوە بەسەر ژمارەیەك لە دەوڵەتانی دراوسێدا.

(شەرەفەدین بەدلیسی) لەشەرەفنامەدا دەڵێت: (ئەی کورد دەتەوێت بزانیت ئەو شوێنانە کامانەن خزمو کەسو کارەکەتی تیادا دەژینو نیشتەجێن؟.)

لە رۆژئاواوە سنووری کوردستان بەرەو ئەسکەندەروونەو چیاکانی تووروس بەرەو دەریای رەش درێژبوومتەوەو لە باکوورەوە ئەردەهانو ئاراس، لە رۆژ هەڵاتەوە شاخەکانی وەند تا دەگاتە شاخی حەمرینو شەنگارو رێگای نوسەیبین. کوردەکانی عێراق لە بەشێکی مەزنی ویلایەتی موسڵ ناوچەی باکوور ژیان

بەسەر دەبەن، ناوچەکەیان بەرەو باشووری زەنجیرە چیاکانی حەمرین جیاکەرەوەی رێگای سەرەکی بەغداو هەولێر درێژ دەبێتەوە، لەویلایەتی هەکاری تورکیای نزیك بە سنووری ئێران، زۆربەی کوردەکان تیایدا نیشتەجێن‌و ژیان بەسەر دەبەن، جگە لە ناوچە شاخاویەکانی ویلایەتەکانی (وان – بەدلیس – دیاربەکر – خەرپووت‌و ناوچەکانی بۆتان‌و کەرتی دەرسیم. بەڵام کوردەکانی کوردستانی ئێران بە شێوەیەکی رەها لە ویلایەتەکانی (کرماشان‌و سنە - کوردستان) نیشتەجێن‌و لەهەندێ بەشی ناوچەکانی سابلاخ‌و موکری باشووری دەریاچەی ئورومیە (ورمێ) واتە (رەزائیە) زۆرینەی دانیشتوانی پێك دەهێنن.

هەروەها لە ئازەربایجان‌و هەندێ کەرتی دیکەی یەکێتی سۆڤیەتی جاران بەشێکی بەرچاو لە کوردەکان نیشتەجێن‌و لە سووریایش پارێزگاکانی (قامیشلی‌و حەڵەب‌و حەسەکە بە زۆرینە کوردەکان تیایاندا دەژین).

## گرنگترین شارەکانی کوردستان

شارەکانی کوردستان لەگەڵ زۆری ژمارەیاندا هەندێکیان دێرین‌و هەندێکی دیکەشیان تەمەنیان چەند سەدساڵێك دەبێت.. ئەمەش بەشێکە لەو شارانە:

## شاری هەولێر

هەندێ شارەزا مەزندە دەکەن هەولێر دێرینترین شارە لە جیهاندا تا ئێستاماببێتەوە، کەلە هەزارەی سێهەمی پێش زاین لە سەرچاوەو نووسینە سۆمەریەکاندا بە (ئەربل) ناوی هاتووەو لەسەردەمی ئاشووریەکانیشدا بە (ئەر بائیلۆ) ناسراوە، کەلەنزیکی دا (ئەسکەندەری مەکدۆنی) بەسەر داریووشی فارسیدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا.

قەڵای دێرینی ناوەراستی هەولێر وەك هێمایەکی گەشتیاری گرنگ بنیادنانی گەرێنراوەتەوە بۆ (سەرجوون)ی ئاکەدی لەساڵی (٢٣٥٠) ی پێش زاین.

## شاری دیاربەکر

ناوە کوردیەکەی (ئامەد)ەو بە پایتەختی هەرێمی کوردستانی تورکیا دەژمێررێت، پێشترو لە رابردوودا پایتەختی ژمارەیەك لە ئەمارەتە کوردیەکان بووە، گرنگترینیان ئەمارەتی – مەروانیو دیاربەکرە، کە بەسەر لێواری رووباری دیجلەی ناو خاکی تورکیادا دەڕوانێت.

## شاری بەدلیس

دەکەوێتە سەر لێواری چەمێکی رووباری دیجلەو رۆژئاوای دەریاچەی وان..

جگە لەم شارانەیش چەندین شارو شارۆچکەی دیکەهەن وەك (کرماشان، ئیلام – قەسری شیرین – سلێمانی – دهۆك و...هتد).

لە کاتێکداو تا ئێستایش هێشتا ناکۆکیو جیاوازی بیروڕا لەسەر بارو دۆخی شاری کەرکوك بەردەوامەو نەگەیشتۆتە کۆتایی – ئاخۆ کوردستانی دەبێت یان تورکمانی یان عێراقی عەرەبی.

# بەشی دووەم

## هێماکانی زمانەوانی و ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی و ئایینی

### زمانی کوردی

(ساتع ئەلحوسەری) دەڵێت: (زمان گیانی نەتەوەو ژیانیەتی کە هاوتای میحوەری نەتەوەیەتیو بڕبڕەی پشتیەتی).

ئەم وتەیە دەقاو دەق بەسەر کوردەکاندا دەسەپێت، چونکە ئەوان تا مردن وا بەستەی زمانەکەیانن، زمانی کوردی دەوڵەمەندە بە داستانو چیرۆكو چیرۆکی ئەفسانەو شیعرو ئامۆژگاریو پەندو دانایی، هەر چەند زمانێکی ئاریاییە، بەلام بەهۆی نووسین بە (ئەلف با)ی عەرەبی لە هەموو شوێنێکی کوردستان زیاتر لە زمانی عەرەبییەوە نزیکترە. پاش گۆڕینی پیتی عەرەبی بەپیتی لاتینی لەلایەن (کەمال ئەتاتورك)ەوە، ئێستا لە تورکیا پیتی لاتینی لە نووسینی زمانی تورکیدا پەیرەو دەکرێت. بەلام لە عێراقو ئێران (ئەلف با)ی عەرەبی لە خوێندنو نووسین دابەڕێوە دەبرێ.

ئەوەی جێی سەرنجە لەم سەردەمەی دواییدا لە جێی پیتی عەرەبی کوردەکان لە نووسیندا دەستیانداوەتە بەکارهێنانی پیتی لاتینی. لە ئاستی ئەم مەسەلەیەدا چەند جارێك لەگەڵ ژمارەیەك نووسەرو رووناکبیرانی کورد دا وتوێژو راوێژم ئەنجامداوە، بیانوویان بە نەبوونی شوێنو نەگونجانی چەند پیتێکی وەك (ژ – چ – گ) لە ئەلف بای عەرەبیدا هێناوەتەوە. شاعێران لە کۆمەڵگای کوردەواریدا ڕێزی تایبەتی خۆیان هەیە.. تەنانەت هاولاتی کورد

ئەگەر نەخوێندەواریش بێت ناوی شاعیران و شیعرەکانیشیان لەبەرەو لە ڕێکردنیانداو لەبەر خۆیانەوەو لەسەر ئاوازو مۆزیکی کوردی بە گۆرانییەوە دەیلێنەوە.

شیعری کوردی لەسەر ریچکەو ڕێڕەوی شیعری فارسی کێش و قافیەدارە. باس و خواسێك شاعیرانی کورد دەهەژێنێ و کاردەکاتە سەر هەستیان وئیلهامیان پێ دەبەخشێت، (خۆشەویستی نیشتیمان – عیشق و سۆز – پەرۆشبوون – شانازیکردن – خۆشەویستی) یە.

شاعیرانی کورد سۆزو پەرۆشیان لە نێوان رۆمانسیيەتی پاك و سۆزی عیشق دا جیاوازە، رووگەی گرنگیدان لای زۆربەی شاعیران لەتەسەوفی ئیسلامی و سۆزو ستایشی پێغەمبەری مەزنی ئیسلام (دروودی خوداى لەسەر) بەدەرنییە دیاریترین شاعیرانی کورد (محەممەد فەزلی – نالی – شەره ف خان- مەلای جزیری – حاجی قادری کۆیی – بێکەس – هەژار- پیرەمێرد – کامەران بەدرخان – عەبدولا گۆران – هێمن.. هتد). لەنووسەران و ئەدیبانیش (ئەحمەدی خانی – شەرەفەدینی بەدلیسی – عەلی ترمۆکی) وچەنداتی تریش. زمانی کوردی دەوڵەمەندە بەچەند زاراوەیەك و بەپێی ناوچەکان دابەشبووە، هەندێ جارو لە هەندێ شوێن جیاوازی نێوانیان دەگاتە ئاستی لەیەك نەگەیشتن،ئەوەی یەکەمجار گرنگی بە مەسەلەی زمانەوانی و زاراوە کوردیەکان داوە (شەرەفخانی بە دلیسی) خاوەنی شەرەفنامە بووە، لەسەر بناغەی جوگرافی جیاوازی نێوان زاراوەکانی بۆ چوار بەشی سەرەکی دابەشکردووە (کرمانجی – لوڕی – گۆران – زازا[٢]) دەگونجێت ئەم زاراوانە بەزاراوەی دایك لە زمانی

---

(٢) جێی سەرسوڕمانە نووسەر لەگەڵ شارەزابوونیدا زاراوەی هەورامی لە یادکردووە ، یان بەدواداچوونی بۆی نەبووە، دیارە زاراوەی هەورامی کۆنترین زاراوەیەو (ماریفەت)ی پیرشالیاری زەردەشتی بەو زاراوەیە نووسراوە کە دەگەڕێتەوە بۆ پێش هاتنی ئیسلام. و.ك

کوردیــدا پەنجــەیان بخرێتەســەرو دیــاری بکــرێن، دیــارە زاراوەی کرمــانجی بەربلاوترین زاراوەیە، کوردستانی تورکیاو ئێرانو دهۆکی لە کوردستانی عێـراق گرتۆتەوە، لەو رووەوە زاراوەی کرمانجی زۆربەی ناوچەی بادینـانی گرتـووە تـەوە، بـە زاراوەی بادینــانی ناســراوە. زاراوەی ســۆرانی لــە باشــووری کوردســتانو بــە تایبـەتی لـە شـارەکانی هـەولێرو سلێمانی بڵاو بوومتـەوە، جگـە لـەوەی زاراوەی خوێنـدنو فێربوونـە، هـەمانکات بـە زمـانی ئـەدەبی یـەکگرتوو ناسـراوەو بـەو هۆیەوە لەمێژە شـاری سلێمانی شـاری نووسـەرانو شـاعیرانو هونەرمەندانـە. لـە رووی رەوانبێژیەوە زاراوەی سۆرانی بە ئاسانترین زاراوەی کوردی دادەنرێت.

بــارودۆخی کوردەکــانی عێــراق لــە بەشــەکانی دیکــە زیــاتر پاریــدەدەری فێرکردنــی رۆڵــەکانیانو دامەزرانــدنو وابەســتەکردنیانن بــە زانکـۆو پـەیمانگاو قوتابخانە کوردیەکانەوە.

## بارو دۆخی ئایینی

زۆربــەی هــەرە زۆری کوردەکــان موســوڵمانو لەســەر مەزهــەبی (ســوننەو جەماعەت) پەیرەوی ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەکەن، لەگەڵ بـوونی کەمینەیـەك لــە پــەیرەوانی مەزهــەبی (شــیعەی جەعفــەری) نیشــتەجێبووی سەرســنووری عێراقـی نزیـك بـە ئێـران، لـە شـارەکانی (خانـەقین – مەنـدەلی – لـە پارێزگـای بەعقوبــە).. کــە بــە فــەیلی ناســراون. تێکــڕا کوردەکــان هــەردەم شــانازی بــە ئیسلامەتی خۆیانەوە دەکەن، بەو پەڕی دڵسۆزیو دەمارگیریـەوە پابەنـدی بـڕواو ئایینەکـەیانو بـەگیانێکی لـە خۆبووردنـەوە بـەرگری لێدەکەنو بـە پەرۆشـەوە رووبەڕووی هەرگرفتێك دەوەستنو بەدڵسۆزیەوە چارەسەری دەکەن.

لەســەردەمی ئێســتاو لــە رابردوویشــدا زۆر گرنگــی دراوە بــە خوێنــدنو فێربــوونی بنەماناییـنییــەکانو بــەجێ بــەجێکردنی ئەرکــەکانو ســوننەتە

شەرعیەکان. لەو دیدگایەوە کارێك شیاوی سەرنجدان وتێبینی کردنە، لە دیاریکردنی مانگی کۆچی کە بە مانگی عەرەبی ناو بانگی دەرکردووە، کوردەکان باوەڕدەخەنە سەر ئەزموونە کلاسیکیەکانی خۆیانو لەو ڕووەوە هیچ وەخت پابەندی بڕیاری حکومەت نابن.

وەختێك بیانەوێت بۆ دەرکەوتنو دۆزینەوەی مانگی ڕەمەزان بگەڕێن، پەنادەبەنە بەر لوتکەی چیا بەرزو بڵندەکانو تیژبینان دەڕواننە ئاسمانو چاودێری وردی دەرچوونی مانگ دەکەن، بە دیدەوانیو کارامەیی دەیدۆزنەوە، لەو ڕێگایەوە ڕۆژوەکانیان دەگرنو ئاهەنگی جەژنی ڕەمەزانیش دەگێڕنو ساڵانە بە جۆشو خرۆشی بێ هاوتاوە یادی لە دایکبوونو شەوڕەویو بەرزبوونەوە (الأسراء والمعراج) ی پێغەمبەری مەزن دەکەنەوە، بێ جیاوازیکردنی هەژارانو دەوڵەمەندان شیرینی بەسەر دە ڕو دراوسێو ڕێبوارو کەسو کاردا دابەش دەکەن. لەڕووی بڕوای بەتینیان بە ئایینی ئیسلامو پەیڕەویکردنی ڕێنمایی شارەزایانیان، کوردەکان بێئەندازە وابەستەی شێخە کانیان دەبنو بەگرنگیەوە دەڕواننە ڕێبازی سۆفی گەری (طريقة التصوف) زۆر جار ڕوویداوە بە سوود وەرگرتن لە هەستو سۆزو پابەندبوونیان بە ئایینەکەیانەوە، فەرمانڕەواو خەلیفەکان لە پێناوی هێنانەدی مەبەستو نیازکانیان پێچەوانەی بنچینە شەرعیەکان، فتوای بێدین بوونو کافربوونیان بەسەر تیرەو تاقمێکی ئایینەکانی دیکەداداوەو کوردەکانیان لێهانداون.

مێژوو دەری دەخات، لە سەردەمی دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا (میر محەمەد)ی میری سۆران یاخیبوونی خۆی دژ بە خەلیفە رادەگەیەنێت، بەو هۆیەوە (مەلا محەممەدی خەتێ)ی موفتی دەربار، رایدەگەیەنێت هەر کەسێك شەڕ دژی سوپای خەلیفە بەرپا بکات، بێ ئیمانەو ژنەکەیشی لێحەرام دەبێتو تەڵاقی دەکەوێت. لە ڕاستیدا ئەم فتوایە لە ڕیزی سەربازانو دەستو پێوەندی میریدا دەنگی دایەوەو کاریگەریەکی توندی خستەوە، ئەوە بوو بەهۆی دوور

کەوتنــەوەی خەڵـکی لـە مـیرو دەورو بـەریان چۆڵـکردو لـە ئاکامـدا روو بـەرووی چارەنووسی خۆی بوویەوە.

لـە کۆمەڵـگای کوردەواریـدا پیـاوی ئـایینی (مـەلا) جێـی خۆشەویسـتیو شـکۆداری خۆیـەتیو پلـەو پایەیـەکی مـەزنی هەیـە، هـەر ئـەوەش بووەتـە هـۆی ئــەوەی زۆرجــار پیــاوانی ئــایینی کــورد دەســەڵاتی ئــایینیو سیاســیان یــەکی گرتووەتــەوەو رۆڵــی گــرنگو کاریگــەریان هــەبووە، لــە مێــژووی بزووتنــەوەی رزگاریخوازی کوردا رابەرایەتی چەندین راپەرینی گرنگو دیاری وەك راپـەرینی (شێخ عوبەیدیلای نەهری)و (شێخ سەعیدی پیران)و (شێخ ئەحمەدی بارزانی)و (مەلا مستەفا)و (قازی محەممـەد) یـان کـردووە. گومـان لـەوەدا نییـە شـێخەکانو کەسایەتیە ئایینییەکان تەنها رۆشنبیرێکن لە نێوان زۆربـەی خـەڵکی پارچـەکانی کوردســتاندا رۆڵــی گرنگیــان لــە مێــژووی سیاســی ناوچــەکەدا گێــڕاوە، هــەمانکات خاوەنی زەویو زارو دەسەلاتێکی وابوون بـالآتربووە لـە دەسـەڵاتی سـەرۆك هـۆزە کلاسیکیەکان.. بـەو جـۆرە کاریگـەری ئـایینی سـنووری خێڵایـەتی بەزانـدوە. لـە کوردسـتان رێبـازی سـۆفیگەری پانتاییـەکی فراوانـی لـە نـاخو دە روونـی خـەڵکی داگیرکـردووە کـەوەك رێبـازێکی ئـایینی پـەیڕەو کـراوە، جگەلـەوە شـێخەکان لـە کۆمەڵگادا شکۆمەندیان پارێزراوە.. لەوانە

## نەقشبەندی

لەم ناوچەیەدا بـەربلاوترینو بـەناوبانگترین رێبـازەو لەسـەر دەسـتی (شـێخ محەممـەد)ی نەقشـبەندی کـوڕی (مـەولا نـا محەممـەد بەهائـەدین)ی بوخاریـەوە دامـەزراوەو لـە بوخـاراوە گەیشـتوەتە کوردسـتانو تیایـدا تەشـەنەی کـردووەو خـەڵکێکی زۆرلێـی کۆبوونەتـەوە، تائـەم سـەردەمەیش رێبـازی نەقشـبەندی پلـەو پایەیەکی بەرزی هەیە. لەناوەندو مەڵبەندە گرنگـەکان، لـە کوردسـتانی عێراقـدا خانەقاکانی بیارەو تەوێڵەن، بەسەر لوتکەی چیاکانی هەورامانەوە.

## بارزان

هەمانشێوە بارزانییەکان شوێنکەوتەی ڕێبازی نەقشبەندین و سەربەتەکیەی گوندی بارزانن.. ئەم ڕێبازە لەو شوێنەدا چەند گرنگی ئایینی بە خۆوە گرتووە، ئەوندەیش گرنگی سیاسی هەبووە، گرنگترین ڕەگەزی شوێنکەوتەی ڕێبازە کە پێشتر (مەلا مستەفا بارزانی) و لە ئێستایشدا هەندێ لە ڕابەرانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردایەتین.

## قادری

سەرچاوەی ئەم ڕێبازە دەگەڕێتەوە بۆ (شێخ عەبدولقادری گەیلانی) کە ئێستا مەزارەکەی لە بەغدا لەو مزگەوتەدایە کە بە ناوی خۆیەوە ناونراوە. وەك زانراوە، لەبەغداوە و لەو شوێنەوە شێخ عەبدولقادر هەستاوە بە بانگەوازو لەوێشەوە گەیەنرایە کوردستان و شانبەشانی ڕێبازی نەقشبەندی بوونە کلتووری گیانی (ڕۆحی) لەناوچەکەدا.

## بەرزنجی

خێزانێکی ئایینییەو لە ڕێگای ڕێبازی (قادری) یەوە ڕابەرایەتی ئایینیان گرتووەتە دەست و شێخەکانیان بە شوێنکەوتەی ڕێبازی قادری ناسراون.

## تاڵەبانی

بە هەمانشێوە ئەمیش وەك خێزانێك شوێنکەوتەی (ڕێبازی قادری)یە.

## ڕێبازوئایینەکانی دیکە:

### یەزیدی

یەزیدیەکان بیرو رایان وا بەستەی شێخەکەیان (عودەی کوڕی موسافر)ی ئەمەویە، کە مەزارەکەی لە لالشی نێوان موسڵو دهۆکە، بە پەیڕەوکردنی ڕێنماییەکانی ئەو دەجوولێنەوەو هەڵسوکەوت دەکەن، بۆیە بە(عەدەوی ناوبانگیان دەرکردووە) ئەم یەزیدیانە ئاینێکی سەیریان هەیەو سروتە ئاینییەکانیان لە سنووری ناوچەی نیشتەجێبوونیان تێناپەڕن، بۆیە بە شەیتان پەرستیش ناو دەبرێن، بەشێوەیەکی رواڵەتی باس لە کارەکانی چاکەو خراپە دەکەن. یەزیدی بڕوایان بە جارێکی تر گەڕانەوەی گیانەکان (تناسخ الأرواح) بۆ تەنێکی تر هەیەو ئاگرو رووناکی بە پیرۆز دەزانن، بە بۆچوونی ئەوان شەیتان یەکەم یەکتاپەرست بووەو جگە لە کڕنووش بردن بۆ یەزدانی مەزنو بالآدەس کڕنووشی بۆ کەسێکی تر نەبردووە، بۆیە بە گەورەو پیرۆز رایدەگرن. هەرلەسەرەتاوە رەچاوی ئەوە دەکەن بە گوێرەی ڕێنماییەکانی (شێخ عودەی – شێخ ئادی) نەفرەتکردن لەشەیتان کارێکی قەدەغەیەو دواتر فەرماندرا بە خۆ پارێزی لەناو هێنانی شەیتان، ئەمانەو جگە لەچەند نەرێتیکی دیکەی سەیروسەمەرەو سەرنجڕاکێشی وەك قەدەغەکردنی خواردنی کاهوو ماسی.

### عەلی ئیلاهی

زۆربەی ئەم خاوەن باوەڕانە لە کوردەکانن، وەك مەزهەبێك پەیڕەوی دەکەن، بەبیرو بۆچوونە سەیرەکانیانەوە شونیکەوتەی خەلیفەی چوارەمی ئیسلام (ئیمامی عەلی کوڕی ئەبووتالب)نو وەك خودا پەرستشی دەکەنو بڕوایان بە دیسانەوە گواستنەوەی گیانەکان (تناسخ الأرواح) بۆ جەستەیەکی تر هەیەو پابەندن بە سەردانی چەند مەزارێکی تایبەت بە خۆیان.

## شەبەک - یان قزڵباش

شـونیکەوتەی مەزهـەبێکی نهێنـی پەردەپۆشـکراون، (تـەورات و ئینجیـل و قورئان) یـان لاپیرۆزەو هـەمانکات ئیمـامی (عـەلی) و نـەوەکانی پیرۆز رادەگـرن.. نـەرۆژو دەگـرن و نـە نوێژدەکـەن، لـە رۆژێکـدا تـەنها یـەك نوێـژیان لافـەرزە، پابەندبوونی ئایینی و مەزەبیان لەچەند سروتێك تێناپەڕێت، سـەیر لـەوەدا یـە هەموو جۆرە خواردنەوەیەکی سرکەرو مەستکەریان لا حـەرام و قەدەغەیـە، بـە مەبەستی جیاکردنـەوەیان لـە تـوخم و مەزهەبـەکانی دیکـە وەك نـەریت کڵاوی سوور لەسەر دەکەن. بۆچی نازناوی (قزڵباش)یـان بەسـەردا سـەپێنراوە؟ وەك لـە مێژوودا هاتووە، بە هێزترین دەستەی ناوفارسە سەفەویەکان بوون.

## ئایینی مەسیحی - گاور

لێرەدا ئەم پرسیارە سەر هەڵدەدات.. ئایا کوردەکان خاچپەرست (گـاور) یـان تیادایە؟.. لە راستیدا کورد وەك نەتەوە گاوری تیادانییە، دەتوانین بڵێین گـاوری کوردسـتان. وەك مێـژوو دەریخسـتووە چـەندین فەرمانـدەی بـە ئـایین (گـاور) لـە ریزەکـانی بزووتنـەوەی رزگـاریخوازی کـورددا خـەباتیانکردووەو ناویـان تۆمارکراوەو ئەندامیش بوون لە ریزی پارتـە کوردیـەکانی کوردسـتانی عێراقـدا. بـەزۆری گاورەکـان لـە هـەردوو مـەزەبی (ئاشـووری و کلـدان و کەمینەیـەکی ئۆرسۆزۆکس) پێکهاتوون. سەبارەت بە ئاشووریەکان چەند بیرو بۆچوونی جیاواز هەیە.. هەندێك بە کوردی رەسەنیان دادەنێن، کـە دوای ئیسلام بوونیـان لەگـەڵ تێپەڕاندنی کاتدا جیاوازی لە نێوانیاندا درووستبووە. کەسانێکی تر بەو کلدانانە دە ریاندە خەن، لە ژێرفشاری گەلانی دیکەو لـە ترسـی کوشتنی بـە کۆمـەڵ و بـە نیازی نیشتەجێبوون پەنایان بردوەتە ناوچە شاخاویەکان. بەپێ ی رای هەنـدێکی تر لە نەوەی ئەسباتی جولەکەن و لەلایەن ئاشووریە کۆنەکانـەوە یەخسیرکراون و

بەچیا سەختو دووره دەستەکانی کوردستاندا تەفرو توونا کراون، کە ئەو سەردەمە لە ژێر چەپۆکی داگیرکاری ئەواندابووە. بەلاّم رای باوو بەربلاّوی ئاشووریەکان خۆیان، بنەڕەتیان دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵەی (سامی)و لە هەزارەی چوارەمی پێش زاین نیشتیمانەکەیان لەنێو دوورگەی عەرەب بەجێهێشتووەو رووبانکردووەتە باکوور، لەپاشماوەی ئەو ئاشووریانەن لە دەوروبەری سەدەی دەهەمی پێش زایندا مەزنترین ئیمپراتۆرییەتیان لە باکووری میزۆپۆتامیا (بلاد مابین النهرین) دامەزراندوە. ئەم چیرۆکە پشت بەستووە بە دەقی کتێبی پیرۆز (الکتاب المقدس) وەك تیایدا هاتووە.. {ئەی مەلیکی ئاشوور، ژێر دەستەکانت خەواڵوو کردووە، گەورەپیاوانت لە جێی نووستندانو گەلەکەت پەراگەندە کردووە بە سەر شاخەکانداو کەسیان یەکناگرن}.

سەرۆکی رۆحی ئەم مەزهبە نازناوی (مار شەمعون)ی لێنراوە. ئاشووریەکان وکلدانەکان بەزمانی سورمییانی قسە دەکەنو لەخێزانی زمانەسامیەکانن، بەلاّم زمانی کوردی سەربەخێزانی هیندۆ ئۆرۆپی یە.

بەدرێژایی مێژوو ئاشووریەکان دابڕاوو دووره پەرێز لە کۆمەڵگاکان ژیاونو توانیویانە پارێزگاری لە زمانو فەرهەنگو رۆشنبیری خۆیان بکەن. بەو هۆیەوە عێراق لە ژێر دەسەڵاتی دوولایەنەی فارسو دەوڵەتی خەلافەتی عوسمانیدا بووە، هەردوولاشیان دەوڵەتی ئیسلامی بوون، دۆخی گوزە رانی ئاشووریان لەو پەڕی بارخراپیدا ئەگوزەراو دوای کوردەکانو توورکەکانو ئێرانییەکان، لە پلەی چوارەمی هاولاّتیبووندا دەژیان.بە درێژایی مێژووی ناوچەکە تابیستو پێنج ساڵی سەرەتای سەدەی نۆزدە هەم هیچ شەڕو ناکۆکیەك لە نێوانی کوردو ئاشووریەکاندا روونەداوە، بەلاّم پاش دەرکەوتنی بەرژەوەندیە سیاسیو ئابووریەکانی دەوڵەتانی زلهێز لە عێراقداو دەرکەوتنی رۆڵی نێردراوە مژدە دەر(البعثات التبشیریة)ەکانی هاتوو لە ئەورووپاوە، پەیوەندیەکانی نێوان کوردەکانو ئاشووریەکان گۆڕانکاریان بە خۆیانەوە دی. هاتنی مژدە دە رانی

ئەوروپایی جۆرە هەستیاریەکی لای کوردە موسوڵمانەکان دروستکرد وگەیشتە ئاستی روودانی گرژیو ئاڵۆزیو هەندێ جار کەوتنەوەی شەڕی خوێناوی لە نێوان گاورەکانو موسوڵمانەکان لە ناوچەکەدا. تێبینی لەوە دەکرێت بە درێژایی مێژووی دوورو درێژیان ئاشووریەکان هەوڵی دامەزراندنی کیانی سەربەخۆیان نەداوە، بەلاّم لەگەڵ هاتنی سەدەی بیستەمدا هەستی نەتەوایەتی لەناویاندا بەرزبوویەوە، بەتایبەتی پاش دەرکەوتنی سیاسەتی (ئیتحادو تەرەقی) لە تورکیای پاش کوودەتاکەی(ساڵی ١٩٠٨)و چڕکردنی هەوڵیان لەئاستی بە تورککردنی گەلانی ژێر دەسەلاّتی خەلافەتی عوسمانیو لەناوبردنی گاورەکان تیایدا، بەئاشکرا کاردانەوەیان لە بەندی یەکەمی بەیاننامەی ١٩١٧/٦/٢٨ دەرکەوتو لە ژێر ناوی (یەکێتی ئاشووری ئازاد) دەربڕینە لە هەرچی زووتر بەڕێوەبەراتیکردنی ناوچەکانی - ئورومیەو موسڵو تورعابدینو نوسەیبینو جەزیرەی جۆلامیرگا - لە چوارچێوەی روسیای سەربەستدا. هەروەها لە تەمموزی ١٩١٩/ دا یاداشتێك بۆ کۆنگرەی ئاشتی پاریس بەرزکرایەوە، تیایدا باس لە دامەزراندنی دەوڵەتی ئاشووری سەربەخۆ دەکات، وەك تیایدا هاتووە دەڵێت: (ئاشووریەکان خوازیاری دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆن لەسەر خاکی ژمارەیەك لەویلایەتەکانی رۆژهەلاّتو باشووری دەوڵەتی عوسمانی ئاوەدان بە کوردو تورکمانو عەرەب، لەگەڵ داواکاری ویلایەتەکانی - حەڵەبو دیرەزوورو موسڵو دەستەبەرکردنی دەرگای دە ریایی لەسەر دەریای ناوە راستو کەنداوی عەرەبی. رۆڵی نیراوانی مژدە دەری ئەوروپایی بۆ ناوچەکەو دەرهاوێشتەکانی مەترسیەکی فراوانی خستەوە، دروستبوونی گرژیو ئاڵۆزی لە نێوان کوردو تورك لەلایەكو ناکۆکیو گرژی لەگەڵ ئاشووریەکان لەلایەکی ترەوە، دایە پاڵی روودانی شەڕو کوشتارو کارگەیشتە ئاستی کوشتنی سەرچاوەی دەسەلاّتی یەکەمی ئاشووری (بنیامین مار شەمعون) بە سەردەستی یەکێك لە فەرماندە کوردەکان بەناوی (سمکۆ). بەلاّم لە ئێستادا ئاشووریو کلدانەکان لە ناوچەکەداو

لەگەڵ کوردو عەرەبو تورکەکاندا بە ئارامیو گیانی برایەتی پێکەوە ژیان بەسەردەبەن.

## خەسڵەت.. خووو رەوشت.. نەریت

دەربارەی کوردەکان (کلۆدیۆس ریچ) دەنووسێتو دەڵێت: (بەشێوەیەکی گشتی کوردەکان ئەگەر پیاوبێت یا ئافرەت خاوەنی جەستەی دامەزراوو هێزو بازووی توانادارن، هێزوتوانای لەو جۆرەم تەنها لەکوردستاندا دیوە.. کوردەکان بەگشتی روخسار سەختو زۆر رەق دەبینرێنو زۆر شانازی بە سمێڵەکانیانەوە دەکەنو زۆربەی وەخت سوێندی پێدەخۆنو بە هێمای پیاوەتی دادەنێن. دەربارەی ئەو دیمەنو روخسارە شاعیری ئەرمەنی (ئەبووڤان) دەڵێت (دەگونجێت هەر لە یەکەم سەرنجەوە بە رامان لە شانو شەوکەتو پیاوەتیو هەیبەتیدا کوردبناسرێت، کوردەکان تیژبینو سروشت گەرمو بە زۆری برۆکانیان مووچڕو پەیوەستن، لەگەڵ ئەوەشدا ناوچاو قۆقزو لووت درێژو روخسارپانن، هەنگاوەکانیان توندو جێگیرن، کەبەڕاستی ئەمانە بەسوارچاکی رۆژهەڵات ناسراون[٣] لە دیاریترین خەسڵەتەکانی کورد سوارچاکیە لەگۆڕەپانی شەڕدا.. پەندێکی کوردی سەلمێنەری ئەو راستیەیە کە دەڵێت: (جیهان موڵکی قارەمانانە).. ئەم خەسڵەتە لەگەڵ سروشتی ژیانی سەربەستی وئازادیدا لە دایکبووە، وەك نەریتی هەمیشە، کورد سەوداسەری راوو پەیداکردنی لەوەڕگای بەپیتن. گرنگی کەسایەتی کورد لەوەدایە دەردەکەوێت لە ئاستێکی بەرزدا ملکەچی ویستو فەرمانی خێڵەکەی خۆیەتی، لەڕوویەکی ترەوە دان بەخۆداگرو ئارامو بەخشندەو هەمیشە ئامادەی خۆ بەختکردنە لە پێناوی کۆمەڵەکەیدا کەوتنەژێر کاریگەری ئەم دوو هۆکارە دوو لایەنیە، لایەنی بەردەوام ناکۆك لەگەڵ سروشتو مرۆڤو لایەنی ملکەچبوونی بۆ یاسای خێڵەکەی خەسڵەتەکانی

---

[٣] عەرەب و کوردەکان – نووسینی منزر ئەلموسڵی

جوامێری‌و ڕەوشت بەرزی وملنەدانی لە ناخی کورد دا خولقاندوە.. سروشتی ڕەق‌و نالەباری شاخ‌و کاریگەری سەرمای زستان‌و گەرمای هاوین، بە جۆرێك کوردیان دڵڕەق کردووە لە تۆڵە سەندندا سۆزو بەزەیی لەسەر یان نامێنێ. شیاوی یادخستنەوەیە کەنازناوی (ئۆجەلان)ی پەیوەست بە فەرماندەی کورد (عەبدولا ئۆجەلان) بەمانای تۆڵەسێن هاتووە. لەوبارەوە پەندی پێشینان لە ئەدەبی کوردیدا پانتاییەکی فراوانی داگیرکردوە، وەك دەڵێت: (دوژمنی باوك نابێتە هاوڕێی کوڕ - دەست سوور بوون لە خوێن باشترە لەوازهێنان لەتۆڵە سەندن). کوردەکان لەوە گەیشتوون خواردن چ زیانێك بە مرۆڤ دەگەیەنێت، کەچی زیادە ڕۆیی زۆری تیا دەکەن، هەروەها لەشتەکانی دیکەشدا پەندێکی کوردی دەڵێت: (هەموو شتێك لە ناسکیدا دەپچڕێت‌و پیاو لە قەڵەویدا). هەڵبژاردنی ناوی کوردی خەسڵەت‌و نەریتێکی ڕەسەنی کوردەواریەو ناوی شاخ‌و دەشت‌و دۆڵ‌و ناوچە ناودارەکانی کوردستان لە منداڵەکانیان دەنێن.. وەك (قەندیل - هەندرێن - زاگرۆس - کۆسرەت - سەفین - هتد). لەلایەکی ترەوە کوردەکان بیرتیژو زوو تووڕە بووو زویش رازی، لەگەڵ ئەوەشدا دڵسۆزو دڵپاك‌و ڕاستگۆو توندڕەوو سەرسەخت‌و ڕووگەش. تاکی کورد ژیانێکی ئاسان‌و ئاسایی بەسەردە بات.. بەرانبەر بەکەسانی نامۆ دیواری گومانە، کە بڕوایشی پێ بەخشی بێ سنوور پێی دە بەخشێت، زۆر بە وریایی ئارەزووی سووسەکردنی هەیەو خۆیشی لە زۆرشت وەردەدات‌و بە جۆرێك سەرنجی کەسێکی ناموو دەدات خەریکە جلەکانی لەبەردا دامالێت. لە کۆمەڵگای کوردەواریدا، بێئەندازە ڕێزلە پیرو پەککەوتەکان دەگیرێت‌و ئافرەتیش بە بنەڕەتی سەرەکی خێزان دادەنرێت بەوەی لەناو ماڵدا ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕێت. ئەگەر بەوردی سەرنج بدرێن دەزانرێت پەیوەندی شاخ‌و کورد پەیوەندیەکی مێژوویی زیندوو توندو تۆڵە. وتەیەکی زیندووی کوردی دەڵێت: (هەموان پشتیان لێکردین، جگە لە شاخ هاورێمان بۆنەماوەتەوە).

بەدرێـژایی مێـژوو شـاخ مـەزنترین پشـتیوانی کـوردان بـووە، لـە شـەڕدا حەشارگەو پارێزگاریانە.. لەگەڵ ئەوەدا شاخ ئارامگاو هەوارگەی دڵانە، هەمانکات جێـی دیـاریکراوی ئاهـەنگ گێـڕانو زەماوەنـدی هاوسـەرگیریو هەڵپـەڕکێی بـەناوبانگی کوردیەبـەجلو بـەرگی رەنگـاو رەنگـی ئـاڵاو واڵاوە قـەد پاڵـەکان دەرازرێنـەوە، جـوانی سروشـتی شـاخەکان بەگوڵـە رەنگـاو رەنگـە دڵفرێنـەکانو کانیاوە ئاودارەکانیو لووتکەی بە بـەفر داپۆشـراوو گوڵاڵـە سـوورەو گـژوگیا شۆڕ بووەکانی ژێرتاشە بەردەکان سەرچاوەی ژیانی هەمیشـەیی کـوردو کوردسـتانن — جوانیو رازاوەیی کوردسـتانی رەنگین، لـە جلو بـەرگی ئـافرەتی کـورددا رەنگـی داوەتەوەو تێکەڵی خۆشەویستیو شیعرو مۆسیقاو گۆرانیو تابلۆو پەیکەرو وێنـە فۆتۆگرافەکان بووە.

خەسڵەتەکانی دیکەی دژوارو پێچەوانەی یەکترهـەنو دەگونجێت خەسـڵەتی دیکەشیان تێکەڵ بووبێت ونەچووبنە تۆمارگـەوە، یـان بەرچاووگوێ نەکـەوتبن. بەڵام لە کۆتاییدا ئەمانە خەسڵەتی مرۆڤی کوردن، ئەگەر ئەو مرۆڤـە لـە تورکیـا بژی یان لە ئێران یان لە عێراق یان لە سووریا، جیاوازی لە خەسڵەتەکاندا نییـە. لـە بـواری فەرهەنگیـدا چـەندین چـیرۆکی کلتـووری کـوردی هـەن زیـاتر لەسـەر هێماکانی رابردوو دەکۆڵنەوە، وەك لە خوارەوە داهاتووە.

١- چەند کوردێك بە رێگادا دەڕۆن سەبارەت بە خولگـەی (کاکێشـان) مشـتو مـڕ دەکەوێتـە نێوانیـان.. هەریەکـەو رایـەکی جیـاواز لـەوی تـر دەر دەبڕێـت.. ئەوەندە نا خایـەنێت بەگژیەکدا دەچن، کاتێك بـە خۆیانـدا دێنـەوە هـەموویان نوقمی خوێن بوون.

٢- مێـژوو نـووس (هارۆڵـدلامپ) ئـەم چـیرۆکە دەگێڕێتـەوە، لەسـەردەمی شـەڕەکانی خاچپەرسـتاندا روویـداوە.. دەڵێـت: (ریتشـاردی شـێردڵ) دوو لـە فەرماندەکانی شاری عەکا بەدیل دەگرێتو رزگارانە) (فدیە)یان لەسـەر دادەنێت بە مەرجی ئازادکردنیان.

بڕی رزگارانەی سەر فەرماندەی بەڕەگەز کورد (ئیبن ئەل مەشتوب) تەنها هەشت سەد پارچە زێڕ دانرا، لەکاتێکدا بڕی رزگارانەی سەر فەرماندەی بە رەگەز عەرەب (قەرەقۆش سێ هەزار پارچە زێڕ دادەنرێت.. فەرماندەی بە رەگەز کورد (ئیبن ئەل مەشتوب) بەتوندی ناڕەزایی دەر دەبڕێ‌و دەڵێت: من لەو کەمترنیم، چۆن دەبێت رزگارانەی من لەو کەمتربێت ؟.. بەم هەڵوێستە سوارەکانی پەرستگا پێدەکەنن‌و رزگارانەکەی ئەویشیان بۆ سێ هەزار پارچە زێڕ بەرزکردەوە.. ئینجاکوڵی دەروونی دامرکایەوە.

٣- رێگرەکانی (مام رزگۆ) نزیک رێگای دیاربەکر بۆسەیەکیان نابوویەوە، لاوێکی بالاّ بەرزی چەك لەشان دوو قەدفیشەکی لەکەمەری بەستبوو، دەستە پۆشاکێکی کوردی نایابی لەبەرکردبوو، دەستی لەبناگوێی توند کردبوو، بە دەنگی بەرز گۆرانی دەوت.. لەگەڵ ئەوەشدا چەکدار بوو، بەرانبەر چەکدارێکی رێگر لە پیاوانی (مام رزگۆ) خۆی پێڕانە گیراو توانای هیچ بەرگریکردنێکی لەخۆی نەماو زۆر بەئاسانی تفەنگەکەو تەواوی کەل‌و پەل‌و جلەکانی لێ دارنی. کورد واتەنی (رووتی کردەوە)و هەموو شتێکی لێ زەوتکرا. ئەوندەی نەخایاند پیرەمێردێکی لاواز بەناوی) مام خالۆ (لەسەر رێگاکە دەرکەوت‌و کەوتە بۆسەکەوە..) مام خالۆ چارشێو(عەبا)یەکی تەسکو رزیوی بە خۆیەوە ئاڵاندبوو، زۆر هۆشیارو بە ئاگاو بە توندی مشتووی شمشێرەکەی گرتبوویە ناو لەپی دەستی، بەپەلە کەرەکەی لێدەخوڕی.. مام رزگۆ (فەرمانیدا بە رووتکردنەوەی‌و زەوتکردنی کەل‌و پەلێك لەگەڵ خۆیدا هەڵیگرتبوو. لەوێدا رێگرێکی لێهاتە پێشەوەو بە هات‌و هاوارو جنێوی ناشرینەوە رووبەڕووی وەستاو پێی وت - کوڕە لێرەدا وەك سەگ چی دەکەی؟. پاش ئەم هەڵوێستە داوای ئەوەی لێکرد چی پێیە بیداتە دەستی) مام خالۆ (ئارامی لانەمابوو لەو تووڕەترو بەهەمان هات‌و هاوارو بگرە توندتریش کەوتە سەرزەنشتکردن‌و بەرپەرچدانەوەی، رێگر دۆشداماو حەپەسا نەیدەزانی چی بکات.. کەمێك غیرەتی وەبەرخۆی هێناو رووی

چەکەکەی کردە (مام خالۆ)ی پیرەمێردی دانا بێ ترس و گرنگی دان بەو کاروکردەوە ناپەسەندە، زۆر جوامێرانە بەرانبەری وەستاو بەشمشێرو قەڵغانەکەیەوە پەلاماری رێگرەکەی داو راوی ناو بەدوایدا رۆشت تا کردیەوە بەلانکەو بنکەی سەرۆکی دزان و رێگرانداو رووبەڕووی) مام رزکۆی سەرۆکیان بوویەوە، وەختێك جوامێری و نەترسی ئەم پیاوەی بۆ دەرکەوت، بەڕوویەکی تەواو گەشەوە بەپیریەوە چوو پێشوازی لێکرد.. پاش وتووێژی کورت و کەم خایەن و راگۆڕینەوە،) مام خالۆ (خۆشەویستی خۆی چەقاندە دڵ و دەروونی سەرکردەی رێگران و پێکەوە کەوتنەکەباب خواردن. پێش دەرچوونی لە بنکەکە) مام رزکۆ (تەواوی کەل و پەل و فیشەك و چەکی لاوە هیچ لێنەهاتوەکەی لەگەڵ خەنجەرێك پێ بەخشی و پێی وت لە راستیدا تەنها تۆ شیاوی هەڵگرتنی ئەم خەنجەرەیت.

٤-)ئالۆ (رێگرێکی ترسناك بوو توانیبووی بۆ ماوەیەك ئاسایشی ناوچەکەیان بشێوێنێ، لەگەڵ ماوەیەك بەردەوامبوونی لە رێگری لەلایەن دەوڵەتەوە دەستگیرکراو چەندین تاوانی خرایە ئەستۆ، بەسووتاندن سزای مەرگی بەسەردادرا، کاتی جێ بەجێکردنی سزاکەی میری وڵات ئامادەبوو، دی تاوانبار نەترسانەو بەهەنگاوی لەسەر خۆو ئارام بەرەو ئاگردانەکە رۆیشت، لەوێدا پرسیاری لێکرد ووتی: ئالۆ (دەزانیت ئێستا لە چ بارودۆخێکی دژواردا دەژیت؟..) ئالۆ (روویکردە میرو وتی.. میرم بارو دۆخی لەمەیش خراپتر هەیە کە ئێستا منی تیادام، ئەویش ئەوەیە خودای مەزن میوانێکت بۆ بنێرێت و شتێکت نەبێ پێشکەشی بکەیت و لەگەڵ هاوسەرەکەتدا سەرداخەن و تەماشای بەرپێتان بکەن.

٥ - شوانێك سەردانی بارەگای میری جەزیرە دەکات و دەڵێت: میرم سەلامەت.. دوێنێ ئێوارە پاش پەڕینەوەم بۆ سنووری میرنیشینەکەتان، بەهۆی ئەو هێمنی و ئارامی و ئاسایشەی ناوچەکەتانی گرتووەتەوە، لە دادپەروەریتان دڵنیابووم، لە نزیکی رانەمەڕەکەم راکشام و خەوبردمیەوە، وەختێك خەبەرم

بوویەوە، دیم پێنج لەبەرخەکانم گورگ خواردوونی، پێستەکانیم هێناوەتە بارەگاتان‌و لە دادپەروەریتان خوازیارم قەرەبووی زیانەکەم بۆ بکەنەوە، میر فەرمانیدا سبەینێ سەرلە بارەگای بداتەوە. بە هۆکاری تایبەتی خۆی میر دوای راستی رووداوەکە کەوت‌و راستی داواکەی بۆ دەرکەوت. خاوەن مەڕو مالأت هاتەوە بارەگاکەو لەگەڵ میردا چوونە شوێنی رووداوەکەو پێنج گورگی بە کوژراوی دی.. میر پێنج بەرخی لە پاداشتی زیانەکەیدا دایەوەو پێنج گورگەکەیشی بەسزای خۆیان گەیاندبوو. (توێژینەوەی سۆسیۆلوژی مێژوو - باسیل نیکیتین).

پاش دەرخستنی هێماو خەسڵەتی چەند کەسایەتیەکی کورد لەچەند چیرۆکێکدا، لە ئاستی تێگەشتن لەهەڵوێستی بەرزو وتەی چەند فەرماندەیەکی کوردو رووبەڕوو بوونەوەیان لەگەڵ دوژمنانی گەلەکەیان وتۆمارکردنی هەڵوێستی جوامێرانەیان.

١- ئەو رۆژەی مەرگ بەخەم پێدەگرێت هێشتا کوردستان نەگەیشتوەتە رزگاربوون، گوڵ لەسەر گۆڕم دامەنێن.) (عوسمان سەبری سیاسی‌و ئەدەبی کورد).

٢- ئەی برای عەرەبی خاوەن دووچاوی رەش، جارێك تاڵی بەشی تۆ بووە، جارێکیش بەشی من.. هەردووکمان لەیەك کاسەدا تاڵیمان چەشتووە) (عەبدوڵا گۆرانی شاعیر).

٣- ژیانی ئاسایی لە کۆتایی نزیك دەبێتەوە، هیچ وەخت لەوە پەشیمان نیم کە خۆمم کردووەتە قوربانی گەلەکەم، ئەوەمان بەسە نەوەکانمان لە ئاستی دوژمنانماندا هەست بەخەجاڵەتی ناکەن.) شێخ سەعیدی پیران (لەسەرکەوتنیدا بۆسەر سێدارە.

٤- بژی گەلی کورد.. ئەی خۆ بەختکەرانی کوردستان.. ئێستا حەسەن خەیری پێتاندەگات.) حەسەن خەیری (ئەندامی پەرلەمانی تورکیا وەختی

سەرکەوتنی بۆ سەر سێدارە.

٥- ئەی جەلادانی خوێنرێژ بە ئاغاکانتان بڵێن خوێنی من بەفیڕۆ ناڕوات، گەلی کورد تۆڵەی دەسێنێت، من بڕوام بە هێزو تواناتان نییە، شانازی بەمانەوەی ناوەکەم دەکەم لەیادەوەریەکانی ڕۆڵەکانی گەلەکەمداو لەڕیزی ئەوانەدا دەبێت لە پێناوی بەختیاری‌و سەرفرازی کوردستاندا ژیانی خۆیان بەختکردووە. (نەقیب مستەفا خۆشناو) (کاتی سەرکەوتنی بەسەر سێدارەدا)

٦ - بە خوێنی خۆم‌و هاوڕێکانم داری ئازادیم ئاودا، هیوادارم هەرچی زووتر گەشەبکات‌و ببوژێتەوەو ئازادی‌و بەختەوەری نیشتیمان بەدوای خۆیدا رابکێشێ. مردن بۆ ئیستیعمارو بەکرێگیراوانی. (شەهید عزمت عەبدولعەزیز) کاتی لەسێدارەدانی.

٧ - ئێستا لەنێوانی ژیان‌و مردندا ڕاوەستاوم، سێدارە نامترسێنێ، وەختێك بۆی سەردەکەوم زۆر کەس دەبینم شیاوی ژیان نین‌و لەژێر پێم دان، ئێستا لەبەردەستی پەروەردگاری مەزندا وەستاوم، وەك موسوڵمانێك تەنها هیوام بە پەروەدگاری مەزن‌و ئایینی بەرزو پیرۆزی ئیسلام هەیە. وەك عێراقیەك دەومستم کەسی‌و سێ ساڵە لە پێناوی یەکێتی عێراقی مەزندا خۆمم پێشکەشکردووە، بە ئاشکراو لە پێش هەمواندا رایدەگەیەنم کەشانازی بەو کاروکردەوە خزمەتگوزاریانەمەوە دەکەم پێشکەشی نیشتیمانم کردوون، شانازی بەوەوە دەکەم لە رووی بڕوابوونمەوە بە ئیسلام‌و بە نیشتیمان دژبە کۆمۆنیستی وەستاوم – شانازی دەکەم وەزیرێکی کاریگەرو کارامەبووم، بەڕێنمایی خودای مەزن‌و ژیری سەرم‌و دڵی ناوسنگم بە هۆشیاریەوە لە شەڕەنگێزەی کۆمۆنیستی نێو دەوڵەتی‌و مەترسیەکانی بۆ سەر نیشتیمانی ئازیزم بە ئاگاهاتمەوە. لەبەرئەوە لێرەدا کۆتایی لەبەرگری لە خۆکردنم دەهێنم، من داوای لێبوردن‌و بەزەیی‌و سۆز لە هیچ کەسێك ناکەم، بەڵکوو نیازم دەدەمە دەستی پەروەردگارو ئارام دەگرم تا فەرمانی خودام بەسەردا دەدرێت. باشترین فەرمانڕەوا تەنها

ئەوەو بەرزو پیرۆزە. (سەعید قەزاز) وەزیری ناوخۆی سەردەمی (نوری سەعید) لەبەردەم دادگای گەلدا بەسەرۆکایەتی (فازل عەبباس مەهداوی - دەرەنجام گەیەنرایە پەتی سێدارە).

٨ - ئەی برایانی کوردی خۆشەویست.. پێش جێ بەجێکردنی فەرمانی لە سێدارەدانمان بەچەند ساتێك ئەم نامەیەتان بۆ دەنووسین. برایان لەم کاتەدا ژیانمان بە فەرمانی ئیستیعمار نووسراوە تەنها چواردە کاتژمێری تر بەردەوام دەبێت، ئیتر پەتی سێدارە لەگەردنمان دەئاڵێنرێت. برایان ئێمە لەو پەڕی دڵئارامیو مانو نەمادایینو هەست بەوە دەکەین بە ئەرکی پیرۆزی خۆمان هەڵساییینو بەوپەڕی دان بەخۆگرتندا گیانی خۆمان بەگەلەتێکۆشەرەکەمان بەختکردووە..

داواکارین یەك بگرنو ریزەکانتان یەکخەن.. دژی جەهالەت بن.. بە ئازایەتیو خۆشەویستی یەکترەوە دژبەو ئیستیعمارەی چەوسێنەری گەلەکەمانە خەبات بکەن.. بەوە ئێوە ئەو هەموو گەلو نەتەوانە رزگار دەکەن کە ستەم دەچێژن، برایان نەزانی دوژمنی سەرسەختمانە، بە هەموو تواناتان دژی خەبات بکەن.. شەهید بوونمان باشترین گەواهیە لەسەر خەباتی بەردەوام لە پێناوی سەربەستی نەتەوەی کوردا.. پێویستە لەسەرتان لە پێناوی شەرەفو نیشتیمانتان بکۆشن.. گومانی تیدانییە رزگاربوونی گەلەکەمان بەرێوەیە.

برایان: تەنانەت پەتی سێدارەکانیش توانای لەرزاندنی بڕوای ئێمەیان بەسەرکەوتنی کۆتایی نییە. ئێمە لە پێناوی سەربەستی دا خەبات دەکەین، لە پێناو ی رزگارکردنی گەلیشمان نکوڵی ناکەین، سەلماندنی راستگۆترین بەڵگەمان وەستانمانە لە ژێر پەتی سێدارەدا. بۆپێشەوە بەرەو یەکگرتنو سەربەستی.. بژی کورد.. بژی کوردستان. (نامەی چوار ئەفسەرە شەهیدە قارەمانەکان بۆ گەلی کورد).

بێگومان ئەم وتانە دەربڕینە لە خەسڵەتە دەروونییەکانی گەلی کورد.

# بەشی سێیەم

## کوردستان لە ڕەهەندی سیاسی.. گوزەرگای گشتی

### دابەشکردنی کوردستان

لەگەڵ سەودا سەری کوردەکان بۆ شەڕی داکۆکی لە خۆکردن، خەڵکانێکی ئازاو قارەمانیشن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بوونەتە ژێر دەستەی چەند لایەنێك‌و لەمێژوودا دووجار کوردستان دابەشکراوە.

جاری یەکەم - پاش ڕوودانی شەڕی چاڵدێرانی ساڵی (١٥١٤)ی نێوان ئێرانی سەردەمی سەفەوی‌و تورکیای عوسمانی،کەدەرئەنجامی ئەو شەڕە لەڕووی دەسەڵاتەوە دابەشکردنی کوردستانی لێکەوتەوە لە کاتێکدا گەورەترین بەشی لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا مابوویەوە، ئێران دەسەڵاتی بەسەر ئەو ناوچەیەدا کێشا کە ئێستایش لە ژێر دەسەڵاتیدایە.

جاری دووەم - لە کۆتایی بیستەکانی سەدەی ڕابردوداو لە ئەنجامی دابەشکردنی میراتی لە دوا جێماوی دەوڵەتی عوسمانی بە پێی ڕێککەوتننامەی (سایکس/بیکۆ) کە کوردستانیشی گرتەوەو دابەشکرا بەسەر یەکێتی سۆڤیەتی جاران وسوریاو تورکیادا.

لێرەدا کوردستانی عێراق کە بە ویلایەتی موسڵ یان ویلایەتی شارەزوور ناسرابوو لە نێوان دەوڵەتی عێراقی نوێ‌و تورکیادا بە هەڵواسراوی مایەوە، هەریەکەیان بەمافی خۆیانیان دەزانی‌و داواکاری بوون، تا ساڵی (١٩٢٥) مەسەلەکە

بەگرێدانی کوردستان بەوڵاتی عێراقەوە یەکلایی کرایەوە. بەو چەشنە کوردستان لە نێوان تورکیاو ئێران و عێراق و سوریاو یەکێتی سۆفیەتی جاراندا دابەشکراو تائێستایش بەهەمان شێوەماوەتەوە. بەو پێیە بەردەوام ئەو دەوڵەتانە مافە نەتەوایەتیەکانی کوردیان پێشێلکردووە، لەو دیدگایەوە مەسەلەکە تەنها لە بڕوا نەبوون بەو مافانەو دانەنان بە نەتەوەی کورددا، وەك تا سەردەمێکی نزیکیش لە تورکیا نەبووە، بەڵکوو ناکۆکی لە ئاستی دیاریکردنی سنووری سیاسی و جوگرافی و ئەومافانەدایە وەك ئەمڕۆ لەبارو دۆخی عێراقدا دەگوزەرێت.

ئایا ڕۆژێك لە ڕۆژان کوردستان دەوڵەتی دامەزراندوە؟

لەچەند سەردەمی جیاوازو بە درێژایی مێژوو، بەتایبەتی لەگەڵ بڵاو بوونەوەو پەرەسەندنی ئایینی ئیسلامدا ژمارەیەك میرنیشینی سەر بەدەوڵەتی ئیسلامی عەبباسی بە کوردستاندا بلاوبوو بوونەوە..

دیارە میرنیشنە کوردیەکان لە شەڕی چاڵدێرانی ساڵی (١٥١٤) داو لەیەکلایی کردنەوەی شەڕو سەرکەوتنی سوڵتان (سەلیمی یەکەم) بەسەر ئێرانی سەفەویدا ڕۆڵی گرنگیان گێرا، کەچی دواتر لە جیاتی پاداشتدانەوە وڕێزلێنانیان ڕووبەڕووی ئەو زیانە گەورەیەی کردنەوە، بووە سەرەتای زیانپێگەیاندنی بەردەوامیان کە بەدرێژایی مێژوو لە کۆڵیان نەبێتەوە.

لە سێبەری خەلافەتی عەبباسی دا ئەم میرنیشینانە دەرکەوتن:

- میرنشینی شەدادی لە ئازەربایجان - (٩٠٥ - ١١٧٤)ز
- میرنیشینی حەسنەویە - لە ڕۆژهەلاتی کوردستان (٩٥٩ - ١٠١٥)ز.
- میرنیشینی مەروانی لە دیاربەکر (٩٩٠ - ١٠٩٦)ز.

وەك دەرکەوتووە، ئاستی پەیوەندی ئەم میرنشینانەو دەوڵەتی خەلافەت لەنێوان سەربەخۆیی تەواوو نیمچە سەربەخۆییدا بەڕێوە بڕاوە.هاتنی شەپۆلەکانی کۆچکەرانی خێڵ و هۆزە تورکەکانی وەك (ئۆگۆز - سەلجووقی و

تورکمانەکان)و چەندانی دیکە، لەسەدەی پانزەهەمداو لەناوەراستی ئاسیاوە سەری هەڵداو بەقەفقاس ودەریای خەزە رو خاکی ئێراندا تێپەڕین.. دواتریش هێرشی داگیرکاری مەغۆلەکان بەسەرکردایەتی (هۆلاکۆ)و رووخاندنو سەرنگومکردنی دەوڵەتی خەلافەتی عەبباسی ساڵی (١٢٥٨)ز هۆکار بوون لە هەرە سهێنانی دەسەڵاتی هەموو میرنیشینە کوردیەکانو داگیرکردنی کوردستانو وێرانکردنیو ژێر دەستەکردنو چەوساندنەوەی گەلی کورد. لەگەڵ دە رکەوتنی دەوڵەتی عوسمانیشدا چەند میر نیشینێکی نوێی وەك میرنیشینی (مزەفەریە) لەناوچەی لورستان دە رکەوتن، هەروەها لە سەرەتای سەدەی شانزەهەمدا دەوڵەتی سەفەوی لە ئێران وەك هێزێکی کاریگەرو نوێ دەرکەوت.. ئەوەندەی نەخایاند ساڵی (١٥١٤) شەڕی چالدێران لە نێوان ئەمو دەوڵەتی عوسمانیدا روویدا، تیایدا میرە کوردەکان بە سەرکردایەتی میری بەدلیس هاوکاریو پشتیوانی (سوڵتان سەلیم)ی یەکەمیان لە شەڕەکە داکردو دواترئەوە بوو هەردوولا ساڵی (١٦٣٩) رێککەوتننامەی (ئەرزرۆم) یان بەدابەشکردنی کوردستان مۆرکرد، کەچی هێشتا ئەو سەردەمە شەڕی نێوانیان بەردەوامبوو، لەگەڵ دابەشکردنە کەو رووداوەکانیشدا دەسەڵاتە خۆجێیەتیەکانی میرنیشینە کوردیەکان وەك خۆیان مابوونەوە، بەڵکو دابەشکردنەکە لەو سەردەمەدا تەنها مەسەلەیەکی رواڵەتیو بەناو بوو، جگە لەوەی هەردوو دەوڵەت لە پێناوی بەرگریکردنو پاراستنی سنوورەکانیان پێویستیان بەبوونی هێزە کوردیەکان هەبووە[٤] تاکۆتایی سەدەی هەژدەهەم میرنیشینە کوردیەکان رووگەی گرنگی پێدانی سوڵتانەکانی عوسمانی بوون و بەڵێنیان بەوە پێدرابوو دەوڵەتی

---

[٤] ئاشکرایە هەردوو دەوڵەتانی (سەفەوی و عوسمانی) میرنیشینە کوردیەکانیان وەك پێکەو گۆڕەپانی شەڕەکانیان بەکارهێناوە، کەزیان و وێرانکاری کوردستان و رژانی خوێنی رۆڵەکانی کورد تەنها بەشی گەلی کورد بووە و هەرلەو رێگایەشەوە هەردوولا سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە و لەئاکامدا دوژمنایەتی کوردیان پێکردوە.- و.ك.

خەلافەت دەست لەکاروباری ناوخۆیان وە رنەداتو سەروە ریان پێشێل نەکرێتو رێزلە ویستی تێکڕاخەڵکی میرنیشینەکان بگرێت، بەو مەرجەی ئەوانیش دژبە سەفەویەکان هاوکاری دەوڵەتی خەلافەت بکەن. سەدە ی پانزەهەم سەردەمێکی دیکەبوو، لەبازنەی دەسەڵاتی عوسمانیدا چەند میرنیشینێکی دیکە بێتەکایەوەو رابەرایەتی ناوچە جۆر بەجۆرەکانی کوردستان بکەن، وەك میرنیشینی (بەدلیس - بۆتان - هەکاری - بادینان - سۆران - بابان) لەولاشەوە میرنیشینەکانی (لوڕستان - ئەردەڵان - موکریان) لە چوارچێوەی دەسەڵاتی سەفەویدا دامەزران. کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم هەردوو دەوڵەت، بە تایبەتی دەوڵەتی خەلافەت، کەوتنە هەوڵی سەپاندنی دەسەڵاتی ناوەندیان بەسەر میرنیشنەکاندا، ئەو هەڵوێستە بووە هۆکاری سەرهەڵدانی گرژیو ناکۆکیو راپەرینی کوردەکان لە زۆر ناوچەی کوردستانو راگەیاندنی سەربەخۆیی تەواو لەلایەن ژمارەیەك میرنیشینی وەك:

عبدولرەحمان باشا - میری بابان - ساڵی ١٨٠٦

محەمەد باشا - میری سۆران - ساڵی ١٨٢٥

بەدرخان بەگ - میری بۆتان - ساڵی ١٨٣٩

مەحمود پاشا - میری بابان - ساڵی ١٨٤٣

میر یەزدانشێر - ساڵی ١٨٥٣

شێخ عوبەیدیلای نەهری - ساڵی ١٨٨٠

لە چەرخی نوێو دوای شەڕی جیهانی یەکەم (شێخ مەحمودی بەرزنجی حەفید) چەند جارێك دژبە هێزە داگیرکەرەکانی ئینگلیز راپەڕیو لەلایەن نەوهێزانەوە سەرکوت دەکران چەند جارێك شێخ ئاوارەو دەربەدەری ولاتان دەکراو لە ولات دووردەخرایەوە. لەئاستی رووبەڕوو بوونەوەی باکووری عێراق (کوردستان) لە مەترسیەکانی تورکیاساڵی (١٩٢٢) بەریتانیا شێخی حەفیدی لە تاراوگەی هیندستان گێڕایەوە، بەونیازەی بەسەرۆکی حکومەتی کوردستان

دەستنیشان بکرێت و سلێمانى وەك پایتەختى دیارى بکرێت. سەبارەت بەوە بەریتانیا ئەم لێدوانەی خوارەوەی وەك راگەیاندنێكى فەرمى بلاوكردەوە.. (حكومەتى خاوەنشكۆى بەریتانیاو حكومەتى عێراق، بەدامەزراندنى حكومەتى كوردستان مافى كوردەكانى عێراق پەسەند دەكەنو هیواخوازن هەرچى زووتر هێزەكوردیەكان رێزەكانیان لەهەماهەنگى یەكتریدا رێكبخەنو لەناستى هەڵسانیان بە ئەنجامدانى كارو چالاكیەكانیان و ناردنى نوێنەرانى رێكەپێدراویان بەباسكردن و لێكۆڵینەوەى مەسەلە ئابوورى و سیاسیەكان لەگەڵ نوێنەرانى هەردوو حكومەتەكانى بەریتانیاو عێراق).

## كۆمارى كوردستان لەمەهابادى ئێران

لە تشرینى دووەمى ساڵى (١٩٤٥) رۆژنامەدەرەكیەكان دەنگوباسى گۆڕانكاریە سەرەكییەكانى ئێرانیان بلاوكردەوە وەك تیایانداهاتووە.. (بەم زوانە ناوچەیەكى كوردى لە باشوورى دەریاچەى ورمێ (نورومیەى ناوچەى سابلاغ - مەهاباد) دە بێتە ناوەندى راپەرینێكى كشتگیرو بەربلاو). ئەوە بوو لە ٢٤ى كانوونى دووەمى ساڵى ١٩٤٦ بە سەرۆكایەتى (قازى محەممەد)ى سەرۆكى (پارتى دیموكراتى كوردستانى ئێران) دامەزراندنى كۆمارى مەهاباد راگەیەنراو هەر لەسەرەتاوە دەستى دایە بنیادنانى دامەزراوەكانى بەڕێوەبردنى خۆجێیەتى و بوارى پەروەردە[5] لەگەڵ راگەیاندنى كۆمارى كوردستاندا (مەلا مستەفا بارزانى)و

---

[5] پێشەواى مەزن(قازى محەممەد) ساڵى (١٩٢١) لەشارى مەهابادى سەربڵند هاتوەتە ژیان، هەر لەسەرەتاى تەمەنییەوە لەسەردەستى چەندین زاناى ئایینى داو دواى برینى پلەكانى سەرەتایى و ناوەندى، زانستە ئیسلامیەكانى خوێندوە، لەگەڵ خوێندندا (قازى) مەزن یەكێك بوو لە ئەندامە چالاكەكانى (خویبوون – الاستقلال) و دواتر لەگەڵ دامەزراندنى كۆمەڵەى (ژ.ك) لە ١٩٤٢/٩/١٦ رێگاى خەباتى سیاسى گرتوەتەپێش .. رۆژى (١٩٤٢/١/٢٢) لەگەڵ دامەزراندنى (پارتى دیموكراتى كوردستانى ئێران)

شوێنکەوتوانی یەکەم گروپ بوون پەیوەندیان بەو کۆمارەوە کردو بەرزترین پۆستو پلەی سەربازی بەخودی بارزانی بەخشرا.

لەیەکەم هەنگاویەوە حکومەتی کوردستان کەوتە هەوڵی بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری کوردیو دامەزراندنی یەکە سەربازیەکانی پاسەوانانی کۆماری، لەپۆشاکێکی سەربازی یەکگرتوودا. ئەم کومارە بەیارمەتیدانو هاوکاریکردنو پشتیوانی یەکێتی سۆڤیەت دامەزرا، کەچی رێککەوتننامەی تاران لەنێوان ستالین ورۆزفلتو چەرچڵ وشای ئێران هۆکاری بڕینی یارمەتیەکانی سۆڤیەتو گەڕانەوەی لە پشتیوانی کردنی کۆماری مەهاباد بوو. بەو هۆیەوە لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦دا لەگەڵ یەکەم رووبەڕووبوونەوەی چەکداری لەگەڵ هێزە سەربازیە ئێرانییە هێرشبەرەکاندا لەناوبرا.

---

لەمەراسیمێکی شکۆدارو بەئامادەبوونی (بارزانی نەمر) و ئەندامانی لیژنەی مەرکەزی پ.د.ك شەهیدی پێشەوا قازی محەمەد بەیەکەم سەرۆکی کوماری کوردستان هەڵبـژێررا رۆژی دواتر بەم جۆرە سوێندی یاسایی خوارد﴿سوێند بە خودا و بە قورئانی مەزن و بە نیشتیمان و بە شەرەفی نەتەوەی کورد و بە ئاڵای پیرۆزی کوردستان کە هەوڵ بدەم تا دوا هەناسەم گیان ومالم و خوێنم لە پێناوی سەربەخۆیی و بەرزی ئاڵای شەکاوەی کوردستان بەخت بکەم ﴾ .. پێشەوا رۆژی ١١ی شوباتی١٩٤٦ بە پێکهێنانی یەکەم ئەنجومەنی وەزیران لە بەڕێوەبردنی ولات کە ١٣ وەزیری لە خۆ گرتبوو یەکەم فەرمانی باڵا (مرسوم)ی راگەیاندو لە هەمان کاتدا لە فەرمانێکی دیکەی باڵادا بارزانی نەمری بە ژەنەراڵو بە فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکان دیاری کرد ... دیارە دوای ١١ مانگ دەسەڵاتی سەربەخۆیی کۆماری مهاباد ، لە پیلانێکی نێودەوڵەتی دژە کورددا هێزە سەربازییەکانی شای ئێران لە ١٩٤٦/١٢/٢١ دا چوونە شاری مهابادو قازیو زۆربەی فەرماندە شۆڕشگێڕەکانی کۆمارەکە دەستگیر کران و لە دادگایی کردنێکی رواڵەتی سەربازیدا سزای لەسێدارەدان بەسەر قازی و سەدری قازی ئەندامی پەرلەمانی ئێران و نوێنەری مهاباد و محەمەد حسەین سەیفی قازی وەزیری جەنگدا سەپێنرا و لە ١٩٤٧/٣/٣٠ دا سزاکە لە گۆڕەپانی چوارچرای شاری مهاباد جێبەجێکراو لە سێدارەدران و گیانی بەرزەفڕیان گەیشتەوە بارەگای پەروەردگاری مەزن .و.ك

# بەشی چوارەم

## راپەڕینی کورد

لەبەرئـەوەی پڵنگـەکان مێـژوو نووسـیان نییـە، چـیرۆکەکانی سـەبارەت بـەڕاوکردن، بـەردەوام بـاس لەشـکۆداری راوچـیان دەکـەن. ئەمـە پەنـدێکی ئەفەریقاییـەو بەسـەر بزووتنـەوەی کـوردو هـەر بزووتنەوەیـەکی دیکـەی رزگاریخوازیـدا دەسـەپێت، راگەیانـدن چالاکیو کـردەوەی بزووتنـەوەکان بـەکارو کـردەوەی رێگـریو تالآنچـیو تێکـدەرو یـاخی ناودەبـەن، تـا کاتێـك پێشـکەوتن بەخۆیانـەوە دەبیـنن‌و دەگەنـە دامەزرانـدن‌و پێکهێنـانی قـەوارەی خۆیـان، لـەو ئاستەدا دیمەنەکە دەگۆڕێت‌و ئەوانە دەبنە پیاوی کارامەو بەڕێوەبەری دەوڵەت‌و دەبنە خاوەنی هەموو رێزلێنانێك وپاڵەوان‌و بـە نیشتیمانپەروەر نـاودەبرێن. لـە کتێبـی (کـورد لێکۆڵینـەوەی سۆسـیۆلۆژیو مێژووییـدا )(باسـیل نیکیـتین) بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد بۆ سێ قۆناغ دابەش دەکات:

### قۆناغی یەکەم

**(یاخیبوون وراپەڕینی بێ سەرو بەرو بێ بەرنامـەی شـۆڕش و راپەڕینـە دەرەبەگایەتیەکان و بەرگریکردن لە دەستکەوتەکانیان)** لەوانە:

١- **شۆڕشی عەبدولرەحمان پاشای بابان:** سەدەی هەژدەهەم لەسلێمانی.

٢- **شۆڕشی بڵباس:** ساڵی ١٨١٨ دژ بەجێنشینی تـەختی ئێران) عـەباس میرزا (بەرپاکرا لە راستیدا شۆڕشێکی جەماوەری دژ بەستەمی ئاغایەتیو دەسـەڵاتی دەرەبەگایەتیو لێپرسراوانی تورك‌و ئێران بوو.

٣- **شۆڕشی کورد:** لەماوەی شەڕەکانی روسیاو تورکیا ساڵی (١٨٢٨ بۆ ١٨٢٩) روویدا، کە میرنیشینە کوردیەکانی - رەواندز - بۆتان - بابان - هەکاری - بەشداریکردنیان لەو شەڕانەدا رەتکردەوەو دژ بە دەسەڵاتی عوسمانی شۆڕشیان راگەیاند.

٤ - **شۆڕشی محەممەد رەواندزی:** (١٨٣٢ - ١٨٣٩) میر محەممەد هەڵگیرسانی بزووتنەوەی میسریەکانی دژبەدەسەڵاتی عوسمانی بەهەل وەرگرت وئەویش شۆڕشی بەرپاکرد، بەڵام لە ئاکامدا عوسمانییەکان شۆڕشەکەیان کپ کردەوەو(میر محەممەد)ی فەرماندەشیان لەناوبرد.

٥- **شۆڕشی بەدرخان بەگ:** بەپشتیوانیو هاوکاریکردنی ژمارەیەك رابەرو فەرماندەی کورد ساڵی(١٨٤٥) شۆڕشی بەرپاکردو چەند ناوچەیەکی کوردستانی خستە ژێر دەسەڵاتی.

٦- **شۆڕشی یەزدان شێر:** ساڵی (١٨٥٣- ١٨٥٥) لەسەردەمی خەریکبوونی (الباب العالی) بە شەڕی دژ بە رووسیا، شۆڕشەکەی هەڵگیرسا، سەرەتا لە ناوچەکانی(هەکاری، بۆتان)ەوە دەستی پێکردو دەسەڵاتی بەسەر زۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا کێشاو تا بەغدادیشی گرتەوە.

٧ - **شۆڕشی شێخ عوبەیدیلای نەهری:** ساڵی (١٨٨٠) بەوهۆیەوە ئامانجی شۆڕشەکە سەربەخۆیی کوردستان بوو، کەبە شۆڕشە هەرە گرنگەکان دەژمێررا.. سەرەتا لەخاکی ئێرانەوە دەستی پێکردو خاکی تورکیاشی گرتەوە. بێگومان تەواوی شۆڕشو راپەڕینەکانی ئەو قۆناغە هەرەمەکیو بێ بەرنامە بوونو زۆربەی کات کاردانەوەی هەڵوێستی نارەواو نالەباری کاربەدەستان بوو، دیارە ئەوەیش هۆکاربوو دوژمن بتوانێت بە ئاسانی بەسەر ئەو شۆڕشو راپەرینانەدا زاڵ بێتو سەرکوتیان بکات، بێئەوەی هیچ شوێنەوارێکی کەڵەکەبوو لەمەسەلەکەدا بەجێ بهێڵێت، ئەوەی زیاتر جێی سەرنجە لەبەرپاکردنی ئەو شۆڕشـانەدا بیروباوەڕی روونو زیندوو نەبینراوە کەبزوێنەری بەردەوام بوونیان بێت.

## قۆناغی دووەم

### (هەوڵەکانی ڕێکخستنی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد)

لەگـەڵ دە رکـەوتنی بزووتنــەوە نەتەوایەتیـەکانی ناوچـەکە)بزووتنــەوەی نەتەوایەتی عەرەب – یان بزووتنـەوەی تورکیـای نـوێ (چـەند کـوردێکی رۆشـنبیر وەك بزوێنـــەرو پێشـــڕەوی بزووتنـــەوەی کوردایـــەتیو هۆشـــیارکردنەوەو بێدارکردنەوەی گیانی نەتەوایەتی کەوتنە کارو تێکۆشان، لەگەڵ جموجوڵەکەیاندا ساڵی (١٨٩٨) لەلایـەن ژمارەیـەك لـە ئەنـدامانی خێزانـی (بـەدرخان) لـە قـاهیرە دەستیاندایە دەرکردنی رۆژنامەی (کوردستان) بەهـەردوو زمـانی کوردیو تـورکی، دوابـە دوای ئـەویش)شـێخ عەبـدولقادر(ڕۆژنامـەی هـەتاوی کـوردی دامەزرانـدو گۆڤارێکی مانگانەشی بەناوی رۆژی کورد بڵاوکردەوە،لەڕاستیدا گۆڤاری رۆژی کورد بـۆ ئـەو قۆناغـە پاڵنـەری بـەهێزکردنی بزووتنـەوەی نەتەوایـەتی کـورد بـوو... لەماوەی شەڕی جیهانی یەکەمـدا تورکـەکان توانیـان کوردەکـان دوور لـە خواسـتو ئاواتەکانیان بە ئاراستەیەکی پێچەوانەدا ببەن ولـە پێنـاوی سـەرگرتنو هێنانـەدی مەبەسـتو ئامانجـە سیاسـیەکانیاندا بـەکاریان بێـنن، هـەر لەوکاتـەدا هەسـتان بەجێبەجێکردنی سزای لە سێدارەدانی ژمارەیـەك لـە نیشتیمانپەروەرانی کـوردی دژبەدیدگاو خواستەکانی تـورك، هـەر لەوساڵانەدا لـە پێنـاوی سڕینەوەو داڕنینـی ناسـنامەی نەتەوایـەتیان، حکومـەتی تورکیـا هەسـتابە گواسـتنەوەی بـەربڵاوی کوردەکـانو دورخستەوەو دابڕانـدیان لەسـەرکردەو رابـەرەکانیانو بڵاوەپێکـردنو پەراگەنـدەکردنیان لە شارە تورکەکاندا.

لـە سـەردەمی کودەتـای سـاڵی (١٩١٩)ی تورکـەکانو سـەرهەڵدانی بیرۆکـەی پەیمانی سیڤەر) کۆمەڵێك لە رابەرانی کورد لـە پێنـاوی خـۆ رێکخسـتنو سازدانی کـار دژ بـە کـەمالیزمی کۆبوونەوەیـەکیان گرێـداو چـەند کۆبوونـەوەی دیکـەیان بەدوادا بەست، کەدامەزرانـدنی چـەند رێکخـراوو کۆمەڵەی کوردیـان لێکەوتـەوە.. وەك :

(کۆمیتەی سەربەخۆیی کورد - کۆمەڵەی ڕاپەڕینی کورد - پارتی گەلی کوردو کۆمەڵەی پێکهاتە کوردیەکان) وا ڕێککەوت ساڵی (١٩٢٧) تەواوی ئەو ڕێکخراوانە لە ڕێکخستنێکی یەکگرتووی نیشتیمانیو لەژێر ناوی (خۆیبوون - الاستقلال) کۆبوونەوە.

## قۆناغی سێهەم

### (مەسەلەی کوردو گرنگی پێدانی نێودەوڵەتی)

پاش کۆتایی هاتنی شەڕی یەکەمی جیهانی لەڕێی هەندێك پەیمانو ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتی جیهانی لە لایەكو رایکردنی ئەو کارانەی پەیوەندیدار بوون. بەمیراتی لە شوێن بەجێماوی دەوڵەتی خەلافەتی عوسمانی لەلایەکی ترەوە، مەسەلەی کوردیان گەیاندە پلەی گرنگی پێدانی نێودەوڵەتی وەك:

١- پەیمانی سیڤەر

ئامادە بوونی نوێنەرانی (بەریتانیا - ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا - فەرەنسا - ئیتالیا - یابان - پۆڵەندا - سربیا - کرواتیا - سلۆڤینیا - چیکۆسلۆفاکیا - ئەرمینیا - بەلجیکا - یۆنان - حیجاز- پرتوگال - ڕۆمانیاو دەوڵەتی عوسمانی) لە (١٠ ئابی ١٩٢٠) کۆنگرەی (سیڤەر) بەسترا وتیایدا نوێنەری کورد وەك چاودێر ئامادەی وتوێژەکانی پەیوەندیدار بە کوردستان بوو، لەوکۆنگرەیەدا بۆیەکەمجار لەمێژوودا بەلگەنامەیەکی مۆرکراوی نێودەوڵەتی رادەگەیەنرێتو بڕیاری دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی سەربەخۆ تیایدا دەدرێت.. هەرچەندە ئەو پەیمانە جێ بەجێنەکرا، بەتایبەتی بەشی پەیوەندیدار بەمەسەلەی کورد، بەلآم ئەوە لەخۆیدا بەهێمایەکی گرنگو زیندوولە مێژووی بزووتنەوەی کورد دادەنرێت. لەو پەیمانەدا زۆر مەسەلە خرابوونە بەرباسو لێکۆڵینەوە، ئەوەی پەیوەندی بە

كوردستانەوە هەبوو بەندەكانی(٦٢ و٦٣ و ٦٤) بوون بەم شێوەیەی خوارەوە:

- بەندی /٦٢/ دیاریكردنی دەستەیەكی سێ ئەندامی لەلایەن (بەریتانیاو فەرەنساو ئیتالیا)وە بەمەبەستی ئامادەكاریو بەدواداچوونو جێ بەجێكردنی رێككەوتننامەكەو هەمان كات دانانی نەخشەو پلانی بەخشینی دەسەلاتی خۆجێیەتی بەو ناوچانەی زۆربەی دانیشتوانیان لە كوردەكانن و دەكەونە رۆژهەلاتی رووباری فورات و باشووری سنوری ئەرمینیاو بەرەو باكووری سنووری نێوان توركیاو سوریاو ولاتی نێوان هەردوو رووبار (بلاد مابين الرافدين). لە حالەتی نەگەیشتن بەكۆی دەنگ لە ئاستی هەركێشەیەك، ئەندامانی دەستەكە دەتوانن ئەوكێشەیە بەحكومەتەكانیان بسپێرن.. هەمان كات لە نەخشەكەدا پێویستە دەستەبەری پارێزگاری تەواو لە ئاشووریو كلدانو كەمایەتیە ئەتنیو ئایینییەكانی دیكەی ناوچەكە بكرێت. بۆ ئەم مەبەستە دەستەیەك لە نوێنەرانی بەریتانیاو فەرەنساو ئیتالیاو ولاتی فارسو كوردەكان پێكدێت بەپێی ئەو روونكردنەوەیەی لەرێككەوتننامەكەدا هاتووە كاری دیاریكردنی هەر گۆرانكاریەك دەبێت پێویست بكات لە سنووری توركیاو لەكوێدا لەگەل سنووری فارس یەكدەگرنەوە ئەنجام بدرێت.

- بەندی/٦٣ - دەولەتی عوسمانی رەزامەندە لەسەر جێ بەجێكردنی رێنماییو بریارەكانی هەردوو دەستەی دیاریكراو لەبەندی (٦٢) دا، كەپێویستە لەماوەی سێ مانگ لە مێژووی ئاگاداركردنەوەی جێ بەجێبكرێن.

- بەندی /٦٤- وەك لە بەندی ٦٢دا هاتووە، ئەگەر زۆرینەی كوردەكانی نیشتەجێی ناوچە دیاریكراوەكان، دوای سالێك لەجێ بەجێكردنی رێككەوتننامەكە، داواكاربوون لەئەنجوومەنی گەلان بەجیابوونەوە لە توركیاو سەربەخۆبوونی كوردستان، ئەگەر ئەنجومەن گەیشتە ئەو بروایە كوردەكان ئامادەو شایستەی سەربەخۆیین، ئەو كاتە پێیان دەبەخشرێت. ئیتر لەو كاتەوە دە بێ توركیا بەجێ بەجێكردنی راسپاردەكان رازی بێتو هەنگاو بنێت، بەو پێیە

پێویستە دەست لەتەواوی مافەکانی لەو ناوچەیەدا هەڵگرێت. دواتر درێژەی وازهێنان‌و دەست هەڵگرتنی تورکیا لە ناوچە دیاریکراوەکان لەڕێککەوتنی تایبەتی نێوانی تورکیاو دەوڵەتی مەزنی هاوپەیمان دیاری دەکرێت، ئەگەر کوردەکانی بەشی موسڵ داواکاربوون ببنە هاوڵاتی نوێی کوردستانی سەربەخۆ. بەو هۆیەوە هێشتا ناکۆکی نێوان بەریتانیاو دەوڵەتانی دیکەی هاوپەیمان یەکلایی نەبوو بوویەوە، بەیەکجاریش ڕێککەوتنەکە پەسەند نەکرابوو، تەنها مەرجەکەبی سەرکاغەزبوو، لەگەڵ ئەوەشدا وەك پێشتر ئاماژەی پێکرا لە مێژووی خەباتی گەلی کورد دا بەهێمایەکی دیارو گرنگ دەژمێررا.

**٢ - پەیمانی لۆزان**

بەتێپەڕاندنی نزیکەی شەش مانگ بەسەر پەیمانی (سیڤەر) دا، هاوپەیمانان سەبارەت بە مەسەلەی کوردستان لە ئازاری ساڵی (١٩٢٢) دا، لەچەند پێشنیارێکدا گۆڕانکاری سنوورداریان خستە پەیمانەکە، کەبە هیچ شێوەیەك باسیان لەمەسەلەی کورد نەدەکرد. پێشنیارەکان لە پێش کەمالیزمەکاندا لەکارنامەی کۆنگرەی لۆزاندا مەسەلەی کورد فەرامۆش بکرێت، بەو جۆرە تورکیا لە بیرۆکەی سەربەخۆیی کوردستان رزگاری دەبێت. کارکردن لەئاستی پێشینارو دیدە نوێکاندا کەوتە دەستی شەرعییەتی نێودەوڵەتی‌و بووە هۆی سەرهەڵدانی ناکۆکی نێوانی هاوپەیمانان لەسەر ناوچەکەو شێوازی دابەشبوونی. خۆبەستنەوەو پشتیوانیکردنی کوردەکان بۆ هەریەك لە تورکیاو ئێران‌و بەریتانیا جگە لە لاوازبوونی هەڵوێستیان سوودێکی دیکەیان لێنەدی – لەگەڵ بەستنی کۆنگرەی لۆزاندا دەربارەی مەسەلەکانی کەمینە جیاجیاکان وتوێژو لێکۆڵینەوەی فراوان ئەنجامدرا.. ئەم پرسیارە هاتە پێش.. (ئایا کوردەکان وەك کەمینە هێشتا بەردەوام دەبن لەسەر جیابوونەوەیان لە تورکیا؟). پێچەوانەی ڕێنماییەکانی پەیمانی سیڤەر، ڕاکانی پەرلەمانتارانی کورد لە پەرلەمانی تورکیادا سەبارەت بە مەسەلەی کورد ڕاگیران.. لە کۆبوونەوەیەکی پەرلەمان‌و بە ئامادەبوونی «کەمال ئەتاتورك»

پەرلەمانتارانی کورد بە کۆی دەنگ ڕایانگەیاند مەسەلەکەیان تەنها پەیوەندی بە کوردەکان و تورکەکانەوە هەیەو بەریتانیا مافی دەستێوەردانی لە کاروباریاندا نییە. دەربارەی ئەم هەڵوێستەی پەرلەمانتارانی کورد، لەلایەن پەرلەمانی تورکیاوە وەڵامی کۆنگرەی لۆزان بەوە درایەوە (کوردەکان جیابوونەوەیان لەتورکیا ناوێت). دیارە داواو هەڵوێستی پەرلەمانتارانی کورد دەقاودەق هەڵگری ئەومانایە نەبوو، هەمان کات وەڵامی پەرلەمانی تورکیا لەئاستی هەڵوێستەکە بەڵێن بوو بەجێ بەجێکردنی مافە نەتەوایەتییەکانی گەلی کورد. سەرەنجام پەیمانی لۆزان جگە لە دەرخستنی نیازە ڕووکەش و بێ ناوەرۆکەکانی بەهیچ شێوەیەك ناوی کوردو مافەکانی نەگرتبوویە خۆی، وەك لە بەندەکانی (٣٨،٣٩)دا هاتووە..

بەندی ٣٨/- حکومەتی تورکیا بەڵێن دەدات بە نەکردنی جیاوازی لە نێوانی ڕەگەزو نەتەوەو ئایینەکاندا.

بەندی /٣٩- هەموو هاوڵاتیەکی تورکیا سەربەستە لە قسەکردن بە هەر زمانێك و هەر پەیوەندیەکی تایبەت بە بازرگانی و ئایینی و ڕادەبڕین و ڕۆژنامەنووسین و چاپەمەنی جۆراوجۆر لە کۆبوونەوە گشتیەکانیشدا[٦].. وەنەبێ لەگەڵ بەڵێنەکانیدا تورکیا تەنها نەخشەی سڕینەوەو کۆتاییهێنان بەبیرۆکەی سەربەخۆیی کوردستانی کێشابێت، بەڵکو بەتەواوی توانای کۆشاوەو کاریکردوە لە پێناوی سڕینەوەی هەموو جۆرە ناوهێنانێکی کوردو کوردستان لەدووتوێی هەر بەڵگەنامەیەکی فەرمی دەوڵەتی تورکیادا، دواجار لەو سنوورەشدا نەوەستایەوە، لەهەڵێکی دیکەدا جاڕیدا بەوەی جگە لەڕەگەزی تورك لەسەرخاکی تورکیا هیچ ڕەگەزێکی تر مافی بوونی نییە. لەکاتێکدا بەندەکانی پەیمانی لۆزان هەڵوەشێنەری بەندەکانی (٦٢،٦٣،٦٤) ی پەیمانی سیڤەری سەبارەت بە مەسەلەی کوردبوون، هەمان کات ئاماژەیش بوون بەگرنگی پێدانی کێشەکە لەڕێکخراوەکان و دامەزراوە

---

[٦] بزووتنەوەی کورد لە چەرخی نوێدا / جەلیلی جەلیل.

نێو دەوڵەتیەکانداو وەرگرتنی رایان لە ئاستی چارەنووسیاندا. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، هاوکاتی ڕێککەوتنەکان و پەیمانەکان و بەشوێنی ئەوانیشدا بزووتنەوە شۆڕشگێڕیەکانی کورد چالاکی و تینی زیاتریان بە خۆیانەوەدی، تالەپێشەوەچوون و گەشەکردندا گەیشتنە ئەم ئاستەی ئێستا، کەلەم چەنددێڕەی خوارەوەدا دەخرێنە پێش چاو:

## شۆڕشی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی

(شێخ عەبدولسەلام) براگەورەی)مەلا مستەفا بارزانی (بەهەماهەنگی و یارمەتیدان و بەشداربوونی چەند خێڵێك لە ئازاری ١٩١٤دا شۆڕشی هەڵگیرساند، لە ماوەیەکی کەمدا دەسەڵاتی بەسەر ویلایەتی موسڵ و بەشێك لە ویلایەتی بەغدادا کێشا. دواجار تورکیا لە هێرشێکی سەربازی بەهێزدا کۆتایی بە شۆڕشەکە هێناو سەرکردەی شۆڕشەکەیش توانی ئازایانە لە چنگیان هەڵبێت.

## شۆڕشی سەید عەبدوڵا

(سەید عەبدوڵا) نەوەی (شێخ عوبەیدیلای نەهری)یە، بەهاری ١٩١٧ لە شاخەکانی موسڵ شۆڕشەکەی بەرپاکرد.

## شێخ مەحمو دی حەفید – بەرزنجی

سەرەتای ساڵی/ ١٩١٨ (شێخ مەحمودی حەفید) بەفەرمانڕەوای سلێمانی دانرا، ئەو کاتە چل رابەرو سەرکردەی کورد وەك بەڵگە نامەیەك یاداشتێکی مۆرکراویان پێشکەش بە نوێنەری سامی (المندوب السامی) بەریتانیا کرد.. بەم دەقەی خوارەوە (هەروەك حکومەتی خاوەن شکۆ بەڵێنی دا بەرزگارکردنی گەلانی رۆژ هەڵاتی چەوساوەو ژێردەستەی تورکیاو یارمەتیدەریش بێت لەسەربەخۆبوونیاندا، ئێمەی نوێنەرانی گەلی کورد داواکارین لە حکومەتی خاوەن شکۆ، بە بەخشینی توانایەکی

بەگەلەکەمان‌و گوزەراندنی لەسەر ڕێگای ئاشتی‌و پەرەپێدانی، لەژێر چاودێری‌و سەرپەرشتی بەریتانیادا) شێخی حەفید سوور بوو لەسەر داواکردنی تەواوی ویلایەتی موسڵ‌و دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان بە سنووری تەواویەوە، حکومەتی بەریتانیا نەك هەر ئاوڕی لەو داواکاریانە نەدایەوە، بەڵکوو هەڵوێستی دوژمنکارانەی دژبە گەلی کورد دەربڕی، ئەوە بووە هۆکاری قەیران‌و پەرەسەندنی توندوتیژی‌و تووڕەیی جەماوەرو بەرپابوونی شۆڕش لەنیسانی(١٩١٩) دا دژبە دەسەڵاتی بەریتانیای داگیرکەر لەناوچەکەدا. لەکاتێکدا شۆڕشێکی دیکەیش لەناوچەی بارزان بەسەرکردایەتی (شێخ ئەحمەد بارزانی) برای)مەلا مستەفا بارزانی(ڕوویدابوو... شێخ مەحمودی حەفید لەماوەیەکی دیاریکراودا سەرکەوتنی گرنگ‌و مەزنی بە سەر هێزە بەریتانییەکاندا بەدەستهێناو بە فەرمی سەربەخۆیی کوردستانی ڕاگەیاندو تەواوی دەزگاو دامەزراوە دەوڵەتیەکانی لە بەڕێوەبەرایەتیەکی تۆکمەدا ڕێکخست، لەجێی ئاڵای بەریتانیا ئاڵای کوردستانی بەسەر ساختمانەکانی حکومەتەوە بەرزکردەوە، توانای حکومەت هەموو ناوچەکانی کوردستانی گرتبوویەوە، فەرماندە مەزنە شۆڕشگێڕەکانی ناوچەکان ڕابەرایەتی ڕەهایان بە شێخ بەخشیبوو. لەکۆتایی دا باڵا دەستی سەربازی‌و پەلاماردانی کوردستان هۆکاری شکستهێنانی شۆڕش‌و حکومەتەکەی شێخ‌و بەدیل گرتنی‌و ناردنی بۆ بەغداو لەوێشەوە دوور خستنەوەی بۆ هیندستان. ئەو سەردەمە جموجوڵی تورکیا چالاکیەکانی دژ بە بەریتانیا لە پەرەسەندندابوون، توانیبووی ژمارەیەك فەرماندەو سەرکردەی کورد لەخۆی نزیك بکاتەوەو دڵنەواییان بکات، لەئاستی ئەو هەڵوێستە جگە لەگێڕانەوەی بەناچاری)شێخ مەحمود(بۆ عێراق ڕێگایەکی تر لە پێش بەریتانیادا نەمابوویەوە. بەوکارەی بەریتانیا کاریگەری ڕۆڵی شێخی بەکارهێنا لەڕووبەڕووبوونەوەی تورکەکان لە باشووری کوردستاندا.. ئەوە بوو لە ئەیلوولی ١٩٢٢دا بە فەرمانڕەواو حوکمڕانی کوردستان گەڕایەوە سلێمانی‌و هەر دوو حکومەتەکانی بەریتانیاو عێراق ئەم

بەیاننامەیەیان ڕاگەیاند (حکومەتی خاوەن شکۆی بەریتانیاو حکومەتی عێراق مافی ئەو کوردانەیان بە فەرمی ناساند، لە عێراقدا دەژین‌و حکومەتی کوردی دادەمەزرێنن، بەو هیوایەی هەرچی زووتر هێزەکانیان لەدامەزراندنی حکومەتەکەیاندا هەماهەنگی بکەن‌و نوێنەرە دەمڕاست‌و باوڕپێکراوەکانیان بنێرن بەمەبەستی باسکردنی مەسەلە ئابووری‌و سیاسیەکانیان لەگەڵ نوێنەرانی هەردوو حکومەتەکاندا). لە ڕاستیدا ئەمە هەلێکی گونجاوو لەبار بوو بۆ)شێخ مەحمودی حەفید(بتوانێت سەربەخۆیی وڵاتی کوردستان ڕابگەیەنێت‌و لە ١٨ ی تشرینی دووەمی ١٩٢٢ لەگەڵ ڕاگەیاندنەکەدا خۆی بە مەلیکی کوردستان ناساند، لەو سەردەمەدا پشتیوانی بەریتانیا لە ئاستی (مەلیك فەیسەڵی یەکەم) ڕاڕاو ناجێگیر دەبینرا، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا ناوچەی باکور(کوردستان) بە عێراقەوە گرێ نەدرابوو مەلیك فەیسەڵ ناچار بوو هاوشێوەی بەریتانیا مامەڵە لەگەڵ (شێخ مەحمود) بکات. لەگەڵ دانانی بەحکومەتی کوردستانیشدا کەچی بەریتانیا هەنگاوی زۆر خاوی دەنا.. لەو بارەوە ﴿ مەندوبی سامی﴾ بەریتانیا دەڵێت: قسەکردنی کوردەکان بە سیفەتی حکومەتی کوردستان سەرسامیان کردم. وەك هەستکردن بەشتێك شێخ بە مەبەستی پەیمانێك کەوتە پەیوەندیکردن بە تورکیاوە. لەکاردانەوەی ئەو هەڵوێستەدا هێزی ئاسمانی بەریتانیا هێرشی ئاسمانی توندی کردەسەر شاری سلێمانی‌و جارێکی تر بزووتنەوە نوێکەی (شێخی حەفید) سەرکوتکرایەوەو خۆیشی بە دیلگیراو بەرەو خوارووی عێراق دوور خرایەوە. لەگەڵ ئەو تەنگ پێهەڵچیننەشدا، سلێمانی بووە ناوەندی بەر هەڵستکاریکردن‌و دژایەتیکردنی حکومەتی عێراق‌و ڕوودانی توندوتیژی‌و خۆپیشاندانی ناڕەزایی دەربڕین. ترسناکی بارودۆخەکە سەرلە نوێ هەلی گەڕانەوەی شێخی بۆ سلێمانی‌و جارێکی تر بەرپاکردنەوەی شۆڕشێکی نوێی ڕەخساند، ئەوەبوو لەحوزەیرانی ١٩٣٢دا بەیەکجاری کۆتایی پێهێنرا.

## کۆمەڵەی گەلان(عصبە الامم) و زەمانەتکردنی کوردەکان

دامەزراندنی دەوڵەتی نوێی عێراق ساڵی ١٩٢١ پێکهاتبوو تەنها لەویلایەتەکانی بەغداو بەسرە، دواتر لەسەر بڕیاری کۆمەڵەی گەلان، ویلایەتی موسڵ)بەشی باکوور(بەووڵاتی عێراقەوە گرێدراو لەجیاتیدا قەرە بووی)مادی‌و مەعنەوی(تورکیا کرایەوە.. هەمان کات کۆمەڵە زەمانەتی کوردەکانی لەئەستۆگرت بە رێزگرتنی ناسنامەو دیاریکردنی مافی نەتەوایەتیان لەلایەن حکومەتی عێراقەوە.

## راپەڕینی سمکۆ

کۆتایی ساڵی ١٩٢٤ رۆژئاوای دەریاچەی ورمێ لەکوردستانی رۆژهەڵات ئێران بەسەرکردایەتی (سمایل ئاغای شکاک- سمکۆ) راپەڕینێکی مەزنی تیادا هەڵگیرسا، ئەوندەی نەخایاند سەرەتای ساڵی ١٩٢٥ بەتوندی (رەزا خان) سەرکوتی کرد، لە مایسی ١٩٢٩ دیسانەوە (سمکۆ) لایەنگرانی کۆکردەوەو راپەڕینێکی دیکەی سازدایەوە، کەلەم جارەدا بۆ یارمەتیدانی بارزانییەکان پەیوەندیان بەراپەڕینەکەیەوە کرد.. بەڵام ئەم جارەیش حکومەتی ئێران کۆتایی پێهێنایەوە.

## شۆڕشی شێخ سەعیدی پیرانی نەقشبەندی

شۆڕشەکەی (شێخ سەعیدی پیران) ساڵی ١٩٢٥ لە تورکیا بەرپاکراو مەودایەکی گرنگی لەمێژووی بزووتنەوەی کوردایەتیدا گرتبوویەوە، پێشوەختی دەستپێکردنی شۆڕشەکە لەرێکخستنی نهێنی دا خۆی بینییەوە کە هەڵگری ناوی (ئازادی) بوو. هەر لەسەرەتای دەستپێکردنییەوە زۆربەی بنکەکانی پۆلیسی تورکی خستەژێر دەسەڵاتیەوە، ئەوندەی نەخایاند شۆڕش زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی تورکیای گرتەوەو دەسەڵاتی شۆڕشگێران بەسەریاندا باڵا دەستی

وەرگرتو هاوشێوەی بەڕێوەبەرایەتیو دامەزراوی دەوڵەتی ناوچە رزگار کراوەکان بەڕێوە دەبران، باجی بە ناڕەوا سەپێنراوی تورکیا قورسایی لە سەر هاوڵاتیانی کورد کردبوویە بارگرانی، هەڵگرتنی دەستکەوتێکی مەزنی شۆڕشەکە بوو، کاریگەری گەیشتە ئاستێك بیر لە رزگار کردنی شاری (دیاربەکر)ی گرنگترین شاری کوردستانی تورکیا بکرێتەوە، دەسەڵاتی شۆڕش گەیشتە ئاستی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی سەر بەخۆی کوردستان. لەئەنجامی بەجێهێنانی سێ کاری گرنگو سەرەکی سوپای تورکیا، بە تەواوی چەکی سەنگینو تواناى سەربازییەوە توانی شکست بە شۆڕشەکە بێنێ، وەك لە خوارەوە دەستنیشانکراوە:

١ - تێکشکاندنی خوێناوی شۆڕشەك

٢ - داماڵینی چەك لەهەمووکوردەکان، لەگەڵ لەبەرچاونەگرتنی بەشداریکردنیان لەڕاپەڕینەکەدا.

٣- گواستنەوەو سەرلەنوێ نیشتەجێکردنەوەی کوردەکان لەناوچە جۆر بەجۆرەکانی تورکیا، بەمەرجێك لەهیچ ناوچەیەکی نیشتەجێکردنیان زۆرینە پێکنەهێنن‌و لە هەنگاوێکی دیکەداو لە کردەوەیەکی ئەندازەیی نیشتەجێ کردندا تورکەکان لەناوچە کوردیە ڕاگوێزراوەکاندا نیشتەجێ بکرێن.

## ڕاپەڕینی دەرسیم

دەرسیم وەك ناوچەیەکی کوردستانی تورکیا، حکومەت بڕیاری دا تەواوی خێڵو هۆزەکانی ملکەچی ویستی خۆی بکاتو ناسنامەی نەتەوایەتی کوردیان لێ دابڕنێتو سیاسەتی بە تورك کردنیان بەسەردا بسەپێنێ، لە پەیڕەوکردنی ئەم سیاسەتەیدا، ناوچەکەی بۆ ویلایەتێکی بەڕێوەبەرایەتی تایبەت لەگەڵ گۆڕینی ناوەکەی ڕێکخست. لەوپێناوەدا(سەید ڕەزا)ی ڕابەری کوردەکانی دەرسیم هەوڵی فراوانی دا حکومەتی تورکیا لەو کردەوەیەی پەشیمان بکاتەوە، بەڵام زۆر بەتوندی حکومەت بەرپەرچی هەوڵەکەی دایەوە بەشێوەیەکی ناڕەفتارو

نرندیەتی کوردەکەی کوشت. لەئاستی ئەو هەڵوێستەدا (سەید رەزا) بانگەوازی یەکخستنی توانای خێڵەکان و کۆکردنەوەی هێزەکانیان راگەیاند، تا بزوتنەوەیەکی هاوبەش دژبە هێزەکانی تورکیا رێکبخەن و شۆڕشێك بەرپابکەن. ئەوە بوو ساڵی ١٩٣٠ شۆڕشی دەرسیم بەرپاکراو بەخێرایی پەرەی سەند، لە کۆتاییدا هێزەکانی تورکیا ئاگری شۆڕشەکەیان خامۆشکردو فەرماندەکانیشی گەیاندە پەتی سێدارە.

## پەیمانی سەعدئاباد

هەریەك لە ئێران و تورکیاو عێراق بەشداریان تیادا کردو ساڵی ١٩٣٧ مۆرکرا. بەندی حەوتەمی پەیمانەکە باس لەوە دەکات: ـ هەموو لایەنێك لەلایەنە بەرێزەکانی پەیمانەکەو هەر لایەنەو لە بازنەی دەسەڵاتی خۆیدا پابەندە لە دژەوەستانی بەرپابوونی هەرجۆرە جموجووڵێکی یاخیبوونی چەکداری دامەزراوەکان دەدەن و دەبنە هەڕەشە بۆ سەرپاساو ئاسایشی هەر ناوچەیەك و ناوچەکانی لایەنەکانی پەیمانەکە (مەبەست لەیاخیبوونی چەکدارانی کۆمەڵەو رێکخراوەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردە).

## کۆماری مەهاباد

لە ٢٤ ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦ کۆماری مەهاباد لە کوردستانی ئێران دامەزرا.

وەك یادەوەریەك لەپەرەسەندنی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد بەکورتی راپەڕینەکانی (١٩٤٣ - ١٩٤٥)ی بارزانی کوردستانی عێراق دێنینەوە یادو دواتر لەباسکردنی کوردستانی عێراق دا دێینەوە سەری. پێش مانگێك لە راگەیاندنی کۆماری مەهاباد بەسەرۆکایەتی (قازی محەممەد) پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران دامەزرا، لەگەڵ راگەیاندنی کۆمارەکەدا ئاڵای کوردستان بەسەر بیناکانی

دامەزراوە دەوڵەتیەکاندا هەڵگرا، کە هەمان ئالآی ئێستای کوردستانی گەورەیە، کەپێکهاتووە لەڕەنگەکانی (سوورو سپی‌و سەوزو ناوەڕاستەکەی بەخۆرێکی رەنگ زێڕین رازێنراوەتەوە).

هەر لەسەرەتای پێکهێنانی حکومەتەوە، بلآوکردنەوەی چاپەمەنی کوردی، بەتایبەتی رۆژنامەی (کوردستان)ی زمانحاڵی حکومەت هەنگاوی یەکەمبوو، لەگەڵ بەچاپ گەیاندن‌و بلآوکردنەوەی چەندین کتێب‌و گۆڤاری مانگانەو ئامادەکردنی کتێبە نوێکانی قوتابخانەکان بەو هەنگاوە چالاکی رۆشنبیری کوردی پەرەی سەندو روویکردە بووژاندنەوە، تەواوی ئەرك‌و فەرمانەکان ئاماژەیان بە کۆمارێکی باوڕپێکراو دەکرد، بەو هۆیەوە بەپشتیوانی هەمەلایەنەی یەکێتی سۆڤیەت لەچوارچێوەی ناکۆکیە هەرێمیەکاندا بەرپاکرا، ئەوەبوو پاش مۆرکردنی رێککەوتنی تارانی نێوان (ستالین‌و رۆزفلت‌و چەرچڵ‌و شای ئێران)[٧]، حکومەتی ئێران لە رووی سەربازییەوە بەسەر کۆمارەکەدا زاڵبوو. لە (١٩)ی کانوونی یەکەمدا. (قازی محەممەد)و چەند سەرکردەیەکی تری کۆماری مەهاباد لە سێدارە دران.

لەو سەردەمەدا (مەلا مستەفا بارزانی) فەرمانەدەی بەرگریکردن بوو لە کۆماری مەهاباد، توانی لەگەڵ هێزە لایەنگرەکانیدا لە پەتی سێدارە دەربازبێت‌و لە کۆڕەوێکی دوورو درێژی ئەفسانەییدا لە نێوان شەڕی سەختی بەرگری لەخۆکردنی دژ بە سوپاکانی ئێران‌و عێراق‌و تورکیاو بەریتانیا بگاتە خاکی یەکێتی سۆڤیەت.

---

(٧) ئەم مەسەلەیە چەند جارێك لە مێژووی خەباتی بزووتنەوەی کوردیدا ڕوو یداوە و بەوڕێککەو تننانە شۆڕشەکانیان گەیاندوەتە تێك شکاندن و سەرکوت کردن . و.ك

# بەشی پێنجەم

## مێژووی نوێو هاوچەرخی بزووتنەوەی کورد

دوای وەرگرتنی زانیارییەکی کورت سەبارەت بەبزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد تا سەرەتاکانی سەدەی بیستەم، لە داهاتوودا بەپێی بارو دۆخی هەر دەوڵەتێك کوردەکان تێیدا نیشتەجێن باس لە رووداوەکانی دەکەین.

هەروەك کوردەکانی عێراق جێی باسو خواسو سەرنجی تایبەتو سەرەکی نوسینەکەن، لەجێی شیاوی خۆیدا باس دەکرێت.

### یەکەم: کوردەکانی تورکیا

(ئێمە سەربەخۆ ترین گەلو دەوڵەتین لەم جیهانەدا دەژین، لەناوەڕاستی جەماوەرێکی کەم وێنەو نموونەیدا، نوێنەرتان بەڕاشکاوی باس لە راوبۆچوونەکانی خۆی دەکات، بێ پێچوپەناو شاردنەوەی هەستەکانم دەڵێم: با دۆستو دوژمنو تەنانەت شاخەکانیش بزانن‌و لەو راستیە بگەن‌و لەیادی نەکەن، لەم وڵاتەدا تەنها تورکان رەگەزی رەسەن‌و بەرزو مەزن‌و بێگەردو خاوەنی سامان‌و دەسەڵاتن، ئەو تورکانەی بنەڕەتو سەرچاوەیان پۆخڵ بووە تەنها مافێکیان پێدراوە، ئەویش بەندەیی‌و نۆکەری‌و خزمەتکاریە). بەم ناشکرایی‌و راشکاوییە ساڵی ١٩٢٠ پاش سەرکوتکردن‌و خامۆش کردنی ئاگری شۆڕشەکانی کوردستانی تورکیا (مەحمود ئیزەت) وەزیری دادی تورکیا لەپێش کۆمەڵێك هاوڵاتی تورکدا ئەو لێدوانەی راگەیاند، هەر لەم ئاراستەیەوە (عیسمەت ئینۆنۆ)ی سەرۆك وەزیرانی تورکیا ئەوەی پشتڕاستکردەوەو وتی

(تـەنها تورکـە داخـوازی مـافی رەگـەزو توخمـە جیاجیاکـانی ئـەم وڵاتـەی لەدەستدایەو هیچ رەگەزو توخمێکی دیکە ئەو مافەی پێ رەوا نابینرێت). هەر لـەو سـاڵەداو لەسـەر هـەمان رێچـکە رۆژنامـەکانی تورکیـا بـەم شـێوەیە نووسینەکانیان بلاّو دەکردەوە.. وەك لە خوارەوە دەبینرێت.

- رۆژ نامەی - حاکمیەتی میللی - دەنووسێتو دەڵێت.. گومان لەوەدا نییە داخوازیـەکانی رانـە ئـاژەڵێکی درنـدەی کێـوی وەك داخـوازیکردنی (سـەربەخۆیی کوردستان) بە گازندەو بانگەشەیەکی تـەواو لێکدەدرێتـەوە.. گـەلێك فەرهـەنگی زمانەوانییەکەی لەدوو سەدو شەست وشە تێناپەڕێت، تاکە ناوچەیەك شیاوی بـەڕێوەبردنی (ئۆتۆنـۆمی) بێـت ناوەڕاسـتی ئەفـەریقا یـان بیابانێـك لـە بیابانەکانییـەتی کـە هاوشێوەی ئـەو خەڵـکەی تیایـدا دەژین. بـەلاّم لـە ئاسیای لانکەی ژیـارە دێرینەکانـدا، ئـەو جـۆرە داخوازیانـە جێـی گومـانن، هـەر رەگـەزو کەسو توخمێك خۆی بەشیاوی ئەو ویستو ئارەزووییە بێت، لە پێناوی ئاسایشو ئارامی گشتیدا شیاوی ژێرپێخستنو یەکسانکردنە لەگەڵ خاکداو هەربەو شێوازە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت .

ئەمەیـە دیـدگاو بۆچـوونی نوخبـەی فـەرمانڕەوا لـە بازنـەی حکومـەتی تورکیادا، بەرانبەر بـە هـەموو رەگـەزێکی جیـا لـە رەگەزی تـورکو نەسـەلماندنی رەگەزی دیکە.

ئاشـکرایە راوبۆچـوونو دیـدگای نوخبـەی تـورکی (تـۆرانی) لەسـەر ئـەم بنەڕەتانە بەرپاکراوە.

١ - بالاّخوازی رەگەزی تـورك بەسـەر رەگـەزەکانی تـرداو شکۆمەندی رەهای تورکیاو مێژووەکەی.

٢ - پـەیڕەو کردنـی پرنسـیپەکانی دکتاتۆرییـەتی رەهـاو قبووڵنـەکردنی بەرانبـەر لەبەشـداریکردنی دەسـەلاّتو رێگەنـەدان بـە ئاسـانکاریو بەخشـینو لێبووردەیی لە ئاستی کەسانی دیکەدا.

٣ - رەنگدانەوەو رازی نەبوون بە فرەلایەنی هزری و رۆشنبیری.

٤ - مەزن وپیرۆ ز راگرتنی رۆڵی دامەزراوەی سەربازی تاکە پشتیوان و پارێزەری تیۆری تۆرانی لەدەسەلاتدا.

٥ - بەندایەتیکردنی تاک – لێرەدا تاک مەبەست (کەمال ئەتا تورك)ە خاوەنی تیۆرو رێنماییکەرو فەرماندەی نەمرو دڵسۆز، کە دەوڵەت وابەستەیە بە پاراستنی یادکردنەوەو پیرۆز راگرتنی، بە جۆرێك تەواوی پەیکەرو تابلۆو نیشانەو پولە رازاوەکان و وێنە فۆتۆ هەمەجۆرو سەیرو سەمەرەکانی لە لێوارو کەناری گۆڕەکەیدا ریزبەند کراون.

٦ - لەدەقی بەندی هەشتەمی دەستووری تورکیادا هاتووە دەڵێت: هەر کۆبوونەوەو رێپێوان و خۆپیشاندان و هەر پڕو پاگەندەو بانگەشەیەکی نوسراو یان زارەکی، تیایاندا ئامانج تێکدان و دابڕانی یەکێتی نەتەوەو دەوڵەت بێت قەدەغەیە، هەر کەسێك ئەو کارانەی لێوەشایەوە سزای زیندانی لەدوو ساڵەوە تاپێنج ساڵی بەسەردا دەدرێت. دواتر لە هەوڵێکی چڕدا ساڵی ١٩٥٥ سزاکە بۆ ساڵێك کەمکرایەوە. بنچینەی تیۆری تۆرانی تورکی هاوچەرخ دەگەڕێتەوە بۆسەرەتای سەدەی بیستەم و کۆتایی دەسەلاتی سوڵتان (عەبدولحەمید) لەکاتێکدا بانگخوازی ناسراوو بەناوبانگی تۆرانی (عوبەیدیلا) دەرکەوت و وتارەکانی شێوازی پیرۆز مەندیان وەرگرت و لەکتێبێکدا کۆکرانەوەو بوونە بەرنامەو لەهەست و هزری تورکاندا بنچی داکوتا، لەسەردەمێکدا وتەکانی رەواجیان پەیداکردبوو دەوڵەتان چاوی تەماعکاریان بڕیبوویە سەر میراتی دەوڵەتی عوسمانی و لە هەموو لایەکەوە پەلاماریان دەدا، وەك لەوتەکانیدا دەڵێت: سەیرە سەردیواری مزگەوتەکان بەناوی خەلیفەکانی عەرەب نەخشێنراون و پیرۆزو مەزن رادەگیرێن، لەکاتێکدا ناوی خەلیفە توورکەکان فەرامۆش دەکرێن، ئایا ئەوە دواکەوتن وبێئاگایی نییە؟.. پێویستە لەسەرمان زۆربەوردی و بەتێبینی یەوە لە مێژووی پێشینانمان بکۆڵینەوەو ناوەکانی (جەنگیزخان و ئۆغوزو

هۆلاکۆو تەیموری لەنگ) زیندوو بکەینەوە وەمەزنی‌و پیرۆزمەندیان بپارێزین.

نووسەری تورکی بەناوبانگ (حسەین جاهد) ساڵی ۱۹۸۰ لە ڕۆژنامەکەیدا تیۆری شۆڤینیزمی تۆرانی لەدەسەڵاتدا بەم جۆرە کورت کردوەتەوەو دەنووسێت: هەر لە رابردووە تا ئێستا نەتەوەی تورك فەرمانڕواو خاوەنی دەسەڵات‌و دەستکەوتی مەزنن، بەو سیفەتە بڵندترین‌و باڵادەسترین ڕەگەزن کە بواری یەکسانیکردنی لەگەڵ کوردەکان‌و ڕەگەزەکانی دیکەدا نییە[8] لەکۆتایی هاتنی دەوڵەتی عوسمانییەوە تائەم سەردەمە کوردەکانی تورکیا پێچەوانەی تورکەکان ژیانیان گوزەراندوەو بەهەموو شێوازێك حکومەتی تورکیا بوونی کوردی ڕەتکردوەتەوەو بەم جۆرە سەرنج خراوەتە سەریان.. (لە بنەڕەتدا کوردەکان دەچنەوە سەر ڕەگەزی تورك‌و پەنایان بردووەتە ناوچە شاخاویە سەخت‌و بەردەڵانەکان‌و شێوازی دڕندایەتیان وەرگرتووەو زمانیان رووی لە چەوتی ناوە، ئەوانە ئێستا بوونەتە تورکی چیایی).

دیارە دامەزراوی سەربازی پشتیوان وپارێزەری ئەم بنەما ڕەگەز پەرستیە، هەمیشە هەولی دڕکاویکردنی ڕێگای خەباتی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردی داوە. بێگومان بزووتنەوەکانی گەلانی ئارەزوومەند لە هێنانەدی خواستەکانیان لە ئازادی‌و سەربەخۆیی، ئەگەر ماوەیەکیش سەرکوت بکرێن‌و لە خەبات سڕبکرێن، دوژمنانیشیان چەند بەهێزو توانابن لەناکاوێکدا سەر لەنوێ ڕادەپەڕنەوەو بەرووی سەرکوتکەرانیاندا دەتەقنەوە. سەلماندنی بەڵگەی ڕاستی ئەم مەسەلەیە، لەواقعی خەباتی کوردایەتیدا ڕەنگی داوەتەوە، هەر چەند ماوەیەکی دوورو درێژ بەسەرچەوساندنەوەو سەرکوتکردن‌و سڕکردنی بزووتنەوەی کوردەکاندا تێپەڕیوە، کەچی لەئەنجامدا بەکۆکردنەوەو یەکخستنەوەی پەلوپۆ تێکشکاوو پرش‌و بڵاوەکانی چەشنی ئەو (قەقنەسە)

---

[8] ئۆجەلان سەرکردە و کێشە- نووسینی /ڕەجائی فایدو ئەحمەد بەهادین شەعبان.

حەزێر تینی گەرمای سووتێنەری بیاباندا هێلکەکانی دەشارێتەوەو هەڵیاندێنێ‌و سەرلە نوێ ژیان بەبەریاندا دەکرێتەوە، بزووتنەوەی کوردایەتیش لەناوەڕاستی سەختی ژیاندا.. سەرهەڵدەداتەوە، وەلەچەند ئەزموونێکدا دەردەکەوێت پاش جەنگی جیهانی دووەم‌و دوابەدوای کوودەتا سەربازیەکەی ساڵی ١٩٦٠ لیژنەی یەکێتی نیشتیمانی تایبەت بەکوودەتا، یاسای ژمارە (١٠٥)ی هەموارکرد وەك تیایدا بەدی دەکرێت کە : ئەو خێزانە کوردانەی گومانیان لەسەرە، بەگوێرەی رێژەی نیشتەجێکردن‌و لەرێی بەکارهێنانی هێزەوە ناچاردەکرێن بە راگواستن بۆ ناوچەکانی دیکەی تورکیا. هەمانکات لیژنەیەکی هەمیشەیی تایبەت بە دەرکردن‌و دوورخستنەوەی ژمارەیەك مامۆستایانی زانکۆ لەکارەکانیان پێکهێنراو بەبەردەوامی کاردەکات لەسەر دیاریکردن‌و پەرەپێدانی رەوشی نەتەوایەتی تورکی لە دەستووری نوێدا. لەو سۆنگەیەوە(جەمال گورسیل) سەرۆك وەزیرانی تورکیا دەڵێت: پەلە بکەن لە دارشتن‌و دانانی نەخشەی چەمکی نەتەوایەتی لەدەستووردا، وە ختێك ئایدیۆلۆژیای تورکی لەوڵاتدا رێوشوێنی جێگیری خۆی دەگرێت، ئیتر تەزاندن یان سڕینەوەی لەتواناکان بەدەردەبێت، ئێوە لەو ناکۆکی‌و دژایەتیکردن‌و رووبەڕوو بوونەوەیەی دژبە کوردەکان پیادەی دەکەن تێدەگەن ئەگەر وازمان لەهزری نەتەوایەتی خۆمان هێنا.. ئایا ئەوانە بەئێمە وەگرێدەدرێن؟.. بێگومان نەخێر.. پشت بەستن بەچەمکی نەتەوایەتیمان دامەزراندنی بەرێوە بەرایەتیەکی سروشتی مەترسیە چاوەڕوانکراوەکانی پاشەڕۆژ دەڕەوێنیتەوەو پێش هەرشتێکی دیکە نەتەوایەتی تورکی دەسەلمێت‌و دەچەسپێت.. دەبێ لەوەبگەین تورکیا تەنها بۆ تورکان دەبێت، ئەگەر لەوتێگەیشتنەوازمان هێنا لێی دووره پەرێزەوەستاین، بێگومان لەگەڵ تێپەڕاندنی ماوەی پەنجا ساڵی داهاتوو لەتورکیادا تەنها تورکێك نابینرێت. دەبینین ئەم شێوەبیرکردنەوەو یاسادارشتنانە لەئاستی کوردەکاندا زۆر بەتوندی پەیرەوکراوە بەلام کاردانەوەی سەختی کوردەکان بەرانبەر راپیکردن‌و

بـەجێهێنانی ئـەو سیاسـەتو یاسـا چـەوتانەدا وەك شـێوازێکی دیکـەی خـەبات، جموجوڵو بزووتنەوەی چەکداری (پێشمەرگایەتی) سـەری هەڵداو لـە ماوەیـەکی کەمـدا پـەرەی سـەند. لەگـەڵ ئەوەشـدا لـە ڕێـی بڵاوکردنـەوەی ڕۆژنامـەو گۆڤارەکانیانەوە ڕۆشنبیرانی کورد لـە پەرەپێدانی گیانی نەتەوایەتیو هۆشیار کردنـەوەو بەئاگاهێنانـەوەی جـەماوەر کەوتنـەکار، لەکاتێکدا حکومـەتی تورکیـا هەستی بـە مەترسی ئـەو ڕۆژنامانـە کـرد هەڵسا بەداخستنو قەدەغـەکردنیانو دادگاییکردنی سەرنووسەرانو ڕۆژنامەنووسانیان.

- کۆتایی حوزەیرانی ۱۹٦۳ لەگەڵ ئاشکرابوونی ڕێکخراوێکی نهێنـی کوردیو گـرتنو دادگـاییکردنی ئەنـدامانیو بـەکارهێنانی توندوتیـژیو چەوسانەوەشـدا لەکوردستانی تورکیا ئەم دروشمانە بە ڕووی دەسەڵاتداراندا بەرزکرانەوە.

- هاوڵاتی ڕۆژهەڵات مافەکانت داوابکە.

- ئامانجمان هێنانەدی یەکسانیو برایەتیو بەختەوەرییە.

- شانبەشانی گەلانی خەباتگێر دژبە ئیمپریالیزمو شوڤینیزم دەوەستین.

- داواکاری کردنەوەی قوتابخانەکانین نەك مەڵبەندەکانی پۆلیس.

- هـاوڵاتی ڕۆژ هـەڵات پێویسـتە مافەئینسـانیو مەدەنییـەکانت بـە فـەرمی بناسرێن.

- داواکـاری ژیـانی سەربەسـتو ئـازادی تـاکو فێربـوونی زانیـارین. لـەو سەردەمەدا کوردەکانی تورکیـا تەنهالـە چوارچێوەی دەوڵـەتی تورکیـاو مافـەکانی هاوڵاتیبوونـدا دروشمـەکانیان بـەرزدەکردەوە، لەڕاسـتیدا هـیچ دروشمێـك لـەو دروشمە بەرز کراوانەبیرو مەبەستی جیاخوازیان لێ بەدی نەدەکرا.

- شـوباتی ۱۹٦۱ حکومـەت یاسـای ژمـارە(٦)ی تایبـەت بـە قەدەغـەکردنی وەرگێڕانـی هـەر جـۆرە ئایدیایـەکی بنـەڕەت بێگانـە بـۆ سـەر زمـانی کوردیو هەرجۆرە چاپەمەنیو کاسێتی تۆمارکراوبـەو زمانـەو نارەوایـەتو پەخشکردنیان ڕاگەیەنرا، لەگەڵ ڕووبەڕووبوونەوەی حکومەتی تورکیا بـەناڕەزایی نێودەوڵەتی

بەرانبەر بە یاساکەی، کەچی بەردەوامبوو لەسەر درێژەدان بەسیاسەتی گرتن‌و چەوساندنەوەی رۆشنبیران، تورکیا بەوەشەوە نەوەستایەوە دەستی دایە بلاوکردنەوەو سەپاندنی رۆشنبیری تورکی بەسەر کوردەکانداو بەنیازی بەتورککردنی نەوەی نوێ یاسای ژمارە(٢٢٠) ی دەرکرد بەکردنەوەی قوتابخانەو سەپاندنی خوێندنی تورکی بەسەر ناوچەکوردنشینەکاندا. لەبەر رۆشنایی ئەم یاسایەدا.. لەپێناوی زیاتر سەپاندنی سیاسەتەکەیداو لەبەر رۆشنایی یاسای ژمارە (٣٥٩) لە پێناوی سەقامگیرکردنی بیری نەتەوە خوازی تۆرانی تورکی لە ناوچەجیاجیاکانی کوردستاندا چەند ئیسگەیەکی رادیۆو تەلەفزیۆنی بەزمانی تورکی دامەزراند.

- ساڵی ١٩٦٨ دەسەلاتدارانی تورکیا دەستیانگرت بەسەر داستانی بەناوبانگی (مەم وزین)ی کوردی وەرگێڕا وبۆ سەر زمانی تورکی، لەگەڵ راگەیاندنی قەدەغەکردنی هەر کتێبێکی فێربوونی زمانی کوردی‌و دادگاییکردنی نووسەران‌و وەرگێڕەکانیان. ئەم یاساو هەڵوێستە ناجۆرانە کوردەکانی خستە سەر رێڕەوی پێچەوانەی سیاسەتە چەوت ولارو وێرەکەی تورکیا، لەگەڵ گەشەکردن‌و بەرزبوونەوەی ئاستی هۆشیاری نەتەوایەتی‌و سیاسیاندا کوردەکان زیاتر ئامادەبوون لە رووبەڕووبوونەوەی هێزە سەرکوتکەرەکان. ئەوەبوو ساڵی ١٩٦٩ جەماوەری ناوچە جۆر بەجۆرەکانی کوردستان دژبە بارودۆخی گرژو داڕوو خاوی ئابووری‌و دابەزینی ئاستی بژێوی وبلاوبوونەوەی بێکاری‌و برسیەتیدا هەڵسان بە سازدانی چەندین خۆ پیشاندان‌و رێپێوان‌و دەربڕینی نارەزایی.

- لە ١٩٦٩/٤/١٣ لە ئاستی جێ بەجێکردن‌و راییکردنی یاساکانی دژبە کورد لە شاری دیاربەکر کۆبوونەوە یەك رێکخراو دامەزراندنی نهێنی)پ. د. ك)ی لێکەوتەوە، کەلە ئامانجەکانی (هێنانەدی دامەزراوەکانی ئۆتۆنۆمی‌و پەرەپێدانی رۆشنبیری گەلی کورد بوو لە چوارچێوەی دەوڵەتی تورکیا). هەروەك (پ. د. ك)ی تازە دامەزراو بە گورجی لەناو جەماوەردا بنجی داکوتاو پەرەی سەند،

ڕێکخراوەکانی)پارتی رزگاری کوردو ڕێکخراوی پەیوەندی ئازادیو ڕێکخراوی جەنگاوەرانی کوردستان(بەنهێنی دامەزرانو ڕێگای خەباتو تێکۆشانیان گرتەپێش. ئەم کاردانەوانە بۆ کوردەکان هاندەری زیاتر خۆ ڕێکخستن بوو لەپێناوی رزگاربوون وهێنانەدی مافەکانیان، لەبندەستی ئەم پارتو ڕێکخراوانەدا، کۆتایی شەستەکان ڕێکخراوەکانی لاوانو ناوەندەکانی رۆشنبیریو شۆڕشگێڕی لە زۆربەی شارە کوردیەکاندا بە ئاشکرا دامەزرانو دەستیاندایە چالاکیەکانیان. هەر لەو سەرو بەندەدا (پارتی کرێکارانی کورد) جیاواز لە ("پە. کە. ك" ی عەبدولاّ ئۆجەلان) هاتە گۆڕەپانی خەباتی سیاسی. لە سەرەتای دامەزراندنییەوە ئەم پارتە بەرانبەر بە مەسەلەی نەتەوایەتی هەڵوێستی تەماویو نادیاری هەبوو، بەلاّم بەتێپەڕاندنو گوزەرکردنی بەچەند ئەزموونێکدا سەرکردایەتیەکەی گەیشتە ئەو بڕوایە لە رووی ئابووریو کۆمەلاّیەتیەوە مەسەلەکە کاریگەری خۆی هەیەو پێویستە کاری بۆ بکرێت.. لە ئەنجامی هەستکردن بەو کاریگەریە لە ۲۸ بۆ ۱۹۷۰/۱۰/۳۱ کۆنگرەی چوارەمی لە ئەنقەرە بەستو چەند بڕیارێکی گرنگی لێکەوتەوە وەك تیایدا هاتووە: رژێمی فاشیزمی دامەزراوی دەستی چینە فیوداڵو فەرمانڕەوا بالاّکان هەرلە سەرەتاوە لە ئاستی گەلی کورد سیاسەتی چەوتی کۆمەلاّیەتیو ئابووریو یاسایو پەرەپێدانی سەرمایەدارییانگرتەبەرکە هۆکاربوون لە دواکەوتنو هەژار کردنی کوردەکانی نیشتەجێی ناوچە جۆر بە جۆرەکانی کوردستان.. هەڵوێستی چینی بالاّو دەسەلاّتداری تورك بەرانبەر بە کێشەیەك کەمافی شەرعی گەلێکە دەربڕی ئایدیۆلۆژیای رەگەز پەرستیو نەتەوە پەرستی شۆڤینیزمیە.. پارتیمان هەردەم دژبەو رەوتە رەگەز پەرستە فاشیزمە دەجەنگێت کەدژ بە خەباتی گەلو نەتەوەی کوردە..لە پێناوی بە فەرمی ناساندنو دانەنان بە مافە مەدەنیو دەستووریەکاندا، تاجێ بەجێکردنی تەواوی داواکاریەکانو هاتنەدی هەموو ئاواتەکانمان لە چەسپاندنی دیموکراتی وەك ئەرکێکی سروشتی درێژە بە

خـەباتی خۆمـان دەدەیـن، وەك پێویست دەبـێ سۆشـیالە تـورك‌و کوردەکـان لـە پرۆسەی تەواوکاری خەبات‌و لە پێناوی جێ بەجێکردنی داواکاری‌و مافەکانی گەلی کورد پێکەوە لە ریزی پارتەکەماندا کاربکەین. هاتنە بەرهـەمی بڕیارەکـانی کۆنگرە بەسـەرەتایەکی نـوێ دادەنرێـت لـە بـەهێزکردنی پەیوەندیـەکانی کوردو تـورك‌و گرێـدانی بــە خــەباتی بزووتنــەوەی رزگـاریخوازی کــوردەوە. کاتێــك دەسەلاتدارانی تورك هەست بە هەلکشان‌و بـەرز بوونـەوەی ئاستی بزووتنەوەکە دەکەن، بەهەمان ئاست‌و توندتریش هێزە دڕندەو سەرکوتکەرەکان رێگای گرتن‌و تۆقانــدن‌و ســزادانی بێتاوانــان دەگرنەبــەر. یەکــەکانی کۆمانــدۆ بــەهاوکاری هێزەکانی پۆلیسی نـاوخۆو پاساوڵەکان لـە سـەرەتای حەفتاکانـدا بـوو هێرشـێکی بەربلاویانکردە سەر شارە کوردنیشینەکانی تورکیـاو لـە رەشـەبگیریەکی نـاڕەوادا ژمارەیــەکی زۆری کوردەکـان دەسگیرکران لەگـەڵ ئەشـکەنجەدانیاندا خرانـەژێر لێکۆڵینــەوە، ســەندیکاکانی کرێکــاران‌و کۆمەڵــەو رێکخراوەکــانی دیکــە لــە راگەیانــدنێکی هاوبەشـدا گــەلانی تورکیـاـیان لــە ئاسـتی پــەلاماردانی هێــزە ســەربازییەکان بــۆ ســەر خــاکی کوردســتان بەئاگاهێنایــەوە نــاڕەزایی تونــدیان بەرانبــەر بــە رووداوەکــان خســتە روو راگەیانندنەکــە توانــاو پەرەســەندنی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی لەتورکیا سەلماندو مەسەلەی دیموکراتی بـەکاری رێکخراوەیی‌و رێکخستنەکانی کۆمەڵگای مەدەنییەوە گرێدا. لەگـەڵ هەسـتکردنی تورکیا بە مەترسیەکانی یەکخستنی ریزەکانی بزووتنـەوەی کـورد، لـە سـەرەتای حــوزەیرانی ۱۹۷۰ دا لەگــەڵ وەلامدانــەوەی تونــدی هێــزە ســەربازییەکانی‌و پــەلاماردانی ناوچــەکانی کوردســتان‌و گــرتن‌و زینــدانیکردنی ژمارەیـەکی زۆری کادرو لایـەنگرانی رێکخـراوە یـەکگرتوەکان، لەلێدوانێکـدا سـەرۆکی تورکیـا وتـی: رووداوەکـانی ئـەم دواییـەی رۆژهـەلاتی ولات هەرەشـەی راسـتەوخۆن بـۆ سـەر یـەکێتی ولات‌و دەوڵـەت، لـە کاتێکـدا کـوردە کۆمونیستەکان لـە رێـی هەژانـدنی هەسـتی جـەماوەرەوە لـە هـەوڵی دامەزرانـدنی دەوڵـەتی کـوردی سـەربەخۆدان،

بێگومان بەم رفتارەیان دەیانەوێت یەکێتی نەتەوەمان بشێوێنن‌و دابەشی بکەن بۆ چەند بەشێکی لاوازو بێتوانایی پێکهاتوو لە کوردو چەرکەسەکان. کردەوە سەربازیە تۆڵەسێنەکانی کۆماندۆو پاساوڵەکانی تورکیای دژ بە کورد بوونە جێی دەربڕینی نارەزایی‌و بەرزبوونەوەی دەنگی جەماوەرو کاردانەوەی خراپ، وەك هەڵوێستی هەندێ لەئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران‌و هەڵسانیان بە دەربڕینی نارەزایی لە ئاستی رووداوەکانی گرتن‌و زیندانیکردن‌و ئەشکەنجەدانی دانیشتوانی بێ دەسەلات‌و بێتاوانی‌و پلایەتەکانی رۆژهەلات‌و گەیاندنیان بەسەرۆکایەتی ئەنجومەن. بەو هۆیەوە ئەنجومەن بەمەبەستی لێکۆڵینەوە وزیری ناوخۆی بانگهێشتکرد، کە بیانووی بەوە هێنایەوە، کردەوەکانی حکومەت تەنها لەچوارچێوەی بەرپەرچدانەوەی کردەوە دوژمنکاریەکان‌و گەراندابوو بەدوای چەکی قەدەغەکراوی هاتوولەدەرەوەی سنوور.هەواڵەکانی راگرتنی توندوتیژی چەوساندنەوە بەرانبەر بە کوردو داخوازی مافەکانیان بەردەوام لەپەرەسەندندابوون، بەلام ئەو پیلان‌و کارانە دەرهاویشتەی ستراتیژییەتی ئەوسیستەمە دەردەچوون کە (کەمال ئەتاتورك) بنەرەتی دارشتبوو، بۆیە هێزەچەکدارەکانی پاسەوانانی ئەو سیستەمە بریاریدا بە لێدانی توندی سەراسەری بزووتنەوەی دیموکراتی لە تورکیادا. ئەوە ی گرنگەو تێبینی دەکرێت.

- لە ١٢ای ئازاری ١٩٧١ هێزە کەمالیزمیەکان یادداشتێکیان دایە سەرۆك کۆمارو ئەنجومەنی پیران‌و سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران، داواکاربوون بە دامەزراندنی حکومەتێکی نیشتیمانی دابراو لە پارتایەتی، لەپێناوی بنبڕکردنی گێرە شێوێنی‌و ئاژاوەگێڕی، تواناداربێت لە چاکسازیکردنی یاسایی‌و دەستووریەکانی زادەی بنەما سەرەکییەکانی بیری شۆڤینیزمی ئەتاتورك‌و رزگارکردنیان لە شێواندن‌و تیاچوون. لەو پێناوەدا حکومەتەکەی سلێمان دیمیرێل وازنامەی داو حکومەتێکی نوێ پێکهێنرا، لەسەرەتا ی دەست بە

کربوونییەوە حکومەتی نوێ ڕێگای سیاسەتی توندوتیژیو چەوساندنەوەو سەرکوتکردنو گرتنی هاولاتیانی بێتاوانو ئەشکەنجەدانی گرتەبەر، لەگەڵ دامەزراندنی چەند دادگایەکی سەربازی تایبەت بەدادگاییکردنی دەیان ڕۆڵەی کورد، بەتاوانی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی، ئەوەی جێی سەرنجە فەرماندەی گشتی هێزە سەرکوتکەرەکان بە راشکاویو بێ هیچ رووگیریو شەرمکردن، لە هەڵمەتێکدا زیندانیکردنی دەهەزار کەسی ئاشکرا کرد.

- ئابی ۱۹۷۲ بە هۆی هەڵوێستی مرۆڤدۆستیەوە زانای کۆمەڵناسی (ئیسماعیل بێشکەچی) ماوەی سێنزە ساڵ زیندانی بەسەردا سەپێنراو تائەم سەردەمیشە هێشتا لە زینداندا ماوەتەوە.

- پارتی شۆشیالیستی کوردستانو ڕێکخراوی ئازادی ساڵی ۱۹۷٤ دامەزران، هەر لەو ساڵەدا بەنیازی پاککردنەوەی ناوچەکانو بەرپاکردنی دەسەلاتی میللی لەکوردستانی تورکیادا)پ. د. ك(سوپای میللی دامەزراند.

بەپەیوەستبوونو بەشداریکردنی ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی پێشووی ناوەندە شۆڕشگێڕو ڕۆشنبیرەکانی کوردستان ساڵی ۱۹۷٥ لاوانی کورد لە ئەستەموولو ئەنقەرە بە ئاشکرا دامەزراندنی ژمارەیەك کۆمەڵەو ڕێکخراوی شۆڕشگێڕو دیموکراتخوازو ڕۆشنبیریان راگەیاند.. لەم هەنگاوەوە سەردەمی خەباتو تێکۆشانی(پە. کە. کە)و رابەرەکەی (عەبدوڵا ئۆجەلان) دەستیپێکرد.

## عەبدوڵا ئۆجەلان و پەکەکە

کاتێك گیانی رزگاریخوازی ئارەزووی گۆڕانکاری لای نەوەی شەستەکان لە سەرانسەری جیهاندا چەکەرەی کردبوو، ئەو سەردەمە عەبدوڵا ئۆجەلان قوتابی زانکۆ بوو، ساڵی ۱۹۷۱ چەند کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ کۆمەڵێك کەسی ناسراو ئەنجامدا، بە گوزەراندنی چەند مانگێكو پاش وتووێژی چڕو سودمەند یەکەم کۆبوونەوەی سیاسی لەگەڵ ئەو کۆمەڵەدا گرێدا، هەر لەو وەختەوە هەنگاو

بەهەنگاو لەسەرخۆ کۆمەڵەکەڕویکردە پەرەسەندن.. دەرئەنجامی هەمانساڵ پاش ڕووداوی کوودەتای ژەنەڕاڵانی تورکیا ماوەی شەش مانگ ئۆجەلان خرایە زیندان.. لەگەڵ دەرچوونی کەوتە هەوڵی ئاشنابوونی بەئەزموونە شۆڕشگێڕیو ڕزگاریخوازیەکانی جیهانو پەیداکردنی هۆشیاری بەرز لە ئاستیاندا، بەتایبەتی شارەزابوونی لەگەڵ ئەزموونی گەلی ڤیەتنام، بۆیە بڕیاریدا پشت بەو ئەزموونە ببەستێت.

لەو ئاراستەیەوەو لەئاکامی چەندین کۆبوونەوەو راوێژکردندا گەیشتنە ئەم دەرئەنجامە..

یەکەم - کوردستان نیشتیمانێکی داگیرکراوە لەلایەن بێگانەوە.

دووەم - گەلی کورد مافی خۆیەتی بەدەستی خۆی چارەنووسی دیاری بکات.

سێیەم - کێشەیەکی راستو دروست هەیە پەیوەندیدارە بەکەسایەتی خودی کوردستانەوە.

چوارەم - شۆڕش بەخەباتکردن دژبە کەمالیزمو هێزی نەتەوە پەرستی دواکەوتووی شۆڤینیزمو دەرەبەگایەتی نەبێ، سەرکەوتنی مەحاڵە.

پێنجەم - پەرەپێدانی رێکخستنێکی شۆڕشگێڕو کارامە.

شەشەم - گۆڕانکاریکردن لەو رێکخستنەدا بەرەو خەباتی چەکداری.

سەرەتای خۆ سازدانو دەستپێکردنی شۆڕش لە کوردستانی تورکیا، شۆڕشگێڕان ئەنقەرەیان بەجهێشتو لەگوندە دوور دەستەکان جێگیربوون چەندین خانوو چایخانەیان کردە بنکەو بارەگای بەیەکگەیشتنو کۆبوونەوەکانیان.. ساڵی ١٩٧٧ ئەو تاقمەنازناوی ئاپۆ یان بەسەر)عەبدوڵا ئۆجەلان)دا بڕی، ئەوەبوو بەتوانایەکی بەرزەوە لەسەر گۆڕەپانی کوردستانی تورکیا دەرکەت. ساڵی ١٩٧٨ فراوانبوونی ژمارەیان بووە جێی سەرنجو گرنگی پێدانی ناوەندی کوردستانی تورکیا.

بەو جۆرە لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٨ رابەرانو لێپرسراوانی کۆمەڵەکە لەشاری

دیاربەکر کۆبوونەوەی گشتیان گرێداو بڕیاردرا بە گۆڕینی ناوی کۆمەڵەکە بۆ پارتی کرێکارانی کوردستان پە. کە. کە.

لەگەڵ گرێدانی یەکەم کۆنگرەیدا لە ٣٠ی تەمموزی/١٩٧٩ (پە. کە. کە) یەکەم چالاکی شۆڕشگێڕی دژ بە هێزەکانی تورکیا ئەنجامدا، هەرلەو سەرەتایەوە رووبەڕووی خێڵە کوردێکی بەکرێگیراوی حکومەت بوویەوەو لەشەڕێکی لابەلاییدا سەرۆکی ئەوخێڵە بەدەستی جەنگاوەرانی شۆڕشگێڕ دەکوژرێت. لە ئاستی کردەوەو لێدوانە توندەکانی (پە. کە. کە)ی تازە دامەزراو، حکومەت کەوتە خۆسازدان و ئامادەکاری و لەدژوەستانی.. لەو هەلۆێستەدا (ئۆجەلان) ولاتی بەجهێشت و بەمەبەستی پەیوەندی لەگەڵ رێکخراوە فەلەستینییەکانی نیشتەجێی سوریاو لوبنان گیرسایەوە. چەکدارانی (پە. کە. کە) شانبەشانی جەنگاوەرانی فەلەستینی دژبە ئیسرائیل کەوتنە شەڕەوە، زیاتر نیازی ئۆجەلان لەو بەشداریکردن و هاوکاریەدا بەهێزکردنی بیروباوەڕی شۆڕشگێڕی و راهێنانی گیانی بەرگری بوو لەناخی جەنگاوەرانی بزووتنەوەکەیدا.

(پە. کە. کە) ساڵی ١٩٨٣ لە گوندێکی لوبنان یەکەم کۆنگرەی خۆی گرێداو ئەم بڕیارانەی راگەیاند.

١ - دەستپێکردنی شەڕی پارتیزانی.

٢ - دامەزراندنی بەرەی نیشتیمانی.

بەدوای کۆنگرەی یەکەمدا بەماوەیەك پە. کە. کە لە سەربازگەیەکی فەلەستینی سەرسنووری ئەردەن دووەم کۆنگرەی خۆی بەست وتیایدا بڕیاردرا بە گەڕانەوەی دەستە چەکدارەکان بۆ خاکی کوردستانی تورکیاو سپاردنی باڵێکی سەربازی بەیەکێك لەفەرماندەکانی و گەڕانەوەیان وەك پێشەنگی هێزەکان.. لەگەڵ خۆسازدانی بەچەکی بڕواوچەکی دەست و مەشقی کاریگەرو راهاتنی تەواو وتێگەیشتن لە ئامانجەکانی شۆڕشگێڕی، لەگەڵ سەختی و نالەباری هەل و مەرجەکەیشدا، یەکەم بنکەی سەربازیان لە نێوان سنووری عێراق و تورکیا

دامەزراند.

سەبارەت بەوە ئۆجەلان دەڵێت: بارودۆخی سەخت بەرهەمهێنەری کەسایەتی بەهێزو تواناداره، بڕوابوون بەمەسەلەکە گرانبەهاترین چارەسەری چارەسەرە سەختەکانە. سەردەرکردنی ساڵی ١٩٨٤ لە سەرەتای بڵاو بوونەوەی دەستەبچووکەکانی جەنگاوەران بوو بەسەرخاکی کوردستاندا، بەگوزەرانـدنی دووساڵ خەباتی چەکداری‌و فراوانبوونی هێزەکان سوپای ڕزگاری کوردستان دامەزرا.. ئەوە بوو لە ئابی ١٩٨٤ دەنگدانەوەی سەدای یەکەم گوللەی ئاراستەکراوی رووبە دژومن کوودەتایەکی مەزنی لە دەروون‌و ژیانی سەرانسەری کوردستانی تورکیا بەرپاکرد. مەترسیداری باروودۆخەکە حکومەتی ئەنقەرەی گەیاندە ئەو بڕوایە کاتی ئەوە هاتبێت بەیەکجاری تەواوی ناوچەکە بگێڕێتەوە بۆ ژێر دەسەلاتی سەربازی‌و بزووتنەوەکەو تەواوی جەنگاوەرانی ڕوو بەڕووی شکستی یەکجاری بکاتەوە.

لەگەڵ سەرگەرمی حکومەتی تورکیا بە ئامادەکاری جێ بەجێکردنی نیازو نەخشەکەی،لەناکاوێکی چاوەڕوان نەکراودا ئەنقەرە ڕووبەڕووی پەیامی دووهێرشی توندی کۆمەڵە شۆڕشگێڕی نەناسراو ونادیاری سەرنجراکێش بەناوی (پارتی سوپای باشووری ڕۆژهەلات) بوویەوە، کەبووە هۆی کوژرانی (٢٤) جەندرمەو سەرباز، دیارە ئەم دوو هێرشەو ئەم هێزە نەناسراوە نوێیە حکومەتی تورکیای لەرزاندو لەوە گەیشت ئەم ڕووداوانە سەرەتای بەرنگاربوونەوەی راستەوخۆی کوردەکانە دژ بەهێزەکانی سەربازی‌و جەندرمەکان‌و سەرەتای راستەقینەی سەرهەڵدانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردە لە تورکیادا. ڕەوشەکە تائەوکاتەی لە ٩ ی شوباتی ١٩٩٩ دەزگای هەواڵگری نهێنی تورکیا (میت) هەواڵی رفاندنی عەبدوڵا ئۆجەلانی بلاوکردەوە بەوجۆرە بەڕێوە دەچوو وەك لەخوارەوە دەسنیشانکراوە.

١ — لە تشرینی یەکەمی ١٩٩٨ سلێمان دیمێرێل ی سەرۆکی تورکیا بەرانبەر

بەیارمەتیدانی (پە. کە. کە) هوشیاری دەدات بە سوریا.

٢ - لە ٤ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨ میسر بە رۆڵی ناوبژیوانیکردنی نێوان تورکیاو سوریا هەڵدەسێت، موبارەکی سەرۆکی میسر بەسەردانێکی لەناکاو گەیشتە ریازی پایتەختی عەرەبستانی سعودیو لەوێشەوە لە (١٠)ی ئەو مانگەدا گەیشتە ئەنقەرە.

٣ - لەگەرمەی هەڕەشەو گوڕەشەکانی سەر سوریا کەمال خەڕازی وەزیری دەرەوەی ئێران گەیشتە دیمەشقو بە مەبەستی ناوبژیوانی نێوان هەردوو وڵات سەردانی ئەنقەرەیشی کرد.

٤ - لە (١١)ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨ فاروق ئەلشەرع لە قاهیرە سەبارەت بەکێشەی پە. کە. کە ئەنجامدانی گفتوگۆی سیاسی لەگەڵ تورکیا راگەیاند.

٥ – (١٣)ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨ (عەمرو موسا)ی وەزیری دەرەوەی میسر دوونامە بۆ دیمەشقو ئەنقەرە دەگوێزێتەوە.

٦ – (١٥)ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨ وەزیری بەرگری تورکیا سەردانی وەزیرانی دەرەوەی میسرو ئێرانی بۆ ئەنقەرە ئاشکراکردو لەزاریانەوە داخستنی سەربازگەکانی پە. کە. کە یان لە سوریا دووپات کردەوە.

٧ - (١٦)ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨ وەزیری دەرەوەی تورکیا ئەنجامدانی هەر گفتوگۆیەکی سەبارەت بەکێشەی ئاوی کردە پێش مەرجی راگرتنی یارمەتیدانو هاوکاریکردنو پشتیوانیکردنی سوریا لە پە. کە. کە.

٨- ٣٠ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨ بۆ دواجار سلێمان دیمێرێل حکومەتی سوریا ئاگادار دەکاتەوە بەراگرتنی هاوکاریکردنی ئۆجەلان و پارتەکەی.

٩ - (١٨)ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨ بەمەبەستی دڵنیابوون لە راگرتنی هاوکاریەکانی سوریا بۆ (پە. کە. کە)و هەڵگرتنی سەربازگەکانیو دەرکردنی عەبدوڵا ئۆجەلانو هێزە چەکدارەکەی، دەستەیەك پشکنەری تورکی دەگەنە دیمەشق.

١٠- (٣١)ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨ ئاشکرابوونی گواستنەوەی عەبدولآ ئۆجەلان بۆ روسیا.

١١- (١٤)ی تشرینی دووەمی ١٩٩٨ دوای گەیشتنی ئۆجەلان بەفرۆکە خانەی لیۆناردۆ دافنشی، وەزارەتی دەرەوەی ئیتالیا دەست بەسەرکردن و بەندکردنی بلآوکردەوە، وەك لەلێدوانەکانی دەسەلآتدارانی تورکیادا دەرکەوت هەوڵێکی زۆر چرپاندراوە لەپێناوی فایلکردنی ئیتالیا بەوەرگرتنەوەی.

١٢- (١٨)ی تشرینی دووەمی ١٩٩٨ سەرۆك وەزیرانی ئیتالیا دانەوە دەستی ئۆجەلان ی بەتورکیا رەتکردەوە.

١٣- (٢١)ی تشرینی دووەمی ١٩٩٨ سەرهەڵدانی کێشەیەکی سیاسی توندو ترسناك لە نێوان تورکیاو ئیتالیا بە هۆی تەسلیم نەکردنەوەی ئۆجەلان بە تورکیا.

١٤- (٢٢)ی تشرینی دووەم دەنگۆی رەزامەندی قەزافی سەرۆکی لیبیا بەمیوانداریکردنی ئۆجەلان.

١٥- (٢٣)ی تشرینی دووەم ئەنقەرەیاداشتی نارەزایی دایە باڵوێزی ئیتالیاو ئامادەیی دەرخست بە لێدان- ی بڕیاری دادگاکەی لە ئاستی ئازادکردنی عەبدولآ ئۆجەلان وبە ئاشکرا هەڕەشەکردن بە دوورخستنەوەی کۆمپانیا ئیتالیەکان لە زیادو کەمکردنی بەڵێندە رایەتی پرۆژەپیشیەسازیەکانی بواری بەرگری تورکیا.

١٦- (٢٦)ی تشرینی دووەمی ١٩٩٨ لە رێی پارێزەرانییەوە ئۆجەلان پێشنیاری ئاشتی پێشکەش کردو لەورووەوە ئەم پرۆژەیە دادەبەزێنێ..

- راگرتنی تەواوی کردەوە سەربازیەکان و راگرتنی توندو تیژی و دەستدرێژی دژبە گوندنیشانی کورد.

- گێرانەوەی راگوێزراوان بۆ گوندە پێشوەکانی خۆیان.

- دان پێدانان و جێ بەجێکردنی ئۆتۆنۆمی — ناوچە کوردیەکان لەگەڵ پاراستنی یەکپارچەیی خاکی تورکیا.

- بــە فــەرمی ناســاندنی تــەواوی مافەنــە تەوایەتیــەکانی کــوردو دەستەبەرکردنی ئازادیە دیموکراتیەکان یەکسانکردنی
کورد تیایاندا، لەگەڵ تورکەکان.

- دانان بەناسنامەو زمانو رۆشنبیری کوردیدا.

- دەستە بەرکردنی چالاکیو کاری فرەلایەنیو سەربەستی ئایینی.

١٧- (١٤)ی کــانوونی یەکــەمی ١٩٩٨ ئاژانســەکانی دەنگوباســە جیهانییــەکان وازهێنــان لەخــەباتی چــەکداریو گرتنەبــەری شــێوازی ئاشــتی چارەســەرکردنی مەسەلەی کوردیان لەسەر زاری عەبدوڵا ئۆجەلان بڵاوکردەوە.

١٨- (١٥)ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٨ بۆ ٣١ی کانوونی یەکەم شاردنەوەو بــەنهێنی راگرتنــی تــەواوی جموجووڵــەکانی ئۆجــەلان، هــەمانکات دەنگــۆی چــڕکردنەوەی هەوڵــەکانی لــەوەرگرتنی رەزامەنــدی هــەر دەوڵــەتێك مــافی پەنابــەری پــێ ببەخشێت.

١٩- ســەرەتای کــانوونی دووەمــی ١٩٩٩ ئاژانســەکان لەســەر رەزامەنــدی تورکیــا هەواڵی خۆتەسلیم کردنی ئۆجەلان یان بە ئەلبانیا بڵاوکردەوە.

٢٠- (١٦) ی کــانوونی دووەم پــاش رازیبــوونی هوڵەنــدا بەچــوونە خاکیــەوە عەبدوڵا ئۆجەلان بەرەوشاری مینسکی بلاروسیا ئیتالیای بەجێ هێشت.

٢١- راپۆرتەکانی رادیۆی هۆڵەندا دەریانخست، دەوڵەتی هۆڵەندا رێگربووە لــە پێش عەبدوڵا ئۆجەلان لەگەیشتنی بــەو وڵاتــەو ئەنجامــدانی وتووێــژ ســەبارەت بەکێشەی وڵاتەکەی لەگەڵ دادوەرانی نێو دەوڵەتی.

٢٢- شوباتی ١٩٩٩ ئۆجەلان لە فڕۆکەخانەی جۆمۆکینیاتا ی نێو دەوڵــەتی نایرووبی نیشتەوە.

٢٣- (١٣)ی شوباتی ١٩٩٩ لەدوونامەی جیاوازدا ئۆجەلان داواکارە لــە یۆنــانو روسیا مافی پەنابەری پێ ببەخشنو دەستەبەری پاراستنی ژیانی بکەن.

٢٤- لــە (١٧)ی شــوباتی ١٩٩٩ دەزگــای هەواڵــگر (میــت)ی تورکیــا ســەرکەوتنی

خۆی لە رفاندنو دەسگیرکردنی (عەبدولاّ ئۆجەلان) راگەیاند.

٢٥- (١٨)ی شـوباتی ١٩٩٩ و رۆژانـی جـەماوەریو خۆپیشـاندانی بـەربلاّوی نارەزایی توندی گوردەکان لەئەستەموولّ وشارەکانی ئەوروپا، لە بەرانبەریشدا خۆپیشاندانو ریّپیّوانەکانی دەربرینی خۆشی لەچەند شاریّکی تورکیا سازکران.

٢٦- (١٩)ی شوباتی ١٩٩٩ لەناو بازنەی توندوتۆلّی سیخوڕانو پاسەوانانداو لە بەندیخانەی ئەمیرالّی رۆژئاوای تورکیا عەبدولاّ ئۆجەلان خرایە ژیّرلیّکۆلّینەوە، هاوکات هیّزەکانی پۆلیسو ئاسایشی تورکیا بـە شـیّوەیەکی بـەربلاّو کەوتنـە هەلّمەتی رەشەبگیری کوردەکان لە زۆربەی شارە کوردنیشینەکاندا.

٢٧- (٣١)ی مایسـی ١٩٩٩ بـەرِاگرتنی لەناوقەفەسـی شووشـەیی گوللەنـەبڕدا دادگاییکردنی ئۆجەلان بەرِیّوەبراو لە کۆتاییدا سزای لەسیّدارەدانی بە سەرداردا، دواتر لەژیّرفشاری توندی نیّودەولّەتیو بەتایبەتی فشاری یـەکیّتی ئـەوروپا، کـە تورکیا لـە هـەولّی بـوون بـە ئەندامـە تیایـدا، سـزاکە بـۆ زینـدانی هـەتا هـەتایی سوککرا، لەژیّر کاریگەری هەمان فشاریشدا تورکیا کـردەوە سەرکوتکەریەکانیشی لەسـەر کوردەکان کـەمتر کـردەوەو تـا ئاسـتیّك دەرگـای لـە پـیّش بلاّوکردنـەوەی رۆژنامـەو گۆڤارەکوردیەکانـدا کـردەوەو فـەرمانی دابـە ئـازادکردنی هەنـدیّ کەسایەتی زیندانیکراوی وەك (لەیلا زانا)ی پەرلـەمانتاری پیّشوو لـە پەرلـەمانی تورکیادا، کە پیّداگری زۆری کرد کە سویّندی یاسایی بەئەنـدامبوونی بـە زمـانی کوردی بخوات، بەلاّم پەرلەمان (حەسانە)ی پەرلـەمانی لەسـەر لاداو رووبـەرِووی دادگایشی کردەوەو خرایە زیندانەوە. دوابەدوای ئـەم رووداوانـە مەسـەلەی کورد لەتورکیا بەشیّوەیەکی کاتی خرایە پەخچالّەوەو بۆ ماوەیەك سرِکرا. هەندیّ جار دەبیـــنین پارتـــە کوردیـــەکان خـــەباتی چـــەکداری دەخەنـــەلاوەو دواتـــر پەشیماندەبنەوەو دەگەرِیّنەوە سەریو بەوجۆرە. سرِبوونی بزووتنەوەی کورد لە تورکیا کاتیّکی زۆری نەخایاند سەر لەنویّ جاریّکی تر لـە سرِی نـاو بەستەلّەکی پەخچالّ دەرچووەوە دەرەوە

## دووەم: کوردەکانی ئێران

داو بەدوای رووخانی کۆماری مەهاباد لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٦و لەسێدارەدانی رابەرو سەرکردەو فەرمانـدەکانیو دواتـر گـرتنو زینـدانیکردنی تـەواوی سەرکردەکانی کوردو پارتی دیموکراتی کوردستان شکستێکی سەختی بەخۆوە بینی. لەگەڵ بەردەوامی گرتنو زیندانیکردنو راوەدوونانی کادرانی پارتی، ئەو فەرمانـدەو کادرانـەی لـە گـرتنو کوشـتن رزگاریـان بـوو سـەر لـەنوێ خۆیـان رێکخستەوەو رێگای خەباتی نهێنیان گرتەبەرو گۆڤاری (رێگا)یان بڵاوکردەوە، لە رێکخستنەوەیەکی نوێدا بە هێمنیو لەسەرخۆ (ح. د. ك) کەوتـەوە هـەنگاونانی خۆنزیککردنەوە لە جەماوەرو توندو تۆڵکردنی پەیوەندییەکانی.

لەسـەرو بەنـدی ئـەم رووداوانـەداو لـە ئاسـتی کوردەکانـدا دوو هەڵوێسـتی لەیـەك جیـاوازو دژبەیـەکی شـای ئێـران تێبینـی دەکرێـت.. لـە کاتێکـدا لەسـەر خاکەکەی خۆی بەردەوامبوو لەگرتنو زینـدانیکردنو کوشـتنو دوورخستنەوەی شۆڕشگێڕانی کورد لە وڵاتو دژایـەتیکردنی سـەرجەمی بزووتنـەوەی کوردایـەتی لە ئێرانداو، بەردەوام لە هەوڵی گۆڕینی ناوچەی کوردستان بـوو لـە کردنـی بـە سەربازگەیەکی مەزنی ئێرانیو فەرمانـدەکانی سوپای لـە هـەرکارو کردەوەیـەکی دژ بـە تێکـڕای کـوردی ئێـران بەگشـتیو (ح.د.ك) بـە تایبـەتی سەربەسـت کـرد هەرچی لە توانایاندایە ئەنجامی بدەن، کەچی لەلایـەکی دیکـەوە زۆربـە فراوانـی هاوکـاریو پشـتیوانی لـە بزووتنـەوەی کوردەکـانی عێـراق دەکـردو لـە رێـی ئیسگەکانییەوە گیـانی نەتەوایـەتی لەناخیانـدا زینـدوو دەکـردەوەو هـانی دەدان دژبـە رژێمـەکانی بەغـدا زیـاتر کاربکـەن. سـاڵی ١٩٤٦ (ح.د.ك) بـە رابەرایـەتی (عەبدوڵا ئیسحاقی) کۆنگرەی دووەمـی گرێـدا، لـە ئـەنجامی تاوتوکردنی هـەڵو مـەرجی ئـەو سـەردەمە چـەند بڕیـارێکی راگەیانـد، کەتیایانـدا راگرتنـی کـردەوە چـەکدارییەکانی وسـتراتیژییەتی ئەوکاتـەی دژبـە حکومـەت راگەیانـد. لـەژێر کاریگـەری بـەردەوامی کردەوەکـانی حکومـەتی شـای ئێـران لەچەوسـاندنەوەو

سەرکوتکردنیو زیندانیکردنی کوردەکان، کادرانی (ح.د.ك)ی ئێران ناچاربوون ولآت بەجێ بێڵنو عێراق بکەنە ئارامگای خۆیان، لەگەڵ بەسەر چوونی کاتدا دژواریو ناکۆکی توند کەوتەوە نێوان کوردەکانو حکومەتی شا. کادرانی پارتی هەلی شێواوی بارو دۆخەکەیان لەبەرژەوەندی بزووتنەوەی کوردایەتی خستەبەرنامەو راپەڕینی ساڵی ١٩٦٧ یان هێنایە بەرهەمو ماوەی هەژدەمانگی تەواو دژبە دەسەلآتی شا شەڕی سەختیان بەڕێوەبرد.

لەبەر پەرچدانەوەی راپەڕینی کوردەکانو ڕێگریکردن لە ڕوودانی شۆڕشی چەکداری، دەسەلآتدارانی ئێران ڕێوشوێنی توندو تۆڵیان گرتەپێشو لەپەلامارێکدا ژمارەیەکی فراوانی لە کادرانی (ح.د.ك) دەسگیرکردو ژمارەیەکیشی لە سێدارەدان.

لە ئەیلولی ١٩٧٣ کونگرەی سێهەمی پارتی گرێدراو لە ڕێڕەوی کارەکانیدا دەرەنجامی راپەڕینەکە بەوردی هەڵسەنگێنراو لێکۆڵینەوەی لەسەرکرا، کۆنگرە گەیشتە دەرەنجامێك نەبوونی رابەرایەتی بە هێزو کەمو کورتی ڕێکخستن، راپەڕینی رووبە رووی شکست کردەوە. بەرانبەر بە بارودۆخی ئەو سەردەمەی کوردەکانی ئێران راگەیاندنی بەیاننامە١١ ی ئازاری ١٩٧٠و دانان بە ئۆتۆنۆمی کوردستانی عێراق، رەنگدانەوەی کارای هەبوو لەسەر بووژاندنەوەو زیندوکردنەوەی چالاکییەکانی (ح.د.ك)ی ئێران وئەم ئەرکانە خرانە ئەستۆی کۆنگرە.

١ - دەستە بەرکردنی یەکێتی سیاسیو ئایدیۆلۆژی ناوخۆی پارتی لەسەر بنەڕەتی بەرنامەیەکی نوێ.

٢ - بنیادنانەوەی لایەنی ڕێکخستن لەسەر رۆشنایی پەیڕوو پرۆگرام.

٣ - لە پێناوی بەرجەستەکردنی دروشمی (دیموکراتی بۆ ئێرانو ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستنان)و یارمەتیدانی کردەوەکانی جەنگاوەران دژبە هێزەکانی ساواك.

٤ - بەرپاکردنی پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ پارتو هێزو لایەنە

ـیشـتیمانیو پێشـکەوتوو خوازەکـانی ئێـرانو جیهـانو شـارەزا بوونیـان لـە چۆنییەتی بارو دۆخی کوردستانو مەسەلەی کورد.

کـۆنگرە بڕیـای دا بـە دەرکـردنو بڵاوکردنـەوەی ڕۆژنامـەی کوردسـتانو دامەزراندنی دەزگایەکی نووسینو پەخشکردنو دامەزراندنی پەیمانگای کادرانی سیاسی، لەمیانـەی چالاکییەکانیدا، پارتی پەیوەندیـەکانی خۆی لەگـەڵ هەنـدێ لەهێزە نیشتیمانیو پێشکەوتوو خوازەکانی دیکەی ناوخۆی ئێراندا بە هێزکـردو بەرەیەکی تێکۆشانی بەتینیان دژبە دەسەڵاتی شا دامەزراند، کە شـەرەفی دەست پێشخەریەکەی دەگەڕایەوە بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان.. هەمانکات ڕۆژنامـەی کوردسـتان زمانحـاڵی پـارتی سـەبارەت بـەپێکهێنانی ئـەو بەرەیـەو چـۆنییەتی یەکگرتنی هێزە بەرهەڵستکارەکانو پێشنیارەکانی بەڕوونی بڵاوکـردەوە. بـەهۆی زیندانیکردنو کوشتنی ژمارەیەك لـە کادرانی (حیزبی دیموکراتی کوردستان)ی ئێـران گـەورەترین زیـانی پێگەیشـتەوەو ناچـاربوو، لـە ئەیلـەلی سـاڵی ۱۹۷۲ بەبەستنی کۆنگرەی سێهەمیو هەڵبژاردنی سەرکردایەتیەکی نوێو داڕشـتنەوەی بەرنامەیەکی کاراتر.. جگە لەوەیش کۆنگرە بڕیاری دا لەسەر.

- دیموکراتی بۆ ئێرانو ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان.

- دیاریکردنی سنووری سروشتی کوردستانی ئێران، لەگـەڵ پـێش چاوگرتنی هۆکارە مێژوویيو جوگرافيو ئابووریەکان.

- خوێندنو فێربوونی زمانی کوردی شانبەشانی زمانی فارسی.

راسـپاردەکانی کـۆنگرە دووپـاتی دەکەنـەوە، ئامانجـە هاوبەشـەکانی نێـوان پـارتیو پارتـەکانی دیکـە، دەسـتەبەرکەری ڕووخانـدنی دەسـەڵاتی شـای ئێـرانو کۆتایی هێنانە بەکلتووری ئیمپریالیزميو دامەزراندنی حکومەتێکی نیشتیمانی. لەمـەودای هەماهـەنگیو هاوکـاری بـەرەی یـەکگرتووی ئێـران ڕێکخراوەکـانی فیداکارانی گەلی ئێرانو ڕێکخراوی خەباتکەرانو موجاهیدی خەڵك و ژمارەیەکی دیکەی ڕێکخـراوە سیاسیەکان پشتیوانی تـەواوی خۆیـان لـە خـەباتی گـەلی کورد

دووپاتکردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا بەهۆی نهێنی کاری سیاسیو سنوردار کردنی چالاکییەکانیان هەندێ سستیو لاوازی رووی تێ کردبوون، روودانی مانگرتنو پشێویو راپەڕینی جەماوەری دژبە دەسەلاتی شاو بەشداریکردنی کوردەکان تیایداڕوو بەڕووی توندو تیژترین پەلاماری دڕندانەی هێزە ئێرانییەکان بوونەوەو جارێکی تر حکومەت کەوتەوە راوەدوونانی کادرانی پارتە کوردیەکانو زیندانی کردنیان، دیسانەوە لێپرسراوانو کادرانی پارتی بەناچاری ئێرانیان بەجێ هێشتەوە. ئەو سەردەمە مۆرکردنی رێککەوتنی ١٦ ی ئازاری ١٩٧٥ ی جەزایری نێوان شای ئێرانو سەدام حسەین ی جێگری سەرۆکی ئەوکاتەی عێراق هۆکارێکی کاریگەر بوو لە فشارخستنە سەر کوردەکانی ئێرانو کوردەکانی عێراق، لە ئاکامی ئەو رێککەوتنەدا شای ئێران کۆتایی هێنا بە یارمەتیدانو پشتیوانیکردنی شۆڕشی کوردەکانی عێراق، بەرانبەر بەوەیش کوردە پەنابەرەکانی ئێران لە عێراق بەرەو ئێران دەرکرانو جارێکی تر کەوتنەوە بەر شالاوی گرتنو ئەشکەنجەو ئازاری دەزگا داپڵۆسینەرەکانی ساواك، هاوکات لەگەڵ قەدەغەکردنی تەواوی چاپەمەنیو نووسینو دانراوە کوردیەکانو فشارخستنە سەر مامۆستایانی قوتابخانەکان لە ناوچەکانی کوردستاندا تەنها بە زمانی فارسی قسەلەگەڵ قوتابیاندا بکرێت، کە ئەوە هێمایەکی راستەوخۆ بوو لە قەدەغەکردنی زمانی کوردی، جگە لەوە لە دامەزراوە فەرمیو بەڕێوەبەرایەتیەکانو ئیدارەکانی دەوڵەتیدا، لەبەرکردنی جلو بەرگی کوردی قەدەغەکرابوو، بەرایبکردنو جێ بەجێکردنی ئەو کارانە سەرانسەری کوردستانی ئێران کەوتە ژێر نوێترین جۆری چەوساندنەوەو سەرکوتکردن. لە بازنەی خۆپیشاندانەکانی ساڵی ١٩٧٨ هەروەك داواکاری رووخاندنی شا تەواوی ئێرانی گرتبوویەوە، هەمانشێوە کوردستانیشی گرتەوە.

کەسایەتی دیارو ناسراوی بزووتنەوەی کورد (عەزیز یوسفی) دوای گوزەراندنی چارەکە سەدەیەك لە زیندانو لە پشتی دەرگای ئاسندا مردو

ـورصمی بـەخاك سـپاردنی لاشـەکەی وەرگـەڕا بـۆ خۆپیشـاندانی نـاڕەزایی‌و تووڕەیی کوردەکان دژبـەو سیاسـەتە چـەوت‌و ناڕەوایـەی شـای سـتەمکار. لەگـەڵ ڕووبەڕوو بوو ـەوەو سـەرکوتکردنی دەسـتەجەمعی جـەماوەری ڕاپـەڕیو، دەزگـای سـیخوڕی سـاواك هەڵسـا بەدەسـگیرکردنی ژمارەیـەکی زۆری خـەڵکی کـوردو تونندکردنیان لە گرتووخانە بەدناوەکەی (ڕەزائیە - ورمێ).. ئەو کردەوە ناڕەوایە زیاتر هاندەری جەماوەری ستەمدیدەی کوردی ئێران بوو لـە سـەرخۆڕاگرتن‌و لـە خۆڕاگرتن‌و لـە ئزووستانی پیاوانی ساواك و هێزە سـەرکوتکەرەکانی دیکـەی حکومـەت‌و زیاتر شلەژاندنی بارودۆخەکەو فراوانبوونی تـەنگو چەڵەمەکان. لـە تشرینی یەکـەمی هەمانسالدا لـە ژێـر پاڵە پەستۆی تـووڕەیی‌و ئاڵۆزی زیـاتری کۆمـەلانی خـەڵکی شۆڕشگێڕ زۆربەی دەرگای گرتووخانەو زیندانە بـەدناوەکانی ئێـران خرانـە سـەر پشت‌و زینـدانیکراوان دەرچـوونە دەرەوە. لـە ئاسـتی تـووڕەیی وفشاری تێکـڕای گەلانی ئێرانیدا، سـەرۆکی حکومـەت شـەریف ئیمامی ئازادی کـارکردنی پارتـە سیاسیەکانی ڕاگەیاند. لێـرەوە هـەلێکی وا ڕە خسا، (ح.د.ك)ی ئێـران بکەوێتـەوە چاکسازی‌و ڕێکخستنەوەی ڕیزەکانی‌و کادرانی دەرەوەی بـۆ ناوخـاکی کوردستان گەڕاندەوە. لە هەوڵێکی تری حکومەت‌و ڕێگری لەسەر هەڵدانـەوەی بزووتنـەوەی کـورد، دەزگاکـانی هەواڵـگری سـاواك لـە هەڵمـەتێکی گشتگیردا ژمارەیـەکی لـە کوردەکان دەسگیرکردو زۆربەی شارەکانیشی خستە ژێر پەستانی سیخوڕانییەوە.

لـە ڕاسـتیدا ئـەو هەڵمەتـەو هەڵمەتـەکانی دواتـریش کاریـان نـەکردە سـەر خەڵکی ڕاپەڕیوو شۆڕشگێڕی کوردستان کاتێك کە سایەتی ئـایینی مـەزنی ئێـران (ئایـەتوڵا خومـەینی) نیشتەجێی ئـەو سـەردەمەی فەرەنسا، چـەندین جـار لـەو نامانەدا ئاراستەی گەلی چەوساوەو ستەمدیدەی ئێرانی دەکـردن پشتیوانی خۆی لەگـەلی کـورد ڕادەگەیانـدو ڕۆڵـی کـوردو کەمایەتیـەکانی دیکـەی لەسـەرکەوتنی شۆڕشدا بەرز دەنرخاند. لەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕش‌و بالادەستی پیـاوانی ئـایینی شیعەمەزەب لـە دەسـەلاتی نوێـدا، هـەرزوو ڕۆڵـی کـوردو کەمایەتیـەکانی ئێـران

فەرامۆش کراو لە نرخ و بەهای خەبات و تێکۆشانیان کەمکرایەوە. ئەو پیاوانەی لەسەرەتاوە هێشتا دەسەڵاتیان جێگیر نەبوو بوو بە شارەزاییەکی پڕلە فروفێڵ وتەڵەکە بازی لەگەڵ بزووتنەوەی کوردەکاندا پەیوەندیەکانیان هێشتبوویەوە، بێئەوەی هیچ بەرنامەیەکی چارەسەرکردنی کێشەی کوردیان لەبەردەستدابێت..

لە کۆتاییدا ئەوەبووە هۆی ئاڵۆزبوون و تێکچوونی یەکجاری بارو دۆخی سیاسی ناوچەی کوردستان. تیۆری ئیسلامی و پەیڕەوکردنی لەلایەن کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە لەسەر بنەڕەتی نەتەوایەتی ئیسلامی (الأمة الأسلامية)یەوە بەرپادەکرێت، بەو پرنسیپەی باوەڕی بنەڕەتی کۆماری ئیسلامی لەسەر بنیادنراوە، کە ئایین لە هۆزو رەگەزو نەتەوەو نیشتیمان و دەوڵەتیش بەرزترو پیرۆزترە. لەو سۆنگەیەوە رژێمی ئیسلامی تاوانی یاخیبوون و جیاخوازی دەدایە پاڵ بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردو سەراپای بزووتنەوەکانی گەلانی ئێران و بەهەرە شەیان دادەنان لەسەر یەکێتی دەوڵەت، بەو بیانوانەوە رژێمی نوێی ئایینی داخوازیەکانی کوردی پشتگوێ خست و تاوانی دوژمنایەتیکردنی دەوڵەتی دایە پاڵیان[٩] لەسەرەتاوە کوردەکان بە هیوابوون حکومەتی ئیسلامی داخوازیەکانیان لە چواچێوەی ئۆتۆنۆمی کوردستانی ئێران جێ بەجێ بکات، بەڵام زۆری نەخایاند بێ هیوایی رووی تێکردن پاش ئەوەی لەوەگەیشتن یاسای بنەڕەتی دەوڵەت دەستووری ساڵی١٩٧٩ هیچ ئاماژەیەکی بە مافی کەمایەتیەکانی ئێران نەکردوە، لەکاتێکدا کەمایەتیەکانی کوردو ئازەری و تورکمان و عەرەب زیاتر لە نیوەی دانیشتوانی ئێران پێکدێنن.

دوای بێهیوابوون لە وەڵامدانەوەی کۆماری ئیسلامی، جارێکی تر کوردەکان چەکیان بەرووی رژێمدا بەرزکردەوەو لە بەهاری ١٩٧٩ دا رووبەرێکی فراوانی کوردستانیان خستە ژێردەسەڵاتیانەوە، بەتایبەتی وەختێک دیان ناکۆکیەکانی

---

[٩] حیزبی دیموکراتی کوردستانی ناوزەدە دەکردبە (ضد انقلاب) واتە دژە شۆڕش. و.ك.

ـوەن بیاوانی نـاو دامـەزراوەی دەسـەلات لەپەرەسـەندندایەو لاوازیـەكی بەرچاو ڕووی لێناون.زۆربەی شارە گەورەكانیان لەدەسەلاتی ڕژێمـی مـەزەبی رزگـار كـرد. ـبزووتنـەوەی كـورد لـە پـێش هەموانـدا (ح. د.ك) دەسـەلاتی (ئۆتۆنـۆمی) یـان ـناوچەكەدا راگەیانـدو زۆربـەی بەڕێوەبەرایەتیـە گرنگـەكانی خزمـەتگوزاریان ـدەستەوەكارو ئێسگەی كـوردی كەوتـە پەخشـكردنەوەی بەرنامـەكانی.. حیزبـی دیموكرات دروشمی (دیموكراتی بۆ ئێران و ئۆتۆنۆمی بۆ كوردستان)ی بـە بـەرزی هێشتەوەو دەقی یاسایی ئۆتۆنۆمی دارشت كە بریتی بوو لە:

١ - پێویستە ئۆتۆنۆمی وەك مافی نەتەوایەتی گەلی كورد لەدوو توێی یاسادا تۆماربكرێت.

٢ - لەسـەر خواستی دانیشـتوانی ناوچـە كـورد نشـینەكان، لەگـەل لەبـەر چاوگرتنی هۆكارە مێژوویی و جوگرافیەكان سنووری كوردستان دیاری بكرێت.

٣ - هەڵبـژاردنی ئەنجومـەنی گشـتی لەلایـەن دانیشـتوانی كوردسـتان و بڕیـاردانی دەسـەلاتی ئۆتۆنـۆمی و دامەزرانـدنی ئیـدارەكانی خۆجێیـەتی لەناوچەكەدا.

٤ - بـە فـەرمی ناسـاندنی زمـانی كـوردی شانبەشـانی زمـانی فارسـی لـە كوردستاندا.

٥ - بەڕێوەبردنی كاروباری ناوخۆو دەزگاكانی پۆلیس و ئاسایش لە ژێـر چاو دێری دەسەلاتی ئۆتۆنۆمیدا[10].

لە ئاستی ئەم بەجێهێنان و راییكردنەدا ڕژێمی كۆمـاری ئیسلامی فەرمانیـدا بە سڕینەوەی تەواوی ئـەم دام و دەزگایانـەی بزووتنـەوەی كـورد لـە چوارچێوەی ئۆتۆنـۆمی دا بـەرپای كردبـوون.. بـۆجێ بـەجێكردنی فەرمانەكـەی هێـزە چەكدارەكانی كۆ كـردەوە بـەنیازی پـەلاماردانی ناوچـەی كوردسـتان و دامـاڵینی كوردەكان لەچەك و هەڵوەشـاندنەوەی دەزگاكـانی ئاسـایش و پۆلیسـی كـورد، بـەلام

---

(10) ڕۆژنامەی (كەیهان)ی تارانی٢/٤/١٩٧٩

دەستەکانی سوپای رزگاری کوردستان زۆر بەتوندی بەرپەرچی پەلامارەکانیان دایەوەو لەگەڵ شکست پێهێنانیاندا زیانێکی فراوانیان بە هێزەکانی ئێران گەیاند رووداونی شەڕی کوردو حکومەتو سوپای پاسداران لەلایەکی ترەوە، هەمانکات دەرئەنجامی شەڕی شارە گەورەکانی مەهابادو سنەو بۆکانو بانەو سەردەشتو ورمێ وکامیەران لەگەڵ خراپ شکانەوەیاندا، ئەنجومەنی خۆجێیەتی شۆڕشی ئیسلامی مەریوانیش وەدەرنرا. لەگەڵ دەرهاویشتەو ئاکامەکاندا، دەرئەنجامی ئەم کارەساتانە گفتوگۆی بێ ئاکامی نێوان شۆڕشی ئیسلامیو بزووتنەوەی کوردی لێکەوتەوە. هەر لەو سەردەمەدا کۆماری ئیسلامی نیازە خراپەکانی بۆ نەشارانەوە، سەرەتا دەستی دایە دژایەتیو بەربەرەکانێکردنو تاوانبارکردنی بزووتنەوەی کوردو پەلاماردانی شارەکانو گرتنو زینداینکردنی خەڵکانی بێ تاوان.. ئەو هەڵوێستە بووە هۆی سازدانی خۆپیشاندان لەسەرانسەری کوردستانو رووداونی شەڕێکی سەخت، کەتیایدا هێزەکانی کۆماری ئیسلامی لە ئەیلوولی ۱۹۷۹ چەندین فڕۆکەی جۆری فانتۆمو کۆپراو تانگو زرێپۆشو مووشەکی ئاراستەکراوو هەموو جۆرە چەکێکی سەنگینیان بەکارهێنا. لەو هەلو مەرجەدا سەرکردایەتی بزووتنەوەی کورد بەتایبەتی (د.عەبدولڕەحمان قاسملو- سکرتێری ح. د. ك - ئێران)و سەرجەمی جەنگاوەرانی کورد پەنایان بردەوە بە شاخەکانی کوردستانی هاوڕێی دێرینو پشتو پەنای راستەقینەیان.. سەختی بارو دۆخو شەڕی چارەنووس ساز جارێکی دیکە بزووتنەوەکەی توشی زیانێکی فراوانکردو دانیشتوانی شارو شارۆچکەکان لە ترسی دادگاییکردنی هەرەمەکیو بێ سەرو بەرەیی دادگاکانی ئینقیلابی ئیسلامی حاڵو ماڵیان جێ هێشتو بە کۆمەڵو رێگای شاخە سەختەکانو گوندە دوورە دەستەکانیان گرتە پێش[11]. لە لێدوانێکی بۆ رۆژنامەی (لیبراسیۆن)ی فەرەنسی د. عەبدولڕەحمان قاسملو

---

[11] بۆ ئەم مەبەستە دوو خوێنەری وەکو (خاڵخاڵی و چەمران) خرانە کەمر. و.ك.

دەڵێت: لە ئێستادا ئێمە ئامادەی شەڕی پارتیزانی درێژخایەنین، تاسەرکەوتنی یەکجاریو گەیشتن بەدیموکراتیو ئۆتۆنۆمیو هاتنەدی تەواوی ئامانجەکانمان درێژە بە خەباتمان دەدەین.

لە پێناوی هەمان مەبەستدا رابەری ئایینی (شێخ عیزەدین حسەینی) دژبە هێزە سەربازیەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە کوردستاندا جیهادی ڕاگەیاند. ئاڵۆزبوونی زیاتری بارو دۆخەکەو پەرەسەندنی ئاگری شەڕەکەو کاریگەری لەسەر کوردو حکومەتیش لە چەندلایەکەوە دەنگی چارەسەری کێشەکە بەرزبوویەوەو جارێکی ترو بەنهێنیو بەبەشداری سکرتێری یەکێتی نیشتیمانی کوردستانی عێراق (جەلال تاڵەبانی) نوێنەرانی کۆماری ئیسلامیو بزووتنەوەی کورد لەسەر مێزی گفتوگۆ کۆبوونەوە، بەوە ماوەیەك ئارامی وئاسایش باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشا. جێی داخە ئەو ڕەوشە ئەوەندەی نەخایاند، وەك دەست پێشخەریەك لە ئاڵۆزکردنو شێواندنەوەی بارو دۆخەکە، چەند کەسایەتیەکی توندڕەوی ئایینی ناو حکومەتی کۆماری ئیسلامی کەوتنە هەڵوێستی هەڕەشە ئامێز لە کوردو شۆڕشو رابەرانی. لەگەڵ بەردەوامبوونی هەوڵەکانی لایەنی کورد بە درێژەدانی گفتوگۆکانو راگرتنو هێشتنەوەی بارو دۆخی ئاشتیو ئارامی لەناوچەکەدا، نوێنەرانی کۆماری ئیسلامی کشانەوە.

ئەوە بوو لە ئابی ١٩٨٠ (ح.د.ك) نامەیەکی ئاراستەی سەرۆکی ئەوکاتەی ئێران (ئەبولحەسەن بەنی سەدر) کرد.. لە جیاتی ڕاکێشانی دەستی ئاشتی، بەم جۆرە وەڵامی دایەوەو وتی: ئەگەر کوردەکان خوازیاری ئۆتۆنۆمی دەبن لە چواچێوەی ئێراندا دەبێ لە بازنەی ئایدیۆلۆژییەتی کۆماری ئیسلامی دەرنەچنو پێش هەموو شتێك ئیسلامبوونی خۆیان بسەلمێنن[١٢] چۆن دەکرێت ئۆتۆنۆمی

---

[١٢] دوژمنانی کورد فارس بێت یان تورك یان عەرەب، لە ئاستی کورد یەك ئایدیۆلۆجیا دەگرنە پێش، ئەوەتا لە سەرەتای بەشی تورکیای ئەم نووسینەدا سەرۆك وەزیرانی تورکیا (عیسمەت ئینۆنۆ) هەمان قەوانی سەرۆکی ئێران لێدەداتەوە. و.ك.

بەکۆمەڵگایەك ببەخشرێت پابەندی یاساکانی ئیسلام نەبێت.

لە وەڵامەکەیدا سەرۆکی ئێران بەهەموو شێوەیەك دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستانی ڕەتکردەوە، بەڵام دەرخستنی رای خۆیو رژێمەکەی لە ئاستی جێ بە جێکردنی جۆرە دەسەڵاتێکی-لامەرکەزی-وەك پرۆژەیەك خستە بەردەستی لێپرسراوانی بزوتنەوەی کورد، کەئەویش جۆرێك بوو لەخۆبەدەستەوەدان. شکستی گفتوگۆو ڕتکردنەوەی داخوازیەکانو هەڵوسانی کێشەکانی ناوخۆی دەسەڵاتو سەرهەڵدانی ناکۆکی نێوان نوخبەی دەسەڵاتداری ئێرانو ناکۆکیو گیروگرفتەسیاسیەکانی نێوان کۆماری ئیسلامیو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا،هەموو ئەمانە هۆکاری دروستبوونی درزبوون لەریزەکانی (ح.د.ك)و دابەشبوونی بۆ چەندرەوتێك بەرابەرایەتی (د. قاسملو) کەچڕکردنەوەی خەباتی لە پێناوی بەدیهێنانی ئۆتۆنۆمیدا بوو.. هەمان کات رەوتێکی دیکە لەسەر ئەو رایەبوو، دەکرێت بە پێی ئایدیۆلۆجیای ئیسلامی گۆڕانکاری لە داخوازیەکاندا بکرێت.. تەنها ئەم بۆچوونە هۆکار بوو لە جیابوونەوەی ئەم رەوتە وەك باڵێك لە (ح.د.ك)و هەڵگرتنی ناوی لایەنگرانی کۆنگرەی چوارەمی پارتی. بێگومان ئەم دابشبوونو ناکۆکیە تا ئاستێکی دیار بزووتنەوەی کوردی ئێرانی بەرەولاوازی بردو هەلی خۆگوڕجکردنەوەی لە پێش حکومەتی ئێراندا رەخساند زیاتر پەرە بدات بە کردەوە سەربازیەکانی لە ناوچەکەدا. ئەوەبوو لە تەموزی ١٩٨٠ یەکە سەربازیەکانی لە چەندین قۆڵەوە هێرشیان کردە سەر شارەکانی کوردستان.. ئەویش هاوکات بوو لەگەڵ هەڵمەتەکانی گرتنو زیندانی کردنو ئەشکەنجەدانو لە سێدارەدانی کادرە کوردەکان. هەڵگیرسانی شەڕی عێراقو ئێران، کۆماری ئیسلامی روویکردە گرنگیدانو بەهێزکردنی بەرەی ناوخۆو جارێکی تر ناچار بوو بە گەڕانەوە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ شۆڕشی کوردا، بەو نیازەوە پێشنیاری کرد هێزە جەنگاوەرەکانی

ـرووتنـەوەی کوردایـەتی شانبەشـانی سـوپای ئێـران لـە شـەری دژ بـە عێـراق ـحندری بکـەن. کوردەکـان لەلایـەن خۆیانـەوە زۆر زوو لـەوە گەیشـتبوون ئێـران ـیـەوێت داواکاریـەکانیان جێبـەجێ بکـات، بـەو هۆیـەوە پێشنیارەکەیان گێرایـە ـوەو ئـەمجارە هەڵوێستەکە تونـدتر بوویـەوەو شـەرێکی خوێنـاوی سـەخت لـە کوردستان بەرپاکرایـەوە. کوردەکـان سـێ بەرانبـەر شـەری نێـوان هـەردوو وڵاتـی ـاگیرکـەری کوردسـتان هەڵوێسـتی خۆیـان دیـاریکردو، لەولایەنـەوە (د.قـاسملو) ـەڵێت: ئێمە لـە نـاکۆکیو شـەری عێـراقو ئێـران هـیچ بەرژەوەندیـەکمان نییـەو ـاکۆکیش لە رژێمێکی پێکهاتوو لە پیاوانی ئایینیو مەزهـەبی دژ بـە گەلەکـەمان ـاکـەینو ناشمانـەوێت بـەرگری لـە دەوڵـەتێکی رەگـەز پەرسـتی شـۆڤینیزمی زلهێزیش بکەینو بەردەوامیش دەبین لە دژایەتیکردنی ئیمپریـالیزم.. سیاسـەتی جێگیری دژبە ئیمپریالیزم سیاسەتێکە پێش هـەموو شـتێك پارێزگـاری لـە مـافی گەلی کورد بکات، نەك خەڵکی بە بارمتە بگرێت، رژێمێك سەرەتاترین مافـەکانی گەلانی ئێران پێشێل بکات، بێگومان رژێمێکی شۆرشگێر نابێت.

لە کانوونی دووەمی ١٩٨١ شەری نێوان عێراقو ئێران گەیشتبوویە چڵەپۆپە. هەر لەو کاتەدا بوو رژێمی کۆماری ئیسلامی بەنیازی سـەرکوتکردنی کـورد هێـزە سـەربازیەکانی نـاردە ناوچـەی کوردسـتان، بـێ گەیشـتنە ئەنجامـدانی کارەکانیـان دیسـانەوە کەوتـەوە نەوازشـکردنو دڵدانـەوەی کوردەکـانو رازیکردنیـانو راکێشـانیان بـەهاوکاریکردنیان لـە شـەری دژ بـەعێراق. پـاش تـاووتووکردنی هەڵوێستی نوێی کۆمـاری ئیسلامی، بزووتنـەوە داخوازیەکـەی بەجێبـەجێکردنی ئۆتۆنـۆمی کوردسـتانەوە گرێـدا. لـە راسـتیدا سـتراتیژییەتی ئێـرانو بەرنامـەو رێـرەوی ئـایینیو مەزهـەبی راشکاوانە رێگربـوو لـە پـێش هـەر جـۆرە سازشـێك لەگەڵ بزووتنـەوەی رزگـاریخوازی کـورددا.. بۆیـە لـە ئامادەکاری سـەربازی دژبـە خـەڵکی کوردسـتان بـێ هـیچ رووگیریـەکی ئـایینیو نیشـتیمانی، کەوتـە کـارو لـە حوزەیرانی ١٩٨٢ دا توانی بزووتنەوەکە گۆشەگیر بکاتو ماوەی زیاتر لە دوو سەد

کیلۆمەتری سنووری بەرانبەر بە عێراق‌و تەواوی ڕێگا سەرەکی‌و گشتیەکانی کوردستان بخاتەوە ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی‌و لە ڕێی دارشتنی ستراتیژییەتێکی تایبەتەوە زۆر بە چڕی گوڕوتینی دایە بانگەشەکانی دژبە شۆڕشی گەلی کوردو بزووتنەوە رزگاریخوازەکەی. نکوولی لەوە ناکرێت ئەم نەخشە نوێیەی ئێران کوردەکانی تووشی پەژارەی سەختکرد، بەتایبەتی بانگەشەکانی چاکسازیکردن لە بوارەکانی ڕۆشنبیری‌و ئابووری‌و خزمەتگوزاریەکان لەناوچەکەداو گۆڕانکاری لە گوتارەکانی راگەیاندن، جیا لە گوتارەکانی جارانی، لەو تێڕوانینەوە رابەرانی کوردی بەهاوی بێگانەو خۆ گریدانیان بە عێراقەوە دژ بەکۆماری ئیسلامی خەتابارکرد، زۆر بە ئاسانی ئێران کرۆکی بانگەشەکانی خۆی لە کوردستاندا کردە گورزێکی کوشندە لە لێدان‌و لاوازکردنی هێزەکانی شۆڕشی کورد.

دەسەڵاتدارانی تاران بەوەشەوە نەگیرسانەوە، لە ئەیلوولی ١٩٨٤ بە نیازی تەواو پاکسازیکردنی کوردستان زیاتر هێزە سەربازیەکانی یەکخستەوەو ناردینەوە ناوچەکە. لەگەڵ دەسپێکردنەوەو بەردەوامبوونی هێرشە سەربازیەکانی دژ بە شۆڕشگێڕانی کورد، بەهاری ١٩٨٥ حکومەت کەوتە هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەکی نوێی کێشەی کوردو ناردنی نوێنەرانی بۆ ناوچەکە. رازی نەبوونی (پ. د. ك) بەدانان‌و وەلاخستنی چەك لەسەر پێشنیاری کۆماری ئیسلامی ئێران هۆکاری پووچەلکردنەوەی هەوڵەکان‌و جارێکی تر پێشکەشکردنی داخوازیەکانی کوردبوو بە جێبەجێکردنی پرۆژەی ئۆتۆنۆمی هەرێمی کوردستانی ئێران بەحکومەتەو سەردەمە (ح. د.ك)ی ئێران تاکە هێزی ناوخۆی کوردستان بوو، هەڵسا بە کۆکردنەوەو یەکخستنی هێزە سیاسی‌و پارت‌و توخمە سەرەکیەکانی ناو خۆی کوردستان‌و ئێران‌و کۆکردنەوەیان لەبەرەیەکی یەکگرتوودا دژبە دەسەڵاتی کۆماری ئیسلامی. لەگەڵ ئەم کردەوەیەشدا (ح. د. ك) هەڵسابە دامەزراندنی ئەنجومەنی ناوچەکان بە نیازی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری‌و ڕاپەڕاندنی کارەکانی خەڵکی. ئاشکرایە دیدگای

ـیینی رەگەزی مەلاکانی شیعە مەزەبی ناو دامەزراوەی کۆماری ئسلامی هۆکارو پشتیوانی بە هێزی رەوشی سەرکوتکردنی کوردو زیاتر خۆ سەپاندن بە سەر کوردستاندا بوونو پاڵنەری سەرەکی ئەو هەموو ستەمە بوون هێزەکانی رژێمەکەیان ئەنجامیان دەداو بوونە هۆکاری ناساندنو لاوازکردنی چالاکییە شۆڕشگێڕیەکانی جەنگاوەرانی کورد. دوابەدوای کۆتایی هاتنی شەڕی نێوان عێراقو ئێران لە تەمموزی ١٩٨٨و لەسەرەتای نەوەدەکاندا حکومەتی ئێران بەنیازی ئەنجامدانی گفتوگۆ لەگەڵ رابەرانی بزووتنەوەی کورددا هەوڵەکانی چڕکردەوە.. ئەوە بوو لە ئەنجامدا لە میوانخانەیەکی ڤییەننا ی پایتەختی نەمسا لەگەڵ) د. عەبدولڕەحمان قاسملو کۆبوونەوەو لە گەرمەی لەیەك نزیکبوونەوەو کۆتایهێنان بە دانیشتنەکە قاسملو درایە بەر رێژنەی گوللە وتیرۆرکرا، دواتر هەموو بەڵگەکان ئاماژەیان بە دەزگای هەواڵگری (الأطلاعات)ی ئێران دەکرد کە لە پشتی کردەوەکەوە بووە. بەکوشتنو لەناوبردنی رابەری بەتوانای کوردو چەند هۆکارێکی دیکە جارێکی تر بزووتنەوەی کورد لە ئێراندا لە پەخچاڵی سیاسەتو سەربازیدا سڕکرایەوە، هەرچەند ماوە درێژخایەن یان کورت خایەن بێت هەلو مەرجی لەبار دەستەبەرکەری سەر لەنوێ سەر هەڵدانەوەو بەتینکردنییەتی.

## سێیەم: کوردەکانی سوریا

کۆمەڵێك پارتو ریکخراوی سوریا لە دەرەوەی وڵات، یادداشتێکیان دایە پەرلەمانو وەزارەتی دەرەوەی ئەلمانیا – تیایدا هاتووە:

(سەرنجی بەڕێزتان رادەکێشین بۆ بارو دۆخی سەختو نەوسیاسەتە چەوتەی دژ بە گەلی کورد لەو پارچە کوردستانەی بە سوریا وەگرێدراوەو پەیڕەو دەکرێت. ئەمە پەیڤە هەڵگری تەنها مانایەکە، ئەوە ناگەیەنێت هەر لە بنەڕەتەوە بەشێك بووبێت لەدەوڵەتی سوریاو جیابوونەوەی ئەستەم بێت، بەڵکو

بە زۆرداریو دوور لە ویستی گەلەکەی بەو وڵاتو دەوڵەتەوە گرێدراوە). یاد داشتەکە زیاتر داخوازیە لە پەرلەمانو حکومەتی ئەلمانیا فشاربخاتە سەر ڕژێمی سوریاو فایلکردنی بەچارەسەرکردنی کێشەی کورد لە ڕێی ئاشتیو وتووێژەوە، کە لەگەڵ گیانی سەردەمدابگونجێتو لەگەڵ یاساکانی مافی مرۆڤو پەیمانە نێو دەوڵەتیەکاندا یەکانگیربێت. لەیاد داشتەکەیاندا پارتو ڕێکخراوەکان، باس لەستەمکاریو گرتنو زیندانیکردنی نایاساییو ئەشکەنجەدانو کوشتنی کوردەکان دەکاتو بەم جۆرە باروو دۆخەکەیان پێش چاوخستووە،

- دیدگای دەستەو تاقمە ڕەگەز پەرستەکانی پشتیوانیکەری هەوڵەکانی سڕینەوەی ناسنامەی نەتەوایەتی گەلی کورد لە سوریا، لە وتەیەکی (میشێل عەفلەق) دامەزرێنەری بەعس بە ڕوونی دەردەکەوێت کە دەڵێت: کارو کردەوەی نەتەوایەتی بە جۆرێك شیاوی سەرکەوتنە، ڕەقو کینە بەرانبەر بە کەسانێك هەڵگری بیرو بۆ چوونی پێچەوانەی بیرو بۆچوونی نەتەوەکەمان بێت، لەم حاڵەتەدا پشت گوێخستنو پەراوێزخستنی واقعی کوردەکانە لەبیرو هۆشو هزری عەرەبو حکومەتەکانیشیاندا.

- گۆڕانکاریکردنی بنەڕەتی تەواوی دیاردەو ڕواڵەتە جوگرافیەکانی ناوچەکە، لەڕێی جێ بەجێکردنی چەند پرۆژەیەکەوە وەك:

أ - پرۆژەی دامەزراندنی بازنەیەکی عەرەب نیشتەجێکردن بە درێژایی دووسەدو پەنجا کیلۆ مەترو پانی دەتا پانزە کیلۆمەترو ناو بنرێت کێڵگە کشتوکاڵیەکانی دەوڵەت.

ب - ڕاستکردنەوەی یاسای سەرژمێری ناکاوی ساڵی ١٩٦٢ ی پارێزگای حەسەکەی زۆرینە کورد، کەلە دەرەنجامیدا نزیکەی سەدوو پەنجا هەزار کوردی سوریا لە ڕەگەزنامە بێبەشکراونو نازناوی (شاراوە)کانیان بەسەردا سەپێنراوە.

* کارکردن لەسەرتواندنەوەی گەلی کورد لە سوریا لە بۆتەی نەتەوایەتی عەرەبدا. کە ئێستا ژمارەیان لە نیوملیۆن زیاترە.

کە ئێستا ژمارەیـان گەیشـتووەتە چارەکە ملیۆنێـك یادداشـتەکە بـاس لـە بێبەشکردنی دوو سەدو پەنجا هەزار کورد دەکات لە مافی هاولاتیبوون‌و لەو کارە نەنجامدراوانـە دەکـات لـە لایـەن دەسـەڵاتدارانی رژێمەکـەوە راییکـراون، وەك لای خوارەوە دەبینـرێن..

١ - بێبەشـکردنی کوردەکـان لـە مـافی رۆشـنبیری‌و کلتـووری‌و فەرهـەنگی نەتەوایـەتی، لـەرێی بریـاری فەرمیـەوە بـەرێگری کـردن‌و قەدەغـە کردنـی چاپەمەنی‌و بلاوکراوە کوردیەکان وقەدەغەکردنی مۆزیك وگۆرانی کوردی.

٢ - گۆڕینی ناوی کوردی زۆربەی شارەکان ناولێنانیان بەناوی عەرەبی.. وەك

- تەربەی سپی بۆ قحطانیة
- سەری کانی بۆ رأس العین
- گۆیانی بۆ عین العرب
- عەفرین بۆ العروبة

٣- دەرکـردن یـان گواسـتنەوەی زۆر داری‌و ناچاری فەرمانبـەران‌و مووچـە خۆرانی دەوڵەت ودەرکردن‌و بێبەشکردنی قوتابیـانی کـورد لـە زانکـۆو پـەیمانگاو قوتابخانەکان.

٤ - سـەپاندنی سیاسـەتی بەبەعسـی کـردن لـە شاروشارۆچـکە کـورد نیشنەکانداو بەزۆر رێکخستنیان لە رێکخراوەکانی پارتی بەعسدا.

٥ - بەردەوامی رژێم لە جێ بەجێکردنی سیاسـەتی نیشتەجێکردنی عـەرەب لە چوارچێوەی بازنەی عەرەبیدا.

٦ - گـرتن‌و زینـدانیکردنی ناهـەق‌و نـاڕەوای کوردەکـان بـێ هـیچ بیانوویەك،لەگـەڵ درێژکردنـەوەی ماوەیـەك بـۆ ماوەیـەکی دیکـەی نادیـارو هێشتنەوەیان لەزیندا ندا.

لەگـەڵ ئەمانەشـدا یادداشـتەکە چـەند داواکاریـەکی لـەخۆگرتووە وەك لـە دەقەکەیداهاتووە.

١ - هەڵگرتنی یاساکانی تەنگە تاوی‌و عورفی یەکان‌و دان پێدانی یاسایی بەبوونی کوردو تەواوی مافە نەتەوایەتیەکانیدا.

٢ – هەڵگرتن‌و سڕینەوەی تەواوی پرۆژە ڕەگەز پەرستیەکان.

٣ - هەرچی زووتر ئازادکردنی هەموو زیندانیانی کورد لە گرتووخانەکانی ڕژێمدا.

پێشکەشکارانی یادداشتەکە بریتین لەم پارت‌و ڕێکخراورنەی لای خوارەوە..

١- پارتی یەکێتی کورد- سوریا.

٢- پارتی یەکگرتووی گەلی سوریا.

٣- پارتی چەپی کوردی سوریا.

٤ - پارتی یەکگرتووی دیموکراتی کورد لە سوریا.

گرنگە بەرانبەر بە دەقی یادداشتەکە هەڵوێستە یەك بکەین کە دەڵێت: بەوردبوونەوە لە مەبەستی بنەڕەتی یادداشتەکە،

نەبوونی پەیوەندی بە دەوڵەتی سوریاوە دەبەخشێت‌و هەوڵێکیشە بۆ لێجیابوونەوەی، هەمانکات تەنها داخوازی هاولاتی بوونە لە چوارچێوەی سوریادا. لە ڕوویەکی ترەوە ئەگەری ئەوەیش بەدی دەکرێت داخوازیەکان هەنگاوێك بن بەرەو جیابوونەوە. لەئاستی یاداشتەکەیشدا چەندین وتارو راوبۆچوونی جیاجیای رەخنە ئامێز دەبینرێن‌و هەرکەس‌و لایەنێك شێوازێك دەگرێتە پێش‌و زۆربەی خاڵ‌و برگەکانیشی ڕەتدەکەنەوە.

● لێپرسراوی خانەی پەخشی سەرگون لە سوید شەمعوف دنخۆ لەسەر تۆڕی ئاوارە سەبارەت بە کوردی سوریا لێکۆڵینەوەیەکی دوورو درێژی نووسیوە، لە ژێر سەردێڕی (سوریا لە کۆپیکردنی ئەزموونی کوردەکانی عێراقدایە).. دەڵێت: کوردەکانی سوریا لە هەوڵی ڕەواجپێدانی زاراوەی کوردستان، یان کوردستانی ڕۆژئاوادان، جگە لەوە گازندەی ئەوەیش دەکەن، لەبنەڕەتدا ناوی شاری (رأس العین)ی کوردیە بەناوی (سەرکانی).. لە راستیدا ئەم شارە

سورياييەو لە ئەنجامی راوەدوونانو دەکردنی کوردەکان لەتورکيا، ساڵی ١٩٢٥ بەدواوە وەك پەنابەر روويان لە سورياناوەو لەبەشی باکووری رۆژهەڵاتی نيشتەجێ بوون. نووسەر لە لێکۆڵينەوەکەيدا وتەيەکی عەبدوڵا ئۆجەلان دەکاتە بەڵگەی راستی بۆچوونەکەی کەوتوويە (زۆربەی گەلی کورد لە سوريا بەهۆی بارودۆخی ناهەمواری کوردستانی باکوور هەڵهاتوونو لەسوريا گيرساونەتەوەو نيشتەجێ بوون، کەسانێك بانگەشەی زاراوەی کوردستانی سوريا دەکەن بەنادروستی دەيکەن، ناکرێت بەو شێوازە دەربڕبکرێت، لە راستيدا دەبێ بە کوردەکانی سوريا ناوببرێن.. داخوازی کوردەکان لەو وڵاتە داخوازی ئاسايين وەك مافی رەوای هەرلايەنو هاوڵاتيەکەو لەو راستيەيش جياناکرێتەوە). هەندێ رێکخراوو پارتو کەسايەتی کورد لە هەوڵی شێواندنی مێژووی ئەم وڵاتەدانو دەستيانداوەتە گازندەو هەڵمەتی بەکوردکردنی کۆمەڵگا، بەئامانجی چەواشەکاريکردنی مێژووو گۆڕانکاریو گواستنەوەی وێنەو روخساری دوور لە راستی). لێرەدا لەبڵاوکردنەوەی ئەو ئەندازەيە لەولێکۆڵينەوە دەوەستينو بە سەرنجەوە دەڕوانينە بڕگەکانی.

* ئەگەر بەوردی سەرنج بدەينە ئەو خانەيەو ناوی بەڕێوەبەرەکەیو شێوازی لێکۆڵينەوەکەی، دەزانين نووسەر گاورێکی ئاشووريەو هەر لەسەرەتاوە پێداگرە لەسەر بەعەرەب کردنی ئەو شارانەو، داخوازی کوردەکان لە ئاستياندا بەدرۆ دەخاتەوەو ناوچە کوردنشينەکانيش بەنيشتيمانی بنەڕەتی ئاشووريەکان مەزندەدەکات.

* لێکۆڵەر وتەی ئۆجەلان ی رابەری کوردەکانی تورکيا دەکاتە بەڵگەی راستی داواکەی وەك لەولێدوانانەدا دەرکەوتووە، پێويستە هەلو مەرجی ئەو وتەيە بەوە بەرچاوبخرێت، ئەو سەردەمە ئۆجەلان نيشتەجێی سوريا بووە، تاسەر هەڵدانی رووداوەکانی ١٩٩٩و دەرکردنی لە ديمەشق، ديارە خاکی ئەو وڵاتە لەوسەردەمەدا قووڵايی ستراتيژييەتی بزووتنەوەکەی بووە. لێرەدا پرسياری

لۆژێکی ئەومیە.. بۆتاپێش چەند ساڵێکی کەمی رابردوو، مەسەلەیەکی دیارو ناسراو بە بزووتنەوەی کورد لە سوریا بوونی نەبوو؟.. وە بۆچی لە پڕێکداو دوای داگیرکردنی عێراق دەرکەت؟.. ئایا ئەوە بەیەکەوە گرێدان نییە؟.. لە راستیدا چەندین هۆکاری بابەتی دەبنە وەلآمی ئەم پرسیارانە.

١ - نەبوونی شاخ بەشێوازە تەقلیدیەکەی وەك پشپتیوانێکی سروشتی بۆ بزووتنەوەی کورد لە سوریا، وەك لە تورکیاو ئێران‌و عێراق دەبینرێت.

٢ - نەبوونی شاری گەورەو کاریگەر لەکوردستانی سوریا وەك لە پارچەکانی دیکەی کوردستاندا بەدی دەکرێن.

٣ - بەشێکی زۆری کوردەکانی سوریا پاش کۆتایی هاتنی شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ی (شێخ سەعیدی پیرانی نەقشبەندی)و سەرکوتکردنی لەلایەن حکومەتی تورکیاوە، بەنیازی گەڕان‌و پەیداکردنی ژیانی ئاسوودەیان، بەرەوخاکی کوردستانی سوریا کۆچیانکردووە.

* هەروەها لەسەر شوێنی قامیشلی لە تۆڕی ئەنتەرنێت- شەمعون دنخۆ لە لێکۆڵینەوەیەکی تریدا دەربارەی هەرێمی جەزیرە دەدوێت، کەهەرێمێکی کوردنیشنەو کوردەکان بەنیازن لە پاشەرۆژدا دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆی تیا دابمەزرێنن.. لەوبارەوە دەنووسێت هەرێمی جەزیرە دەکەوێتە نێوان هەردوو رووباری دیجلەو فورات‌و لەنێوان تورکیاو سوریاو عێراقدا دابەش بووەو رووبەرێکی فراوانی نێوان تکریت لە عێراق‌و تاسەر چاوەی رووباری ئەرمینیای تورکیا دەگرێتەوەو تێکەڵاوە لەگەڵ ناوچەکانی ئەرمەنی‌و باشووری، لەرۆژئاواوە سنووری فوراتی مەزن‌و لەرۆژهەلآتەوە ئازەربایجانی ئێران‌و کەرتی کوردستانی رۆژهەلآتی ناوخۆی سنووری ئێرانی نزیك بەشاری سلێمانی وەك بازنەیەك گەمارۆ دراوە. گومان لەوەدانییە وەك راستی مێژوو دووپاتی دەکاتەوە، دواتر کوردەکان لەسەر ئەم بەشەبچووکانەوە پەرمیان سەندووەو بەناوچەکانی جەزیرە دا بلآوبوونەتەوەو تەشەنەیانکردووە. نووسەر لە لێکۆڵینەوەکەیدا پەیوەندی

مێـژوویی وابەسـتەبوونی كوردەكـان بەهـەرێمی جـەزیرە وە دەگێڕێتـە دواوەو دەڵێـت: جـەزیرە بەشـە بـاكووری نێـوان وڵاتـی هـەردوو رووبـاری (بـلاد مـابين النهرين) پێكدەهێنێ، كە لەسەر چاوە ئەغریقیەكانـدا بـە میسۆپۆتامیا ناسـراوەو لەسـەردەمی بڵاوبوونـەوەی دەسـەڵاتی عەرەبـدا نـاوی جـەزیرەی بەسـەردا سەپێنراوە، جگە لەوە هەرێمی باشوور لانكەی بەرپاكردنی شارستانی ئاشووریو كلدانیو سـوریيان بـووە، دیـار ئـەویش ئاماژەیـە بۆمانـای (سـوریا یـان وڵاتـی سـورەییان). نووسـەر بـەردەوام دەبێـتو دەڵێـت: تـا ئـەم سەردەمیشـە زۆربـەی شارەكانی جـەزیرە هەڵـگری نـاوی كـوردی نـینو بەدەگمـەن شـوێنێكی تیابـەدی بكرێت ناوی كـوردی لـە خۆگرتبێـت، دواتـر كوردەكان لەهەرێمەكـەدا نیشتەجێ بوونـوو نـاوی كوردیشیان بەسـەر شـارەكانیدا سـەپاند وەك (ئـەربیل - هـەولێر - دهۆك - زاخۆ - رەها - ئۆرفـە - ئامـەد - دیاربـەكرو ماردینو حـەڕانو سـێرت — سەعرەت -و نوسەیبینی نۆێ — و قامیشلی یـان (ریـش عینـو)و سـەركانی (راس العين)و عاموداو دێر ئەلزورو رەقا. سەبارەت بـەنزیكی هاتنو نیشتەجێبوونی كوردەكـان بـۆ سـەر زەمینـی هـەرێمی جـەزیرە نووسـەر دەڵێـت: پێچـەوانەی بانگەشـەو گازنـدەی لایـەنی كـوردی، عـەرەب پـێش لـە كوردەكـان نیشـتەجێی هەرێمەكـە بـوون.. بـۆ وێنـە شـاری (حـەڕان)ی بـەناوبانگی جـەزیرەی سـەروو، بارەگای هۆزی (بەنی تەغلەب) بـووە، كـە(ئەختـەل)ی شـاعیری نـاوداری عـەرەبی تیـادا هەڵـكەوتووە. دوور لـەو راو بۆچـوونە جیاوازانـەی دەربـارەی كوردەكـانی سوریا هەیە دەڵێن (ئەگـەر رووداوەكانی ٢٠٠٤/٣/١٢ی شـاری قامیشـلی نەبوونایـە، بە دڵنیاییەوە باسو خواسی ناسراو بە مەسەلەی كورد لە سوریا بوونی نەدەبوو، هەر چەند پێشتر لە ناوچەی بـاكووری رۆژهـەڵات لـەو بـارەوە چـەند ئاماژەیـەك دەركەوتن، وەك لە ٢٠٠٢/٦/٢٥ بە هاوكاریو پشتیوانی پارتەكانی یەكێتی میللەتی كوردو یەكبونی كوردو یەكێتی دیموكراتی كوردو پارتیو پارتی چەپی كـورد. لـە رۆژی جیهـانی منالأنـدا نزیكـەی سـێ سـەد منـاڵێكی كـورد لـە پـێش بارەگـای

(یونسێف) لە دیمەشق خۆ پیشاندانێکیان رێکخستو بەزمانی کوردیو عەرەبی چەند درۆشمێکیان بەرز کردبوویەوە، تاچ ئاستێك دەربڕی ئێشو ئازارو گروفتەکانیان بوو بەو ئاستەیش داخوازی گشتی بوون.. وەك (خوێندن بە زمانی دایكو قسەکردنی کوردی لە قوتابخانەکانو سەربەستی بیروڕاو دادپەروەریو بەهێزکردنی گیانی برایەتی نێوان کوردو عەرەب). لە پێناوی گەیاندنی داخوازیەکانیانو دیداری سەرپەرشتیاری لقی رێکخراوی (یونیسێف) لە دیمەشق، خۆپیشاندەران وەك نوێنەر دەستەیەکیان دیاری کرد.

لیژنەی ناوەندی پارتی (یەکێتی کورد) لە بەیاننامەیەکی بلاوکراوەی سەرتۆڕی ئەنتەرنێتو لەسەر شوێنی گۆیانی هاتووە دەلێت: گەلی کورد لە سوریا هاوکارە لەگەلٚ تەواوی پێکهاتە ئەتنییەکانی ناوخۆی ولاتو خۆی بە ئەندامێکی کارای ئەو پێکهاتەیە دەزانێت، هەر لەسەرەتای دامەزراندنی دەولەتی سوریاوە تاکۆتایی پەنجاکانی سەدەی بیستەم زۆربەی سەرۆکی حکومەتەکانو ئەفسەرانی پلە بەرزی سوپا لە نەتەوەو رەگەزی کورد بوون.. لەوانە -عەلی ئەلعابدی- سەرۆکی یەکەم حکومەتی دامەزراوی ولات، یەکێك بوو لەو کوردانە.. کەوایە کێشەکە لەکوێدایە؟ بەیاننامەکە دەلێت: لەگەلٚ دەرکەوتنی هێزی توندڕەویو نەتەوە پەرستی عەرەب، لەسەرەتای پێکهێنانی حکومەتی یەکگرتووی نێوان میسرو سوریا، دەستدرا یە پڕۆژەی پاکسازی نەتەوایەتیو رەگەز پەرستی دژبە ئەفسەرانی کوردی ناو سوپاو دەرکردنیان لەریزەکانیدا، بێگومان جێ بەجێکردنی ئەم هەنگاوە تا ئاستێك بووە هۆی لاواز کردنی رۆلی کورد لە ژیانی سیاسی سوریادا. رووخانو هەرەسهێنانی یەکگرتنەکەی میسرو سوریاو سەردەرهێنانو گەشەکردنی رۆلی پارتی بەعس لەو ولاتە، کارو کردەوەی پاکسازی دژبە کورد زیاتر هەلکشانی بەخۆوە بینی.. سەرەتا لە قۆناغی یەکەم دا رەگەزەکاریگەرەکانی ناو سوپاو دامەزراوە دەولەتیەکان، کەوتنە بەر شالاوی گرتنو دوورخستنەوەو دابڕاندنیان، لە قۆناغی دووەمداو لەکردەوەیەکی تەنگە

تاویدا ساڵی ١٩٦٢ ڕەگەزنامەی سوری لە دەیان هەزار هاووڵاتی کورد داڕنراو ناوی سنووربڕیان لێنرا، کەلە نێوانیانـدا سـەرۆکی پێشووی ئـەرکانی جـەنگ گـەواهی ئەو ڕاستیەیە. هاوکاتی پاکسازی سوپاو بەڕێوەبەرایەتیو دامەزراوە دەوڵەتیەکان جێ بەجێکردنو ڕاییکردنی گۆڕانکاری باری دیموگرافی لە ناوچەکەدا دێتەپێش، دیـارە ئەمانـە هۆکـاری سـەرەکی بـوون لـە دەرکـەوتنی ڕۆڵی کـوردو هەڵبـژاردنی ڕێڕەوی خـەباتی دیمـوکراتیو ئاشـتی خـوازی بـەهیوای گەیشـتن بـە ئامانجـەکان، دوور لە توندو تیژیو کەوتنەوەی ناکۆکی وەك تێبینـی دەکرێت بڵاوکردنـەوەی بەیاننامەکـە ڕازاوەیـە بـە ئـاڵای ڕەنگـاو ڕەنگـی کوردسـتانی گـەورە، بـەڕوونی باسـدەکات لـە سـەپاندنی ڕێـڕەوی ئاشـتی خـوازی پارتـە کوردیـەکان لـە خـەباتی سیاسیاندا. بەپێی دەنگو باسەکانی ئاژانسی ڕۆیتـەر، لـە کـانوونی یەکـەمی ٢٠٠٢ نزیکەی سەدکەسایەتی کورد هەڵسان بە سازدانی ریپیـوانو خۆپیشاندانی ئـارامو لەسـەرخۆ، تیایـدا خوازیـار بـوون چەشـنی عەرەبـەکانی وڵات کوردەکـانیش مافەڕەواکانیان پێ ببەخشرێت، لەو ڕووەوە ئاژانسەکە زیاتر تیشك دەخاتـە سـەر مەسـەلەکەو دەڵێـت: خۆپیشـاندەران لـە پـێش تـەلاری ئەنجومـەنی گـەلی سـوریا کۆبوونەوەو داخوازیەکانیان لەچەند دروشمێکدا بەرز کردبوویەوە، وەك تیایانـدا هاتبوو خوازیارین قەدەغەکردن لەسەر بەکارهێنانی زمانی کوردی هەڵـگیرێت – سـوریا وڵاتـی هەموانـە، لـە عـەرەبو کـوردو کەمایەتیـەکانی دیکـە. هـەروەك خۆپیشاندانەکە لەلایـەن پـارتی یـەکێتی سـوریا وە ڕێکخرابـوو دەسـتەیەك لـە ئەندامانی لەگەڵ سەرۆکی ئەنجومەنی گەل کۆبوونەوەو بەتێروتەسەلی دەسـتەکە لـە چارەسـەرکردنی داخوازیـەکان زیـاتر لەیـەك ملیـۆن کـوردو ئەوکێشـانەی ڕوو بـەڕوویان دەبێتـەوە گفتوگۆیـان کـردو چـاوەڕێی هەرچـی زووتـر وەڵامو جـێ بەجێکردنی داخوازیەکانیان بوون[١٣].

لـە جێـی وەڵامدانـەوەی دروسـتو گرتنـە پێشی شـێوازی دیـالۆگـە لـە ڕۆژی

---

[١٣] سایتی B.B.C لەسەر تۆڕی ئەنتەرنێت.

۲۰۰٤/۲/۱۲ لـە یاریگـای شـارەوانی قامیشـلی یـاریکردنێکی تـۆپی پـێ وەرگـەڕابۆ نـاکۆکیو تونـدو تیـژیو رووبـەڕوو بوونـەوەی نێـوان هاوڵاتیـانی کـوردو هێـزە سـەرکوتکەرەکانی ئاسایشی رژێـم.. ئـەوە هـەلێك بـوو بـۆ بەرزبوونـەوەی دەنگی نـاڕەزاییو هـاواری داخوازیـەکانی گـەلی کـورد. بـەنیازی کۆتـایی هێنـان بەتوندوتیژیو بلاوە پێکردنی جەماوەی راپەڕیو، پۆلیس گازی فرمێسك رێـژو گوللـەی زینـدوویان بـەکارهێنا. کـردەوە نـاڕەواو نابـەجێکانی پـۆلیس زیـاتر خەڵکەکـەی هەژانـدو تـووڕەیی گەیشـتە ئاسـتی بـەرووداتەقینـەوەی پـۆلیسو پەلاماردانی بنکەکانیانو سووتاندنی چەند بنکەو دامەزراوەیەکی حکومی.

رووداوەکانی قامیشلیو شەڕو پێکدادانـەکان بـە گـورجی پـەرەیان سـەندو بـۆ شـارەکانی دیکـە تەشـەنەیانکردو زیـاتر کوردەکـانی هەژانـد.. سـەبارەت بـەو مەسـەلەیە شـوێنی میـدل ئیسـت ئـەون لایـن راپـۆرتێکی ئامـادەکردووەو تیایـداهاتووە دەڵێـت: لێپرسـراوی پـارتێکی کـوردی سـوریا بـە دڵنیاییـەوە وتـی- رۆژانـی هـەینیو شـەممەی پـێش رووداوەکـانی یاریگـای قامیشـلی لـە رووبـەڕوو بوونەوەی نێوان پۆلیسو خۆپیشاندەراندا (۱٤) کەس بەگوللەی پۆلیسو پیاوانی ئاسایش کوژران، کەسێ کەسیان منداڵ بوونو (۱۲٤) کەسی دیکەیش بریندارکران

سـکرتێری پـارتی دیمـوکراتی پێشـکەوتوو خـوازی کـورد لـە سـوریا عەبدولعەزیز داود وتی : رێپێوانو خۆپیشاندانەکانی شاری قامیشلی لە رۆژی شەمەدا بەردەوامبوون، روونیکردەوە دوێنێ هەینی (۹) کەس کوژرانو زیـاتر لـە سەد هاووڵاتی دیکە بریندارکران. لـە درێـژەی کـارو کـرەوە تێکدەرانـەکان شـەڕی نێوان جەماوەرو هێزەکانی رژێـم پـێش دەسپێکردنی یاریـەکانی نێـوان یانـەی لاوانی دیرەزورو تیپی جیهاد لە یاریگای شارەوانی قامیشلی (٦) کەس بەگوللەی پۆلیسی قەلاچۆ کردنی تونـدو تیـژی کـوژراون، هـەمانکات بـە هـۆی بلاوەکردنـی جەماوەرو خۆ دەربازکردن لە یاریگاکەو تەنگەبەری دەرگاکانو چڕی تەماشاکران سێ منـداڵ پێشـیلکرانو کەوتنـە ژێرپێیـانو گیانیـان لـە دەسـدا. لـە درێـژەی

قسەکانیدا عەبدولعەزیز دەڵێت: ڕووداوەکانی رۆژی شەممە کوژرانی(٥) کس‌و برینداکردنی (٢٤) کەسی تری لێکەوتەوە.. هەمانکات خۆپیشاندەرانی- قامیشلی‌و عامو‌داو دیریك نە تۆڵەی کوژرانی دوو هاووڵاتی رۆژی هەینی بەردەوامییاندا بە ڕێپێوان‌و خۆپیشاندانەکانیان. لەلایەکی ترەوە (فەیسەڵ یوسف) ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی پێشکەوتوو خوازی کورد لە سوریا لە لێدوانێکیدا دەڵێت: کوردەکانی تەدمور نارەزایی‌و بێزاری خۆیان لە ئاستی ڕووداوەکانی هەینی‌و شەممەی شاری قامیشلی دەربڕی‌و لە چەندین لاوە ڕێپێوان‌و خۆپیشاندانیان دژبە پەلامارو دەستدرێژیەکانی پۆلیس‌و ئاسایش وەستان‌و ژمارەیەکیان برینداکران‌و ژمارەیەکیش دەسگیرکران. هەر لەو رۆژانەدا کوردەکانی گەڕەکی خۆر ئاوای دیمەشق لە پشتیوانیکردنی خۆپیشاندەرانی قامیشلی‌و شارەکانی دیکە ڕووبەڕووی هێرش‌و پەلامارەکانی هێزەکانی پۆلیس‌و ئاسایش بوونەوە. سەبارەت بە ڕووداوەکان‌و کارەنا پەسەندەکانی پیاوانی رژێم لەشاری قامیشلی‌و شارەکانی تر چەندین بیروڕاو لێدوانی جیاواز سەریان هەڵدا.

- تەلەفزیۆنی سوریا وای دەبینێ- کارو کردەوەی توندوتیژی رەفتاری کەسانێکی دڵڕەشی شاری حەسەکەیە دژ بە ئارامی‌و ئاسایشی هاوڵاتیان‌و گەل‌و نیشتیمان، دیارە لەژێر هەر جۆرە کاریگەری‌و بیانوویەکدا بێت رێگا بە هیچ گیرە شوێنێك نادرێت ئاسایش‌و ئارامی گەل‌و نیشتیمان‌و گوزەرانی هاوڵاتیان تێکبدات.

- فەیسەڵ یوسف دووپاتی دەکاتەوەو دەڵێت: هەندێ گیرە شێوێنی دوژمنانی ئاشتی‌و ئارامی هەلیان لە ڕووداوەکان‌و بارودرخەکە وەرگرت‌و چەندین کردەوەیان ئەنجامداو دەستی چەپەڵیان بۆ سەر ماڵ‌و موڵکی گشتی‌و تایبەتی وڵات درێژ کرد، بێگومان ئەم کارانە دژبە یاسان‌و دەبێ لێپرسینەوە لە ئاستیان ئەنجام بدرێت.

- سەروتاری رۆژنامەی ـ بەعس ـ زمانحاڵی پارتی بەعسی سوریا، دەربارەی

ڕووداوەکــان دەنووســێت دیمەشــق هێزەدەرەکیــەکان بەنانــەوەی ئــاژاوەگێڕیو بەرپاکردنی فیتنە لە وڵاتدا تاوانبار دەکات، کە لەو کارانەیاندا مەبەستیان زیـان گەیاندنــە بەگــەل ووڵاتو بەشــدارن لــەو فشــارو گەمارۆیــەی بەســەر ســوریادا سـەپێنراوە، لـە راسـتیدا ڕووداوی یاریگـای شـاری قامیشـلی ڕووداوێکـی دەروون هـەژێنو پـڕئێشو ئـازارو جێـی داخو پـەژارەی هـەموان بـوو، هەنـدێ کۆمـەڵو دەسـتەو تـاقم هـەڵی کاولکاریو خـاپوورکردنی دەزگـا گشتیەکانیان بـۆ رەخسـاو زیـانی قـورسو سـەنگینیان بـە بەرنامـەی خزمـەتگوزاری گەیانـدو دەسـتدرێژی ناڕەوایان کردەسەر سامانی گشتیو تایبەتو تێکدانی ئاسایشی وڵاتو شـێواندنی بارودۆخی ئەو برایەتیەی لە سوریا جێگیرکراوە.

* لـە لایـەکی تـرەوە بەرانبـەر بەکارەسـاتە خوێناویەکـەی قامیشـلی پارتـە کوردیــەکان بەیاننامەیــەکیان بلاوکــردەوەو بەقەســابخانەیەکی کــەم وێنــەیان لێکدابوویەوە وتاوانی دەسـتدرێژیکردنیان بۆسـەر خـەڵکی کورد خستە ئەستۆی هێزەکانی ئاسایشی سوریا.

* لـە بەیاننامـەی کۆمەڵـە پـارتێکی دیکـەدا هـاتووە، داواکـارە بـەڕاگرتنو کۆتـایی هێنــان بــەکارو کردەوەکــانی ســەرکوتکردنو گــەمارۆدانی ڕووداوەکـانو ڕاگرتنی پەرەسەندنیان. وەك بەیاننامەکە ڕوونی کردوەتەوە، نەدەبوو بەو جۆرە رێگـای پەرەسـەندنی ڕووداوەکـە بخرێتـە سەرپشت وببێتـە هۆکـاری داڕووخـانی باری سیاسیو کۆمەڵایەتی وڵات.. بێگومـان ئەمـەیش دەرهاوێشتەی نادیـاربوونی ژیانی دیموکراتیو نەبوونی ئازادی گشتی دەردەخـات، بەتایبـەتی پشتگوێخستنی مافی کوردەکانی سوریایە. دیسانەوە سەبارەت بە بـارو دۆخەکە، رابـەرانی پارتـە کوردیـەکانی سـوریا بەیاننامەیـەکیان بلاوکـردەوە، تیایـدا دڵتـەنگیو بێـزاریو ماتەمینی خۆیان لە ئاستی قوربانییەکانی ئەم دواییەی باکووری وڵات ڕاگەیاندو بەیەکجاری رێگربـوون لـە ئاهەنگـەکانی جـەژنی نـەورۆزی سـەری ساڵی کوردی، رابـەرانی پارتـە کوردیـەکان خوازیـاربوون بـە کۆتـایی هێنـانو ڕاگرتنـی کـردەوە

ناڕەواکانی هێزەکانی ئاسایش‌و پۆلیس. لە هەمان کێشەدا کۆمەڵی برایانی موسوڵمان (جماعه الأخوان المسلمين)ی سوریا بەیاننامەی غەمناکی‌و پەژارەی ئاراستەی خێزان‌و کەس‌و کاری قوربانیانی بێتاوان کردو نزای چاکبوونەوەی پەلەی بۆ بریندااران خواست، بەیاننامەکەی برایان زۆر بە توندی‌و راشکاوی بەر پرسیاریەتی ئەنجامدانی تاوانەکانی خستە ئەستۆی حکومەت‌و دەڵێت: رشتنی خوێنی هاولاَتیان‌و لە کەدارکردنی نیشتیمان یەکسانە بەسەپاندنی باری نائاسایی ئەو دەسەڵاتە خۆسەپێنەرەی لەوکاتەوە تائێستا زیاترلە چل ساڵە بەسەر گەلەکەماندا سەپێنراوە.. ئاشکرایە پەیڕەوکردنی سیاسەتی چەوتی سەرکوتکردن‌و گرتن‌و کوشتن، هۆکاری سەرەکیە لەسەر هەڵدانی ئاژاوەو تەقینەوەی ئەو دەروونانەی چەندەها ساڵە لە ژێرستەم‌و خەفەکردنی دەنگ‌و بێ بەشکردنداگیرۆدە کراون.. دەبێ ئەوەیش لەبیر نەکرێت خودانەکردە ئەگەر گڕی دەروونەکان تاویان سەندکەس نازانێت سەرەنجام بەکوێ دەگات‌و چۆن‌و بەچ جۆرێک تووڕەیی خەڵکی گەمارۆ دەدرێت.. کۆمەڵی برایان لە بەیاننامەکەیدا رووداوەکانی بە بارودۆخی گشتی سوریاوە گرێداوەو بەم جۆرە هەڵی دەسەنگێنێ.. لەمێژە ستەم‌و سەرکوتکردن‌و بەدوایەکدا هاتنی زەنجیرەکانی چەوساندنەوەی سیاسی‌و هزری‌و ئەتنی سەرسنگی کۆمەڵگای سوریایان داپۆشیوە، داواکارین لەگەلەکەمان لەم کارەساتە دڵتەزێنانە پەند وەربگرێت‌و بکرێنە پردێک بۆ بەیەک گەیشتن‌و ئەنجامدانی دیالۆگ‌و بەتینکردنی یەکێتی نیشتیمانی.

لەدرێژەی بەیاننامەکەیدا کۆمەڵی ناوبراو پێشنیاردەکات بەپێکهێنانی لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەی بێلایەن‌و دەست‌و دەرونپاک بەبەشداری دامەزراوی داکۆکیکردن لەمافەکانی مرۆڤ‌و لیژنەکانی گەشەکردنی کۆمەڵگای مەدەنی‌و کەسایەتیە نیشتیمانپەروەرە باوەڕ پێکراوەکان.. لە پێناوی دیاریکردنی بەرپرسیاریەتی لە رشتنی خوێنی بێتاوانان‌و سزادانی ئاژاوە گێڕانی تاوانبار بەو

خوێن رشتنە تا چیتر لە ئێستا بەدواوە مافی هیچ کەسێك پێشێل نەکرێت. کۆمەڵی برایان خوازیارە لە پێناوی بەرژەوەندیە باڵاکانی نیشتیمانو هەستکردن بە بەرپرسیاریەتیو دانانی ئاستێك بۆ دەرهاوێشتە ناکارو ناجۆرەکان تا رێگریە توندو کاولکاریەکانیان بەسەر هەموانـدا نەشکێنەوە. رووداوەکانی قامیشلی رەنگدانەوەی بارو دۆخی نەتەوایەتی کوردو بەتایبەتی گەلی کوردی عێراق بوو، ئەوەبوو پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق بەسەرۆکایەتی (مەسعود بارزانی) بەیاننامەیەکی نارەزاییو بێزاری بەرانبەر بە رووداوەکانی قامیشلی راگەیاند، وەك تیایداهاتووە دەڵێت: ئێمە لە پ. د. ك دووپاتی برایەتی نەتەوایەتی نێوان کورد لەلایەكو گەلانی دیکەی دراوسێ لەلایەکی ترەوە دەکەینەوەو هاوکارین لەسەر ئاشتی پەروەریو پێکەوەژیان، خوازیارین هەموو لایەنەکان لەتوندوتیژیو بەکارهێنانی هێزو هەژاندنی هەستەکان دوورەپەرێزبن، بە دڵنیاییەوە لە پەیوەندی نێوان گەلاندا توندو تیژی چەندبێ گەڵکەو زیانبەخشە هێندەیش جێی رەزامەندی نابێتو پەرەسەندنیشی بێ بایەخە. لەلایەن خۆیەوە رۆژنامەی (التآخی) زمانحاڵی پ. د. ك نوسینێکی تایبەتی لەسەر وتاری خۆیدا بەم جۆرە نووسیوە:)کارو کردەوە توندو تیژیەکانی ئەم دواییەی قامیشلی بەتوندی ریسوادەکەین، هاوکاریو هاوخەمی خۆمان بۆ کەسو کاری شەهیدان دەردەبڕین، هیوادارین زمانی گفتوگۆ لەچارەسەرکردنی کێشەکاندا بەسەر توندوتیژیو بەربەرەکانێدا زاڵ بێتو ناکۆکی وەلابنرێت.

هاوکات لەگەڵ بیرو بۆچوونەکانی (پ. د. ك)و رۆژنامەی (التآخی) شەقامی کوردی لە کوردستانی عێراق هەژاندو کاردانەوەی توندی لێکەوتەوە.

پێویستە بزانین داواکاریەکانی کوردەکانی سوریا چییە؟

کەسایەتی ناسراوو سیاسەتمەداری کوردی سوریا (سەلاح بەدرەدین) بەم جۆرە داواکاری کوردەکانی سوریای خستەڕوو..

١ - دانـان بەبوونی گەلی کورد وەك نەتەوەی دووەم لەوڵاتداو دیاریکردنی لە

دەستووردا، ئاشکرایە کوردەکان ڕێژەی (١٥٪)ی دانیشتوانی سوریا پێکدەهێنن.

٢ - دیاریکردنی دەقێکی دەستووری لەچوار چێوەی سوریای دیموکرات و یەکگرتوودا، مافی چارەنووسی کوردی تیادا دیاری بکرێت.

٣ - فیدراڵیەت ئاستی سەرەوەی داواکاریەکانەو لای خوارەوەی جۆرێك لە ئۆتۆنۆمی.

٤ - سڕینەوەو دوورکەوتنەوە لە سیاسەتی چەوساندنەوەو سەرکوتکردن و لەگەڵ گێڕانەوەی ڕەگەزنامە بۆ زیاتر لە دووسەد هەزار کورد، کەمافی هاوڵاتیبوونیان لێزەوتکراوە، لەگەڵ دووپاتکردنەوەی برایەتی کوردو عەرەب.

بەبیرو بۆچوونی (سەلاح بەدرەدین) گرتنە پێشی ڕێ و شوێنی پێویست بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە، دەکرێت لە ڕێی گفتوگۆی برایانە لەنێوان بزووتنەوەی کوردو حکومەتدا ئەنجام بدرێت.

بێگومان مەسەلەی کورد لە سوریا رەهەندێکی دیکەی جیاوازی لە دەوڵەتانی دراوسێ وەرگرتووە، بەوەی بزووتنەوەیەکی نوێ و مێژوویەکی دیاری هەیە، جگە لەوە ڕووداوەکانی قامیشلی هاوکات بوون لەگەڵ گۆڕانکاریەکانی عێراق و هۆکاربوون وەزیری بەرگری ئەمەریکا لە ئاماژەیەکیدا بڵێت: لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بارو دۆخێکی نوێ سەری هەڵداوەو گەشەی کردوە، پێویستە لەسەر دەوڵەتانی دراوسێ هەستی پێ بکەن.

تەواوی ئەم پێکهاتانە بوونە سێبەری سەرگەلی سوریاو بزووتنەوەی کوردەکان، ئەگەر بەژیرانە هەنگاوەکان بنرێن بەرەو لەیەك گەیشتن مەودای گەشەکردن و پێشکەوتن فراوانتر دەبێت.

## چوارەم: کوردەکانی عێراق

بزووتنــەوەی ڕزگـاریخوازی کـورد لـە کوردسـتانی عێـراق، پەرەسـەندنێکی مەزنی بەخۆوە بینیو توانی خۆیشی بەسەرگۆڕەپانی نێو دەوڵەتیدا بسەپێنێو دەسکەوتی فـراوانو گـرنگیش بـە ئـەنجام بگەیـەنێتو زۆربـەی کـات لـە پلـەی سـەربەخۆییو جیابوونـەوە لـە بەغـدا نزیـك ببێتـەوە.. لەکاتێکـدا کوردەکـانی عێراق لەهـەر پارچـەیەکی تـر زیـاتر ڕووبـەڕووی دەربەسـەریو چەوساندنەوەو سەرکوتکردنو دەربـەدەری بوونەتـەوە، نـەك دەیـانو سـەدان بـەڵکو لـە ئـەنجامی پــەیڕەوکردنی سیاســەتی فڕکردنــی بەکۆمــەڵو خــاکی ســووتاو لەلایــەن ڕژێمەستەمکارەکانەوە بەملیۆن کەسیان ئاوارەی وڵاتان کراون، کە لـە لاپـەڕەکانی داهاتوودا بە دوورو درێژی باسی لێوە دەکەین.

# بەشی یەکەم

## کوردەکانی عێراق و

## نەهاتنەدی دەستکەوتەکان بۆ خەڵکانی تر

مەسەلەی کورد لە عێراق پێشەنگی بزووتنەوەکانی کوردی دەوڵەتانی دراوسێیەئایا مانەوەی کورد لە چوارچێوەی دەڵەتی عێراق کاتیە؟.. ئایا هەوڵیان جیابوونەومیە؟.. ئایا داواکاری تایبەتیان بەفیدراڵیەت دواهەنگاوو دوا ویستگەیانە؟.. یان هەنگاوی پێش دواهەنگاوە بەرەو جیابوونەوە؟.. دواجار گرنگی کاریگەریان بۆسەر ئاسایشی نەتەوەی عەرەب لە کوێدا پەناگیربووە؟. لەناو کوردانی پارچەکانی دیکەی کوردستان و بزووتنەوەکانیاندا، کوردەکانی عێراق تاکە کۆمەڵی دیارو دەرکەوتوون توانیویانە چەندین دەستکەوتی گرنگ بۆ خۆیان بەدی بێنن، کەلە توانای کوردەکانی دیکەدا نەبووە، هەمانکات دەگونجێت لە بەشێکی کوردستان بۆ بەشێکی تری جیاوازی تیادابێت، ئەوەیش لە لێدوانەکانی چەند رابەرو سەرکردەیەکی کوردەکانی عێراقدا بەدی دەکرێت وەك وتراوە: (ئێمە کوردستانمان دابەش نەکردوە، ماوەیەکە بەسەر دابەشبوونماندا دەگوزەرێت و چارەنووسمان بەو جۆرە هاتووە کە بەو شێوەیە بین.. تێپەڕبوونمان بەو ردوشەدا جیاوازی و گۆڕانکاری خستوەتە نێوان کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکان و دابڕان لە نێوانیاندا روویداوە، ئەو جیایی و دابڕانە هۆکاربووە لەکارکردنی کۆمەڵگای کوردی لەهەر پارچەیەك بەجیاو بەشێوازی گونجاوی

خۆی چارەسەری کێشەکانی بکات لەگەڵ حکومەتە ناوەندیەکەیدا، ئەوەی بۆ کوردو بۆ دەوڵەتانی دراوسێیشی گرنگە، هیچ بەشێك کێشەو گرفتی خۆی تێکەڵو ناوێتەی کێشەو گرفتی کۆمەڵگای بەشەکانی دیکەناکات،کێشەی کوردەکانی تورکیا لە ئەنقەرەو کێشەی کوردەکانی ئێران لە تاران‌و کێشەی کوردەکانی سوریا لە دیمەشق چارەسەر دەکرێن).

دەستکەوتە بەدیهاتووەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە عێراقدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی نوێی عێراق، ئەوە بوو بەچاو دێری (ونستون چەرچڵ)ی وەزیری موستەعمەراتی بەریتانیا لە ۲۱ ی ئازاری ۱۹۲۱ کۆنگرەی قاهیرەی تایبەت بە پاشەڕۆژی عێراق گرێدرا. نوێنەران بۆ کۆنگرەکە پێکهاتبوون لە (سێر بێرسی کوکس)ی مەندووبی سامی بەریتانیاو (مسس بێڵ)ی سکرتێری رۆژ هەلاتی خانەی ئینتیداب‌و راوێژکارانی وەزارەتەکانی دارایی‌و بەرگری‌و کارو گەیاندن‌و دوو کەسایەتی دیکەی بەریتانی‌و دوو وەزیری عێراقی وەك چاودێر بەشداریان دەکرد. بەرنامەی کاری کۆنگرەکە بریتی

بوو لە:

١- پەیوەندی دەوڵەتی نوێی عێراق بەبەریتانیاوە.

٢- دیاریکردنی، کێ دەسەلاتی عێراق دەگرێتە دەست.

٣- دیاریکردنی جۆرو شێوازی دەسەلات لەعێراق.

٤- بارو دۆخی ناوچە کوردنشینەکان (کوردستان)و پەیوەندیان بە عێراقەوە. کۆنگرە تا ٢٤ ی ئازار دانیشتنەکانی لە نێوان قاهیرەو قودسدا گرێدا، هەر لەسەرەتای کۆبوونەوەی یەکەم‌و لە چوارچێوەی مەسەلەی دیاریکردنی پاشەڕۆژی ولاتی نێوان هەردوو رووبار (بلاد مابین النهرین) دا باس لەمەسەلەی کورد کرا، هەروەك بەوردی لە کۆبوونەوەکەدا هاتبوو، بەرژەوەندی گشتی دەخوازێت کوردستان راستەو خۆ لە ژێر چاودێری مەندووبی سامی بەریتانیاوە

کاروبارەکانی بەڕێوە ببرێت، تا ئەنجامدانی راپرسی کوردەکانو کاریگەری رای تەواویان بە گرێدان یان گرێ نەدانیان بەعێراقەوە. راو بۆچوونی بەشداربوانی کۆنگرە لەوە دەکۆڵنەوە (هەر هەوڵێك بەسەپاندنی دەسەلاتی حکومەتێکی عەرەبی بەسەر ناوچەی کوردستاندا، پێچەوانەی ویستی دانیشتوانەکەی، هۆکاردەبێت لەخولقاندنی کێشەو رووداني رووبەڕوو بوونەوەو بەرگری لە خۆکردنو ناڕازیبوون بەو دەسەلاتە). دوابەدوای لێکۆڵینەوە، لیژنەی سیاسی کۆنگرە کۆبوونەوەی چوارەمی تەرخانکرد بە لێکۆڵینەوەو باسکردنو چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد.

ئەوەی لەو دانیشتنەدا وروژێنرا، کێشەی کەرکوكو دەوروبەری بوو.بۆ مەسەلەی کورد بە تایبەتیو لەئاستی نێودەوڵەتی بە گشتی، نرخو بایەخی تایبەتی هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا تیشکێکی رووناكو درەوشاوە بوو لەسەر زۆربەی رەهەندە شاراوەکانی مەسەلەی کورد لە عێراقدا.. دەرەنجامی گفتوگۆکانو تاوو توێکردنی تەواوی لایەنەکان کۆنگرە رایگەیاند..

١ - لەسەر رۆشنایی ماددەکانی (٦٢و٦٣و٦٤)ی پەیمانی سیڤەرو بڕیاری دەوڵەتی عوسمانی بەبەخشینی مافی چارەنووس بە گەلی کورد، لیژنەی سیاسی کۆنگرە لەسەر ئەو بنەڕەتە مامەڵە لەگەڵ مەسەلەی کوردا دەکاتو پێشنیار ئەوەیە، کوردەکانی باشوور نەخرێنە ژێر دەسەلاتی حکومەتی عێراق.

٢ - مەندووبی سامی بەریتانیا جارێکی تر دڵنیایی دەبەخشێت کە سەرۆك وەزیرانی عێراق (عەبدولڕەحمان نەقیب) لەلایەن کۆنگرەوە ئاگادار کراوە، بەپێی بەندەکانی پەیمانی سیڤەر لەماوەی ساڵێك دا کوردەکان مافی سەربەخۆیی وەردەگرنو خودی مەندووبی سامی بەرپرسیار دەبێتو هەڵدەسێت بەدیاریکردنو چۆنییەتی بەڕێوەبردنی ناوچەکە بەکەرکوکیشەوە. لێرەدا کۆنگرە بەڕوونی دەری بڕیوە، مەبەست لەناوچە کوردنشینەکان ئەو ناوچانەیە زۆربەیان کوردو هەردوو کەرتی کەرکوكو سلێمانیو چەند ناوچەیەکی

دیاریکراوی باکووری موسڵیش دەگرێتەوە.

٣ - جارێکی تر مەندووبی سامی پەنجە لەسەر مەسەلەکە دادەنێتو دووپاتی دەکاتەوە، هەمانکات کەرکوکو موسڵ دووپارێزگاو دووئەفسەری بەریتانی ڕاوێژکارو دەستەیەك فەرمانبەری کورد بەڕێوەیاندەبن.

٤ - کۆنگرە بەوردی لەشێوازی دەسەڵاتی بەخشراو بەکوردەکانی باشووری کۆڵیەوەو دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیو ڕاستەوخۆ پەیوەستکردنی بە مەندووبی سامیەوە پێشنیارکرا.. لەگەڵ ئەوەشدا مەرجی ئەوەیش دیاریکرا، کەئەو دەوڵەتە بەشێك نەبێت لە عێراقو بەویشەوە گرێ نەدرێت. بەبڕوای کوردەکان سیڤەر بەدیهێنەری ئامانجەکانیانە، دەخوازن دەسەڵاتی داهاتووی پێشنیارکراویان لە ئۆتۆنۆمی تێپەڕێتو لە کۆنفیدراڵیەوە نزیك بێت.

٥ - (ونستون چەرچڵ) ڕای خۆی بەوە دەربڕی کوردەکانی عێراق لە چاودێریکردنی حکومەتی عێراق دوور ڕاگیرێنو پێویست بەوە دەکات کاروباری بەڕێوەبەری ناوچەکە هاوشێوەی (میر)ی پێشنیارکراوی تەختی عێراق بە میرێکی کورد بسپررێت.

٦ - گەیشتنی وتووێژەکانی کۆنگرە بەئاستی بڕیاردانو دیاریکردنی زەنجیرە شاخی حەمرین[١٤] بە سنووری ناوچەی کوردستان.

لە پرۆسەی ڕاپرسی دانانی (مەلیك فەیسەڵی یەکەم) لەسەر تەختی پاشایەتی عێراق، زۆربەی کوردەکان پێچەوانەی ئامانجەکانی کۆنگرەی قاهیرەو پەیمانی سیڤەر، لەگەڵ دانانی چەند مەرجێك ڕایان لەبەرژەوەندی (فەیسەڵ)و دژ بە سەربەخۆی کورد دا.: ـ

١ - بەفەرمی ناساندنی زمانی کوردیو بەکارهێنانی لەبەڕێوەبەرایەتیەکانی دەوڵەتو خوێندنی لە قوتابخانەکاندا.

---

(١٤) کەرکوك و دەوروبەری- حوکمی مێژوو و ویژدان- نووسی د/کەمال مەزهەر ئەحمەد.

٢ - ڕێزگرتنو پاراستنی مافە یاساییو مەدەنییەکانی هاوڵاتیانی کورد.

٣ -پاراستنی مافی کوردەکان لە چۆنییەتی وابەستەبوونیان بە کوردستانی تورکیاو لەگەڵ چاودێریکردنی مەسەلەی بەخشینی سەربەخۆیی بە کوردستانی تورکیا. وەك سەرەتای گۆڕانکاری لە مێژووی هاوچەرخی عێراقداو لە ئاهەنگێکی شکۆدارو بێ وێنەو بە ئامادەبوونو بەشداریکردنی کوردەکان لە ٢٣ ی کانوونی یەکەمی ١٩٢١ (فەیسەڵ) لەسەر تەختی پاشایەتی عێراق دانرا.

ماوەیەك لەگەڵ کۆنگرەی قاهیرەو ئەنجامدانی دیالۆگەکانو بڕیارەکانی کۆتایی تایبەت بە کوردەکانی عێراق وەستاین..

تا ئەو ئاستە روون ببێتەوە هەرچی لە عێراقدا بەدیهاتووە بۆیان، دەگەڕێتەوە بۆ بنچینە مێژووییەکەی.

## دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق

وەك پێشتر روونکرایەوە لە ٢٣ ی کانوونی یەکەمی١٩٢١ مەلیك (فەیسەڵ) بە پاشای عێراق دانرا (مەبەست لە عێراق تەنها هەردوو ویلایەتەکانی بەغدا وەك بەشی ناوەڕاستو بەسرە وەك بەشی باشوور دەگرێتەوە). هەمانکات بەشی باکوور کێشەیەکی سەرەکی بوو لەنێوانی تورکیاو[١٥] عێراقی نوێدا مابوویەوە.. وەك لەداهاتوودا باسی لێوە دەکرێت.

## شۆڕشی بارزان (١٩٤٣ ـ ١٩٤٥)

لە ماوەی جەنگی جیهانی دووەمدا بارزانییەکان لەناوچەکەی خۆیان بۆ شاری سلێمانی دوور خرانەوە بوونی (مەلا مستەفا) لە سلێمانی هەلی لە پێشدا رەخساند بەئازادیو دوور لە چاودێریکردن پەیوەندی بەڕێکخراوە سیاسیە

---

(١٥) سەرچاوەی پێشوو

کوردیەکان‌و کەسایەتیە ڕۆشنبیرو نیشتیمانپەروەرەکانەوە بکات.. دیارە لەو سەردەمەدا سلێمانی ناوەندێکی مەزنی چالاکی‌و جمو جوڵە سیاسیەکان‌و سەرچاوەی خەباتی کوردایەتی بوو، هەر لەو کاتەدابوو بەنیازی خۆسازدان‌و ئامادەکاری بەرپاکردنەوەی شۆڕش (بارزانی) پەیوەندیکرد بە کەسایەتیە کاریگەرەکانی ناوچەی بارزانەوە، لەو سەردەمەدا ناوچەکە گیرخواردووی دەستدرێژی‌و کارە ناپەسەندەکانی پۆلیس بوو بوو، ئاڵوزی بارو دۆخەکەی بەرەو تەقاندنەوە دەبردو بارزانییەکانیش چاوەڕێی شۆڕشێکی نوێیان دەکرد. لەو ڕووەوە (مەلا مستەفا) لە سلێمانی بە هەماهەنگی‌و هاوکاری کۆمەڵەی (هیوا) دەستی دایە دارشتنی بەرنامەو کاری ڕاپەڕاندن وسازدانی نیازەکەی، لەم ئاستەدا لە سلێمانییەوە بەنهێنی بەرەو بارزان گەڕایەوەو بڕیاریدا لەوێوە ڕاپەڕین دەست پێ بکات‌و ناوچەکانی تری کوردستان بگرێتەوە. هەر لە سەرەتای دارشتنی نەخشەکەیەوە بارزانی ئەوەی لەبەرچاو گرتبوو تەنها شۆڕش تایبەت نەکات بە ناوچەی بارزانەوە،وەك لە شۆڕشی ساڵی ١٩٣١ دا ڕوویدا.

ئەو سەردەمە عێراق‌و ناوچەی کوردستانیش لەژێر کاریگەری بارودۆخی سەخت‌و نالەباردا دەژیان وەك : ـ

١ - گەیشتنی جەنگی جیهانی دووەم بە لووتکە،و ستراتیژی پێکهاتەی عێراقی ئەو سەردەمە هۆکاربوو لە

گرنگی پێدانی لە لایەن هاوپەیمانانی ڕۆژئاواوە بەتایبەتی لەلایەن بەریتانیاوە.

٢ - سەپاندنی دەسەڵاتی ڕەهای بەریتانیا بەسەر عێراقدا.

٣ - سەردەرهێنان‌و گەشەکردنی چینی دەرەبەگایەتی.

٤ - لەکاتێکدا بزووتنەوەی کورد لە پێشکەوتنی تەواودا بوو،هێشتا بزوتنەوەی نەتەوایەتی عەرەب لەهەنگاوەکانی سەرەتادابوو.

٥ - پوچەڵکردنەوەی هەوڵەکانی بەدوژمنکردنی کوردو عەرەب‌سەبارەت بە

نادروستی ئەو هەوڵانە هەرلەسەرەتاوە (مەلا مستەفا بارزانی) ئەم بەیاننامەیەی ناراستەی گەلی عێراق کرد..وەك تیایداهاتووە:

(نە لەئێستاو نە لەداهاتوویشدا من دژایەتی گەلی عێراقم نەکردووە، لە کاتێکدا من خۆم ئەندامێکی ئەو گەلە مەزنەم، بەڵکو ئێمەی کورد خەباتمان دژ بە ئیستیعماری داگیرکەرو ئەو بەکرێگیراوانەیە خوێنی گەلی عێراقیان مژیوەو سەروەری وڵاتو بەرژەوەندیەکانی گەلەکەیان ژێر پێ خستووە). بێگومان بەیاننامەکەی (بارزانی)

لەوهەلومەرجەدا نەك هەرپوچەڵکردنەوەی هەوڵەکانی بەدواداهات، بەڵکو کاریگەری مەزنو فراوانیشی لەسەرناخو دەروونی جەماوەری عەرەب بەجێ هێشت، تا ئەو ئاستەی (عەبدوڵا عەزام) ی ئەمینداری گشتی کۆمەڵەی وڵاتانی عەرەب لە ژمارەی تشرینی یەکەمی ١٩٤٣ ی گۆڤاری (الهلال) دا دەنووسێت : ـ (لەسەرمان پێویستە بەگرنگی زیاترەوە سەرنجمان بدەینە برا کوردەکانمان لە عێراق، خۆشەویستیو رێزم بەرانبەر کوردەکانی عێراق هەمان خۆشەویستیو رێزە بۆ گەلەکەم، کورد نەتەوەیەکی وەفادارەو رێگای راستی گرتووەتەبەرو هەرگیز ئازاردانی کەسیان لێناوەشێتەوە، پێویستە وا هەست نەکەن یەکگرتنی عەرەب زیان بە بەرژەوەندیەکانیان دەگەیەنێت، پاشەڕۆژ پێشکەوتنی عێراق رۆڵێکی گرنگی دەبێت لە چارەسەرکردنی مەسەلەی کورددا، لە سەرنەتەوەی عەرەبیش پێویستە لەدیدگای هەست بە بە رپرسیاریەتی مێژووییەوە بەئەندازەیەك سەربەخۆییان دەستەبەر بکات بە ئازادی بتوانن چارەنووسی خۆیان لەگەڵ ئێمەدا دیاری بکەنو لە بڕیاردانەدا سڵ نەکەنەوە، بەو مەبەستە ئێمە وازیان لێ بێنین بڕیار لە دەستی خۆیاندابێت.. دەرەنجام ناکرێت مەسەلەی کورد لە عێراقدا بێ چارەسەر بمێنێتەوە)[١٦]

---

[١٦] بارزانیو بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد (شۆڕشی بارزان/١٩٤٣ - ١٩٤٥) مەسعود بارزانی

بەنیازی دوورەپەرێزی لە هێزەکانی حکومەتو روونەدانی شەڕ پێش دارشتنی نەخشەو کۆکردنەوەی هێزەکانو ئامادەکاری تەواوی بەرپاکردنی شۆڕش (مەلا مستەفا) زۆر بەنهێنی گەشتی ناوچەی بارزانی کرد، لەوساتەوەختەدا نامەیەکی ئاراستەی حکومەتی عێراق کرد، تیایداخوازیار بوو دوور لەشەڕو شۆڕو ناکۆکی هەوڵی لە یەك گەیشتنو چارەسەری مەسەلەکە بدرێت، هیچ نەبێت لای کەمی تا دوومانگی داهاتوو بارودۆخەکە ئاڵۆز نەکرێتو دووره پەرێزی رووبەڕوو بوونەوەو شەڕی یەکتری بین. بەهۆی بێ دەنگیو وەڵام نەدانەوەی حکومەتەوە لێرەبەدواوە بەکردەوە شۆڕشی بارزان هەڵگیرسایەوەو سەرەتا بنکەکانی پۆلیسی ناوچەکە بوونە ئامانجی هێرشو پەلامارەکانی شۆڕشگێڕانو لە ماوەیەکی کورتدا بنکەکانو تەواوی پۆلیسەکان کەوتنەژێر دەسەڵاتی شۆڕشگێڕان، لەگەڵ روودانی شەڕی راستەوخۆی بەرەکان (بارزانی) بە حیکمەتو ژیریو لێکدانەوەی دروستەوە هەڵسو کەوتی لەگەڵ بارو دۆخەکە دەکردو لەچەندین نەبەردیدا سەرکەوتنی مەزنو گرنگی بەدەستهێنا، کە لەو ماوەیەدا زیانەکانی حکومەت گەیشتبوویە کوژرانی (١٢٠) سەربازو پۆلیسو بەدیلگرتنی (٦٥) کەسی دیکە. لەگەڵ ئەم شکستەی هێزەکانی حکومەتدا، شۆڕشگێڕان دەستیانگرت بەسەر بڕێکی فراوانی چەكو کەرەستەی جەنگیو خۆراکی هەمە جۆردا. پاش سەپاندنی دەسەڵات بەسەرناوچەکەدا، بەفەرمانی (مەلا مستەفا) وەك دیاری شۆڕش بۆ کەسو کاریان تەواوی دیلەکان ئازادکرانسەرکەوتنەکانی جەنگاوەرانی شۆڕشگێڕ هۆکاربوون لە پەرەسەندنی بەردەوامی لە پەیوەندیکردنی هاوڵاتیان بە ریزەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە، ئەوەندەی نەخایاند تەواوی بنکەکانی پۆلیس لە ناوچەکەو دەوروبەریدا دەستیان بەسەردا گیرا. حکومەت بەنیازی گێڕانەوەی بنکەکان بۆ ژێردەسەڵاتی، هێرشێکی بەربڵاوی کردە سەرناوچەکەو تیایدا رووبەڕووی

بەرگری‌و داكۆكیكردنی جەنگاوەرانی شۆڕشگێڕ بوویەوەوەو لەگەڵ لەدوابەجێهێشتنی زەرەرو زیانێكی گیانی‌و ماڵی بەتوندی شكستی پێهێنرا. سەركەوتنە یەك لەدوایەكەكانی شۆڕش حكومەتیان ناچاری داواكردنی كردنەوەی دەرگای گفتوگۆكرد، بێ هیچ گرفتێك‌و بەبڕوابوونی بە زمانی ئاشتی لەچارەسەركردنی كێشەكەدا (بارزانی) رەزامەندی دەربڕی.. لەلایەكی دیكەوە رێكخراوە سیاسیەكانی كورد، بەتایبەتی (هیوا) هەوڵەكانی خۆیان لەڕووی راگەیاندنەوە چڕ كردەوەو هەڵسان بە بلاوكردنەوەی چەندین بەیاننامە لە بەغدای پایتەخت سەبارەت بە بارودۆخی كوردو راپەڕینی ناوچەی بارزان‌و پەردەلادان لەسەر كارو كردەوەی هێزەكانی حكومەت‌و سەركوتكردن‌و زیندانی كردن‌و چەوساندنەوەو ئەشكەنجەدانی خەڵكی كوردستان. رووداوو گۆڕانكاریە گرنگەكانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی كورد بوونە جێی سەرنجی دەوڵەتانی عێراق‌و بەریتانیاو گۆڕانی دیدگاو بۆ چوونیان لەئاستی بزووتنەوەكەو دەركردنی لە مەودای یاخیبوونی خێڵەكی‌و ناتوانا بوون‌و دەسەوسانیان لەسەر كۆتكردنی، دیاربوو گەیشتبوونە باوەڕ هێنانی تەواو بە بزووتنەوەكەو ناساندنی بە بزووتنەوەیەكی گشتگیرو بەربلاو.. چەسپینی ئەو بڕوایە وەك دەست پێشخەریەك بالوێزی بەریتانیا نامەیەك ئاراستەی (مەلا مستەفا) دەكات، لەویست‌و ئارەزووی حكومەتەكەی لە كۆتاییهێنان بەشەڕو ناكۆكی‌و پەنابردنە بەر گفتوگۆ لەگەڵ حكومەتی عێراق‌و چارەسەركردنی مەسەلەكە لە رێی ئاشتیەوە، بالوێزی بەریتانیا لە نامەكەیدا بەڵێن دەداتە (بارزانی) لە پێناوی دەستە بەركردن‌و بەدیهێنانی مافەنەتەوایەتیەكانی گەلی كورددا تەواوی هەوڵەكانی بە پەرۆشەوە بخاتەگەڕ. شكستە یەك لە دوایەكەكان دڵنیا بەخش بوون لە ناتوانایی حكومەت بەسەركوتكردنی شۆڕش‌و راپەڕینەكەی (مەلا مستەفابارزانی). وەك ئاشكرایە لەو سەردەمەدا بەتەواوی تواناكانییەوە بەریتانیا خەریكی بەڕێوەبردنی بەرەكانی جەنگی جیهانی دووەم بوو، كاتی

خۆخـەریککردنی بەکێشـە لاوەکیەکانـەوە لەپێشـدا نـەبوو.. جگـە لـەوە ئـەوەی کەمێك جێی نیگەرانی بـەریتانیابوو هێشتا تـا ئـەو کاتـە لـە ئاستی جەنگەکـەدا هەڵوێسـتی تورکیـا روون نەبووبوویـەوەو ئاشـكرا نـەکرابوو، بێگومـان شۆڕشـی کوردو چەکداری لە کوردستانی عێراق تورکیای توشی سەرسامیو دڵە راوکێیەکی زۆر کردبوو، دواتر بەشداریکردنی تورکیا لەجـەنگو وەستانی دژ بـە دەوڵـەتانی (میحوەر) بەریتانیا پێشبینی کرد لەتەشـەنەکردنو پەرەسـەندنی شۆڕشـی کورد بەرەو پارچەکانی دیکەی کوردستانی گەورەو دەست تێوەردانی یـەکێتی سۆڤیەت لەکاتێکدا سوپاکەی بەسـەر سنوورەکانی ئێـرانو نزیـك عێراقـدا جێگیر کـردووە بۆیە بەناچاری پاڵە پەستۆی تەواوی خستەسەر حکومـەتی عێـراق لەگـەڵ (مـەلا مسـتەفا) دا بگاتـە شـێوە رێککـەوتنێکی تـەکتیکیو بـەپێی بارودۆخەکـە لەگـەڵ مەسـەلەکەیدا بگونجێـت. لـەکانوونی دووەمـی ١٩٤٣ بـەدانانی سـێ وەزیـری کـورد نوری سەعید وەزارەتی پێکهێنا، ماجد مستەفا یەکێك بوو لەو وەزیرە کوردانـەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردو حکومەتی عێراقی لەیـەك نزیـك کـردەوە، لـەو هەوڵـەدا (مـەلا مسـتەفا) بەیادداشـتێك داخوازیـەکانی کـوردی بـەم شـێوەیەی خوارەوە پێشکەش بەحکومەتەکەی (نوری سەعید) کرد: ـ

١- گواسـتنەوەو دوورخسـتنەوەو دەکردنـی ئـەو فەرمانبەرانـەی بـەخراپی لەناوچەکەدا دەسەڵاتیان بەکارهێناوەو ناویان بە بەرتیل خۆری زڕاوە.

٢- پێکهێنـانی ویلایـەتی کوردسـتان لـە پارێزگاکـانی (کـەرکوكو سـلێمانیو هەولێر) لەگەڵ گرێدانی ناوچەکانی (زاخۆو ئامێدیو دهۆكو ئاکرێو شێخانو سنجار) لە پارێزگای موسڵو هەردوو قەزاکانی خانـەقینو مەنـدەلی لـە پارێزگای دیالە.

٣- زمانی کوردی زمانی فەرمی ویلایەتەکە دەبێت.

٤- بۆ هەموو وەزیرێکی عێراقی جێگرێکی کورد دابنرێت.

٥- دیـاریکردنی وەزارەتێـك بـە نـاوی (وەزارەتـی کاروبـاری ویلایـەتی

کوردستان)و لەلایەن وەزیرێکی کوردەوە بەڕێوە ببرێت.

٦- قەرەبووکردنەوەی زیان لێکەوتوان.

٧- کردنەوەی قوتابخانەو بنکەکانی تەندروستیو چاکسازی ڕێگاوبانەکانو ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکە.

٨- کاروبارەکانی دەرەوەی وڵاتو داراییو سەربازی تایبەت دەبن بە دەوڵەتی ناوەندیەوە.

٩- گێڕانەوەی دوور خراوان بۆ ناوچەکەو ئازادکردنی زیندانیانی سیاسیو زیندانیانی تری بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد.

دروستبوونی پەیوەندیەکانی شۆڕشو حکومەت سەرەتا بەکشانەوەی سوپا لە ناوچەکەدا دەستی پێکردو دەسەڵاتی حکومەت تیادا هاتە کۆتایی، لەگەڵ جێ بەجێکردنی خاڵە سەرەکیەکانو رایکردنیان (شێخ ئەحمەدی بارزانی) لەدوور خرانەوەی گەڕایەوە بارزان. لەبەرایی زیاتر بەتینکردنی بڕوا بەو ئاراستەیە چەند هەنگاوێك نران، وەك دانانی ئەفسەرانی کورد بە ئەفسەرانی پەیوەندی نێوان حکومەتو بزووتنەوەی کوردو دانانی فەرمانبەری نوێ لەناوچەکەدا. ئەم رەوشە ئەوندەی نەخایاند، حکومەتەکەی (نوری سەعید) ناچار بە دەست لەکارکێشانەوەو وازهێنان لە دەسەڵات کرا، دوای ئەو (حەمدی پاچەچی) وەزارەتی نوێی پێکهێنا، هەر لەسەرەتای دەست بەکاربوو نییەوە رقو کینەو دوژمنایەتیو دژایەتی خۆی بەرانبەر کێشەی کورد بۆ نەشاررایەوە. لەوتاری وازهێنانو دەست لەکارکێشانەوەیدا لەئاستی کێشەی کورد (نوری سەعید) بەم جۆرە راو بۆچوونو دیدگای خۆ ی رۆشنکردەوەو تیایدا نووسیویەو دەڵێت: - پێویستە لەئاستی کوردەکانی عێراقو هیواو ئامانجەکانیان وەك هاووڵاتی شتێك بێنمەوە یاد.. لەناوەڕاستی ئەم بارودۆخە ناسكو گرێدارەی کە ئێمە تێیکەوتوین، بابزانین روونترین نەخشەی پێویست لە بەڕێوەبەرایەتیکردنی کوردەکانی عێراق ئەمەیە، بە بۆچوونی من ئەم کوردانە بەسەر سێ توێژدا

دابەش بوون: ـ

**یەكەم** : سەرۆك خێڵ (عەشایەر)ەكان - دوور لە ژیانی شارستانیو نزیك لە ژیانی ئاغایەتیو دەرەبەگایەتی بەسەردەبەنو هیچ هیواو ئامانجێك یەكیان ناخات.. تاكە خەمو ئەندێشەیان تەنها مانەوەی دەسەڵاتە لەدەستیانداو خۆسەپاندنیانە بەسەر ناوچەو تیرەكانیاندا.

**دووەم** : بازرگانان - ئەمانە توێژێكن، لە پێناوی پەرەپێدانی بازرگانییەكانیانو پارێزگاری بەرژەوەندییەكانیان پشتیوانیكەری دەسەڵاتی تەواوی حكومەتو پارێزگاری ئاسایشو هێمنی وڵاتن.

**سێیەم** : رۆشنبیران - ئەم توێژە بەردەوام لەپەرەسەندندان.. بەڵام ویستو ئاواتەكانیان زۆر زیاترە لەویستو ئاواتەكانی رۆشنبیرانی دیكەی عێراق.. بەردەوام خوازیاری فراوانكردنو پەرەپێدانی قوتابخانەكانو بڵاوبوونەوەی زانستو هۆكارەكانی شارستانییەتی وەك ئاوەدانكردنەوەو بنیادنانی بنكە تەندروستیەكان لەناوچەكەدا.. هەمانكات بەهیوای لاوازكردنی توێژی یەكەم، رۆشنبیران لە هەوڵی سەپاندنی دەسەڵاتی خۆیانن لەبەرێوەبردنی فەرمانگە خۆجێیەتیەكاندا. دەربارەی ئامانجە سیاسیەكانی توێژەكە لە ئاستی سەربەخۆیی كوردستان، پیاوە ژیرو كارامەكانیان بەدروستی لێكیان داوەتەوە، بێ پشتیوانی دەوڵەتانی مەزن ئەوبیرۆكەیە تەنها لە بیرو ئەندێشەدا دەمێنێتەوەو سەرگرتنی مەحاڵە. ئەوەی لای هەموان ئاشكرایە نزیكەی (٨٠٪)ی ناوچەكانی كوردستان دەكەونە دەرەوەی سنووری عێراق، ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە دەنگو باسو رووداوەكانو بەدوایاندا بچینو لەروانگەی جەنگە بە هێزەكەوە هەڵسەنگاندنیان بكەین، دەبینین جاروبار هەڵوێستی هەندێ لە دەوڵەتانی مەزن لە پێناوی بەرژەوەندیەكانیاندا كێشەی كوردیان بەكارهێناوە.. هەر چەند ئەم بەكارهێنانە هێشتا بەردەوامەو كەسیش لای روون نییەو لەراستیو دروستی بەڵێنەكان نەك هەر تێناگات بەڵكو بەگومانەوە سەرنجیان دەخرێتە سەرو كاتی .

جێبەجێکردنیان نادیارە).

لە درێژەی وتارەکەیدا (نوری سەعید) دەڵێت (لەم جیهانە پرجەنجاڵیو بارودۆخە ناهەموارەی ئێمەی پیا دەگوزەرێین، تا ئەوکاتەی کارەکان جێگیردەبنو راستیەکان دەردەکەونو شتە شاراوەکان ئاشکرا دەبن، پێویستە عێراق بەردەوام بێت لەبەرێوەبردنی کوردەکان لەناوچەی باکووردا، بەتایبەتی لەم کاتەدا دەبینین لەناوخۆی سنووری ئێرانەوە ئاژاوەو گێرەشێوێنی خەریکە ئەمدیوی سنوورمان دەگرێتەوە.. سەرۆك خێڵە کوردەکانی ئێران دەسەڵاتی تەواویان کێشاوە بەسەر ناوچەکانیانداو دژ بە حکومەت لەشەرِدانو دەنگۆی ئەوەیش هەیە لە ناوچە سنووریەکانی ئێرانی ژێر دەسەڵاتی سوپای سووری سۆڤیەتی بەرانبەر بەسنوورەکانی تورکیاو عێراق کوردەکان لە بەرێوەبردنو هەڵسووراندنی کاری ئەرکە خۆجێیەتیەکاندا خەریکی دامەزراندنی نیمچە دەوڵەتێکن لەناوچەکەیاندا دوور لە دەسەڵاتی حکومەتی ئێران، بە مەبەستی پاراستنی هێمنیو ئاسایشی سنوورەکانی حکومەتی تورکیا خەریکی کۆکردنەوەو جێگیر کردنی هێزە سەربازیەکانییەتی بەرانبەر بەهێڵی روو بەرِوو بوونەوە لەگەڵ ئێرانو عێراق. وەك ئەو زانیاریانەی بە دەستم گەیشتوون، لەم دواییانەدا بە شێوەیەکی دیارو لەبەر چاو زیاتر لە جاران پەیوەندی نێوان چینو توێژە جیاجیاکانی کوردەکانی ئێران لەپەرەسەندندایە. هەروەك پێشتر ئاماژەم پێکرد گومان لەوەدانییە دەوڵەتانی پەیوەندیدارو خاوەن بەرژەوەندی بەرێوەبەرو راپەرێنەری کاروباری ئەو ناوچە کوردنشینیانەن. بەو هۆیەوە هوشیاری دەدەم لەوەبگەن لە ئەمرِۆدا ئێمە لەچ بارودۆخێکی ناهەموارو نالەباردا گوزەر دەکەینو لەهەموو لایەکەوە گەمارۆدراوین، پێویستە لێپرسراوان زۆر بەئاگابنو بەهوشیاری تەواوەوە کارەکانیان ئەنجام بدەن.. تاچەند لەتوانایاندایە خۆپارێزی بکەنو رێگربن لە هەر کارێکی ناپەسەندو دزێوو تێکدانی ئاسایشی وڵاتو هەل وەرگرتن لە بارودۆخی جەنگ.. لەکاتێکدا ئەگەر بۆمان دەرکەوت کوردەکانی

ناوخۆی عێراق ئامانجیان لە ئامانجی عێراقیەکانی تر جیاواز نییەو لەڕووی چاکسازیەوە خوازیاری بەڕێوەبردنی پەروەردەو تەندروستیو ئاوەدانی دەبن..

دەبێ هەست بەوە بکەین نەك چاکسازی تەنها لەو ناوچانەدا پێویستە، بەڵکوو لەسەرانسەری عێراقدا درەنگ یان زوو جێی بایەخپێدانو ڕەزامەندین و دەبێ جێبەجێ بکرێن، ئەمەیش وەك ئەرکێکی نیشتیمانی لەپێناوی بژێویو بەرزکردنەوەی ئاستی پێداویستیەکانی گەل لەو داهاتەی کەهەیەتی، تائەم سنوورە ئەمە ئەرکێکی سەرشانی لێپرسراوانە، ناشکرێت دواکەوتنی پرۆژەکانی چاکسازی بەخراپ کەڵکی لێوەرگیرێتو بەتێکدانی پەیوەندی برایانەی نێوان کوردو عەرەب بشکێتەوە.

لێرەدا دەخوازم بەگرنگیەوە سەرنج بخرێتە سەر ناوچەی باکوورو کاری تایبەتیان بۆ بکرێت، تەنانەت ئەگەر لەسەر حیسابی ناوچەکانی دیکەیش بێت.. دەبێ ئەوەیش پێش چاو بخرێت ئەم مەسەلەیە پێویستیە لەو بارودۆخە کە خستوویەتە ئەستۆمان، دەبێ لەدیدگایەکی فرەڕەهەندەوە وەك یەکەیەکی یەکگرتوو سەرنجەکان بخرێنە سەر عێراقو بێ هەڵاوێردن دەستی چاکسازی هەموو ناوچەیەك بگرێتەوە کەدەبێتە مایەی خۆشبەختیو خۆشگوزەرانیو ئاسوودەیی هەموان)

**دڵسۆزی گەل نوری سەعـــــید**

وەزارەتەکەی (حەمەدی پاچەچی) لەئاستی مەسەلەی کوردو مافەنەتەوایەتیو نیشتیمانییەکانیدا سیاسەتێکی چەوتی شۆڤێنیزمیو کوێرانەی گرتبوو بەرو تەواوی پرۆژەی چارەسەرکردنی (نووری سەعید)ی بۆ مەسەلەکە ڕەتکردەوە.. هەر لەسەرەتای پێکهێنانی وەزارەتەکەیەوە ئاشکرا بوو بەپشتیوانی راستەو خۆی بەریتانیا (پاچەچی) کەوتبوویە خۆ سازدانو

ئامادەکاری ئەنجامدانی هێرشێکی بەربلاو بۆ سەر ناوچە رزگارکراوەکانی کوردستان. بێگومان سەرکردایەتی شۆڕش لەوەبێ ئاگانەبوو، بۆیە بە رابەرایەتی (مەلا مستەفا بارزانی) بزووتنەوە هەرزوو کەوتە خۆ کۆکردنەوەو خۆئامادەکردنی رووبەڕووبوونەوەی هەر تەنگەتاوی و کتوپڕیەك و هێزە چەکدارەکانی سەنگەرەکانی پێشەوەی بەرگری کردنیان گرت. لەلایەکی ترەوە لە پێناوی زیاتر تۆکمەکردنی ریزەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردو رێگریکردن لە هەر گێرەشێوێنییەکی ناوخۆو رەچاوکردنی ستراتیژییەتی سەردەمەکە. لە ١٩٤٥/١/١٥ دا (بارزانی) لیژنەی رزگارکردنی کوردستانی پێکهێناو بڕیاری جێبەجێکردنی ئەم خاڵانەی راگەیاند: ـ

١ - رزگارکردنی کوردستان و گەلی کورد لەستەمی ستەمکاران.

٢ - دامەزراندنی هێزی بەرگری لەکوردستان.

٣ - کارکردن لەپێناوی پاراستنی یەکێتی ریزەکانی گەل و رێککەوتنی نیشتیمانیدا.

٤ - نزیکبوونەوەو گرێدانی پەیوەندی هەمەلایەن لەگەڵ تەواوی رێکخراوو کۆمەڵ و پارتە نیشتیمانییە پێشکەوتوو خوازەکانی کورد لەسەر ئاستی کوردستانی گەورە.

٥ - گەیاندنی دەنگی گەلی کورد بەرای گشتی عێراق و دەوڵەتانی ناوچەکەو جیهان لەرێی باڵیۆزەکانەوە لەبەغداو روونکردنەوەی ئەوستەمکاریانەی لە کورد دەکرێت بۆیان.

٦ - بەکارهێنانی هۆکارەکانی راگەیاندن لەریسواکردن و ئاشکرا کردنی سیاسەتە چەوتەکانی حکومەت دژ بەگەلی کورد بۆ تەواوی کۆمەڵگاکان.

٧ - داواکاری و بەدواداچوونی بەپەلەی جێبەجێکردنی بەندەکانی رێککەوتنی ساڵی١٩٤٣. پاش بلاوبوونەوەی ئەو بەندانە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکانی کوردەواری زۆربەگەرمی و بەچاوی هیواو بڕوای بەتینەوە پێشوازیان لەو

لیژنەیە کردو لەتواناکانیو هەنگاونانی بەرەو جێبەجێکردنی ئامانجەکانیان دڵنیابوون، هەمان کات (بارزانی) لە گەشتی ناوچەکەو بەسەرکردنەوەی بەردەوامبوو، لەلایەك بەسەر کردنەوەی هێزەکانو ئاگاداربوونی لەژیانو گوزەرانی گەلەکەی، لەلایەکی دیکەوە زیاتر لەهەر کاتێکی رابردوو گرنگی خستبوویە سەر پەیوەندییەکانی بەپارتو رەوتە سیاسیەکانی ترەوەنەتەوکاتەی گەیشتە هەماهەنگی تەواو لەگەڵیاندا.

لە ئازاری ١٩٤٥ بەهەر مەبەستێك بوو، باڵوێزخانەی بەریتانیا لە بەغدا داوایکرد لەگەڵ (مەلا مستەفا)دا کۆببێتەوە.. لەگەڵ ئەنجامدانی کۆبوونەوەکەدا باڵیۆزی ناوبراو چەند مەرجێکی لەپێش رابەری بزووتنەوەی کورد دانا:

أ - رێگری نەکردنو دژایەتی نەکردنی سوپای عێراق لەکاتی هەڵسانی بە مەشقو راهێنان لەسەر شەڕی چیایی لەناوچەی بارزانداو لەژێر چاودێری راستەوخۆ ی ئەفسەرانو بەشداریکردنی یەکەسەربازیەکانی بەریتانیا، بۆ ئەوەی هیچ نیازی سیاسیو سەربازی بەدواوەبێت.

ب - ملکەچکردن بۆ فەرمانو رێنماییەکانی حکومەتی عێراق وتێکەیشتنو ئالوودەبوون لەگەڵیدا.

ج- گەڕانەوەی ئەفسەرانی کورد بۆ ناو سوپای عێراق.

وەڵامدانەوەی (مەلا مستەفا بارزانی) لە ئاستی ئەو داواکاریانەدا بەم جۆرە بوو:

١ - هیچ کات لەشەڕدا ئێمە دەست پێشخەر نابینو لەدژی لایەنێك ناوەستین ئەگەر پەلامارمان نەدات.

٢ - لەمەرجێکدا ملکەچی فەرمانەکانی حکومەت دەبینو رێنماییەکانی پەسەند دەکەین ئەوە جێ بەجێ بکات کەلەسەری پێکهاتووین.

٣ - هەر لەسەرەتای ئامادەکاری یەکە سەربازیەکانەوە، گومان بەوە دەبەین لەرێی مەشقو راهێنانەکانیانەوە، یەکە سەربازیەکان نیازی داگیرکردنی

ـوچەکانیان هەبێت وبیخەنەوە ژێر دەسەلاتیان.

٤ - ئێمە تەنها دوو هەڵبژاردەمان لە پێشدایە.. یان رزگارکردنی کوردستان، یان مردنی سەر بەرزی.. ئەوەی پێویستە ئاشکرا بکرێت (گەلەکەمان لە بەڵێنە جموتەکان تێربووە).

کۆبوونەوەکە بێ هیچ دەرئەنجامێك گەیشتە کۆتایی.

## هەڵگیرسانی شۆرشی ساڵی ١٩٤٥

دوای چەند پەیوەندیەکی سەرنەکەوتوو لەگەڵ هەردوو لایەنەکانی حکومەتی عێراق و بەریتانیا، لە ٨ ئابی ١٩٤٥ دا وەزارەتەکەی (حەمدی پاچەچی) بەیاننامەیەکی بەم دەقەی خوارەوە راگەیاند: (پاش تێگەیشتن لەناوەرۆکی راپۆرتەکانی تایبەت بە گێرە شوێنی و ئاشوو بگێری وتێکدانی باری ئاسایش لەناوچەی بارزان و دەوروبەری و ئەو کارە دزێوو تاوانکاریانەی (مەلا مستەفا بارزانی) و شوێنکەوتوانی ئەنجامی دەدەن، وەك ئەرکی سەرشەمان پێویستە لەگەڵ دووبارە بوونەوەی تاوانکاریدا هەوڵی گێرانەوەو سەپاندنی یاساو دەسەلات بدەین.

لەودیدگایەوە بڕیارماندا بەداگیرکردنی ناوچەی بارزان و گێرانەوەی دەسەلاتی دەوڵەت و دەستگیرکردنی یاخیبوان و تاوانباران و رەوانە کردنیان بۆ بەردەستی دادو یەکسانی. وەك تێبینی دەکرێت وشەی داگیر کردن تەنها لە رووی داگیرکردنی ولاتێکەوە سەرچاوە دەگرێت، کەخاکی دەوڵەتێکی تری داگیرکردبێت). بڕیاری (پاچەچی) سەرۆك وەزیرانی حکومەتی عێراق لە راگەیاندنی ئەم جۆرە بڕیارەدا لەلایەن خۆیەوە بڕوای بەوە هەیە ناوچەی کوردستان بەشێك نەبێت لە عێراق تابە هێزی سەربازی بیەوێت داگیری بکات و ئاسایش و ئارامی بەسەردا بسەپێنێ. ئەمە پرسیارێکەو وەلامدانەوەی بۆ دواتر

هەڵدەگرین. بەڕاگەیاندنی بڕیارەکەی (پاچەچی) لەهەموو ناوچەکانی دیکەوە یەکە سەربازیەکان بەرەو ناوچەی باکوور ڕێگایان گرتەبەر، بەرانبەر بەم پیلانە شۆڕشگێڕان تەنیا ڕێگای بەرگریکردنو بەرپەرچدانەوەی ئەو هێزانەیان بۆ مابوویەوە. لەکاتێکدا ڕۆشنبیرانو قوتابیانی کوردستان پشتیوانی تەواوی خۆیان بۆ شۆڕش ڕاگەیاند، هەمانکات سەرۆکانی تیرەو خێڵە خۆ فرۆشەکان هەڵوێستی پێچەوانەیان نواندو بەهێزەکانیانەوە پشتیانکردە شۆڕشی گەلەکەیانو پەیوەندیان بەهێزەکانی حکومەتەوە کرد، کەئەمە خیانەتکاریەکی ئاشکرای دژبە شۆڕش بوو، لەسەرەتای هەڵگیرسانی شەڕەوە هێزە شۆڕشگێڕەکان چەندین داستانی سەروەریان تۆمارکردو سەرکەوتنی مەزنیان بەسەر هێزە بەزیوەکانی حکومەتدا بە دەستهێناو زەرەرو زیانی فراوانیان پێگەیاندن.

جێی داخە خیانەتکاری بەردەوامی خێڵەکانو پەیوەندیکردنیان بەهێزە سەربازیەکانی حکومەتەوە هاوکێشەکانیان دژبە شۆڕش پێچەوانە کردەوە.

لەم ئاستەدا سەرهەڵدانی کوشتاری نێوان حکومەتو شۆڕش گۆڕرا بۆ شەڕو کوشتاری ناوخۆی کورد بەکوردو کارەساتی گەورەو نەخوازراوی لێکەوتەوە. ئاشکرایە ئاسەواری بارودۆخی شەڕو کوشتاری ناوخۆ زۆر درەنگ دەسڕێتەوە، ئەوەبوو ڕووداوەکانی دواتر ڕاستی مەسەلەکەیان سەلماندو ناچار پاش چۆڵکردنی گوندەکان لەخێزانەکانو دڵنیابوون لێیان بڕیاری کشانەوە بەرەو سنووری ئێران بەجەنگاوەرانی شۆڕشگێڕدرا. شۆڕشگێڕان لە ناوەڕاستی پەژارەی کشانەوەو خۆشحاڵی پێشوازی لێکردنیان لەخاکی کوردستانی ڕۆژهەڵات نوقم بووبوون کاتێك لە ١٩٤٥/٥/١١ شۆڕش گەیشتە ڕێگای داخراو، هەڵوێستێکی لەیاد زیندووو هەرگیز لەیادنەچوو، گەیشتنی خێزانەکان بەخاکی کوردستانی ئێرانو لە ئامێزگرتنیان بوو، بەتایبەتی دابەشکردنیان بەسەر گوندەکانو هاوبەشی کردنیان لە خۆراكو پۆشاکداو بە نەوازشەوە نیشتەجێکران.

لەو کاتەوە لەگەڵ کۆماری کوردستانی ئێرانو بە تایبەتی لە مەهاباد

سەردەمێکی نوێی ڕێڕەوی بزووتنەوەی کوردایەتی دەستی پێکردەوە.

## بارزانییەکان و کۆماری مەهاباد

هێزەکانی بزووتنەوەی کوردایەتی بە بەرزترین مەشق‌و ڕاهێنان نەخشەو پلانەکانی شەڕیان وەرگرتبوو، لەو ڕێگایەوە توانیان بەسەر سەخترین بارودۆخی شەڕدا زاڵبن. ئەو سەردەمەی کشانەوەی هێزەکانی شۆڕشی بۆ سنوورەکان سەپاند، جیاوازی فراوانی هێزبوو لە نێوان بزووتنەوەی کوردو حکومەتی عێراقداو بەتایبەتی کاریگەری خەیانەتکاری خێڵەکان‌و دژایەتیکردنی شۆڕش‌و کەوتنەوەی شەڕی ناوخۆوە، لەو ئاراستەیەوەبوو بەنیازی پارێزگاریکردنی هێزەکان‌و هێشتنەوەیان لە سوودی داهاتووی ناوچەکە ئەو بڕیارە سەنگین‌و گرانە بدرێت. دەبێ ئەوە بزانین، وەك پێویستی ئەو وەختە دەچوون لەو گێژاوە ناهەموارو نالەبارە ڕوو لەو ئارامگای لەبارو شایستەی مانەوەو پارێزگاریکردنی هێزەکانی شۆڕشی کوردی عێراق کۆماری تازە لە دایکبووی کوردستانی ئێران بوو لە مەهاباد.

پێشوەخت (بارزانی) ڕاستەوخۆ پەیوەندیکرد بەسەرکردە کوردەکانی ئێرانەوە، دەست بەجێ هەڵوێستی جوامێرانەی خۆیان نواند بەبڕیاردانی پێشوازیکردنی هێزە شۆڕشگێڕەکانی کوردستانی عێراق‌و خێزانەکانیان لەخاکی کوردستانی ئێران، ئەوە بوو لەپێشوازیکردنێکی جەماوەری شکۆدارو بە گوێرەی ڕێنماییەکانی (قازی محەممەد)ی سەرۆکی (پ. د. ك)ی ئێران‌و سەرۆك کۆماری دواتری کۆماری مەهاباد، هێزەکان گەیشتنە کوردستان‌و جێ وڕێی شیاویان بۆ دابینکرا. لە ١٩٤٦/١/٢٢ کۆماری مەهاباد ڕاگەیەنراو دواتر ڕووداوەکان سەلماندیان هێزەکانی (بارزانی) هەڵگری قورسایی تەواوی شەڕو کردەوە سەربازیەکان بوون دژبە هەڵەکانی حکومەتی تاران لەگەمارۆدانی شۆڕش‌و لەناوبردنی کۆماری کوردستان.

بارزانییەکان بەجۆرێك جوامێری‌و توانای بەرزو دڵسۆزی خۆیان سەلماند بوونە جێی متمانەی فەرماندەو سەرکردەو جەماوەرو پێشەوا (قازی محەممەد). لەبەرگریکردنی کۆماری مەهاباد بارزانییەکان چەندین شەڕی گرنگیان دژبە سوپای ئێران ئەنجامدا، کە لێرەدا ژمارەیەك لەو شەڕانە دەخەینە روو[17].

## یەکەم: شەڕی قاراوا

تیایدا هێزە سەربازیەکانی ئێران رووبەڕووی مەزنترین شکست بوونەوەو زیانێکی گیانی‌و ماڵی زۆریان پێگەیەنراو هەشتا کوژراویان لە گۆڕەپانی شەڕ لەپاش جێما، جگە لە بەدیل گیرانی سەدو بیست سەربازو دەست بە سەرداگرتنی بڕێکی زۆری چەك‌و جبەخانەی سەربازی. بەدیکردنی گرنگی سەرکەوتن لەم شەڕەدا سەرکەوتنی بارزانییەکان بوو لەیەکەم ئەزموونیاندا لەسەر خاکی کوردستانی ئێران بەرانبەر بەهێزێکی سەرسەختی دژ بەکورد،لەم نەبەردیەدا بارزانییەکان تواناکانی خۆیان بۆ جەماوەری کوردستانی ئێران سەلماند. بەو هۆیەوە خەڵکی شاری مەهابادو گوندەکانی دەوروبەری لە پێشوازیاندابوون‌و پیرۆزبایی سەرکەوتنیان لێدەکردن‌و لەم بەرو ئەوبەری شەقامەکاندا بۆبینینی سەربازانی بەدیلگیراوی ئێرانی ریزیان بەستبوو.

## دووەم: شەڕی مامەشا

لەگەڵ فراوانی چەندایەتی‌و چۆنایەتی هێزە هێرشبەرەکانی ئێران بۆسەر پێگەو سەنگەرەکانی جەنگاوەرە بارزانییەکان، هەر لەسەرەتاوە رووبەڕووی

---

(17) بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد- مەسعود بارزانی

شکستی گەورەو زیانی فراوان بوونەوە. لە ئەنجامی شکستی هێزەکانیاندا، فەرماندە باڵاکانی سوپای ئێران لە ناتوانایی سەربازیەکانیانو لە سەختی پێگەو سەنگەری بارزانییەکان دڵنیابوونو لەوەگەیشتن سەرکەوتن بەسەریاندا مەحاڵەو بەئاسانی کاریان بۆ ناچێتە سەر.

لە راستیدا ئەو سەردەمە بە هۆی نەبوونی پزیشكو و دەرمانی پێویستەوە بارزانییەکان سەختی گوزەران رووی لێنابوونو نەخۆشیو پەتای کوشندە لەناویاندا بلاوبووبوویەوەو لە غوربەتدا زیاتر لە دوو سەد کەسیان لێ بووە قوربانی. جگە لەو کۆسپو ژیانە سەختە، سەرباری هەمووی ئاشکرا بوو هێزە سۆڤیەتیە یاریدەدەرەکانی کۆماری مەهاباد لە رێی پەیمانێکی نێودەوڵەتیەوە لە سەرەتای بەجێ هێشتنی ئێراندان، دیارە سەرگرتنی پەیمانەکە لە ئاستی کرانەوەی رێگای کوردستانو مەهابادا دەبێت لە پێش سوپای ئێرانداو دەرەنجامەکەیشی ئەوە بوو وەك نەرێتی هەمیشەیی زلهێزانو گەمەکردن بەچارەنووسی کورد ئەمجارەیش لەنێوان بەرژەوەندیەکاندا کۆماری کوردستان گەیەنرایە ئەو چارەنووسە تاریکە. لە جیاتی خۆ بەکوشتدانو داکۆکیکردن لە ژیانی گەلی کورد سەرۆك خێڵە یاریدەدەرەکانی کۆماری مەهاباد لە دوژمنایەتیکردنیدا کەوتبوونە پێشبڕکێو ناردنی نامەو نێرراوانی تایبەت لە پەلەکردنی گەیشتنی سوپای ئێران بە ناوچەکەو بە شاری مەهابادو بە سنگی کراوەوە لە پێشوازیکردنی هێزەکانیدا بوون.

سەرچاوەیەك لە رووداوی دوادیداری (مەلا مستەفاو قازی محەممەد) لە زاری خودی (مەلا مستەفا)وە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی (سەردانی قازی کردو لە نیازیم پرسی چی دەکاتو بڕیاری چیە؟ وەڵامی ئەوەبوو وتی – بە نیازم لە پێناوی پاراستنی گیانی خەڵکی مەهاباد خۆم بەخت بکەمو خۆم دەدەمە دەستی سوپای ئێران.. پاش تاوێك بێدەنگی گەڕایەوە سەر قسەکەیو وتی: نوێنەرێکم ناردوەتە لای جەنەڕاڵ (هومایۆنی)و لە نیازی خۆم ئاگادارم کردوە. (بارزانی)

دەڵێت: (دیم فرمێسك بەخوڕ لە هەردوو چاوی سەر دەکەن، بە دەروونی تەنگو قورکی تاساوەوە وتی- بەناگابە جگە لە خێڵەکەی خۆت بڕوات بە کەسی تر نەبێت، ئەوانە هەموو پێش من بە سوێندخواردنەوە دڵسۆزیان بۆ کوردو کۆماری مەهاباد دەربڕی، هەر ئەوانەشن دڵسۆزیو ملکەچی خۆیان بۆ سوپای ئێران دەرخستووە). لەم ئاستەدایە (مەلا مستەفا) روو لە (قازی) دەکاتو دەڵێت: (ئامۆژگاریەکت دەکەم بڕوات بە بەڵێنی ئێران نەبێت)[١٨]. (قازی) لە دڵسۆزی تەواوی خۆیەوەو دەڵێت: (تاله تواناتدایە لەسەرۆك خێڵەکان خۆت دوور بگرە، دڵنیام بەرانبەر بە ئێوە رێگای نادروست دەگرنە بەر، تکات لێدەکەم لەشەڕی سوپای ئێران خۆپارێزی بکەو هەرچی زووتر لەشاری مەهاباد دەرچۆرە دەرەوە). لە کۆتایی دیدارەکەدا (قازی) بەدەروونی پڕ لە پەژارەوە لە دوانیازی خۆی پرسی.. وتم (بەنیازم خێزانو کەسو کارەکەمو جەنگاوەران لە سنووری عێراق نزیك بکەمەوەو تا بەهار خۆمان لە هیچ شەڕێك نەدەین، ئەوکاتە هەوڵ دەدەین حکومەتی عێراقی رازی بکەین لێبوردنی گشتی بۆ خێزانو ماڵو منداڵەکانمان دەربکات.. ئەگەر لە هێنانەدی ئەو نیازە نا ئومێد بووین بە ناچاری لەگەڵ خۆماندا دەیانبەینە خاکی یەکێتی سۆڤیەت). لەو دیمەنە پڕ ئاسۆرو چارەنووسسازەدا (مەلا مستەفا) دەڵێت :(تکایەکی زۆرم کرد لەقازی لەگەڵماندا بێتو لەشاری مەهاباد دەربچێتە دەرەوە، بەوشەی شەرەف دڵنیام کرد تا دوا دڵۆپی خوێنمانو کۆتاهەناسەمان لەپێناوی ئەو هێما مەزنەی گەلی کوردا گیانمان بەخت بکەین.. ئێمە بەلامانەوە سەختە یەکەم سەرۆك کۆماری کوردستان

(١٨) وشەی ئامۆژگاری بەرانبەر بەقازی نەوتراوە، بارزانی ئامۆژگاری بەڕێز کاك مەسعود دەکات و پێی دەڵێت کە بڕوای بە ئێران نەبێت .. وشەکە بە هەڵە لە چاپدا پەڕیوەتە ئەو جێگایە .. بێگومان مێژوو لەمۆرکردنی پەیمانی جەزایری/ساڵی ١٩٧٥ ی نێوان عێراق و ئێران ئەو ڕاستیەی سەلماند .. وەك دواتر لە جێی خۆیدا باسی لێوە دەکرێت. نووسەر.

ـەدیلی ژێـر دەسـتەی دوژمـن بکرێـت.. هیـوادارم بـە هەڵوێستەکەتدا بچیتەوە. (فکزی) بەکوڵی گریانەوە لە جێگاکەیدا هەڵسایەوەو بە توندی لە ئامێزی گرتمو ووسـاندمی بـە سـنگیەوەو چـەند جارێـك رووخسـارمی مـاچ کـردو وتـی: (لـە ـەروەردگاری مـەزن دەخـوازم سـەرکەوتووتان بکـاتو بتانپـارێزێ.. دڵنیابـە بەخشـینی گیـانی مـن بـەم نیشـتیمانە هۆکاردەبێـت لـە هێـور بوونـەوەی بارودۆخەکەو روونـەدانی توندوتیـژیو کوشـتنو تۆقانـدنی خەڵکەکە). ئەمـەی وتو لەگیرفانیدا ئاڵای کوردستانی دەرهێنـاو دایـە دەستمو وتـی: (ئەمـە هێمـای کوردسـتانەو وەك ئەمانـەتێك دەیدەمـە دەسـتت، رام وایـە شـیاوترینو چاکترین کەسێك بیت لەگەردنتا بیپارێزیـت. لـەبارو دۆخـی سـەختو نالـەباری گوزەرگـای ئەم هەمووناکۆکیانەدا، لە ١٩٤٦/١٢/١٧ بەگەیشتنی سوپای ئێران بە شاری مەهاباد، بارزانییـەکان تیایـدا کشـانەوە.. بـەو کارەسـاتە دڵتەزێنـەی داڕووخـانی کۆمـاری مـەهاباد بـێ هیـوایی سەرانسـەری کوردسـتانی گـەورەی گرتـەوە. لـە ئاسـتی هەڵسـەنگاندنی بارودۆخەکـەو دیـاریکردنی چارەنووسـی هێزەکـانو خێزانـە بارزانییـەکان (مـەلا مستەفا بـارزانیو شـێخ ئەحمـەد)ی بـرای لەگـەڵ فەرمانـدە سەربازیەکانی ئێراندا کۆبوونەوەو سێ هەڵبژاردە خرایـە بەردەستیان یـەکێکیان بۆ خۆیان هەڵبژێرن.

١ - بەجێ هێشتنی هەرچی زووتری خاکی ئێران.

٢ - دانـانی چـەکەکانیانو رازیبوونیـان بـە نیشـتەجێکردنیان لـە شـاری (هەمەدان).

٣ - ئامادەیی روو بەڕوو بوونەوە لەگەڵ سوپای ئێران.

وەڵامی (شێخ ئەحمەد) تەنها هەڵبژاردنی رێگای یەکەم بوو رزگاریـان بکـات، بە راشکاوی ئێرانییەکانی لەوە هوشیارکردەوە ئەگەر هێـرش کرایـە سـەریان زۆر بەتوندی وەڵام دەدەنەوەو بەرگری لە خۆیان دەکەن. ئەوەبووتا ئەوکاتەی هـاتنی بەهار بارزانییەکان بەیـەکجاری لـەخاکی ئێـران چوونە دەرەوە، لەگـەڵ روودانـی

چەند شەڕوپێکدادانێکدا وەک:

## شەڕی ئالووس

بە تێکشکاندنی سەختی هێزە سەربازیەکانی ئێران کۆتایی هات و تیایدا زیانێکی یەکجار فراوانیان پێگەیشت لە زیانی گیانی و کەلوپەل و کەرەسەی جەنگی لە چەک و تەقەمەنی و بەدیلگرتنی ژمارەیەکی زۆر ئەفسەرو پلەدارو سەرباز، کاریگەری توندی شەڕەکە سەرکردایەتی ئەرکانی سوپای ئێرانی ناچارکرد هەڵسەنگاندنێکی نوێتر بەرانبەر بەرزانییەکان بکەن و بەهەڵوێستەکانی پێشوویاندا بچنەوە. لەلایەن خۆیانەوە خێڵە کوردەکان بێ لایەنی خۆیان لە نێوان حکومەت و بارزانییەکاندا شیاوترو گونجاوتر لێکدابوویەوەو نەیاندەویست ببنەلایەنی ناکۆک لەکێشەکەدا.

## شەڕی خۆشار

دوای دڵنیابوونی (مەلا مستەفا بارزانی) لەنەمانی بواری مانەوە لە ئێران و عێراقدا، کەوتە تاقیکردنەوەی ئەو ڕێگایەی بەئێراندا بەرەو خاکی یەکێتی سۆڤیەت تێدەپەڕێت. لەو وەختە ناسکەدا زانیاری و سخیوڕێکی خیانەتکاری سەر بە هێزەکانی ئێران هۆکاربوو لە گەمارۆدانی تەواوی (مەلا مستەفا) و ژمارەیەک لە هاوڕێکانی، بەوپەڕی پاڵەوانییەتی و بە هێزێکی کەمەوە توانی گەمارۆکە بشکێنێ و هێزی گەمارۆدەر تووناوتوون بکات و فەرماندەی هێزەکەو چەند سەربازێکیشیان لێ بکوژێت.

## شەڕەکانی شنۆ

هێزێکی مەزنی پڕچەکی ئێران هێرشێکی توندی کردە سەر بارزانییەکانو لە هەموولایەکەوە گەمارۆدران، بە جۆرێك تانزیکی مردن برسی کرانو جێگایان بێ لێژکراو ژمارەیەکی زۆریشیان لێکوژرا.

لەگەڵ خۆڕاگریو بڕوای بەهێزەوە بارزانییەکان توانیان گورزی کوشندەو تۆڵەسێن بە سوپای ئێران بگەیەننو زیاتر لە پەنجاسەرباز وپلەداری لێ قەلاچۆبکەنو چلی دیکەیش بەدیل بگرن.. ئەو گورزە کوشندەیە فەرمبووکەرەوەی شەڕو قوربانیدانەکانی پێشتربوو.. بەناچاری لە تۆڵەی شکستو زیانەکانیدا ئێران پەنای بردە بەر فرۆکەکانی هێزی ئاسمانیو بوردمانکردنی ئەو گوندانەی پەناگای بارزانییەکان بوون.

## دواشەڕەکان (یان شەڕەکانی کۆتایی)

بەنیازی جێپێلێژکردنو رامالینی بارزانییەکانو دەست بەسەردا گرتنی لووتکەی چیاکان رۆژی ١٩٤٧/٣/٢٥ هێزێکی فراوانی سوپای ئێران هێرشی کردە سەریان، سەرەتا تا ئاستێك هێزەکە سەرکەوتنی بەدەستهێنا، ئەوەندەی نەخایاند لە هێرشێکی پێچەوانەی غافلگیردا بارزانییەکان هێرشبەرانیان خستە گەمارۆی خۆیانەوەو بەیەکجاری هێزەکەیان تێکشکاندو بەکوشتنو بریندارکردنی ژمارەیەکی زۆری سەربازان شوێنەکەشیان لە چنگ دەرهێنانەوە.

## چوونەدەرەوە لە ئێران

لەو وەختەدا بارزانییەکان بەرەو خاکی عێراق لەجێ بەجێکردنی هەنگاوەکانیاندا بوون، دەنگۆی لەسێدارەدانی (قازی محەممەد) ی سەرۆك کۆماری مەهابادو هاو رێکانی پێگەیشت. لەوبارەوە (مەسعود بارزانی)

دەڵێت: ئەم رەستەیەم لەیادداشتنامەکەی (بارزانی) دا بەمجۆرە

بەرچاوکەوت کەبەزمانی عەرەبی نووسرابوو (وصلنی نبأ إستشهاد الپیشوا و احمد حسین و صدر قاضی.. إنا لله و إنا إلیه راجعون - دەنگوباسی شەهیدکردنی پێشەواو محەممەد حسەین‌و سەدری قازی مان پێگەیشت.. هەموان مولکی خوداین‌و بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە). وەك دەزانین سەردەمێك بزووتنەوەی کورد لە عێراقدا گەیشتە کۆتایی، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو سەردەمە چەند ڕەهەندی نەتەوایەتی لەخۆ گرتبوو، هیواو ئاواتی جارێکی تر هەڵسانەوەی لێدەکرا. پێش بەجێهێشتنی سەردەمە کە پێویستە بەوردی سەرنجی بدەین‌و هەندێ تێبینی تایبەتمان لەسەری هەبێت.

## ڕەهەندی نەتەوایەتی

لەگەڵ بوونی بزووتنەوەی کورد لە عێراق، (پ. د. ك) چەشنی (ح. د. ك) ی ئێران بەپاراستنی سەربەخۆیی خۆیەوە دامەزرا.. بەمانا دووپارت‌و دوو بزووتنەوەی جیالەیەك، ئەو کاتەی فشاری هەمە لایەنە کەوتە سەر مەودای چالاکی‌و جموجوولی شۆڕشی بارزان‌و زۆر بۆ هاتنی بەناچاری جەنگاوەرانی ڕوویانکردە کوردستانی ئێران‌و لەلایەن جەماوەرە دڵسۆزو کورد پەروەرەکەیەوە لە ئامێز گیران‌و پێشوازی شیاویان لێکرا.

بەرانبەر بەوەو بەگیانێکی لە خۆبوردنەوە بارزانییەکان خۆیان بۆبەرگریکردن لەکۆماری مەهاباد سازو ئامادەکردو لە پێناویدا دەیان ڕۆڵەی دلێریان کردە قوربانی ئەو ڕێگایە، بەوە سەلێنرا بزووتنەوەکەیان بەتەنها بزووتنەوەی جەنگاوەران نەبوو، بزووتنەوەیەکی تەواوی هەموو تاك‌و تیرەو خێڵ‌و توێژێك بووەو لەهەماهەنگی‌و هاوپەیمانییەکی تۆکمەدا سەر ڕێگای خەباتی گرتبوویە پێش.. وەك دەرکەوت کۆچکردنەکەیشیان کۆچکردنێکی گشتگیربوو لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر لەناو خۆی کوردستانی گەورەدا. لێرەدا

تێگەیشتن لەچەمکی بزووتنەوەکە دووپات دەبێتەوەو بەڕوونی دەسەلمێت کوردستان خاکی کوردەو هەمووی کوردخاوەنییەتی، پێویستە بزانینو خۆمان بدەینە دەستی ئەو واقعە، بوونی سنووری سیاسی لە نێوان دەوڵەتاندا کارێکە پەیوەندی بەکەسەوەنییەو بزووتنەوەکانیش سنوورەکان نابەزێننو لەڕاستیدا بە سنوورێکی وەهمی سیاسەتی دەزانن. هەمان کات لەگەڵ خۆشحاڵی سەرکردەکانی مەهاباد لە ئاستی دامەزراندنی (پ. د. ك) لەعێراق ڕێگای کارکردنو چالاکیە سیاسیەکانیشیان لەناوخۆی ئێراندا نەدا، مەترسی لەکاردانەوەی دەوڵەتانی دراوسێ دەکرا بەڕەهەندی نەتەوایەتی لێك بدەنەوەو بەزیان بەسەر بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی ئێراندا بشکێتەوە. لێرەدایە ڕەهەندی نەتەوەیی‌و نیشتیمانی دەردەکەوێت. ماوەتەوە بڵێین دوا تێبینی بە شێوەیەکی گشتی‌و لە هەموو شتێك گرنگتر جەنگاوەری کورد هەڵگری کلتووری ڕەسەنایەتی‌و گیان بەختکردنەو بڕوای بەوە هەیە (مردنە ژیان دەبەخشێت).

جەنگاوەری کوردو شاخ بەتوندی دەستەملانو وابەستەی یەکترن، ئەوندەی بەچەکی دەستیەوە خۆی لە ئامێزی شاخ ناوەو هەست بە گرنگی مانەوەی دەکات، بەو ئەندازەیە گەلی کورد هەست بەهاو پەیمانی‌و بەرژەوەندیە نێودەوڵەتیەکان ناکات، لەگەڵ هەردەوڵەتێکدا پەیمان دەبەستێت لەوەناگات ئەگونجێت ئەو دەوڵەتە لەهەرساتێکدا بزووتنەوەکەو گەلی کوردیش بکاتە قوربانی بەرژەوەندیەکانی. جگەلەوە ئەگەر کورد بەچەکەکەی دەستیەوە هێزو توانا لەشاخ وەربگرێت، ئەگەر وازی لێهێنا هەمان هێزو توانای دەمێنێتەوە؟.. بێ پێچ وپەنا دەڵێین لە توانای کورددا هەیە ببێتە بەڕێوەبەری کاری دەوڵەتی‌و شاخ بە نووسینگەبگۆڕێت‌و هەمان کاریگەریشی هەبێت؟ پرسیارێکەو هەوڵ دەدەین دواتر وەڵامی بدەینەوە.

# بەشی دووەم

## پارتی دیموکراتی کوردستان

### دامەزراندنی (پ. د. ک)

لەنیشانە دیارو بەرچاوەکانی مێژووی بزووتنەوەی رزگاریخوای کورد دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، دوای سەرکەوتنی ئەزموونی (ح. د. ک) ی ئێران بەڕابەرایەتی (قازی محەممەد) لەگەڵ لێکدانەوەی چڕو پڕدا (بارزانی) بیری لەدامەزراندنی پارتێکی هاوچەشنی (ح. د. ک) ی ئێران کردەوە. بۆهێنانەدی نیازەکەی پەیوەندیکرد بەچەند پارت و ڕێکخراوێکی کوردستانی عێراقەوە، لەیەکەم هەنگاوەوە ڕابەرایەتی کۆماری مەهاباد بەگەرمی پێشوازی لە بیرۆکەو هەوڵەکەی کرد، بەڵام لەنالەباری هەل و مەرجی ئەو سەردەمەی ناوچەکەو کۆماری نوێی مەهابادو مەترسی لەسەر کاردانەوەی وڵاتانی دراوسێ، بەتایبەتی تورکیاو عێراق لەسەر تەواوی بزووتنەوەی کوردایەتی، ڕابەرانی مەهاباد بەئەنجامدانی جموجووڵ و چالاکیەسیاسیەکانی (پ. د. ک) ی عێراق لەسەر خاکی کوردستانی ئێران رازی نەبوون. بۆ جی بەجێکردنی کاری دامەزراندنی پارتی (بارزانی) پەیوەندی کرد بە پارتەکانی (ڕزگاری کورد)[19] و (شۆڕش)[20] و (ژ.ک)[21] و (لقی ح. د. ک) ی ئێرانەوە لە سلێمانی[22]. پاش راو

---

(19) پارتی ڕزگاری کورد – لەناوەڕستی ساڵی ١٩٤٥ لە ڕێکخراوی (شۆڕش) جیابویەوە.

(20) شۆڕش باڵێك بوو لە پارتی کۆمۆنیستی عێراق و ساڵی ١٩٤٥ بە کۆمەڵی شۆڕش

یژوگوڕینەوەی بیرو را، پارتەکان بەرپاگرتن وسەرکردنی چالاکییە سیاسییەکانیان پەیوەندیانکردبە (پ.د.ک)ی تازەدامەزراوەوە.کاتێک (مەلا مستەفا) لەمەهابادبوو، رۆژی ١٦ ی ئابی ١٩٤٦ پارتی لە بەغدا یەکەم کۆنگرەی گرێداو بەکۆی دەنگ ئەو بە سەرۆکو (هەمزە عەبولا) بە سکرتێر هەڵبژێرران..پەیڕەوو پرۆگرامی پارتی ئامانجەکانی گەلی کوردی لە بەدیهێنانی مافەنەتەوایەتیو دیموکراتیەکانی لە چوارچێوەی یەکێتی نیشتمانی عێراقدا

---

ناسراو ئەم کەسایەتیانە رابەرایەتیان دەکرد سالح حەیدەری سکرتێر و سەرکردایەتیەکەیشی پێکهاتبوو لە نافع یونس – عەلی عەبدەلا – عەبدولکەریم توفیق .) و.ک

(٢) لقی (ح. د. ک) ی ئێران لە سلێمانی (برایم ئەحمەد) رابەرایەتی دەکرد و پاش رووخانی کۆماری مەهاباد پەیوەندیکرد بە (پ. د. ک) ی عێراقەوە – و.ک

(٣) بەمەبەستی دامەزراندنی پارتێکی پێشڕەو، رابەرایەتی جەماوەری کورد بکات لە بەدیهێنانی ئامانجەکانی لە رزگاری و دیموکراتی و مافنەتەوایەتیەکانی، لەبەهاری ساڵی ١٩٤٦ دا دەستەی دامەزرێنەری پارتی بریاریدا بەناردنی (هەمزە عەبدولا) بۆ کوردستانی عێراق و چاوپێکەوتنی بە لێپرسراوانی(رزگاری کوردو شۆڕش و رێکخراوی –ژ.ک). دەرەنجام لەرۆژی ١٦ ی ئابی ١٩٤٦ بە بەشداری زیاتر لە حەفتا کەسایەتی پێکهاتوو لە نوێنەرانی (رزگاری کورد و شۆڕش و ژ.ک ولقی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە کوردستانی عێراق) لەماڵی (سەعید فەهیم) لە بەغدا یەکەم کۆنگرە بەسراو بەکۆی دەنگ (بارزانی نەمر) بەسەرۆک و شێخ لەتیف بەجێگری یەکەم و کاکە زیاد بەجێگری دووەم هەڵبژێرران و لیژنەی مەرکەزیش لە هەمزە عەبدولاّ و میر حاج و جەعفەر محەممەد کەریم و عەلی عەبدولاّ و ساڵح یوسفی و عەبدولکەریم توفیق و رەشید عەبدولقادر و رەشید باجەلان مەلا سەی حەکیم خانەقینی و عەونی یوسف و تەها مەحیەدین مەعروف پێکهات و هەروەها (عەبدولسەمەد محەممەد ) بەئەندامی یەدەک هەڵبژێررا

تێبینی – بۆ بەدەستهێنانی ئەم زانیاریانەی پەراوێز و.ک سوودی لە (١- تأريخ الحزب الديمقراطي الكوردستاني وەرگرتووە ).

دووپات کردوەتەوە، کە تیایدا لەسەر بنەڕەتی یەکگرتنی ئیختیاری برایانەی سەربەستدا خۆی دەبینێ.

دیارە (پ- د- ك) لەیەکەم کۆنگرەیەوە بڕوای بەبرایەتی کوردو عەرەب بەهێز بووە، هەر لەو دیدگایەوە دروشمی (لە سەربەردی بناغەی برایەتی کوردو عەرەب پیلانەکانی ئیستیعمار وردوخاش دەکەین)ی دارشتووەو بەرزکردوەتەوە. لای هەموان روونو ئاشکرایە لە یەکەم هەنگاوی دامەزراندنییەوە پارتی لە لانکەی ئەم سێ رەوتەدا کەوتووەتە سەرە رێگای گەشەکردن.

١ - رەوتی دەسەلاتی خێڵەکی (عەشایەری) کەلە رابەرایەتیکردنو سەرۆکایەتیکردنی (بارزانی) یەوە وەك سەرۆكو دامەزرێنەر سەرچاوەی گرتووە.

٢ - رەوتی مارکسی - چەپڕەو- پێکهاتوو لە ئەندامانی پێشووی وەك کۆمەڵی شۆڕش (جماعە شۆڕش).

٣ - رەوتی رۆشنبیرانی نەتەوەیی - کە (برایم ئەحمەد) رابەرایەتی دەکرد.

پارتی وەك لە نهێنییەکی توندو پارێزراودا کارەکانی رادەپەڕاند رۆژنامەیەکیشی بەناوی (رزگاری) یەوە بلاودەکردەوە، بەوهۆیەوە حکومەت بەیەکێك لە رێکخراوە کۆمۆنیستیەکانی لێکدایەوە.

## گەشتێکی ئەفسانەیی بەرەو یەکێتی سۆفیەت.

لە مێژووی بزووتنەوە رزگاریخوازەکانی جیهاندا چەند وێستگەیەك دەبینرێن، دەچنەخانەی (موعجیزە) یان ئەفسانەوە، گەشتە ئەفسانەییەکەی (مەلا مستەفا بارزانی) یەکێکە لەو وێستگانە، کاتێك لە سنوورەکانی عێراقو ئێرانەوە دەستی پێکردو لە ژێرکاریگەری هێرشو پەلامارەکانی سوپاکانی عێراق وئێرانو تورکیاو بەریتانیاو لە ژێر بۆردمانی چڕی فڕۆکە جەنگیەکانو چەکی سەنگینی تۆپخانەوە، لەگەڵ هاورێکانیدا بەتێپەڕاندنی چیا سەختو

سەرکەشەکان گەیشتنە یەکێتی سۆڤیەت. بەوجۆرە (بارزانی) لە ولاتەکەی خۆی دەرکراو ئێرانیش پالی پێوەناو تورکیایش رازی نەبوو بەهیچ جۆرێك بچێتە خاکیەوە.. ئەی روو لەکوێ بنێت؟.. بالداریش نییە بفڕێت بەئاسماندا، ناچار بەو هەموو دژایەتیکردنو بەربەرەکانێکردنو بارگرانییەوە گەیشتە خاکی یەکێتی سۆڤیەت. هەرچوار ئەفسەرە هاوڕێکەی (بارزانی) بەبەڵێنی (عەبدولئیلا)ی جێ نیشینی تەختی پاشایەتی عێراق فریودرانو گەڕانەوە بەغدا، بێ هیچ ماوەپێدان سزای لە سێدارەدان بەسەریاندا سەپێنرا دواتر کوردەکان رۆژی جێ بەجێکردنی سزاکەیان کردە رۆژی شەهیدانی کوردو کوردستان.

ئاشکرایە (مەلا مستەفا) بەرانبەر بەو جۆرە بەڵێنانەو لەرێی ئەزموونی چەند ساڵەی خەباتی شارەزایی تەواوی پەیدا کردبوو، بۆیە هەردەم بە گومانەوە دەیڕوانییە بەڵێنەکانی حکومەتی عێراقو حکومەتە یەك لەدوایەکەکانیو بەتوندی ئەو بەڵێنانەی رەتدەکردەوە. لەو سەردەمەدا راوێژکاری بەریتانی لەوەزارەی ناوخۆی عێراق دەربارەی (بارزانی) دەڵێت: (ئەو پیاوە لەو قارەمانانەیە مێژوو ناویان بە ئاوی زێڕ دەنووسێت).

لەو سەردەمە ناسكو چارەنووسسازەدا، لەسەر سنووری نێوان عێراقو ئێران (بارزانی) هێزەکەی کۆدەکاتەوەو بەمجۆرە رووی وتاریان لێدەکاتو دەڵێت: (پاش چەند سائێکی تر دەچینە ناو خاکی عێراقەوەو روو دەکەینە بەشی سەرووی ناوچەی بارزان، گومانی تێدانییە حکومەت تەواوی توانا سەربازیەکانی بۆلێدانو لەناوبردنی ئێمە یەك دەخاتو بەپشتیوانی چەکدارە بەکرێگیراوەکانی ناوخۆ هێزە سەربازیەکانی کۆدەکاتەوەو بەیارمەتی ئێرانو تورکیا هێرش دەکاتە سەرمان، لەم هەلو مەرجەدا دەبێ چەند لەتواناماندا هەیە خۆڕاگرو دوورە پەرێزبین لەشەڕو رووبەڕوو بوونەوە، وەك دەزانین ئێمە قووڵاییەکی ستراتیژی ئەو تۆمان لە پێشدا نییە بریندارەکانی تیادا چارەسەر بکەینو خۆراكو

پێداویستی شەڕی تیادا دەستەبەر بکەین، تەنها ئەوندەیشمان هەیە بەکۆڵانەوەیەو هیچی تر، بێگومان تەواوی ئەم هۆکارانە زیاتر متمانە بەخۆبوون وخۆڕاگری‌و پابەندبوونمان پێ دەبەخشن، هەوڵدەدەم هەرچی زووتر پەیوەندی بەحکومەتی عێراقەوە بکەم، ئەگەر گەیشتینە چارەسەری گونجاوو پەسەند، هەرچەند ئەگەری سەرکەوتن تیایدا لاوازە، بەلام ئەوکاتە بیر لە چارەسەرێکی گونجاو تر دەکەینەوە). لە درێژەی وتارەکەیدا (بارزانی) دەڵێت: (من بەرەو چارەنووسێکی نادیار دەڕۆم، نازانم ئاخۆ لەبرساندا دەمرم، یان سەرما لەناوم دەبات، یان گوللەی دوژمنان دەمکوژێت، وادەبینم ئەگەری مردن نزیکتربێت.. لێرەشدا پشت ئەستوورم بەهێزو توانای پەروەردگارم‌و هەر بە تەنها ئەویشە لە دەستی دوژمنان دەمانپارێزێ.. بەڕاشکاوی دەیڵێم هەر کەسێك لە ئێوە لەخۆی رانابینێ‌و توانای بەرگە گرتنی ئەم ئەرکەی نییە، دەتوانێت بگەڕێتەوەو خۆی بداتەوە دەستی حکومەت‌و من هەردەم سوپاسگوزاری هەرجۆرە هەڵوێستێکی مەردانەتانم). هیچ کەسێك نەبوو لەرێزی ئامادەبواندا بەوە رازی بێت، بەیەك دەنگ وەڵامیان دایەوە (ئێمە لەگەڵ تۆدا دەژین‌و لەگەل تۆشدا مردن هەڵدەبژێرین‌و بێ تۆ ژیانمان ناوێت). وەختێك حکومەت هەستیکرد (بارزانی)و هێزەکەی گەیشتوونەتەوە خاکی عێراق، لە پەیوەندیەکدا داوای خۆبەدەستەوە دانی لێکرد، بەپێچەوانەوە هێرش دەکرێتە سەر ناوچەکە. بارزانی بەحیکمەتەوە چەند رێگایەکی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو، بۆیە لەسێ قۆڵەوە هێزە سەربازیەکان هێرشیانکردە ناوچەکەو چەند شەڕو پێکدادانێکی سووك روویانداو لەهەردوولا چەند کەسێك کوژران.

هەر لەسەرەتاوە (بارزانی) لە داخرانی دەرگای عێراق بەڕوویدا ئاگاربوو، بەو هۆیەوە رۆژی ١٩٤٧/٥/٦ بڕیاری مێژوویی‌و چارەنووسازی خۆی دا بەپەنابردنە بەر یەکێتی سۆڤیەت. (بارزانی) زۆر پابەندی نەریت‌و کلتوورەپاکەکانی سیستەمی خێلایەتی بوو، دوای بڕیاردانی بە رووکردنە

یەکێتی سۆڤیەتو ئاوارەییو دووره وڵاتی، ڕۆڵی (شێخ ئەحمەد)ی برا گەورەی لەیادنەکردو گەیشتە خزمەتیو ڕەزامەندی لەسەرنیازەکەی لێوەرگرتو لە ١٩٤٧/٤/١٥ بەکوڵی گریانو دڵگەرمییەوە یەکیان لە ئامێزگرتو یەکتریان بە پەروەردگاری باڵادەست سپاردو لەیەك جیا بوونەوە.. بەرەو کوێ؟ بەرەو چ چارە نووسێك؟ بێگومان بڕیارێکی سەختو گرانو بوێرانەبوو، ڕێگای تێپەڕین بە سنووری سێ وڵاتی دوژمنی سەرسەرختی کوردو (مەلا مستەفا)ی بەدڕك چێنراو، ڕێپێوانێکی لەو جۆرە مەترسیدارو لە نێوان سوپاکانی عێراقو ئێرانو تورکیاو بەریتانیاداو بەچەندین کونو کەلەبەری سەختو پێچاوپێچو هەورازو نشێویدا ئەوندە ئاسان نەبوو، لە کاتێکدا دەبوو جەنگاوەرانی ڕێپێوەر چەند بۆیان بلوایە خۆیان لە شەڕی ڕاستەوخۆی ئەو چوار هێزە دوورگرتبا.. مەگەر تەنها لەچارەیان نوسرابوایە، دەبوو لەو هەلو مەرجەدا ملکەچ بوونایەو شانیان بدایەتە بەریو بەرنگاربوونایەتەوە.

## ڕێپێوانی مێژوویی دەستی پێکرد

بەردەوام سوپای عێراق لەچاودێریکردنی جموجوڵی بارزانیو هێزەکەیدا بوو، تازانیاری تەواوی لە شوێنی کۆبوونەوەو پەناگاکانیان بە دەستهێناو لە ڕۆژی ١٩٤٧/٥/٢٣ دا چوارده فڕۆکەی جەنگی بۆمب هاوێژی نارده سەریان زۆر بەخەستی ناوچەکەی بومبارانکردو ژمارەیەك شەهیدو بریندارى لێکەوتەوە. لەکاتو ساتێکی دژوارو غەمناكو ویژدان هەژێنو پڕلە ئازارو خورپەی توندا شەهیدان بەخاك سپێرڕانو بریندارانیش سپێرڕان بە کوێخا (مختار)ی یەکێك لە گوندەکان بە مەبەستی چارەسەرکردنیان. دوورکەوتنەوە لە وڵاتو ئاوارەییو لە یەك ترازانو جیابوونەوە سەختو دژوار بوو، جەستەکان سڕو دەروونەکان تاریكو چاوەکانی پڕ لە ئەسرین، بەو حاڵەوە هێزە پەرتەوازەکە پاش بۆردمان

یەکانگیربوونەوەو کەوتنەوە ڕێپێوان. دەبێ گوزەرگای ئەمانە کوێ بێت؟ لە پێشیاندا شاخی بەفراوی‌و ڕێگای پێچ‌و پەناو بەرزی‌و نشێوی شاخ‌و قولایی شیوەکان، لە زۆربەی جێگاکاندا بەرزایی شاخەکان دەگەیشتنە نزیکەی سێ هەزار مەتر، جەنگاوەران لە نێوان ژیان‌و مردندا ڕێگای بە فریان دەبڕی‌و بەقوناغی چەکەکانیان پلیکانەی بە فریان دروستدەکرد تابەناسانی بریندارەکانیان بگوێزنەوە. بێ پشوودان‌و لەگەڵ بڕینی ئەو ڕێگایانەدا بارزانی‌و جەنگاوەرانی گەیشتنە گوندێکی تورکیاو بەگەرمی پێشوازیکران، پاش تاوێك پشوودان‌و حەسانەوە، بەمەبەستی سەرلێشێواندنی ئەو هێزانەی بەدوایاندا دەڕۆن‌و شەڕیان دەکەن بەرەو سنووری ناو ئێران گەڕانەوە لەگەڵ شارەزایی (بارزانی)و ئەزموونی لە سووسەکردن‌و دیدەوانیدا زانیان سوپای تورکیا تەواوی ڕێگاکانی لێداخستبوون، بەنیازی خۆپارێزی‌و دوورکەوتنەوە لەشەڕ توانیان لەژێر دارو درەختی چڕی دارستانێکدا خۆیان حەشاربدەن. لەگەڵ پەروازی بەرزو نزمی فڕۆکەکانی چەکی ئاسمانی تورکیاو چاودێری وردی ناوچەکە بێ ئاکام گەڕانەوەو لەسووسەکردنی جەنگاوەران وشوێن پێ هەڵگرتینان شکستیان هێنا. لەسەر رووبەری خاك‌و لەکردەوەیەکی زیرەکانەی شوێنگۆڕکێ‌و سەرلێشێواندنی هێزەزە مینییەکاندا بە پێچ لێدانێك لەو هێزانە دەربازبوون‌و بەرەو خاکی ئێران سنووری تورکیایان بڕی‌و ماوەی سێ رۆژ لە گوندەکاندا بەرێز لێگیراوی مانەوە تا رۆژی ٣١ی مایسی ١٩٤٧ حکومەتی ئێران لەگەیشتینان ئاگادارکرا،زۆربە پەلە کردیە سەریان هەرچی زووتر لە خاکی ئێران بچنەدەرەوە.. تاناچار هەمان رۆژ کەوتنەوە سەرە ڕێگای ڕێپێوان، لەم ناوچە بۆئەو ناوچەو لەم خێڵ بۆ ئەویتر، دیاربوو خەڵکی تامەزرۆی ئازادی‌و ڕزگاری لەو ناوچانەدا بەسنگ‌و سۆزی فراوان‌و رووی گەش‌و چاوی پڕ فرمێسك لەگەڵ سۆزو کوڵی دەروونیان لە ئاستی دیمەنی دەروون هەژێنی بریندارەکانی سەرشانی جەنگاوەران پێشوازیان لێدەکراو خواردن‌و خواردنەوەیان پێشکەش

دەکرا. بێگومان لە پەنای ئەو هەموو سۆزو بەزەییە فراوانەشدا کەسانی قین لەدەروون و بەکرێگیراوو چڵکاو خۆر خۆیان مەڵاس دابوو، لەوە دەگەڕان بەفرۆفێڵ (بارزانی)و هێزەکەی تووشی هەڵدێربکەن و هەوڵی ڕێگری لێبدەن.. لەوانە کەسێك پەیدا بوو بە رواڵەت لەگەڵ دەربڕینی سۆزی بێ سنوور لە (بارزانی) خۆی نزیك دەکردەوەو لەداخرانی ڕێگانیش بەرووییدا ئاگاداری کردەوەو تکای لێکرد چەند ڕۆژێکی تر لە ناوچەکەدا بمێنێتەوە، هەر ئەو پیاوە ئامادەگی ئێرانی لە چارەسەرکردنی بریندارەکان و ناردنی خۆراك و پێداویستی تەواو بۆ بارزانییەکان پێ ڕاگەیاند. ئاشکرایە کەسێکی خاوەن ئەزموون و شارەزای هەڵس و کەوت پیلانی دوژمنان هەرگیز ئەو جۆرە پیلانانەیان بەسەردائێناپەرێت، بۆیە بارزانی هەر زوو لەو فرۆفێڵەی ئێران تێگەیشت و خۆی دەربازکردو درێژەیدا بەڕێڕەوەکەی و لەو داوانە تێپەڕی بۆ خۆی و جەنگاوەرانی دانرابوون بەمەبەستی سەرلێشێواندنی هێزە ئێرانییەکان ئێوارەی ١٩٤٧/٦/٥ سەر لەنوێ بۆ ماوەیەکی کورت جەنگاوەران سنووری تورکیایان بەزاندەوەو بەدەست بەسەرداگرتنی شیوی (قتووری)و گردەکانی دەوروبەری مەترسیدارترین ڕێگایان بڕی. شارەزایی شەڕی شاخ و دەشتاییەکان بارزانییەکانی گەیاندە کەناری ئارامی و ڕزگاربوون، بەمەزندەی بارزانی شەڕی ئەو شوێنە زیانێکی فراوانیان پێدەگەیەنێت و ڕووداوەکان دژ بەوان دەگوزەرێن و هەل و مەرجی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردیش ئاراستەیەکی ناجۆ ڕو نالەبار وەردەگرێت و لەبەرژەوەندیدا نابێت، بۆیە هەوڵدرا بە خۆپارێزی و دەربازبوون. بەگیانی لەخۆ بوردەیی و سۆزی نەتەوایەتییەوە خێڵە کوردەکانی تورکیا ئەرکی خۆیان لە خزمەتکردنی بارزانییەکان بەجێ گەیاندو یاریدەدەربوون لەبەردەوامی ڕێپێوانەکەدا.. تەنها نیگەرانییەك دەروونی (بارزانی)و هێزەکەی داگرتبوو ناشارەزایی ئەو ڕێگایە بوو دەیگەیاندنە خاکی یەکێتی سۆڤیەت.

لەدوا هەنگاوی ڕێپێوانەدا هێزێکی مەزنی ئێرانی گەیشتە ئەوناوچەیەی

بارزانییەکانی لێبوو، لە دەست پێشخەریەکدا لە دوو قۆڵەوە بە توندی هێرش برایە سەر پێگەو سەنگەرەکانی دوژمن‌و لە شاخ‌و دەشتاییەکاندا شەڕ تا ڕۆژی ١١ی حوزەیرانی ١٩٤٧ بەردەوام بوو.. لەو شەڕە چارەنووسسازەدا بارزانییەکان بەرزترین داستانیان لە لاپەڕەی مێژووی پڕ سەروەری بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورددا تۆمارکردو زیانێکی فراوانی گیانی‌و کەلوپەلیان بە دوژمن گەیاند. فەرماندە بالاکانی سوپای ئێران تەواوی تواناکانیان لە ڕێگریکردنی بارزانییەکان‌و نەگەیشتنیان بەیەکێتی سۆڤیەت خستبوویەکارو ئەوشوێنەی ستراتیژیەیان هەڵبژارد بەنیازی خۆیان لە باروشیاوبوو لە جموجوولکردنی هێزەکان‌و پەروازی فرۆکە جەنگیەکاندا.. لەگەڵ شکستخواردنیاندا دڵنیابوون کە سەرکەوتنیان بەسەربەرزانییەکاندا بەدەستهێناوە، کەچی بێئاگابوون لەوەی جەنگاوەران بەدەست بەسەردا گرتنی پردێکی گرنگ لەو ڕووبارە پەڕینەوەکە دواکۆسپی گەورەی سەرە ڕێیانبوو. زیانەکانی ئێران لەوشەڕەدا کوژراوو بریندارو بەدیلگرتنی (٣٧١) سەربازو کەوتنی فرۆکەیەکی جەنگی‌و تێکشکاندن‌و پەکخستنی چەندین تانك‌و زرێپۆش‌و ماشێنی نەفەربەرو دەست بەسەرداگرتنی چەندین بارگەی خۆراك‌و تەقەمەنی لێکەوتەوە، هەمانکات لەگەڵ ئەم زیانانەشدا دەستکەوتی جەنگاوەران بریتی بوو لە دەست بە سەراگرتنی سەدان پارچە چەك‌و پەنجا هێستری باربەری خۆراك بەبارگەکانیانەوە. زیانەکانی جەنگاوەرانیش تەنها چوارشەهیدو چەند برینداریك بوو، لەگواستنەوەیاندا سوودێکی گەورە لەولاخەکان وەرگیرا. ڕیپێوانی بارزانییەکان گەیشتە یەکەم خاڵی سنووری یەکێتی سۆڤیەت لەسەرکەناری ڕووباری(ئاراس)و ڕوخسەتی تێپەڕاندنیان پێدرا. بەوهۆیەوە ناوی ئاراس پیرۆزمەندی خۆی وەرگرت‌و زۆرێك لە کوردەکان ناوی ڕۆڵەکانیان بەو ناوەوە تۆماردەکەن.

ئیترلەو وەختەوە لاپەڕەیەکی نوێ لە لاپەڕەکانی مێژووی خەباتی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد بەو ڕووداو داستانانە نەخشێنراو چووە

تۆمارگەی خەباتی بەردەوامی کوردایەتییەوە.




## پارتی دیموکراتی کوردستان و شۆڕشی عبدولکەریم قاسم

### أ- پێش شۆڕش

لەگەڵ دووری (مەلا مستەفا) و بەسەربردنی ژیانی ئاوارەیی لە یەکێتی سۆفیەت وەك سەرۆکێکی کاریگەر چاودێری خەبات و چالاکیەکانی پارتی دەکردو هانی ئەندامانی دەدا لە چالاکیە نیشتمانییە عێراقیەکاندا بەشداری بکەن. لەڕاپەڕینە مێژووییەکەی کانوونی ١٩٤٨ (وثبة کانون) شان بەشانی ئەندامانی بزووتنەوەی نیشتمانی عێراق، ئەندام و جەماوەری (پ. د. ك) ڕۆڵی کاریگەریان

گێڕا لەدژایەتیکردنی پەیمانی دژ بە گەلی نێوان عێراق‌و بەریتانیا، ئەوە هۆکار بوو لە گرتن‌و زیندانیکردنی دەیان کادری پارتی‌و کەسایەتی کوردو عەرەب لە باکوور (کوردستان)و باشوورو ناوەڕاستی وڵات. ساڵی ١٩٥٠ (هەمزە عەبدوڵا)ی سکرتێری پارتی لەلایەن دەزگاکانی ئاسایشی عێراقەوە دەسگیرکراو بۆ تورکیا دوور خرایەوە، لە ئەنجامدا لە ڕێگایەکی تایبەتەوە لەو وڵاتە هەڵهات‌و گەڕایەوە کوردستان‌و بەنهێنی کارەسیاسیەکانی رادەپەڕاند.

لەناو گێژاوی سیاسی‌و بارودۆخی نالەباری عێراقدا ساڵی ١٩٥١ کۆنگرەی دووەمی پارتی دیموکراتی کوردستان لە شاری بەغدا گرێدرا، تیایدا سەرەتای ناکۆکی ناوخۆی پارتی لە نیوانی باڵی چەپڕەو بەرابەرایەتی (هەمزە عەبدوڵا)و باڵی نەتەوە خواز بەڕابەرایەتی (برایم ئەحمەد) سەری هەڵدا، بەتایبەتی لە هەڵبژاردنی (برایم ئەحمەد) بە سکرتێرو لادانی (هەمزە عەبدوڵا) لە سکرتاریەت. گرنگترین بڕیاری کۆنگرە گۆڕینی ناوی پارتی بوو لە (پارتی دیموکراتی کوردەوە بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان) کە لە ڕوانگەی وابەستە بوونی بەخاك‌و نەتەوەههەڵگری ئەو مافە قووڵەبوو کە پارتی دەبێتە لانکەو سەرچاوەی تەواوی ئەو گەل‌و نەتەوە تێکۆشەرانەی لەسەر خاکی کوردستان دەژین‌و وابەستەی ئەو خاکەن.

بەستنی کۆنگرەی سێیەمی پارتی لەشاری کەرکوك وەرچەرخانێکی سەردەمیانەی ئەو وەختەبوو، تیایدا بڕیاردرا لەسەر پەیڕەوکردنی بنەماکانی مارکسی لینینی لە خەباتداو هەوڵدان وبەدواداچوونی چاکسازی کشتوکاڵ‌و بەربەرەکانێکردنی دەرەبەگایەتی‌و دامەزراندنی کۆمەڵەی جووتیاران‌و داکۆکیکردن لە مافەکانیان، هەمان کات کۆنگرە داواکار بوو بە خۆماڵیکردنی نەوت‌و پیشەسازیە سەرەکیەکان‌و داکۆکیکردن لە مافەکانی چینی کرێکاران‌و دژایەتیکردنی ئیستیعمارو هەوڵدان بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی پاشایەتی‌و رزگار کردنی گەلی عێراق لە کۆت‌و بەندایەتی‌و بەرپاکردنی کۆمارێکی دیموکراتی

تیایدا مافەکانی گەلی کورد لە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان دەستەبەربکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا هەڵبژاردنی سەرکردایەتی ئەنجامدراو بەتێکڕای دەنگ (مەلا مستەفا) بە سەرۆك و (برایم ئەحمەد) بەسکرتێر هەڵبژێرران. ئەوەبوو بۆ یەکەمجار لەو کۆنگرەیەدا ناوی (جەلال تاڵەبانی) وەك ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی دەرکەوت. لە ئەنجامی کارەکان و ڕاپیکردنی بڕیارەکانی کۆنگرەی سێیەم پارتی هەڵسا بەپێکهێنان و دامەزراندنی ڕێکخراوە جەماوەرییەکانی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان و یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی ئافرەتانی کوردستان). بۆیەکەمجار ساڵی ١٩٥٥ بەسەرۆکایەتی شاندی لاوانی دیموکراتی کوردستان (جەلال تاڵەبانی) بەشداریکرد لە کۆنگرەی جیهانی لاواندا لە (وارشۆ)ی پایتەختی پۆڵەندا.

لە کاتێکی ترداو لە ژێر کاریگەری ڕاسپاردەکانی (بارزانی) دا سەرکردایەتی پارتی کەوتە هەوڵی گێڕانەوەی ئەوکادرو ئەندامانەی بە هۆی ناکۆکیەکانەوە لە ریزەکانی دابڕابوون و دوورکەوتبوونەوە، بە تایبەتی (هەمزە عەبدوڵا) کەدوای دوور کەوتنەوەی لە سکرتارییەت لە پارتی دابڕابوو. لەو سەردەمەدا پارتی لەمامەڵەکردندا ستراتیژییەتێکی نوێی گرتەپێش کەلە پێناوی ڕێکخستنی یەکگرتووی بیری مارکسی لە کوردستانی عێراق و لەچوارچێوەی دیموکراتی و پەیڕەو کردنی کرۆکی سۆسیالیزمی و مارکسی پەیوەندیکرا بە لیژنەی لقی کوردی پارتی کۆمۆنیستی عێراقەوە[٢٣].

کاربۆکردنی و هەماهەنگی و پەیوەندییە چڕەکان هۆکاربوون لە ڕاکێشانی کادرانی نوێی گرنگ و سوودمەند بۆ ریزەکانی (پ. د. ك) و گەشە کردن و تەشەنەکردنی ڕێکخستنەکان بۆ ناو جەماوەر، بە تایبەتی بۆ ناو جەماوەری کوردستان. لەو ئەرکانەی شیاوی یادادوەرین، لە کۆتایی ساڵی ١٩٥٧ (جەلال تاڵەبانی) بە نوێنەرایەتی پارتی بەشداریکرد لە میهرەجانی لاوانی جیهانی لە

---

(٢٣) ڕەوتە سیاسیەکانی کوردستان- سەلاح ئەلخەرسان.

مۆسکۆی پایتەختی یەکێتی سۆڤیەت، لەماوەی مانەوەیدا بۆ یەکەمجار هەروەك (تاڵەبانی) ناوی دەبات بە (دیداری دەروپێش و شێخ و سەرۆکی ڕێبازەکەی (بارزانی) شادبوو.. (تاڵەبانی) دەڵێت: (لەو دیدارەمدا مەسەلەی ڕوودانی دووبەرەکی و چەندین مەسەلەی گرنگم لەگەڵ (بارزانی) باس کردو بیروڕای ئەویشم لەسەریان وەرگرت، بەرانبەر تەواوی کێشەو مەسەلەکان ئەو پیاوە لەگەڵ یەکخستنی هەوڵەکاندابوو، ئەو مەسەلەیەی بەلایەوە گرنگ بوو دروستکردنی پردی پەیوەندیەکانی پارتی بوو لە گەل خێڵ و تیرەکاریگەرەکان و بەهێزکردنی ئەو پەیوەندیانە.. بەرانبەر بەپەیوەندیەکانی پارتی بەوڵاتانی دەرەوە، ڕێنمایی کردین بەوەی کە ناکرێت تەنها پەیوەندیەکانمان لەگەڵ سۆڤیەتدا بە هێزبکەین، بەڵکو پێویستە لەو چوارچێوەیە دەرچین و ڕووی پەیوەندیەکانمان بکەینە ڕۆژئاوا، بۆ ئەومەبەستە پشت بە (بابە عەلی شێخ مەحمودی حەفید) ببەستین کە پەیوەندی لەگەڵ ڕۆژئاواو بەتایبەت ئەمەریکا زۆر بەتینە)[٢٤].

لە گەڕانەوەیدا (تاڵەبانی) لە دیمەشق چاوی کەوت بە ژمارەیەك سیاسی سوریاو میسرو هەوڵی دا لە ڕێگەیانەوە دیدارێك لەگەڵ سەرۆك (جەمال عەبدولناسر) ڕێك بخات، بەونیازەی دیمەشق و قاهیرە یارمەتی و پشتیوانی لەگەڵی کورد بکەن و ئیسگەیەکی کوردی لە قاهیرە بکرێتەوە.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٥٧ بەمەبەستی هەڵمەتەکانی ڕاگەیاندنی میسر دژبە پەیمانی بەغداو بەکارهێنانی زمانی کوردی وەك هۆکارێك دژبە حکومەتی عێراق، حکومەتی میسر بەشی کوردی لە ئیسگەی قاهیرە کردەوەو ڕۆژانە چەند سەعاتێك بەو زمانە بەرنامەکانی پەخش دەکرد[٢٥].

---

(٢٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٢٥) لەگەڵ یەکەم پەخشی بەرنامەی کوردی لە نێزگەی قاهیرە باڵیۆزی تورکیا لە قاهیرە بە هەڵەداوان و هەناسە سواریەوە خۆی دەگەیەنێتە پرسگەی کۆشکی کۆماری و داوای

## ب- دوای بەرپابوونی شۆڕش

لە یەکەم ڕۆژی بەرپابوونی شۆڕش ١٤/تەمموزی/١٩٥٨ پارتی دیموکراتی کوردستان سەبارەت بە پشتیوانیکردنی شۆڕش‌و جێگربوونی بەیاننامەیەکی بلاوکردەوە تیایدا هاتووە دەڵێت:(پ. د. ك) بەتەواوی تواناکانییەوە پشتیوانی خۆی بۆ شۆڕش ڕادەگەیەنێت‌و بەرگری لێدەکات‌و لە پێناوی جێگیربوونیدا ئامادەی هەر ئەرکێکە بخرێتە ئەستۆی‌و تەواوی تواناکانی دەخاتە ژێر دەستی فەرماندە دلێرەکانی ئەو شۆڕشە مەزنە، تەواوی ئەندامان‌و لایەنگرانی‌و جەماوەرەکەی ئامادەی قوربانیدانن ودژبە ئیستیعمار دەوەستن. هەمانکات (مەلا مستەفا بارزانی) لە یەکێتی سۆڤیەتەوە بە پەلە بروسکەیەکی پیرۆزبایی سەرکەوتنی شۆڕشی ئاراستەی (عەبدولکەریم قاسم) کردو وەك سەربازێك ئامادەیی خۆی بۆ هەر ئەرکێك بخرێتە ئەستۆی دەربڕی. بێگومان دەسەلاتی پاشایەتی لە چەوساندنەوەو کوشتن‌و زیندانیکردنی نارەوای رۆڵەکانی گەلی کوردو پێشێل کردنی مافەکانیان درێغی نەکرد، بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ ی تەمموزی ١٩٥٨ زیندوو کەرەوەی گیانی نیشتیمانپەروەری‌و هەلگرو لادەری ئەو هەموو ستەم‌و کارو کردەوانەیە دژبە مرۆڤی کورد ئەنجام دەدران.. جگە لەوە شۆڕش لە بەرژەوەندی گەلی کوردو پارتی دیموکراتی کوردستان چەند بڕیارێکی گرنگی ڕاگەیاند..

---

دیداری سەرۆك (جەمال عەبدولناسر) دەکات .. لە دیدارەکەدا زۆر بە ئالۆزی و پەشۆکاوی داوای داخستنی بەشی کوردی ئێسگەی قاهیرە دەکات و دەری دەخات کە زیان بە پەیوەندییەکانی هەردوو ولات دەگەیەنێت، سەرۆك (عەبدولناسر) بەخوێن ساردی و لەسەرخۆ لە وەلامیدا دەڵێت: (ئێوە دەڵێن کورد لە تورکیا دا نییە و ئەوانەی بەکورد ناو دەبرێن تورکی چیایین، کەوابێ پەیوەندی ئێوە بەو مەسەلەیەوە چییە لە وەختێکدا هیچ پەیوەندی بە ولاتەکەتانەوە نییە) . و.ك

١ - ئازادکردنی تەواوی زیندانیانی (پ. د. ك) بەتایبەتی ئازاد کردنی (شێخ ئەحمەد بارزانی).

٢ - هەرەسهێنانی پەیمانی بەغدا، کەوەك بازنەیەکی پڕ لە ژەنگ بە گەردنی ناوچەی کوردستانەوە ئاڵابوو.

٣ - ئاشکرا کردنی کارو چالاکییەکانی (پ. د.ك)و دەرچوون لە کاری نهێنیو دەرکردنو بڵاوکردنەوەی رۆژنامەی خەبات.

٤ - هاوبەشکردنو یەکسانکردنی کوردو عەرەب لە عێراقدا بە پێی مادەی (٣)ی دەستووری کاتی.

٥ - دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتی (مەعارف)ی کوردستان.

٦- بڕیاردان بە گەڕانەوەی سەرۆکی(پ. د. ك) (مەلا مستەفا بارزانی) وەك قارەمانێك بۆ عێراق.

## گەڕانەوەی (مەلا مستەفا) بۆ عێراق

لەگەڵ گەیشتنی بە بەغدا لە رۆژی ١٩٥٨/١٠/٦ (مەلا مستەفا) لە بارەگای وەزارەتی بەرگری لەلایەن (عەبدولکەریم قاسم)ەوە زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکراو خوازیاربوو لە سێبەری دەسەڵاتی کۆماریدا گەلی عێراق بە کوردو عەرەبو کەمەنەتەوایەتیەکانەوە گەشە بکاتو لە تەواوی بوارەکاندا بگاتە سەرکەوتن. پێشتر لە رێگەی گەڕانەوەیدا (بارزانی) سەردانی قاهیرەی کردوو لەلایەن سەرۆك (جەمال عەبدولناسر)و حکومەتی میسرەوە بە گەرمی پێشوازی لێکراو بە نیازی ئاگاداربوون لە دوژمنکاریە سێ قۆڵیەکەی (بەریتانیاو فەرەنساو ئیسرائیل) سەردانی شاری (پۆرت سەعید)ی کرد. حکومەتی نوێی عێراق لەگەڵ پێشوازی شیاو بەکەسایەتی بارزانی جێو رێی پێویست بۆ خۆیو جەنگاوەرانی هاوڕێی دابینکراو رێزی بەرزیان لێگیرا.

# ناکۆکی لە سەر دەسەلآت لە عێراقی نوێدا

هەرچەند ماوەیەکی زۆر بەسەر بەرپابوونی شۆڕشدا نەگوزەریبوو لە سەر هەندێ مەسەلە کێشەو ناکۆکی کەوتە نێوانی (عەبدولکەریم قاسم‌و عەبدولسەلام عارف)ەوە، ئەم کێشەیە بەتەنها کاری نەکردبوویە سەر ناوخۆی دەسەلآتی نوێ، بەڵکوو کاریشی کردبوویە سەر پارتەکان‌و رابەرە سیاسیەکانی عێراقیش، ناکۆکی نێوان لایەنە سیاسیەکان گەیشتبوویە ئاستی تەقینەوەو راکێشانی ئەندامانی هەر لایەنێك بۆ لایەنەکەی تر..دیارە رەوشەکە بەوەشەوە نەگیرسابوویەوە ناکۆکی نێوان زۆربەی لایەنە سیاسیەکانی عێراقی گرتبوویەوەو گەیشتبوویە ئاستی دابەشبوون (پ. د. ك)یش یەکێك بوو لەو پارتانەی ناکۆکی‌و دووبەرەکی لە کرۆکی رێکخستنیدا روویداو دوو باڵی لێکەوتەوە.

یەکەم: باڵی مارکسی – بەرابەرایەتی (هەمزە عەبدولآ)و مەکتەبی سیاسی.

دووەم: باڵی (جەلال تاڵەبانی) - بە پشتیوانیلێکردنی زۆربەی ئەندامانی لیژنە مەرکەزی.. لە کاتێکدا (برایم ئەحمەد)ی سکرتێری پارتی لە نێوان هەردوو باڵەکەدا خۆی یەکلایی نەکربوویەوە، تا لە کۆتاییدا خۆی بە باڵی دووەمدا گرێدا. بێگومان دووبەرەکی لەسەر دەسەلآت، رەوتی نەتەوایەتی لە عێراقدا سست‌و لاوازکردو خستیە پەراوێزەوەو بوو بەهۆی پەرەسەندنی پارتی کۆمۆنیستی عێراق (ح. ش.ع) لە شەقامی سیاسی عێراقدا.. ئەوە بوو لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٨ (پ. د. ك)و (پارتی کۆمۆنیستی عێراق) پەیمانی هاوکاری‌و هەماهەنگیان بەست‌و لە زۆر بواردا بوو نەیاریدەدەری یەکتری. دیارە ئەمە بووە گێژاوێك بۆ (برایم ئەحمەد)ی سکرتێکری پارتی‌و باڵی نەتەوە خوازو کێشەکان کەوتنە سەرمەرێی زیاتر پەرەسەندن..

تا لەکانوونی دووەمی ١٩٥٩ دا مەکتەبی سیاسی لە باڵی مارکسیەکان پێکهێنراو جارێکی تر بەلادانی (برایم ئەحمەد)و دوور خستنەوەی لە پارتی (هەمزە عەبدولآ) بەسکرتێکر دانرایەوە. لەلایەکی ترەوە بەفەرمانی (مەلا

مستەفا)ی سەرۆكی (پ. د. ك) ئەندامیەتی (جەلال تاڵەبانی) سڕكراو بۆ ماوەیەك دوور خرایەوە.

## ڕووداوەكانی موسڵ و كەركوك

لە ڕێگای بەستنی پەیمانی هاوكاریو هەماهەنگی نێوان (پ. د. كو پارتی كۆمۆنیستی عێراق)ەوە پارتی بەتەواوی توانایەوە بەشداریكرد لە ڕووداوە خوێناویەكانی موسلو كەركوك دا، لەكاتێكدا (عەبدولكەریم قاسم) لە وتارێكی دا زۆر بەتوندی نارەزایی خۆی بەرانبەر بەو ڕووداوانە دەربڕی.

لە چوارچێوەی هاوكارییەكاندا ڕۆژنامەی (اتحاد الشعب)ی زمانحاڵی پارتی كۆمۆنیستی عێراق، ڕۆژانە نیولاپەڕەی لە ژێر ناونیشانی دەنگی گەلی كورد (صوت الشعب الكوردی)دا بۆ كاروباری كوردستان تەرخانكرابوو. هەڵسوكەوتەكانی (پ.ك.ع) گومانی دەست بەسەرداگرتنی دەسەڵاتی عێراقی لای هەموان دروستكردبوو، لە هەنگاوێكی نوێدا (هەمزە عەبدولاّ) هەوڵەكانی خۆی خستەكار بەمەبەستی تەواو یەكخستنی ڕێكخراوەكانی (قوتابیانو لاوانو كرێكارانو ئافرەتانی پارتیو تێكەڵكردنیان لەگەڵ هاوتەریبەكانی لە (پ.ك.ع).. كارگەیشتە ئەو ئاستە ئەندامانی كۆمیتەی ناوەندیو ئەندامانی مەكتەبی سیاسی پارتی دژبەو هەڵوێستەی (هەمزە عەبدولاّ) وەستانو بەڕاشكاوی نارەزایی خۆیان بەرانبەری تۆماركردو بەرەنگاری بوونەوە. هەڵوێستەكەی (هەمزە) ئاشكرابوو كە مەبەستی تواندنەوەی پارتی بوو لە بۆتەی (پ. ك. ع) دا. لەم ئاڕاستەدا (بارزانی) وەك سەرۆكی (پ. د. ك) داوای كۆبوونەوەی لەناكاوی كۆمیتەی ناوەندی كرد.. پاش تاوو تووكردنی هەڵوێستەكە بڕیاردرا بەسڕكردنی ئەندامیەتیو بەرپرسیاریەتی (هەمزە عەبدولاّ)و پشتیوانانو هاوبیرانی لە مەكتەبی سیاسیو دوور خستنەوەی لە سكرتارییەتی پارتی. هەرچەند ئەو سەردەمە ئەندامیەتی (جەلال تەڵەبانی لە كۆمیتەی ناوەندی بە بڕیارێك

سڕکرابوو، بەڵام ڕێگرنەبوو لە پێسپاردنی سەرنووسەری ڕۆژنامەی (خەباتی زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان).

## کۆنگرەی چوارەمی پارتی دیموکراتی کوردستان

لە تشرینی یەکەمی ۱۹۵۹ (پ. د. ك) کۆنگرەی چوارەمی گرێداو تیایدا بڕیاری دەرکردنی (هەمزە عەبدوڵا)و هاوڕێکانی لە ڕێخستنەکاندا درا، بەو شێوەیە باڵی مارکسی لە پارتیدا پاکسازی کراو جارێکی تر (براییم ئەحمەد) بەسکرتێر هەڵبژێررایەوەو (مەلا مستەفا)یش لە جێی خۆی وەك سەرۆکی پارتی مایەوە. لەسەر وەختی بەستنی کۆنگرەدا لەشەقامی ڕەشیدو بەبەشداری (سەدام حسەین)ی کەم تەمەنترین بەشداربوان هەوڵی کوشتنی (عەبدولکەریم قاسم) درا، بەو بۆنەیەوە کۆنگرە بەیاننامەیەکی ناڕەزایی و ڕسواکردنی هەوڵەکەی بلاَوکردەوەو داوای لە تێکڕا گەلی عێراق کرد بەتوندی دژ بەو کارەساتە ناڕەوایە بوەستێت و هاوکاری و هاوخەمی خۆیشی لە ئاستیدا ڕاگەیاندو تواناکانی خۆی خستە بەردەستی حکومەت لە ڕووبەڕووبوونەوەی پیلانگێڕان و دوژمنانی کوردو عەرەب. لە چوارچێوەی بەفەرمی کارکردنی پارتە سیاسیەکاندا، کۆنگرە داخوازی کارکردنی دا بەحکومەت، پاش سڕینەوەی هەندێ بەندی پەیڕەوو پرۆگرام بەئاگاداری وەزارەتی ناوخۆ وەك لە خوارەوە دەردەکەوێت، ڕێگای کارکردن بە پارتی درا.

**یەکەم:** پارتی دیموکراتی کوردستان لە خەباتی سیاسی شێکاریە کۆمەڵایەتیەکاندا سوود لە تێورە زانستیەکانی مارکسی لینینی وەردەگرێت.

**دووەم:** (پ. د. ك) خەبات دەکات لە پێناوی فراوانکردن و پەرەپێدانی مافە نەتەوایەتیەکانی گەلی کورد لەسەر بنەڕەتی ئۆتۆنۆمی لەچوارچێوەی عێراقێکی دیموکراتیدا.

**سێیەم:** سڕینەوەی هەموو ڕستەیەکی (ناڕەزایی) لە ئاستی تورکیاو ئێران.

# بەشی سێیەم

# شۆڕشی ئەیلول

## پێشەكیەكان

### لە تەباییەوە بۆ ناكۆكی

گۆڕانكاری لە پەیوەندی نێوان (پ. د. ك)و (عەبدولكەریم قاسم) بە چەند هەنگاوێكی یەك بەدوایەكدا گوزەری كرد، لە كۆتاییدا گەیشتنە رووبەڕووبوونەوەو پێكدادانی چەكداری. لەو سەردەمەدا مەسەلەی یەككرتن‌و یەكێتی عەرەب لە رواڵەتدا وەك ناكۆكی سەرەكی نێوان پارتە سیاسیە عێراقیەكان دەبینرا، كەچی راستیەكەی جگە لەگەڕان بەدوای بەرژەوەندیە تەسكەكانی پارتایەتی‌و راكێشانی پلەو دەستكەوتی سیاسی لەسەر حیسابی جەماوەر هیچی دیكەی لە پشتەوە نەبوو. دیارە ئەمە هەلێكی گونجاو بوو لە هاتنەدی ویستی (عەبدولكەریم قاسم) بە چڕ كردنەوەی ناكۆكیەكان‌و دژایەتیكردنی نێوان پارتەكان، تابە ئاسانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر تەواوی گەلانی عێراقدا بسەپێنێ[٢٦].

لەیەكەمساڵی شۆڕش‌و بڵاوبوونەوەی ئەندازەیەك دیموكراتی لەوڵاتدا

(٢٦) بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی كورد – مەسعود بارزانی.

(عەبدولکەریم قاسم) کەوتە پاشگەزبوونەوە لە بەڵێنەکانیو پاشەکشە لە بنەماکانی دیموکراتیو وەرگەڕان بەرەو سەپاندنی دەسەڵاتی تاکڕەویو دکتاتۆرییەتی سەربازی لەدەسەڵاتدا[٢٧]. لە کاتێکدا پەیوەندی نێوان (پ. د. ك)و (عەبدولکەریم) لەبرەودا بوو، هەر لەو کاتەداو لە تەمموزی ١٩٥٩پشتی کردە پارتی کۆمۆنیستی تاکە پشتیوانی شۆڕشی تەمموز.

بە گوزەرانـدنی ئەو ڕەوشە بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد بەهەموو ڕەگەزەجیاوازەکانییەوە تاکە گروپێك بوو لە عێراقدا دەسەڵاتی خۆی پاراستبێت.

ئەوەی (عەبدولکەریم قاسم)ی توشی لادان کردو لە بنەما سەرەکیەکانی شۆڕشی دوورخستەوەو خستیە ناو زەلکاوی هەڵەوە، شێتی خۆبەزل زانین بوو کە خۆی بەنموونەی باڵای جەماوەرو بەرزتر لە پارتەکانی دەزانی، کەلە سەرەتای شۆڕشەوە بەدەر لە پێویست گرنگی پێدا بوونو بڕواو متمانەی خستبوویە سەریانو هاوکاری بێسنووری دەکردنو هەموو ئاسانکاریەکی لە پێشیاندا ڕەخساندبوو.. هەمانکات پەشیمانبوونەوەی لەو بەڵێنانەی دابوونی بە پارتەکان بەبەشداریکردنیان لە دەسەڵاتدا، هۆکاربوو لە هەڵوێست وەرگرتنیانو بەرهەڵستکاریکردنی ڕژێم.. لەو ئاستەشدا (عەبدولکەریم) زیاتر کەوتە دژایەتیکردنیانو خستنەوەی ناکۆکیو دووبەرەکی لە نێوانیاندا، بەتایبەتی توانی ناکۆکی توند بخاتە ریزەکانی پارتی کۆمۆنیستی عێراقەوە. هەر لەو سەردەمەدا بە مەبەستی لاوازکردنی (پ. د. ك)و سستکردنی چالاکیەکانی هەمان ڕێگای بی ناکامی گرتەبەر، بەڵام هۆشیاری سەرکردایەتیو توندوتۆڵی کاری ڕێکخستنەکانیو وابەستەبوونی جەماوەر بەو سەرکردایەتیەوە لەسێ لاوە شکستی بە نیازەکانی (عەبدولکەریم قاسم) هێنا:

یەکەم- نەبوونی کۆمەڵە کەسانێکی خۆ فرۆشو باوەڕپێکراوی حکومەت لە

---

[٢٧] عێراق و مەسەلەی کورد د/سەعد ناجی جواد.

کوردستان‌و لەڕێکخستنەکانی(پ. د. ك) دا.

دووەم- ناتوانایی (عەبدولکەریم) لە پەیداکردن‌و خەڵەتاندنی چەند دەستەیەکی کاریگەر لە کۆمەڵگای کوردەواریداو بەکارهێنانیان لە بەرژەوەندی ڕژێمەکەی، جگەلە هەندێ ئاغاو دەرەبەگی چاوچنۆکی رسوای ناوجەماوەر.

سێیەم- هەست کردنی (قاسم) بەگرنگی جوگرافیای کوردستان‌و پارێزگاریکردنی لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد.

دوابەدوای سەرنەگرتن‌و شکستخواردنی جووڵانەوەکەی (عەبدولوەهاب شەواف) لەشاری موسڵ، ڕێکخستنەکانی پارتی کۆمۆنیستی عێراق‌و پارتی دیموکراتی کوردستان لە هێرشێکی توندی تۆڵەسێندا پەلاماری ئەنجامدەران‌و پشتیوانانی جووڵانەوەکەیاندا.

سەبارەت بەڕووداوەکانی موسڵ (مەسعود بارزانی) بۆ ێرانەو بەڕاشکاوی رەخنەی تاڵ‌و توند ئاراستەی ئەنجامدەرانی تاوانەکان دەکات‌و دەڵێت: (ڕووداوەتاڵەکانی موسڵ هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی، دروستکەری سەردەمێکی نوێی ناکۆکی خوێناوی بوون لە عێراقداو هیچ کەسێك لە شیوعیەکان‌و لە کوردەکان لەو تاوانانە دەرناچن، بەرانبەر بە خۆیان ولات‌و گەلیان‌و بەرانبەر بە عێراق‌و عێراقیەکانیش گەورەترین هەڵە یانکردووە). پاش سەرکوتکردنی جووڵانەوەکە، ئەوندەی نەخایاند یاخیبوونەکەی (شێخ رەشیدی لۆلان) بەهاوکاری‌و پشتیوانی ئێران‌و تورکیا دژبە حکومەتی عێراق ڕوویداو (پ. د. ك) لەسەر کوتکردنیدا ڕۆڵی سەرەکی گێڕاو لەئەنجامدا دووکاردانەوەی لێکەوتەوە:

یەکەم: سەرهەڵدان‌و پەرەسەندنی ناکۆکی لە نێوان { (پ. ك. ع)و (پ. د. ك)و گەیشتنی بە ئاستێك سەر لەشکری[٢٨] دووی سەربازی کەرکوك بە ئاشکرا دژبە کادران‌و لایەنگرانی (پ. د. ك) پارمەتی هێزی بەرگری میللی (المقاومە الشعبیە) بدات‌و چەند کەسێکیان لێدەسگیر بکات.

---

[٢٨] عەمید ڕوکن داود سەلمان ئەلجەنابی – وەك:

**دووەم:** دەرکەوتنی کەسایەتی (مەلا مستەفا)و گرنگی مەکانەتیو سەلماندنی ئەو ڕاستیەی وەك سەرۆکی گەلێك تا ئەو سەردەمە هیچ بەرهەڵستکارێکی نەبوو، بێگومان ئەومیش دژبە ویستی (عەبدولکەریم) بوو، لە کاتێکدا خۆی بە تاکە سەرۆك و فەرمانـدەو پێشڕەوی عێـراق دەزانـی، لـە ئاماژەیـەکی ئاشکرای نیازپیسی بەرانبەر بە (بارزانی) بڕیاری لێبوردنی دابە بەخشینی (شێخ ڕەشید) لە یاخیبوونەکەی.. دواتر دەرکەوت نیاز لەو لێبوردنـە پێکهێنـانی هێزێکی هاو سەنگ بوو دژبە (پ. د. ك)و سەرۆکەکەی لە کوردستانی عێراقدا.

کوردەکان شاری کەرکوك بە دڵی کوردستان دەزانـن، تورکمانـەکانی کـەرکوك کەوتبوونە ژێر کاریگەری فەرمانبەرە بیانییەکانی کومپانیای نەوت لەو شارەدا.

لە پـەنای ئەوانیشدا کونسولگەری تورکیـا دەسـتی بـاڵای هـەبوو لەنانـەوەی ئاژاوەو دروستکردنی کێشەو ناکۆکیەکانی نێوان کوردو تورکمان. یـادی یەکـەمی شۆڕشی ١٤ ی تەمموز کەرکوك لە ئاڵو والآتـرین پۆشاکدا ڕازێنرابوویـەوەو خـۆی ئامـادەی ئاهـەنگ گێـڕان کردبـوو.. جێـی داخـە ڕیپێـوانو خۆپیشـاندانەکانی دەربڕینـی خۆشـیو شـادی لەناکاوێکـدا گۆڕانیـان بەسـەرداهاتو لـە ئـەنجامی سـەرهەڵدانی چـەند ڕووداوێکـەوە سەرانسـەری شـار خوێنڕیـژی گرتیـەوەو بـووە گۆمـاوی خـوێن، کـە خـاڵێکی ڕەشـی لـە مێـژووی برایـەتی کـوردو تورکمـان تۆمارکرد[٢٩].

کێشەکە گەیشتە ئـەو ئاسـتە، دەسـت بەسـەر داکێشانو گـەمارۆدانی کارێکی نەسـتەم بـوو، شـار ببوویـە گۆڕەپـانی کوشـتار. سـەبارەت بـە چـۆنییەتی هەڵسەنگاندنی ئـەو کارەسـاتە (مەسـعود بـارزانی) دەڵێـت: (پێویسـتە لـە هـەر جێگاو سەردەمێکدا شۆڤینیزمیو دەمارگیریو ڕەگەز پەرستی هـەبوو گـەلی کورد دژایـەتیو بـەر بـەرەکانێی بکات، کورد لەهـەر گـەلو نەتەوەیـەکی دیکـە زیـاتر شارەزایە لـە بەگژدا چوونەوەی ئـەو بـیرو بۆچوونانەو دەبێـت هەمیشـە تیایـدا

---

[٢٩] بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد- مەسعود بارزانی.

پێشـەنگبێت‌و هـەمانکات هـەوڵی بـەهێزکردنی هـزری دیمـوکراتی بـدات لـە کۆمەڵگای کوردەواریدا، لەگەڵ پێویستی پێکەوەژیانی برایانە لەگەڵ نەتـەوەکانی دیکـەدا.. ڕووداوەکـانی کـەرکوك لەناخـەوە (عەبدولکـەریم قاسـم) یـان هەژانـدو تووشی دڵە ڕاوکێ‌و خورپەی تونـدیانکرد، بۆیـە فەرمانیـدا بـە هەڵوەشـاندنەوەی بەرگری میللی (المقاومەالشعبیە). لەئاستی ئـەو خوێنڕێژیـە هـەر لایەنـەو لۆمـەو سەرزەنشـتی ئـەویتری دەکـرد، مـن لـەو بڕوایـەدام بـەر پرسـاریەتی ئەسـتۆی هەموانی گرتوەتەوەو ناکرێت کەسی لێهەڵاوێرد بکرێت. بەمەبەسـتی دڵنیـابوون ڕۆژی ٢٠/تەمموزی/١٩٥٩ وەخت‌و سەردەمی ڕووداوەکان باوکم سـەرقاڵی سـەردانی بارزان بوو، بە ئامادەبوونی خۆم دەستەیەك کە سایەتی دیارو ناسـراوی تورکمـان لـە شـەقڵاوە بەتایبـەتی سـەردانیانکردو پێشـوازی گـەرم‌و شـیاویان لێکـراو لـە دانیشتنێکدا بە گیـانی برایانـەوە لـە ڕووداواکانیـان کۆڵیـەوەو زۆر بـە تونـدی لـە ئاسیانـدا دڵتەنگی‌و ناڕەزایی دەربڕا، هەمانکات لەگەڵ دەربڕینی ناڕەزایی بارزانی میوانەکانی دڵنیـاکردەوە هـەردەم پابەنـدی بـەهێزکردنی برایـەتی نێـوان کـوردو تورکمانە.

## سەرەتای ناکۆکی

وەك پێشتر ئاماژەی پێکرا هەڵکەوتنی کەسایەتی (مـەلا مستـەفا)و بـاوەڕی جـەماوەر بـەو کەسـایەتیە لەسـەر دەروونـی (عەبدولکـەریم قاسـم) بارسـتایەکی سـەنگینی دروسـتکردبوو، کـوژرانی سـەرۆك خێڵێکـی کـورد بـە دەسـتی چـەند ئەنــدامێکی (پ. د. ك)و کاردانــەوەی کـوژرانی چـەند کوردێـك لـە تۆڵەیـدا ناکۆکیەکی تونـدی لێکەوتـەوە، سـەبارەت بـەو ڕووداوەو بـە گوێرەی ڕێککـەوتنی نێـوان (عەبدولکـەریم)و (مـەلا مستـەفا بـارزانی) لەسـەر نەهێشـتنی نـاکۆکی‌و تەنگـژەکان، بڕیاردرابـە داخسـتنی ئـەو لاپـەرەیە لـە ناکۆکیـەو کردنـەوەی

لاپەڕەیەکی نوێ لەپەیوەندییەکانی (بارزانی)و سەرۆك خێڵ و ئاغاکانی ناوچەکەو داخستنی دەرگای ناکۆکیەکانی نێوانیان.

هاوکاتی ڕووداوەکانی موسڵ و کەرکوك و کوژرانی سەرۆك خێڵەکوردەکە، دەستدرێژیە ترسناك و سەرنەگرتووەکەی بەعسیەکان بۆ سەر گیانی (عەبدولکەریم قاسم)و بریندارکردنی.. سەردانی (بارزانی) بۆ خەستەخانەو پیشنیاری دانانی پاسەوانانی تایبەت لە بارزانییەکان، نەك لای (قاسم) جێی سوپاس و پێزانین نەبوو، بەڵکو بە گومانەوە دەیڕوانییە ئەو پێشنیارەو لە دواندنی کەسانێك سەردانیان دەکرد بە ئاشکرا (بارزانی) فەرامۆش دەکردو پێشنیارەکەی بە سووکایەتی پێکردن و بەکەم زانینی خۆی لێکدەدایەوە. بێگومان ئەم جۆرە هەڵوێستانە بەسەر کەسێکی بە ئەزموونی وەك (مەلا مستەفا) دا تێناپەڕن، لەگەکاردانەوەی ئەو مەسەلەیەو قورسی لەسەر دەروونی، لەسەردانی دووەمیدا بۆ خەستەخانە بوێرانەو بەڕاشکاوی بەرپرسیاریەتی کوشتنی سەرۆکی خێڵی زێباری لە ئەستۆگرت، بوێری دەرخستنی ئەو هەڵوێستە بوو زیاتر (قاسم) ی هاندا لەکاریگەری دەسەڵاتی)مەلا مستەفا)کەم بکاتەوەو سنوورێکی دیاریکراوی بۆ دابنێ. جگە لە هەڵاوسان و پەنگخواردنەوەی گومانە دەروونییەکانی، (عەبدولکەریم قاسم) هەستیکرد نواندنی نەرمی و ئاسانکاری لە ئاستی (پ. د. ك و پ. ك. ع)و ڕێگەدانی بێسنوور بە هێزی بەرگری میللی هۆکار بوون لە هەوڵی بێ ئاکامی بەعیسیەکان، گەیشتە بڕوایەك ئەگەر بەوریاییەوە ڕەفتارنەکات و کەمێك بە خۆیدا نەچێتەوە (مەلا مستەفا) زیاتر هاندەردەبێت لەسەر دژایەتیکردنی و مەترسی دەبێت بۆ سەر دەسەڵاتی[٣٠]. لە ئاکامی ئەم ڕووداوو گۆڕانکاریانەدا، هەڵوێستی عەبدولکەریم بەرانبەر بە کوردو بارزانی بەم شێوەیە ڕوویکردە گۆڕانکاری..

١ - کەمکردنەوەی گرنگیدان بە مەلا مستەفاو زیاتر ڕێزگرتن لە

---

(٣٠) سعد ناجی جواد – سەرچاوەی پێشوو.

ـەیارەکانی.

٢ - کەم کردنەوەو نزم تەماشاکردنی بەهای کەسایەتی نەتەوەی کوردو پشتگوێخستنی مەسەلەی کورد.

٣ - جگە لە شۆڕشەکانی (١٩٢٠-١٩٣٦) پێناسە کردنی شۆڕشەکانی دیکەی بە بزووتنەوەی ئیستیعماری، لە ئامازەیەکی ئاشکراو راستەوخۆدا مەبەستی لەکەدارکردنی بزووتنەوە شۆڕشگێڕیەکانی گەلی کورد بوو.

٤ - گۆڕانکاری لە دەقی (بیری یەکێتی نیشتمانی عێراق) بۆ (بیری یەکێتی نەتەوەیی عێراق) کە مافە نەتەوایەتیەکانی کورد پشتگوێ دەخات.

٥ - گۆڕانکاری لە گوتاری حکومەت لە ئاستی کوردەکانو ناوهێنانیان بەعەرەبی باکوور، لەگەڵ گۆڕینی کۆماری عێراق بە کۆماری عەرەب.

٦ - پێناسەکردنی هەموو تاکێکی عێراق خۆی بە عێراقی بزانێت، کورد بێت یان زنجی یان ئەرمەنیو لە دەوڵەتی عەرەبیدا ژیان بەسەر ببات دەبێ خۆی بەعەرەب بزانێت. وەك لە رۆژنامەی (الثورە)ی زمانحاڵی حکومەتی عێراقدا بلاوکراوەتەوە.

٦ - بەرانبەر بەو دەقەی لە رۆژنامەی (الپورە)دا هاتوە رۆژنامەی خەبات زمانحاڵی (پ. د. ك) وەلامێکی رەخنە ئامێزی توندی داوەتەوەو دەڵێت: (بوونی نەتەوایەتی کورد راستیەکی مێژوویی حاشا هەڵنەگرو بە هێزەو هەموو هەوڵێکی تاوانکاری وردوخاش دەکات). خەبات لە درێژی نووسینەکەیدا دەڵێت: (پەیرەو کردنی سیاسەتی تواندنەوەو سەرکوتکردنو لە ناوبردن، یەکێتی نیشتیمانی لەبەر یەك هەڵدەوەشێنێ.. ئەو رێبازەی دەوڵەتی لەسەرەو سیاسەتی دژبەگەڵ پیادە دەکات لە رزۆك دەبێتو ناخی دەرزێتو زوو بەرەو پووکانەوە دەچێتو گەلەکەیشی لەژێر کاریگەری ستەمو بەندایەتیدا دەمێنیتەوە).

دەربڕینی نارەزایی دژبە هەوڵەکانی تواندنەوەی نەتەوەی کورد دڵسۆزییە بۆ یەکێتی نیشتمانیو برایەتی کوردو عەرەب.

## دابڕان

دەسەلأتدارانی عێراق جگە لە راگرتن و قەدەغەکردنی تەواوی چاپەمەنییە کوردییەکان لە ئازاری/١٩٦١ دا رۆژنامەی (خەبات)ی زمانحالّی پارتی دیموکراتی کوردستان یان داخست[٣١]. لەهەولّی چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان و رەواندنەوەی گرژییەکان و ئاساییکردنەوەی بارودۆخەکە، لە حوزەیرانی/١٩٦١ بەمەبەستی دیداری (عەبدولکەریم قاسم) دەستەیەك لە نوێنەرانی کورد سەردانی بەغدایانکردو بێگەیشتنە مەبەست بە ناچاری گەڕانەوە بۆ کوردستان. لە هەولّێکی دیکەو لە تەمموزو ئابی هەمانساڵدا مەکتەبی سیاسی پارتی دوو یاداشتی بەجێ بەجێکردنی ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستان دایە حکومەت. ناردنی هێزە سەربازیەکان بۆ ناوچەکە وەلأمی هەردوو یاد داشتەکە بوو. دیارە (قاسم) بەوەشەوە نەگیرسایەوە، بێ رووگیربوون، لە ئەیلولی ١٩٦١ دا فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانی لە دەست پێشخەریدا زۆر بە توندی ناوچەی بارزان و چەند ناوچەیەکی تری هەستیاری کوردستانیان بوردمانکرد. بە تێپەڕاندنی چەند رۆژێکی تر دیسانەوە لە ١١ ی ئەیلولدا ناوچەی بارزان و ناوچەکانی دیکە کەوتنەوە ژێر هێرشی فڕۆکە جەنگیەکانی عێراق.. بەکردەوە ئەو رۆژە بەسەرەتای هێرشە سەربازیەگشتگیرەکانی بۆسەر ناوچەی کوردستان و راگەیاندنی شەڕی دژبە کورد دیاریکرا، هەمانکات بەیەکەم رۆژی راپەڕینی کوردو شۆڕشی بەرگری لە خۆکردنی ئەیلول لە مێژووی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد ناسراو هەر ئەو کاتە (ل. ش. ك) لە دەستەو پەل و لقەکان پێکهێنرا. بەرانبەر بەڕاپیکردنی کارەکان حکومەتی بەغدا لە هەلّوێستی دوژمنکارانەی لە ئاستی گەلی کورد گەمارۆی ئابووری خستە سەر تەواوی ناوچەی کوردستان، بەشکستهێنان و سەرنەگرتنی ئەو هەنگاوە حکومەت کەوتە پەلاماردانی دانیشتوانی بێدەسەلأتی شارو شارۆچکەکان و گرتن و زیندانیکردن و سەرکوتکردنی هاولأتیان.. شکستەکان

---

[٣١] جەلیلی جەلیل.

ـە ئەندازەیەك حكومەتیان توشی سەرشێتی (هستریا)ی دژبە كوردكرد بوو لە تەرینی یەكەمی ساڵی ١٩٦١ دا بەفەرمانی دەسەلاتداران پۆشاكی نەتەوایەتی لە فەرمانبەرانی كورد قەدەغەكرا. پێویستە لێرەدا راشكاویو بوێری مەسعود بارزانی فەرامۆش نەكرێت كەدەڵێت: (بێویژدانییە بەرپرسیاریەتی هەموو ئەو تاوانانەی بەرانبەر بەگەلی كورد ئەنجامدراون، بە تەنها بخرێنە ئەستۆی (عەبدولكەریم قاسم)، نەك تەنها دەبێ، بەڵكوو نەكرێت لەو راستیە دەرنەچین و دان بەوەدابنێین، زۆربەی كات كاركردنی ئێمەیش لە ئاستی خۆیو رژێمەكەیدا وردبینیو دووربینی تیادا رەچاونەكراوەو پڕبووە لەپەلەكردنو هەندێ جار هەڵەشەیی، بێ كوێدانە ئەو مەترسیانەی دبوونە هەڕەشە بۆ سەردەسەلاتیو رژێمەكەی، ئەوەی بۆ ئێمە شیاونەبوو وەك دەوڵەتێك لە ناوخۆی دەوڵەتی ناوەندیدا هەڵسو كەوتمان دەكرد، بێگومان هەر ئەوەیش بوویە سەرچاوەی گومانو دڵەڕاوكێی دەسەلاتدارانو هەڕەشە لەپاشەڕۆژی یەكێتی نیشتمانی، دیارە ئەمەو چەند هەڵوێستێكی دیكەمان كردبوو نەمبیانوو دانمانە دەستی كەسانێكی شۆڤینی لەناوخۆی دەسەلاتدا، كەبەهیچ شێوەیەك دڵسۆزیان بۆ ئەو رژێمەنەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا بەرانبەر بەئامانجە بنەڕەتیەكانی كورد دڵڕەش وقین لەهەناوبوونو توانیشیان (عەبدولكەریم قاسم) بۆ سەنگەری خۆیان راكێشنو دیوارێكی بەد گومانیو نیاز خراپی لە نێوانی ئەوو (بارزانی)و (پ. د. ك)و گەلی كورد دروست بكەن).

## رووخانی عەبدولکەریم قاسم

وەك نەریتی باوی شۆڤینیزمیو رەگەز پەرستی گوتاری فەرمی حکومەت لە کەدارکردنی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردەو تۆمەتبارکردنییە بە بزووتنەوەیەکی کۆنە پەرستو بەکرێگیراوی ئیستیعمار، کەچی هەر ئەو بزوتنەوەیە بوو گۆڕانکاری گرنگو کاریگەری لەناخی ژیانی سیاسی ناوخۆی عێراقدا درووستکردو بووە هۆکاری سەرەکی لەپەرەپێدانی رقو تووڕەیی جەماوەر دژ بە حکومەتو بەرنگاربوونەوەی بەبەشداریکردنی راستەو خۆی بەعسیەکانو ئەفسەرانی نەتەوەخوازی عەرەب بەڕابەرایەتی (عەبدولسەلام عارف)و هاوکاریکردنو بەشداریکردنی ناسریەکان کوودەتای ٨ ی شوباتی ١٩٦٣ روویداو تیایدا (عەبدولکەریم قاسم) گوللەبارانکراو کۆتایی بە رژێمو دەسەلاتەکەی هێنرا.

هەر لەیەکەم رۆژی کوودەتاکەوە، رژێمی نوێ بە چارەسەرکردنی کێشەی رەوای کورد ئامادەیی خۆی دەرخست.

ئەوندەی نەخایاند نوێنەرانی هەردوولا لەسەر مێزی گفتوگۆ کۆبوونەوەو داخوازیەکانی بزووتنەوەی کورد بەمشێوەیەی خوارەوە خرانە بەردەست:

**١ – ئۆتۆنۆمی:**

هەرچی زوو تر سەلماندنی ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستانو جێگیرکردنی لە دەستووری هەمیشەییو بلاوکردنەوەی لە رۆژنامەی فەرمیو بلاوکردنەوەی لە رۆژنامە ناوخۆییەکانو خوێندنەوەی لە ئیزگەداو لە رێی وەزارەتی دەرەوە گەیاندنی وێنەیەکی پرۆژەکە بەرێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان.

**٢ - سنووری جوگرافی کوردستان:**

لە باکوورەوە تورکیاو لەرۆژهەلاتەوە ئێرانو لەرۆژئاواوە سوریاو لەباشوورەوە زنجیرە چیاکانی حەمرین.

٣ – زمان:

لە کوردستاندا زمانی کوردی زمانی فەرمی دەبێتو خوێندن لە قوتابخانەکاندا بەهەمان زمان بەڕێوە دەبرێت، هەمانکات ئەو ناوچانەی کەمایەتیەکانی جگە لە کوردیان تیادانیشتەجێن خوێندن بە زمانی خۆیان دەبێت شانبەشانی خوێندن بەزمانی کوردی.

٤ - دەسەلاَتی پەرلەمان:

أ - ئۆتۆنۆمی کوردستان لەسەر بنەڕەتی دەسەلاَتی پەرلەمانی دیموکراتی دەبێتو جێگری سەرۆك کۆمارو جێگری سەرۆك وەزیران کورد دەبنو ناوچەی ئۆتۆنۆمی دەبێ خاوەنی ئەنجومەنی خۆی بێت.

ب - دیاریکردنی ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیرانو نوێنەرانی ئەنجومەنی نیشتمانی بەرێژەی دانیشتوانی ناوچەی کوردستان دیاری دەگرێت لەگەڵ هێشتنەوەی وەزارەتەکانی دەرەوەو داراییو بەرگری لە ژێردەسەلاَتی حکومەتی ناوەندیو بۆهەر وەزارەتێکیان وەزیرێکی دەوڵەت لە کورد دابنرێت، لەگەڵ دامەزراندنی وەزارەتێکی نوێ بەناوی وەزارەتی دەوڵەت بۆ راپەڕندنی کاروباری دەسەلاَتی ئۆتۆنۆمی.

٥ – سوپا:

أ - پێکهێنانی یەکە سەربازیەکان لە ئەفسەرو پلەدارو سەرباز بەرێژەی دانیشتوانی کوردستان لە خەڵکی کوردستانو جێگیرکردنیان لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی.

ب - ئەو یەکە سەربازیانە بریتی دەبن لە تەواوی بەشەکانی هێزی ئاسمانیو پیادە وزرێپۆشو بێتەڵو هەواڵگریو ئەندازیاریو تۆپخانەو دژە ئاسمانی.

ج - دامەزراندنی دەزگاگرنگەکانی هاوچەشنی دەزگاگرنگەکانی دیکەی سوپای عێراق لە کوردستان.

### ٦- بوودجەی کوردستان:

پێکدێت لە داهاتی باجو گومرگو داهاتەکانی دیکەو بەرێژەیەکی یەکسان لەگەڵ وەرگرتنی رێژەیەکی عادیلانە لەداهاتی نەوت، بە مەرجێك لە رێژەی دوو لەسەرسێی داهاتی کوردستان کەمتر نەبێت.

### ٧- هێزی پێشمەرگەی کوردستان:

هێشتنەوەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان تائەوکاتە میلاکی سوپاپڕدەکرێتەوەو مووچەو خۆراكو پۆشاك بۆ یەکە سەربازیەکان دیاریو جێگیر دەکرێت.

### ٨ - حکومەتی ئۆتۆنۆمی:

بەپێی تەواوی داخوازیەکان حکومەتی ئۆتۆنۆمی چاوەڕوانکراو لە کوردستان دادەمەزرێت.

لەدیدو بۆچوونی حکومەتی نوێ سەبارەت بە مەسەلەی کوردو بزووتنەوەی رزگاریخوازی، ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بەم شێوەیە بەیاننامەی خوارەوەی راگەیاند.

(بژی کورد بژی عەرەب.. کوردەکان برامانو بڕواو بەرژەوەندیەکانمان بەیەکەوە ئاوێزانو گرێدراون، هیچ وەخت دوژمنانمان لە ئیستیعمارو بەکرێگیراوانی ناتوانن پاکیو بێگەردی ئەو برایەتیەمان بشێوێنن.. هەروەك لە دەقی یاسایی دەستووری کاتیدا هاتووەو ئەو راستیەی سەلماندوە، شۆڕشی ١٤/تەمموز لە پێناوی رزگارکردنی گەلی عێراقو بەهێزکردنی ئەو برایەتیەدا بەرپاکرا، بەڵام هەروەك لادانو ستەمکاری (عەبدولکەریم قاسم) لەگرتنو کوشتندا جەماوەری عەرەبی گرتبوو یەوە، هەمانشێوە کوردیشی گرتبوویەوە وفیتنەکاریو دووبەرەکیو ناکۆکی جێی بڕواو متمانە بە یەکبوونی گرتبوویەوەو چەندین بەلای بەسەر ولاتدا هێنابوو. شۆڕشی ١٤ ی رەمەزانی

بیرۆزی ٨ ی شوباتی ١٩٦٣ لە پێناوی رامالینی ستەمکاریو سەپاندنی سەربەخۆییو ئازادیو دادپەروەریدا بەرپاکرا.

لەو دیدگایەوە کوردو عەرەبو نەتەوە براکانی دیکە بە بنەڕەتی یەکێتیو یەکگرتنی هەموو عێراق دەبینێ، پێشترو ئێستا ئامانجی بنەڕەتی شۆڕشەکە دامەزراندنو رێکخستنی دەزگایەکی هاوچەرخە لەبەرێوەبەرایەتیو دەسەلاتو سیستەمی دەسەلاتی لامەرکەزی، وەك لە چەندین شوێنی جیهاندا پەیرەو دەکرێتو ئامانجەکانی لەبەرژەوەندی گشتی تەواو دەبێت، بەجێ بەجێکردنی ئەو شێوازەو بە گوێرەی بنەماسەرەکییەکانی شۆڕش وەك لە بەیاننامەی یەکەمیدا هاتووە، بە شێوەیەك پارێزگاری لە برایەتی کوردو عەرەب دەکاتو سوود بە بەرژەوەندییەکانی خۆی بگەیەنێتو خەباتی هاوبەشیان دژبە ئیستیعمار بە هێز بکاتو رێز لەمافی کەمایەتیەکانی پێکهاتەی ولات بگرێتو هەموان پێکەوە بەشداری لە ژیانی گەلو نیشتماندا بکەن، لەو پێناوەدا ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بڕیار دەدات لەسەر جێ بەجێکردنی مافە نەتەوایەتیەکانی گەلی کورد لەسەر بنەڕەتی (لامەرکەزی)و دەچێتە دەستووری کاتیو هەمیشەیی لەکاتی بوونی بەیاسا، لە پێناوی ئاسانکاری لە دیاریکردنو دانانی خالە بەراییەکانی دەسەلاتی لامەرکەزی، بڕیاردرابە پێکهێنانی لیژنەیەکی پسپۆڕ بە ئەنجامگەیاندنی ئەو ئەرکە)[٣٢].

بەو هۆیەوە رژێمی نوێ چارەسەری گونجاوو دادپەروەرانەی مەسەلەی کوردی لە دەستدانەبوو، هەمانکات لەسەر داواکاریەکانی بزووتنەوەکەیش رازی نەدەبوو.. رژێم بە دلنیایی تەواوەوە بڕوای بە جێگیربوونو مانەوەی دەسەلاتی خۆی هەبوو، بە نیازی خۆی پێویستی بە گفتوگۆنابێت بەو هۆیەوە پشتی لێکردو کەوتە پاشەکشەو تەفرەدانی مەسەلەکە، بەتایبەتی لەو سەردەمەدا بەعسی سوریا لە رێی کوودەتاوە گەیشتە دەسەلات.

---

(٣٢) بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد – مەسعود بارزانی

## گفتوگۆکانی یەکگرتنی سیٚ قۆڵی

گفتوگۆکانی پرۆژەی یەکگرتنی سێقۆڵی نێوان میسرو عێراق‌و سوریا لە ١٧ ی نیسانی ١٩٦٣ دەستیان پێکرد، حکومەتی بەعسی خەریکبوونی بەو گفتوگۆیانەوە بە هەلێکی گونجاوو لەباریزانی لە دوا خستنی گفتوگۆکانی لەگەڵ بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد. لەو وەختەدا باڵی دەسەڵاتداری بەعس بەرابەرایەتی (ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر) لەچارسەرکردنی بنەڕەتی کێشەی کورد مەترسی خۆی هەبوو، دیارە (ئەلبەکر) لەوە دەترسا رۆژێك لە رۆژان‌و لەکاتێکی هەستیاردا (جەمال عەبدولناسر) چارسەرکردنی مەسەلەی کوردو جێگیرکردنی مافەکانی بکاتە چەکی پڕوپاگەندە دژ بەخۆی‌و پارتەکەی. بەمەبەستی دەربڕینی دیدو بۆچوونی بزووتنەوەی کورد لە گفتوگۆکانی یەکگرتنی عەرەبدا (جەلال تاڵەبانی) بەشاندی عێراقەوە پەیوەست کرا. سەبارەت بەو مەسەلەیە (د. جەمال ئەلئەتاسی) لە پێشەکی کتێبەکەی (مونزر ئەلموسڵی — کوردو عەرەب)دا دەنووسێت دەستەیەك راوێژکاری هەڵبژاردە لە بزووتنەوە نیشتمانییەکانی عێراق لە ناویاندا چەند فەرماندەیەکی بزووتنەوەی کورد لە گفتوگۆکانی یەکگرتنی سێقۆڵیدا هاوڕێی شاندی عێراق بوون. لەماوەی درێژەپێدانی گفتوگۆکاندا، بەڕاشکاوی‌و بێ پێچ‌و پەنا (جەلال تاڵەبانی) دیدو بۆچوونی سەرکردایەتی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردی خستە پێش چاوی نوێنەرانی هەرسێ وڵات‌و وتی (ئەگەر ئێوە لە هەوڵی یەکگرتنی هەرسێ کۆمارەکەدابن وەك (دەقی پرۆژەی یەکگرتنی هەرسێ وڵات) لەو حاڵەتەدا داخوازیەکانمان وەك خۆیان دەمێننەوە کە ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستانە لەچواچێوەی ئەو شێوەیەکگرتنەدا.. بەڵام ئەگەر نیازتان پێکهێنان‌و دامەزراندنی یەك کۆماری عەرەبی بێت لەسێ هەرێمدا.. دەبێ ناوچەی کوردستان هەرێمی چوارەم بێت لە نێوانی هەرێمەکانی ئەو کۆمارەدا).

لە درێژەی نووسینەکەیدا (د. ئەلئەتاسی) دەڵێت: (هەروەك ئاگاداربوونم‌و شارەزاییم لەو مەسەلەیەدا، بۆم دەرکەوت (جەمال عەبدولناسر) بە ئاسوودەی دەروونییەوە سەرنجی خستبوویە سەر داخوازیەکانی کورد، لەوە دڵنیابوو هیواو ئامانجە ستراتیژیە دوور مەوداکانی کورد لەگەڵ پاشە رۆژی چاوەڕوانکراوی عەرەبدا یەك دەگرنەوە. لەئاستی گۆڕانکاریەکاندا (عەبدولناسر) هەڵوێستی نەگۆڕی هەبوو، هەمیشە هیوا خوازی مانەوەی عێراقێکی یەکگرتووو یەکپارچەو ئاسوودەو ئارام بوو، بە تەواوی هەست پاکیەوە لەبەرژەوەندی پەرەپێدان‌و بەهێزکردنی برایەتی کوردو عەرەب کاری دەکرد، لەگەڵ پشتیوانیکردنی لە مافەکانی کوردو جێ بەجێکردنیان). بەکەمێك گەڕانەوە بۆ دواوە دەبینین بزووتنەوەی کورد لە ١١/ئەیلولی/١٩٥٨ دا هەمان ئەو داخوازیانەی پێشکەش بە (عەبدولکەریم)و عەبدولسەلام عارف) کردبوو[٣٣].. وەك دواتر ئاشکرابوو ئەو داخوازیانە بوونە هۆکاری بەر هەڵستی کردنی (قاسم) لەپرۆژەی یەکگرتنی عێراق‌و کۆماری عەرەبی یەکگرتوو، جگە لەوە بووە بەردی بناغەی ئەو ناکۆکیەی کەوتە نێوان هەردوو باڵی (عەبدولکەریم‌و عەبدولسەلام). لە١٧/ نیسانی/١٩٦٣ بێ هیچ ئاماژە کردنێك بە کوردو مافەڕەواکانی، هەرسێ وڵاتانی میسرو عێراق‌و سوریا بەیاننامەی رێککەوتنی دامەزراندنی کۆماری عەرەبی فیدراڵیان بڵاوکردەوە. سەرکردەکانی کورد گەیشتنە ئەو بڕوایە دەرەنجامی رێککەوتنەکە پشتیوانی تەواو بوو لە هەڵوێستی عێراق دژبە مافەکانی گەلی کوردو بزووتنەوەکەی، ئەوە بوو پاش چوارمانگ سوریاو عێراق بڕیاری تێکەڵبوون (الاندماج)و یەکگرتنی تەواویان راگەیاندو سوریا لەیارمەتیدانی سوپای عێراق لەشەڕی دژبە کوردەکان‌و شۆڕشی ئەیلول یەك لە شکر(فرقە)ی سەربازی پێکهاتوو لە پێنج هەزار سەربازی بۆ کوردستانی عێراق بەڕێکرد[٣٤].

---

(٣٣) عێراق و مەسەلەی کورد- د. سەعد ناجی جواد.

(٣٤) ئەو لەشکرە بریتی بوو لە هەردوو هێزی (یەرموك و بەرەدا). و.ك

## کودەتاکەی عەبدولسەلام عارف

پاش ناکۆکیەکی دوورودرێژ بە هاوکاریو پشتیوانی (عەبدولڕەحمان عارف)ی برایو کۆمەڵێك ئەفسەری سوپاله دژە کوودەتایەکدا (عەبدولسەلام عارف) باڵی بەعسی لە دەسەڵات دوورخستەوەو لەبازنەی دەسەلأتێکی بیرۆکراتی خۆسەپێنی سەربازی لاوازو بێتوانا لە چارەسەرکردنی کێشەکانی وڵات بەتایبەتی لە ئاستی کێشەی کوردو لە بەدیهێنانی دوو ئامانجدا دەسەلأتی رە های بەخۆی بەخشی.

**ئامانجی یەکەم:** بەهێزکردنی پێگەو دەسەڵات.

**ئامانجی دووەم:** کۆتایی هێنان بە شەڕی کورد، کە توانا بەخشەبە ئامانجی یەکەم، بەبۆچوونی عەبدولسەلام چارەسەرکردنی کێشەی کورد دەبێ لەڕێسا سەرەکیەکانی دەسەڵاتەکەی بێت، بەو مەسەلە یەکەم کۆنگرەی رۆژنامەوانی پاش سەرکەوتنی کوودەتاکەی وتی (لەگەڵ براکوردەکانمان پێکەوە لەم وڵاتە ژیانێکی هاوبەشمان بەسەربردوە، بەپشتیوانی پەروەردگاری مەزن لە ئێستاش بەدواوە هەروا دەژین)[٣٥]. نەرمی هەڵوێستی (عەبدولسەلام) دەگەڕاییەوە بۆ لێکدانەوەی ڕووداني کوودەتاکانیو لاوازیو بێتوانا بوونی هێزە سەربازیەکانو کوژران وتیاچوونی سەدان ئەفسەری شارەزاو بەتواناو پلەبەرز، جگە لەدەرکردنی تەواوی ئەفسەرانی کورد لە سوپاو دوورخستنەوەی سەدان پلەدارو سەرباز بۆ باشووری وڵات، هەر لەوکاتەدا هەڵوێستی رژێمی بەرانبەر پارتی کۆمۆنیستی عێراق هۆکاربوو لە خۆدوورگرتنی یەکێتی سۆڤیەت لە عێراقو راگرتنی ناردنی بارگەکانی چەك بۆ سوپا، لە کاتێکدا ئەو سوپایە تەنها پێویستی بەچەكو تەقەمەنیو پێداویستی سەربازی سۆڤیەتی هەبوو، ئەمە بووە کێشەیەکی ئەوتۆ (عەبدولسەلام عارف) پەلەبکات لە ئەنجامدانی کوودەتاکەیو دوور خستنەوەی

---

(٣٥)

بەعس لە دەسەڵاتی وڵات. (عەبدولسەلام) هەرزوو هەستیکرد مانەوەی زیاتری ئەو لەشکرەی سوریا لە عێراقدا کارێکی تەواو نادروستو ترسناکە، لەو ئاستەدا بڕیاریدا هەرچی زوتر ئەو هێزە لە کوردستانی عێراق بچنە دەرەوەو بەرەو وڵاتی خۆی بگەڕێتەوە.

لەلایەك سەختی زستانو رێگری لە هەر کردەوەیەکی سەربازیو لەلایەکی ترەوە توانای بەرزی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەئاست رووداوەکانو چەند هۆکارێکی دیکە، سەرۆك کۆماری بەگرتنەبەری رێگای گفتوگۆو رێککەوتن لەگەڵ بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد ناچارکرد.

## سەر لەنوێ گفتوگۆو رێککەوتن

### یەکەم: بەیاننامەی حکومەت.

لە کانوونی یەکەمی ١٩٦٣ جارێکی ترو سەر لەنوێ گفتوگۆکان لە نێوانی بزووتنەوەی کورد بەڕابەرایەتی (مەلا مستەفا بارزانی)و حکومەتی (عەبدولسەلام عارف) دەستی پێکردەوە، بەو بۆنەیەوە حکومەت بەیاننامەیەك و (بارزانی) نامەیەکی ئاراستەی گەلی عێراقی کرد. سەرەتا بەیاننامەی حکومەت.

١ – بڕیاردان لەسەر سەلماندنی مافەنەتەوایەتیەکانی براکوردەکانمان لە چوارچێوەی گەلی عێراقو یەکێتی برایەتی نیشتمان، لەگەڵ جێگیرکردنی لە دەستووردا.

٢ – ئازادکردنی تەواوی زیندانیانو سزادراوان بە هۆی رووداوەکانی باکوور (کوردستان)ەوەو راگەیاندنی لێبوردنی گشتیو دەست هەڵگرتن لەسەر ماڵو موڵکی گوێزراوەو جێگیری ئەو کەسانەی ماڵو موڵکیان ژێر دەستە کراوە.

٣ - سەر لەنوێ گەڕاندنەوەو دامەزراندنەوەی تەواوی بەڕێوەبەرایەتیە

خۆجێیەتیەکان بۆ ناوچەکە.

٤ - گێڕانەوەی تەواوی فەرمانبەران و کرێکاران و خزمەتگوزارانی دەرکراو بۆ سەرکارەکانیان.

٥ - هەڵگرتنی گەمارۆی ئابووری لەسەر ناوچەکەو کەوتنەوەکاری ناردنی بارگە جۆراو جۆرەکانی بازرگانیو خۆراكو پێداویستیە سەرەکیەکانی ژیان بۆ کوردستان.

٦ - هەرچی زووتر راکێشانی دەستی ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکەو پێکهێنانی لیژنەی جۆراو جۆر بەمەبەستی ئاسانکاری لە راپەڕاندنی کارەکان و رێگری لە رۆتین و دواخستن، لەگەڵ بەرچاوگرتنی قەرەبووکردنەوەی زیان لێکەوتوان.

٧ - قەرەبووکردنەوەی ئەو خاوەن زەوی وزارانەی زەویەکانیان کەوتوونە ژێر ئاوی پەنگخوار دووی بەنداوەکانی دەربەندیخان و دووکان، بەقەرەبوو کردنەوەیەکی دادپەروەرانە.

٨ - گێڕانەوەو بەرقەرارکردنی باری ئاسایش بۆ ناوچەی باکوور.

بەم بۆنەیەوە خوازیارین براکوردەکانمان بگەڕێنەوە سەر ژیانی سروشتیو ئاسایی خۆیان، تاهەموان پێکەوە لە خێرو خۆشی ئەم وڵاتە بەهرەمەندبن و یەك ریز دژبە پیلانگێڕان و ئیستیعمار بوەستین.. دەبێ برا کوردەکانمان هەست بەوە بکەن و بزانن ئێمە کارلە سەردەستەبەر کردنی مافەڕەواکانیان دەکەین، وەك مافی هەموو هاوڵاتیەکی دیکەی کۆماری عێراق. خودا زاناو ئاگاداری مەبەستەکانمانە.

٩ - لەسەر تەواوی وەزارەتە پەیوەندیدارەکان پێویستە ئەم کارانە جێ بەجێ بکەن و کارئاسانی بکەن لەسەر تەواوی خاڵبەندیەکانی ئەم بەیاننامەیە.

عەبدولسەلام محەممەد عارف

سەرۆك کۆماری عێراق

**دووەم: نامەی مەلا مستەفا بارزانی.**

لەسەر ویستو نیازپاكی سەرۆك كۆماری عێراق موشیرڕكن (عەبدولسەلا م محەممەد عارف) بەپاراستنی یەكێتی نیشتیمانیو وازهێنان لە خوێن رشتنی بێ تاوانان وكۆتایی هێنان بە برا كوژیو لەپێناوی سەلماندنی ئەو نیازپاكیەی دەسەڵاتی فەرمانڕەواو بڕیارماندا لەلایەن خۆمانەوە دەست پێشخەری بكەین لەڕاگرتنی شەڕ، داوا لە براكانمان دەكەم بگەڕێنەوە سەر نیشتەجێكانیانو خەریكبوونیان بەكارو ئەركە ئاساییەكانیانەوە، لەمەدا بوار لەپێش دەسەڵاتی نیشتیمانیدا دە رەخسێنین بتوانێت بەرەو بووژاندنەوەی ژیانی سروشتیو ئاساییكردنەوەی بارودۆخەكە هەنگاوبنێتو هەرچی زووتر كاربكات لەسەر جێ بەجێكردنی داخوازیەكانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی كوردو هێنانەدی مافە نەتەوایەتیەكانی لە چوارچێوەی یەكپارچەیی گەلی عێراقو لەمەودای بە هێزكردنی برایەتی كوردو عەرەبدا پارێزگاری تەواوبكرێتو لەپیلانەكانی ئیستیعمارو چاوچنۆكان دوور بخرێتەوە.. باڵا دەستی یاساو سەپاندنی ئاسایشو ئارامی لەناوچەكەدا دەستەبەر كەری چارەسەركردنی تەواوی گرێو كۆسپەكانە ئەگەر گرانیش بن. پەروەردگاری مەزن یارمەتیدەری دڵسۆزان بێتو هەوڵەكانیان سەركەوتوو بكاتو هەر ئەوە ئاگای لە مەبەستەكانە.

**مستەفا بارزانی**

## سەرهەڵدانی ناكۆكیو كەوتنەوەی دووبەرەكی

پێشتر باس لە سەرهەڵدانی دووبەرەكی نێوان (هەمزە عەبدوڵا)و (برایم ئەحمەد) كرا كە دوای شۆڕشی ١٤ ی تەموزی ١٩٥٨ لەڕێزەكانی (پ. د. ك) روویدابوو. دوای رزگاربوون لە (هەمزە)و دووركەوتنەوەی یەكجاری لە پارتی،

جارێکی تر ناکۆکی کەوتە نێوان (مەلا مستەفا بارزانی)و (م.س) بەڕابەرایەتی (برایم ئەحمەد)و دووباڵی لێکەوتەوە.

باڵی یەکەم بڕوادار بە بەهاو نەریتەبەرزەکانی خێڵەکیو عەشایەریو باڵی دووەم پیاوانی سیاسیو ڕۆشنبیرانی لە خۆگرتبوو، دیارە ئەویش هۆکارێك بوو (بارزانی) بەتاك لایەنی لەگەڵ حکومەتدا بگاتە ئەو ڕێککەوتنەی پێشتر باسی لێوەکراو بەناوی خودی خۆیەوە بەیاننامەی ڕێککەوتنی ڕاگەیاند.

باڵی (م.س) زۆر بە پەلەو بێ لێکدانەوەو ئارامگرتن، بەتوندی دژی ڕێککەوتنەکە وەستاو بەیاننامەی ناڕەزایی لە ئاستیدا بڵاوکردەوەو بەوەی خەتابارکرد کە بەڕوونیو ئاشکرا هیچ ئاماژەیەك بۆ ئۆتۆنۆمی کوردستان نەکراوەو ئەوەی لە ڕێککەوتنەکەدا هاتووە کەمترە لە داخوازیەکانی کوردو هۆکاریشە لە جێگیرکردنو بەهێزکردنی (عەبدولسەلام عارف) لە دەسەڵاتدا. لەو ئاستەدا ئەوەبوو حکومەتی (عەبدولسەلام) هەڕەشەی بەکارهێنانی هێزی کرد لەهەردەستەو تاقمێك بەرهەڵستی (مەلا مستەفا) بکات. هەرچەند ڕێککەوتنی نێوان بارزانیو حکومەت کرۆکی ناکۆکیەکەنە بوو، چەند هۆکارێکی دیکە هەبوون زیاتر ناکۆکیەکەیان قووڵتر کردبوویەوە.. وەك.

- سەرۆکایەتیکردنی پارتی لەلایەن سەرۆك‌و فەرماندەیەکی خێڵەکیەوە، لەکاتیکدا (م.س) لەلایەن کۆمەڵێك ڕۆشنبیری چەپەوە ڕابەرایەتی دەکرا کەبەشادەماری ڕەسەنی پارتی دەناسراو ناکۆکی ناوخۆییو جیاوازی بیروڕا بەشێوەیەکی سروشتی وەردەگرن[36].

---

[36] لێرەدا نووسەر بەو شێوەیە لە مەسەلەکە گەیشتوە.. دیارە شادەماری ڕەسەنی پارتی دەگەڕێتەوە بۆ سەرۆکایەتیکردنی بارزانی و ئەو ڕێبازە ڕەسەنەی کوردایەتی هەر لە دامەزراندنی پارتیەوە تا ئەو کاتەو ئێستا و دواتریش.. ئەمە لەلایەك.. لەلایەکی دیکەوە ئەو هەڤاڵانەی بەناوی (م.س) هوە لەڕەسەنایەتی پارتی جیابوونەوە نەبە تەنها ئەوان ڕۆشنبیربوون و نەباڵی بارزانی تەواو خێڵەکی بوو.. دیارە سەرکردایەتیەکە

بەو هۆیەوە (بارزانی) کە سایەتیەکی کاریگەرو ناسراوی ناوجەماوەری بەرینی کوردو سەرکردەیەکی عەشایەری کۆمەڵگاو لەپێناوی نەتەوەکەیدا خاوەنی ڕێپێوانی ئەفسانەیی بوو بۆیەکێتی سۆڤیەتو بەتواناترین کەس بوو لە

---

لەهەردوونوخبەکە پێکهاتبوو بڕوادار بەپرنسیپەرسەنەکانی نەتەوایەتی و پەرەپێدانی خەباتی سیاسی مەعریفی .. کەزۆربەی ڕۆشنبیرانی لە خۆ گرتبوو، کۆنگرەی گوندی (بوسکین ی نزیکی قەلادزەو بەشێکی لە گوندی گردەسپان) پێکهێنانی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش دەسەڵمێنی کە لە زۆربەی ڕۆشنبیران و سیاسەتمەدارانی (م.س و سەرکردایەتی پارتی)) لەگەڵ ئەو باڵەدامانەوە کە بارزانی ڕابەرایەتی دەکرد کەلەم بەرێزانە پێکهاتبوو:

١-مستەفا بارزانی — سەرۆکی پارتی — سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش.

٢-حەبیب محەممەد کەریم ٣- د. مەحمود عوسمان ٤- عەلی عەبدولا.

٥- سالح یوسفی ٦- عەقید عەزیز عەقراوی ٧- د. فۆادجەلال.

٨- یەدولا کەریم٩-عەلی سنجاری ١٠- نو عمان عیسا ١١- ئیسماعیل عارف

١٢- هاشم عەقراوی ١٣- ئیسناعیل مەلا عەزیز ١٤- شێخ محەممەد هەرسین

١٥- مستەفا قەرەداغی ١٦- محەممەد ئەمین عەلی ١٧- عمر شەریف

١٨- رەمەزان عەقراوی.

جگە لە پێکهێنانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش پێنج لیژنەی سەرەکی پێکهێنران.

١- لیژنەی دەستوور ٢- لیژنەی قەزایی ٣- لیژنەی سەربازی ٤- لیژنەی ئیداری ٥- لیژنەی ئابووری.

لیژنەی سەربازیش بریتی بوولە:

١- عەقید عەبدولڕەحمان قازی ٢- عەقید نوری مەلامارف ٣- عەقیدکافی محەممەد نەبەوی ٤- المقدم نافزجەلال ٥- المقدم نوری مەلا حەکیم. ئەمانەو جگەلە چەندیاساناس و ماف پەروەرو ڕۆشنبیری ناوداری وەك (عیسمەت شەریف وانلی و موحسن دزەیی ..هتد). و.ك

کۆکردنـەوەو راکێشانی لایـەنگرانیو خاوەنداریـەتی هێزێکی تایبـەتی خێڵەکەی خۆی بوو، جگە لەوەی تەمەنی لەبەر بـەرەکانێکردنو خەباتـدا بەسەربرد دژبـە رژێمەیەك لەدوایەکە دوژمنەکان بەکورد. ئەو هەموو خەسڵەتانە جگە لەو پیاوە مەزنە لەکەسدا کۆنەبوونەتەوە. (بۆیە جێی خۆیەتی بەتەنها ئەو تاکە سەرۆكو هێمای کوردبێت —و.ك) رووداوەکانو چەند هۆکارێکی دیکەیش بە کـردەوە مـەلا مستەفا پـان خستبوویە دەرەوەی واقعـی بەربـەرکانێکردنو سـەلماندیان زۆربـەی رێکخستنە بنچینەییەکانی (پ. د. ك)و رۆشنبیران بە تـەنها لایـەنگرو پشتیوانی ئەو بوون. دووبەرەکی لە نێوان هـەردوو بەرەکـەدا تادەهات زیاترتینی دەسـەند، تائـەو وەختـەی بـاڵی (بـرایم ئەحمـەد) کـۆنگرەی مـاوەتی بەسـتو بەتونـدی بڕیارەکانی بارزانی سەرۆکی پارتی رەتکـردەوەو بەخۆبەدەسـتەوەدان تۆمـەتباری کـرد.. کەچـی بـارزانی زۆر بەحیکمـەت وعەقڵیـەتێکی بـەرزەوە کەوتـە مامەڵـە لەگـەڵ بارودۆخەکـەو کـۆنگرەی مـاوەتی بـێ ئامـادەبوونی سـەرۆكو زۆربـەی نوێنەرانی بەنادروستو ناشەرعی لێکدایەوە، لەکاتێکدا (برایم ئەحمـەدو جـەلال تاڵـەبانی) دەربـازبوونو گەیشـتنە ئێـران، چـەندین کەسـایەتی تریـان لەلایـەن (هێزی پشمەرگەی کوردستان)ەوە دەسگیرکران.

بەمەبەسـتی دارشـتنی یاسـاو دەسـتووری شۆرشـی کوردسـتانی عێـراق لـە ۱۹٦٦/۱۰/۷ دا گـۆنگرەی قـەلادزێ گرێـدراو بـەرێنمایی (مـەلا مسـتەفا بـارزانی) ئەنجومـەنی سـەرکردایەتی شـۆڕش پێکهێنـرا، بـەهێنادی دوو ئامـانجی سـەرەکی کـەدووەمیان سـەر لـەنوێ پێکهێنانـەوەی (م.س)ی پـارتی بـوو لـە فەرمانـدەکانی هێـزی (ل. ش. ك)و چـەند سـەرۆك خێـڵ وژمارەیـەك پیـاوانی ئـایینی، کـە زۆربەیان لە پشتیوانە بەهێزو تەواو دڵسۆزەکانی بارزانی بوون[۳۷].

ئـەوە بـوو ئـەو سـەردەمە هەسـتیارە دوو کەسـایەتی کـوردی (لـوڕ)و دوو کەسایەتی (مەسیحی)بەشداربوون کە لەوەدا مەبەست دووپاتکردنـەوەی دروشمـی

---

[۳۷] عێراق و مەسەلەی کورد- د. سەعد ناجی جواد

پارتی بوو لەبەکوردستانی کردندا، بەو مانایەخەبات لە پێناوی ئەوخاکەدایە تەواوی هاولاتیانی گرتوەتەوەو لەسەری دەژین‌و لەهەر تیرەو ئایینێك بن. ئەندامانی کۆنگرە بەتێکڕای دەنگ (بارزانی) یان بە سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان هەڵبژارد، بەو جۆرە تەواوی ڕێکخستنەکانی پارتی‌و هێزەکانی (ل. ش. ك) کەوتنەوە ژێر دەسەلاتی ئەسەرۆك‌و رابەرەمەزنە.

## سەر لەنوێ هەڵگیرسانەوەی شەڕ

مۆرکردنی ڕێککەوتننامەی ١٠ ی شوباتی ١٩٦٤ بەو ئەندازە بەپشوودان‌و هەناسە هەڵکێشان‌و هاتنەدی هەندێ سوودی هەردوولا بوو بەو ئەندازەیە چارەسەرکردنی کێشەکەی لێ بەدی نەدەکرا.

بە تێپەڕاندنی سەردەمێکی هێمنی‌و ئارامی‌و تەفرەدان بە بیانووی درێژەدان بە گفتوگۆ، جیاوازی بیروڕاو ناکۆکیەکانی نێوان بزووتنەوەی کورد بە (پێکهاتە نوێکەیەوە)و نێوان حکومەتی عێراق لەئاسۆ سەریان دەرهێنا، لەجیاتی گەڕان‌و قسەکردن لە دۆزینەوەی چارەسەری گونجاوی مەسەلەی کوردو بەئەنجامگەیاندنی ئەو پڕۆژەیەی لەسەری پێکهاتوون، (عەبدولسەلام عارف) زیاتر قسەو باسی لە عروبەو یەکگرتنی عێراق‌و میسرو برایەتی ئیسلامی دەکردو لەوسەردەمەدا لەسیاسەتیدا شێوازێکی جیاوازی گرتەپێش‌و لە ١٨ ی ئازاری ١٩٦٤دا لەسەر شێوازو نموونەی میسر یەکێتی سۆشیالیسی عەرەبی (الأتحاد الأشتراكی العربی) وەك پارتی هەموو گەلانی عێراق دامەزراند، بەو نیازەی (پ. د. ك) یش پابەندی ئەوسیاسەتەبێت‌و نیازەکانی خۆی بەسەردا بسەپێنێ.

بێگومان ئەو سیاسەتە مەبەست تەنها لە باربردنی مەسەلەی کوردو بزووتنەوەکەی بوو، بۆیە (پ. د. ك) سەراپای بیرۆکەکەی ڕەتکردەوە، هەمانکات دەستووری عێراق لە١٥ ی مایسی ١٩٦٤ بێ هیچ ئاماژەو هێمایەك بەمەسەلەی کورد ئەو پارتە ڕاگەیەنراو بەشێوەیەکی رەهابە تەنها گرنگی خستبوویە سەر

لایەنی یەکێتی عەرەب، هەروەك بەندی نۆزدەی دەستوورەکە ئاماژەی پێدەکات‌و دەڵێت: (عێراقیەکان لە یاسادا یەکسان‌و لەماف‌و ئەرکە گشتیەکاندا چوونییەکن‌و هەموو هاوڵاتیان بە کوردو عەرەبیەوە هاوکارن لەسەر پارێزگاریکردنی کیان‌و سەروەری ئەم وڵاتە، بێ جیاوازیکردنی رەگەزو بنچینەو زمان‌و ئایین، هەمانکات ئەم یاسایە لەچوارچێوەی یەکێتی گەلی عێراق‌و یەکپارچەیی خاکی وڵاتدا بڕیاری مافە نەتەوایەتیەکانی گەلی کورد دەدات). بێ ئاماژەکردنی بە سروشتی بوون‌و چۆنییەتی ئەو مافانە سێ بەندی سەرەتای یاساکە بەم جۆرەهاتووە..

١ - کۆماری عێراق دەوڵەتێکی دیموکراتی سۆشیالیستی‌و لەمەشدا سوودی لەکلتووری عەرەبی‌و گیانی ئیسلام وەرگرتووە، گەلی عێراقیش بەشێکە لەنەتەوەی عەرەب‌و ئامانجی یەکگرتنی تەواوی نەتەوەو خاکی عەرەبەو حکومەت پابەندە لە نزیکترین کاتدا هەنگاو بنێت بەرەو یەکگرتن لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوودا.

٢ - عێراق دەوڵەتێکە خاوەنی سەروەری خۆیەتی‌و ناکرێت دەست لە هیچ بەشێکی بەربدرێت.

٣ - ئیسلام ئایینی دەوڵەتەو بنەڕەتی دەستووریەتی‌و زمانی عەرەبی زمانی فەرمیەتی.

بە هیوای بەدیهێنانی یەکگرتن‌و جێ بەجێکردنی بەندەکانی (عەبدولسەلام)و (جەمال عەبدولناسر) بێ هیچ ئاماژەکردنێك بە کوردو مەسەلەی کورد پەیمانی یەکگرتنیان مۆرکرد. لەو ئاستەدا (مەلا مستەفا) زۆربە توندی ئەو دەستوورەی رەتکردەوەو نارەزایی بەرانبەری دەربڕی‌و بە پاشگەزبوونەوەو گەڕانەوە لە بەڵێنەکانی زانی‌و هوشیاریدا بەرێکەنەدان بەو دەستوورەی پشتگوێخستنی مافە نەتەوایەتیەکانی کوردی تیادا بەدی ناکرێت. لەو بارەوە لەیادداشتێك‌و چەند نامەیەکدا (عەبدولسەلام)ی لەسروشتی

ناخوازیـەكانی كـوردو ئۆتۆنـۆمیو مەسـەلەی كـەركوكو مافـە رۆشـنبیریەكان ئاگادارکرایـەوە. یـەکتر خـەتابارکردن سـەر لـە نـوێ زەمینـەی شـەڕیان سـازو نامـادەکردەوە، (بـارزانی) حکومـەتی بەپشتگوێخسـتنی مافـە نەتەوایەتیـەکانی کوردو پاشگەزبوونەوە لە بەڵێنەکانی خەتابارکرد.

لەلایەن خۆیەوە حکومەتیش بزووتنەوەی کوردی بەتەفرەدەرو هێشتنەوەی هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتانو بـازدان بەسـەر بەیاننامـەی ١٠ی شـوباتدا تاوانبـارکرد. دیـارە بـۆ هەڵوەشـاندنەوەی هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتانو جـێ بـەجێکردنی بەنـدەکانی یادداشـتو دەقـی نامـەکان، دەبوو حکومـەت (بـارزانی) دڵنیابکـات، بـێ بڕیـاردانی مافـەکانی گـەلی کـورد هەڵوەشـاندنەوەی هێـزی پێشمەرگەی کوردستان کارێکی نادروستو ناڕەوایە. لەو ئاستەدا سوپای عێـراق چارەسـەرکردنی سـەربازی کـردە بیـانووی هەڵگیرسانەوەی ئـاگری شـەڕو لـە ١١ ی شـوباتی ١٩٦٥ دا وەزیـری نـاوخۆ نامەیـەکی پـڕ لـە هەڕەشـە ئـامێزی ئاراسـتەی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد کردو تیایدا بنەمای ئۆتۆنـۆمیو هێشتنەوەی هێـزی پێشـمەرگەی رەت کردبوویـەوە، لـە کۆتـایی نامەکەیـدا وەزیـری نـاوخۆ رایگەیاندبوو، هەرچی زووتر سەرکردایەتی بزووتنەوەی کورد ملکەچی خۆی بۆ دەوڵەت رابگەیەنێت، بەپێچەوانەوە حکومەت ناچار دەبێت لە پێناوی گێڕانەوەی ئارامی بۆ کوردستانو سەپاندنی یاساتیایدا هەموو رێگایەکی کاریگەربگرێتەبەر. بێ سەرکەوتنی لایەنێك بەسـەر لایەنەکـەی دیکـەدا مـاوەی سـاڵێك شـەڕ درێـژەی کێشا، نوێبونەوەی شەڕ هۆکاربوو لەگەڕانەوەی باڵی دابڕاوی مەکتەبی سیاسی بـۆ ریزی شۆڕشو بزووتنەوەی کوردایەتی بەسەرۆکایەتی (مەلا مستەفا بارزانی).

ئـەوە بـوو لـە ئـەیلولی ١٩٦٥ (عەبـدولڕەحمان بـەزاز) بـە سـەرۆك وەزیرانـی عێراق دانراو لەنیسـانی ١٩٦٦ لـە کارەسـاتی تێکشکانی نادیـارو شاراوەی فڕۆکـەدا (عەبدولسەلام عارف) گیانی لە دەستداو بەدوایدا (عەبدولڕەحمان عارف)ی برای سەرۆکایەتی عێراقی گرتە دەست.

## بەیاننامەی عەبدولڕەحمان بەزاز لە ٢٩ی حوزەیرانی (١٩٦٦)

بە بڕوای (بەزاز) کورد گەلێکە خاوەنی تایبەتمەندیە نەتەوەییەتیەکانی خۆیەتی. لەگەڵ تێگەیشتنی (مەلا مستەفا) لەو بڕوایە، لە نیاز پاکی خۆیەوەو بەمەبەستی ماوە بەخشین بەو حکومەتە کەبەداخوازیەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردابچێتەوە، بڕیاری راگرتنی شەڕی بۆ ماوەی مانگێک راگەیاند. گەیشتن بە مۆرکردنی رێککەوتننامەی نێوان کوردو حکومەت لە ٢٩ ی حوزەیرانی ١٩٦٦ دا، (عەبدولڕەحمان بەزاز) دیاریکردنی مافە نەتەوایەتیەکانی کوردو جێگیرکردنیانی لە دەستووردا راگەیاند، کەتیایدا بە فەرمی ناساندنو بەکارهێنانی زمانی کوردی شانبەشانی زمانی عەرەبی لەو ناوچانەدا زۆرینەی دانیشتوانی کورد پێکدەهێنن دیاریکردووە، هەمانکات بەیاننامەکە رۆشنایی دەخاتە سەر ئەنجامدانی هەڵبژاردنو دیاریکردنی نوێنەرانی کورد لە پەرلەمان، کە لەگەڵ رێژەی دانیشتوانیدا بگونجێت، لەگەڵ ئەوەشدا دەقی بەیاننامەکە خوازیاری بەدەستهێنانی هەلێکە کادرانی نیشتمانپەروەری کورد بەشداری بکەن لە بەڕێوبردنی وڵاتو دانانیان لە پۆستە دیپلۆماسیو سەربازیو زیاترکردنی رێژەی قوتابیان ووەرگرتنیان لە زانکۆکانو لە خوێندنی باڵا لە ناوخۆی وڵاتو ناردنی رێژەیەکی دروستیان بۆ دەرەوە. بەیاننامەکە پێداگرە لە سەر راگەیاندنی لێبوردنی گشتیو گێرانەوەی ئەو خێزانانەی بەزۆرە ملی لەزێدی خۆیان دەرکراونو دوور خراونەتەوە.

رێککەوتنی ٢٩ ی حوزەیرانی ١٩٦٦ سەردەمێکی گرنگی دی لە مێژووی خەباتی کوردو بزووتنەوە شۆڕشگێریەکەیو لە پێناوی بەدیهێنانی ئۆتۆنۆمی بۆ ناوچەی کوردستان.. بەڵام باڵی سەربازی رژێم لەو حکومەتەدا توانی (عەبدولڕەحمان بەزاز) لە دەسەڵات لابدات و سەرۆک وەزیرێکی سەربازی لە جێگای دابنێ. ئەو تەنگژەیەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گرتبوویەوە، بەرووداني

شـەڕی حـوزەیرانی ۱۹٦۷ی نێـوان عـەرەب و ئیسـرائیل سـوپای عێراقـی لـە دژایەتیکردنی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد بێ هیوا هێشتەوە. لە ئـەنجامی شکستخواردنی عەرەب لەشەڕی حوزەیران و لاوازبوونی سوپای عێـراق رۆژی ۱۷ ی تەمموزی ۱۹٦۸ ئەفسەرانی نەتەوەخوازی عەرەب بەبەشداریکردنی ژمارەیەك لە ئەفسەرانی سەر بە پارتی بەعس هەڵسان بە ئەنجامدانی کوودەتـاو لـە ۳۰ ی تـەممووزدا ئەفسـەرانی بـەعس لـە کوودەتایـەکی ناوخۆییـدا ئەفسـەرانی نەتـەوەخوازیان لـە دەسـەڵات لاداو لەبەرژەوەنـدی خۆیـان دەسـەڵاتیان یەکلاییکردەوەگ.

بەو گۆڕانکاریـە سـەردەمێکی نـوێ لـە سـەردەمەکانی خـەباتی بزووتنـەوەی رزگاریخوازی کورد دەستی پێکرد.

# بەشی چوارەم

## گەیشتنەوەی بەعس بە دەسەڵات[٧]

### پێشەکی

گەڕانەوەی پارتی سۆشیالیستی عەرەب بۆ دەسەڵات لەڕێی کوودەتاو سەرکەوتنی بەسەر (عەبدولڕەحمان عارف)و لادانی لە دەسەڵات لە رۆژی ١٧ ی تەمموزی ١٩٦٨، بۆ بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد رووداوێکی کتوپڕو لەناکاو نەبوو، لە راستیدا رژێمی (عەبدولڕەحمان عارف) بە چەندین شێواز رێگای سەرکوتکردن و چەوساندنەوەی دژبە گەلی کورد گرتبوو بە بەر.. لەحاڵەتێکدا ئەگەر نیاز لە پەیوەندی نێوان بەعس و بزووتنەوەی کورد بەشداریکردنی سەرکردایەتی بزووتنەوەکە بوو بێت لەو کوودەتا چاوەڕوانکراوەدا بێگومان گرژی و ئاڵۆزی نێوان بەعس و (پ. د. ك)و دژایەتیکردنی گەلی کوردو بزووتنەوەکەی لە دژایەتیکردنەکەی رژێمی(عارف) کەمتر نەبوو.. بەتایبەتی بڕوانەبوونی گەلی عێراق بەگشتی و گەلی کورد بەتایبەتی بە پارتی بەعس و کارەناپەسەندەکانی سەردەمی دەسەڵاتی پێشتری، کە لە ئاستی بەڵێنەکان گومانیان دروستکردبوو.. ئەمە لەلایەك نەبوونی متمانەی (بارزانی) بەسەرکەوتنی کوودەتاکەو رازینەبوونی بەشداریکردن تیایدا لەلایەکی ترەوە. بۆ ئەو مەبەستە (ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر)

پەیوەندی دەکات بە (جەلال تاڵەبانی)یەوە. وەك (تاڵەبانی) دەڵێت: (پارتێکی بچووك هیچ حیسابێکی بۆ نەدەکرا). ئەوە بوو بەو هۆیەوە (تاڵەبانی)

بیرۆکەی بەشداریکردنی ڕەتکردەوە. دوای سەرکەوتنی کوودەتاله ١٧ ی تەمموزی ١٩٦٨ ڕژێمی نوێ پێشنیاری کردە سەر (پ. د. ك) بەبەشداریکردنی بزووتنەوەی کورد لە حکومەتی نوێدا، وەلأمدانەوەی بزووتنەوە دەسنیشانکردن و دانانی (موحسن دزەی و ئیحسان شێرزاد)بوو بەبەشداریکردنی پارتی لە حکومەتدا. لەگەڵ گوزەراندنی چەند ڕۆژێکی کەم لەدژە کوودەتایەکی ناوخۆییدا ڕۆژی ٣٠ ی تەمموز باڵی بەعس لە یەکلاییکردنەوەی دەسەلأتدا ئەفسەرانی نەتەوەخوازی سەربە شۆڕشی عەرەبی هاوکاریانی لە دەسەلأت دوورخستەوە، لە کاتێکدا دەستی بالأیان هەبوو لەسەرخستنی کوودەتای ڕۆژی ١٧ ی تەممووزدا. سەبارەت بەمەسەلەی کورد لە ١٩٦٨/٨/٣ ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بەیاننامەیەکی سەبارەت بە مەسەلەی کورد بلأوکردەوە.. تیایدا هاتووە (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش تەواوی لایەنەکانی مەسەلەی کوردو تێپەڕاندنیان بەسەردەمە کانی ڕابردوودا تاوو توو کردو خستیە بەر باس و لێکۆڵینەوە، لەگەڵ ڕەچاو کردنی بەرژەوەندیە بالأکان و دابینکردنی ئارامی و ئاسایش لە ولأتدا، بڕیاردرا لەسەر گرتنەپێشی بە ئاشتی چارەسەرکردنی مەسەلەی کوردو دیاریکردن و جێ بەجێکردن وهێنانەدی مافەنەتەوایەتیەڕەواکانی، ئەنجومەن پابەندە بەدەقی بەیاننامەی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦ وەك بنەڕەت لەچارەسەرکردنی کێشەکەو هەرلە ئێستاوە دەست بەکاردەبین لە جێ بەجێکردنی بەیاننامەی ناوبراو).

دیدو بۆچوونی و لێکدانەوەی سەرکردایەتی کورد لەمەسەلەکەدا تەنها جێ بەجێکردن یان جێ بەجێنەکردنی بەیاننامەیەك نەبوو، بەلکوو چۆنییەتی و شێوازی چارەسەرکردن لەنەبوونی دیموکراتیدا دەبینرا.. وەك پێویست ئەگەر لە سایەی سیستەمێکی دیموکراتی ڕاستەقینەدا نەبێت هیچ کات مافە نەتەوایەتیەکانی کوردو دەستەبرکردنی مانەوەی یەکێتی دەوڵەتی عێراق نایەنەدی.

## بزووتنەوەی کوردو پارتی سۆشیالیستی عەرەب

پاش یەکلاییکردنەوەی دەسەڵات لە ۳۰ ی تەمموزی ۱۹٦۸ پەیوەندیەکانی نێوان کوردو پارتی بەعس چەشنی ترازیدیە ئەغریقیەکان دەبینراو لە نێوان تەبایی‌و ناکۆکی‌و لەشەڕەوە بۆ هاوپەیمانی‌و لەڕاگەیاندنی ئۆتۆنۆمیەوە بۆ بۆردمانکردن‌و قەڵاچۆکردنی کورد بەگازە کوشندەکان‌و وێرانکردنی گوندەکان‌و سوتاندنی تەڕو وشك تیایاندا، کە ئەمانە پێشتر روویان نەدابوو رەنگی دابوویەوە، پێویستە لە ئاستیاندا هەڵوێستەیەك بکرێت‌و تێبینی تەواویان لەسەر بکرێت.

۱ - دیدو تێڕوانینی بەعس لەسەر کەمایەتیە جیاکان لە عەرەب لەناوچەی عەرەبیدا. بەوردی سەرنجدان لە فەلسەفەی بەعس، دەردەکەوێت سەرانسەری ناوچەکە دەریایەکی پان‌و بەرینی عەرەبیە، دەبێ ئەم تێڕاوانینە لە چ سەرچاوەیەکەوە هەڵگۆزرابێت؟! لەگەڵ خۆ سەپاندنی بەسەر چەندین ناوچەو چەندوڵات‌و نەتەوەی جیا لەعەرەب، تێڕوانینەکە دەگەڕێتەوە بۆئەو سەرچاوەیەی کە بزووتنەوەی رزگاریخوازی عەرەب خۆی بەدوور لە ئیستیعمارگەرایی دەبینی. بێگومان ئەمەیە ئەو فەلسەفەیەی بەعس هەڵیگرتووەو لەناخی کەمایەتیەکاندا گومانی دروستکردووە، بەشێوەیەکی تایبەت لەناخی کوردەکاندا، کەبەڕاستی لە نیازە ناپاك وچەوتەکانی بەعس گەیشتوون.

۲ - کێشەو گرفتەکانی سنوور ی نێوان عێراق‌و ئێران. لە چوارچێوەی پەیمانی (سەعد ئاباد) هێڵە سنووریەکانی نێوان عێراق‌و ئێران کیشران، بەوەێ رووباری شەتولعەرەب رێرەوی گرنگی ئاوی بەتەواوی کەوتە سنووری عێراقەوە بە تێپەڕاندنی هێڵی سنووری ئێران بەرۆژهەڵاتیدا. دواتر شای ئێران چەندین جار هەوڵی گۆڕانکاری پەیمانەکەی دا، بەونیازەی هێڵی

سنووری (هێڵی تالووك) كە بە قوڵترین خاڵی رووبارەكەدا تێپەڕێنیٚو دەسەڵاتو سەروەری خۆی بەسەر نیوەی ئاوەكەدا بسەپێنێ. لەگەڵ گەشەكردنی رەوتی نەتەوایەتی عەرەب لە عێراقو مەترسی شا لە كشانی ئەو رەوتە نەتەوایەتیە بەرەو ناوچەی عەرەبستانی زۆرینە عەرەب لە ئێران، بەردەوام هەوڵەكانی لە گۆڕانكاری پەیمانی سەعد ئاباد رووبەڕووی شكست دەبوونەوە. بێگومان مەترسیەكانی شا هۆكاربوون لەدژایەتیكردنی حكومەتەیەك لەدوایەكەكانی عێراق.

كوودەتا بەردەوامەكانی بەغداو تیاچوونی ئەفسەرو فەرماندە سەربازیەكان هەڵوێستی عێراقیان لە ئاستی ئێران لاواز كردبوو، نەگەیشتن بەچارەسەری بنەڕەتی كێشەی كورد، هۆكارێكی دیكەبوو لەلاواز كردنی توانا جۆراو جۆرەكانی عێراقو بەفیرۆدانی ئابووریو دارایی وڵات. دوای هاتنی دەسەڵاتی عەبدولسەلام عارف جارێكی تر داخوازیە مێژووییەكانی ئێران، سەبارەت بەدیاریكردنەوەی سنوور بێ ئاكام سەریان هەڵدایەوە.. لەو ئاستەداو لەكاردانەوەیەكی گورجو گۆڵ دا شای ئێران پەرەیدابە یارمەتیدانی بزووتنەوەی كوردو ناردنی شارەزایانی بواری مەشقی سەربازیو خاكی ئێرانیشی كردە قووڵایی ستراتیژی بزووتنەوەكە, حكومەتی بەغدا گەیشتە ئەو بڕوایە، مانەوەی هێزو توانای بزووتنەوەی كورد بەسراوە بەیارمەتیدانی هێزی پێشمەرگەی كوردستانەوەو دەست بەسەرداگێشانو سەركەوتن بەسەریدا ئەستەمە، بەنیازی لاوازكردنی شۆڕشی كوردستان چەند هەوڵێكی سەرنەكەوتوو لەگەڵ ئێراندا درا، دیاربوو ئەو نرخەی ئێران داواكاری بوودا بەشكردنی سەروەری بوو بەسەر شەتولعەرەب داو دوور كەوتنەوەی عێراق بوو لە سەربازگەی یەكێتی عەرەب، ئەوەیش نرخێكی گرانو سەنگین بوو. لەگەڵ بەسەربردنی كاتدا بەردەوام ئێران زیاتر دەسەڵاتی ئابووریو سەربازی بەسەر بزووتنەوەی كوردا دەسەپاندو چارەنووسی دەخستە ژێر دەستیەوە، بە جۆرێك

پاش ساڵی ١٩٦٦ بە یەکجاری ئابووری کوردستان تێکەڵو وابەستە بە ئابووری ئێران کرا. لە ئەنجامی سەپاندنی گەمارۆی ئابووری بەسەر کوردستانی عێراقدا، بەشی سەر ڕێژی کشتوکاڵیو دانەوێڵە، راستەو خۆ دەنێررایە ئێران، هەمانکات کوردستانیش کرابوویە فرۆشگای کەلو پەلو بەرهەمە بازرگانییەکانی. پاش گەیشتنی بەعس بە دەسەلات، ئێران توانی بارودۆخی دوای کوودەتای ١٧/تەمموز لەبەرژەوەندی خۆی قۆرخ بکاتو سەرلەنوێ داوای گۆڕانکاریو راستکردنەوەی پەیمانی سەعدابادی ساڵی ١٩٣٧ بکاتەوە.. کەچی زۆر توندتر لە دەسەلاتەکانی پێش خۆی بەعس داخوازیەکانی ئێرانی دایە دواوەو زیاترخستیە سەر ڕێی چڕکردنەوەو فراوانکردنی یارمەتیەکانی بۆ بزووتنەوەی کوردو هاوکاریکردنو پشتیوانیکردنی، تائەو ئاستە هێزی پێشمەرگەی کوردستانی توانی هێرش بکاتە سەر دامەزراوە نەوتیەکانی کەرکوك.

هەرەسهێنانی گفتوگۆو پاشگەزبوونەوەی حکومەتی بەعسو نکولیکردنی لە جێ بەجێکردنی پرۆژەی ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستانو نوێبوونەوەی شەڕ، جارێکی تر ئێران بەسوودوەرگرتن لەوبارودۆخە لەمایسی ١٩٦٩ بەتەنها لەلایەن خۆیەوە پەیمانی سەعدابادی پووچەڵکردەوە. ناکۆکی نێوان هەردوو باڵی بزووتنەوەی کورد، لە پەیوەندی ڕژێمی نوێی بەعس بەسەرکردایەتی شۆڕشەوە بارزانیو مەکتەبی سیاسی پارتی ڕۆڵی گرنگیان گێڕا. جارێکی تر سەرکردایەتی شۆڕشی کورد بەم شێوەیەی لای خوارەوە داخوازیەکانی خستەوە بەردەستی ڕژێمی بەعسی.

١ - بەشەداریکردنی پ. د. ك بە چوار وەزارەت لە حکومەتدا، بە مەرجی دوور راگرتنی هەر توخمێکی دوژمن بە شۆڕشی کورد، بەتایبەتی ئەندامانی (م.س)ی دابڕاو لە پارتی سەربەتاقمی – برایم ئەحمەدو جەلال تاڵەبانی.

٢ - فرە لایەنی لە دەسەلاتداو بەشداریکردنی نیشتمانپەروەران تیایدا.

٣ - ڕاگەیاندن و بلاوکردنەوەی بەیاننامەی تایبەتی حکومەت بەچارەسەرکردنی مەسەلەی کورد لەسەر بنەڕەتی بەیاننامەی ٢٩ ی حوزەیرانی ١٩٦٦.

٤ - ڕاگەیاندی لێبوردنی گشتی بۆ تەواوی زیندانیانی سیاسی لەو ماوەیەدا بێ گەیشتن بە ئەنجام گفتوگۆی نێوان بزووتنەوەی کوردو حکومەت دەستی پێکرد. هەرچەند حکومەت ئامادەی جێ بەجێکردنی داخوازیەکان نەبوو، بەلام ناکۆکی قوولی نێوان هەردووپالی بزووتنەوەکە ئەو هەلەی لەپێش حکومەتدا ڕەخساند بە ئاسانی لە بەلێنەکانی پاشگەز ببێتەوە. گرنگیدان و بڕواخستنە سەرپالی بڕایم ئەحمەدو جەلال تالەبانی هۆکاربوو لە هەلگیرسانەوەی ئاگری شەڕو بەکارهێنانی هێزە چەکدارەکانی م.س دژبە شۆڕش.

لەگەل پشتیوانیکردنی تەواوو هەمەلایەنەی حکومەت لەو هێزە چەکدارە دابڕاوانە لە بزووتنەوەکەدا وەك خۆی مابوویەوە.....بەردەوامی شەڕو بە فیڕۆدانی سامانی ولات و فشاری ناوخۆیی و دەرەکی سەنگینی بەسەر بەعسدا سەپاندو سەرەتای ناکۆکی لە ڕیزی نوخبەی دەسەلاتداردا دەرکەوت.. ئەو هۆکارە بوو ئێرانی ڕاکێشا بۆ پووچەلکردنەوەی پەیمانی سەعدابادی سالی ١٩٣٧و زیاتر گرنگیدان بە شۆڕشی کوردو فراوانکردنی یارمەتیەکانی بۆی. لە ئاستی فشارو داخوازیەکانی ئێران، تەنها دوو ڕێگا لەپێش بەعسی عێراقدا مابوویەوە..

٥ - ڕازیبوون بە ملکەچکردن بەرانبەر داخوازیەکانی ئێران، بەتایبەتی لەمەسەلەی دەسەلات و سەروەری بەسەر نیوەی شەتولعەرەبدا.

٦ - ملکەچکردن بۆ بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو جێ بەجێکردنی داخوازیەکانی و دەرکردن و دوورخستنەوەی ئێران لە هاوکێشەکەدا.

## گفتوگۆ

سەرەتا رژێمی نوێ، بەهیوابوو یەکێك لە باڵە ناکۆکەکانی ناو بزووتنەوەی کورد بەسەر باڵەکەی دیکەدا زاڵ ببێت، ئەوە بوو بە چەك و پشتیوانی تانك وزرێپۆش و فرۆکەکانی دەستیدایە پارمەتیدانی باڵی دژبە مەلا مستەفای بارزانی، دواتر لە بێ سوودی هەوڵەکانی تێگەیشت. هەروەك کوردێکی نیشتیمانپەروەر، راستی مەسەلەکەی خستبوویە پێش ئەو لیژنەیەی سەردانی کوردستانیانکردبوو، کەلەنزیکەوە سەرنجی بارودۆخەکە بدەن، وتبووی (ئێوە بەناهەق و نارەواخۆتان بەم کارەوە هیلاککردووە.. ئەئێمەو نە خۆفرۆشی مۆدێلی لەیەك جیاوازنین بتوانین نوێنەرایەتی گەلی کوردبکەین، ئەوەی بەراستی نوێنەرایەتی کوردی لە ئەستۆگرتووە تەنها مەلا مستەفاو پێشمەرگەکانییەتی، ئەگەر رێککەوتنتان دەوێت فەرموون بچنە خزمەتی ئەو پیاوە، چارەسەری کۆتایی تەنها لای ئەو دەست دەکەوێت).

لێرەوە پەیوەندی راستەوخۆی نێوان حکومەتی بەغداو بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد بەرابەرایەتی بارزانی دەستپێکرد. نوێنەری بارزانی بۆ گفتوگۆ دارا تەوفیق دەڵێت: (وەك سەرەتا بۆم دەرکەوت کەسایەتی بە هێزو توانادارو کاریگەری ناوپارتی بەعس ئەو لاوە بوو بەناوی سەدام حسەین تکریتی کەجێگری سەرۆکی پارتی بەعس بوو، لە هەرێمی عێراق و جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و خاوەنی یەکەم وتەو دواو تەبوو لە دەسەڵاتدا).

لە بەرایی گفتوگۆو باس و خواسی مەسەلەکاندا سەدام حسەین مەسەلەی دەسەڵاتی نۆتۆنۆمی دەوروژێنێ و نوێنەرانی بارزانی و شۆڕشی کورد، ئەو ی پێشچاوەدەخات و پێی دەڵێت: (ئێوە ئامادەن دوور لە هەستیارن و هەژاندنی

گوێبیستی ئەو وشەیەبن وپێی ڕازی ببن؟)[٣٨]. هەرچەند داخوازی ئۆتۆنۆمی مەسەلەیەکی نوێ نییە داخوازی لە مێژینەی کوردەکانە بە پێی شایەتیدانی دارا تەوفیق- سەدام حسەین هاوکاریکرد بخرێتە گفتوگۆوەو لەکۆتایشدا بڕیاری لەسەردرا[٣٩].

---

(٣٨) بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد- مەسعود بارزانی.

(٣٩) وەنەبێ مەسەلەی ئۆتۆنۆمی وەك داخوازی گەلی کورد لە دایك بووی سەردەمی دەسەلاتی سەدام حسەین بوو بێت، بەڵکوو لەسەرەتای شۆڕشی ١٤ی تەممووزی١٩٥٨ بە یادداشتێك ئەو پرۆژەیە درایە عەبدولکەریم قاسم و وەك مافی ڕەوای گەلی کورد ڕاگەیەنراو هەر لە دامەزراندنی (پ. د. ك)ەوە ئۆتۆنۆمی ئامانجی سەرەکی بووە. و.ك.

# بەشی پێنجەم

## ئۆتۆنۆمی

حکومەتی عێراق لەئاستی چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە ١١ ی ئازاری ١٩٧٠ بەم دەقەی لای خوارەوە بەیاننامەی ئۆتۆنۆمی ڕاگەیاند : -

هاتنی شۆڕشی ١٧ ی تەمموز دەرەنجامی بێزاریو تووڕەیی نەتەوەی عەرەب، لە ئاستی شکستی حوزەیرانو بڕیاری گەلی عێراقەوە بوو بە تاوانبارکردنی ڕژێمی تاکڕەوو کۆنە پەرستو بەشداربوونی لەو شکستو نسکۆ نەتەوەییەدا..

دابڕانی تەواوی ڕژێم لەگەڵ بێتوانایی لە چارەسەرکردنی کێشە نیشتمانییەکانو چەندین مەسەلەی دیکە بوو، بوونە مۆرانەو بەناخی گیانی نیشتماندا چووبوونە خوارەوە، کەچارەسەرکردنیان پێش هەر مەسەلەو کێشەیەکی تر پێویستیو ئەرکی نیشتمانی بوو، جگە لەوە دەبوو بە پلەی یەکەمو سروشتی هەوڵەکانی لە سوودو بەرژەوەندی هێڵەیەکەمەکانی شەڕی چارەنووسازی نەتەوەی عەرەبدا چڕبکردایەتەوەو بەو ئاراستەکاری لە سەربکرایە، دیسانەوە دەبوو وەك پێویست لە کۆکردنەوەو بەکاربردنی تەواوی تواناماددیو مرۆییەکانی عێراق هەوڵی پێویست بدرایە کەبە ڕێکوپێکیو ڕێگای گونجاوو شیاوو لە شوێنی خۆیاندا کاریان پێ بکرایەو کەڵکیان لێوەربگیرایە. بەو هۆیەوە وەك جێ بەجێکردنو بەدهێنانی ئەرکی یەکێتی نیشتیمانی گەلی عێراق، بێ جیاوازیکردنی ڕەگەزو زمانو ئایینو پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لەگەڵ دەستەبەرکردنی تەواوی مەرجە سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابوورییەکان، کەپێویستی

تەواوی ئەو یەکێتیەتیەن، هەر لەڕۆژانی سەرەتاوە شۆڕش ئەوەی بەرچاوگرتبولەوپێناوەداعێراق رووبکاتەشەڕی بەرگری نەتەوایەتی چارە نووسساز، کەلە دیدو بۆچوونیدا چڵەپۆپەی ئەو ناکۆکیە تاڵەیە لە نێوان ئیستیعمارو زایۆنیزمو چاوچنۆکانو شەڕەنگێزانی ناو نیشتمانی عەرەب لەلایەك و لە نێوان بەرژەوەندیەکانی رزگاریخوازی نەتەوەی عەرەبو خەبات لە پێناوی ئامانجە پێشکەوتووخوازو مرۆییەکانی لەلایەکی ترەوە، لەگەڵ فراوانی کۆسپو تەگەرەو گرێکوێرە بەجیماوەکانی رژێمەکانی پێشترو وەستانیان لەپێش رێڕەوەکەیدا، شۆڕش بە بڕوای بەتینەوە لە پێناوی رزگارکردنی عێراق لە پاشماوەکانی ئیستیعمارو بەکرێگیراوانیو ئەو هەلچوونە سیاسیو کۆمەڵایەتیە رێگای گوڕانکاری گرتووەتە بەرو کار دەکات لەسەر دەستە بەرکردنی تەواوی مەرجە پێویستەکانی بینادنانەوەی عێراقی نویو هێنانەدی یەکسانی رەها لەمافو ئەرکەکانو رەخساندنی هەلی لە بار بەئامانجی رێکخستنەوەی باری کۆمەڵایەتی هاوڵاتیانو کردنەوەی ئاسۆکان بەڕووی جەماوەردا، هەمانکات شۆڕش بەو پەڕی گیانی لە خۆبوردەییو لەمەودای پابەندبوونی نیشتمانیو دڵسۆزی لە ئاستی یەکێتی خاكو یەکێتی گەلو هێنانەدی ئامانجە مەزنە بنەڕەتیە نەتەوایەتیەکاندا کارەکانی رادەپەڕێنێت. چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە عێراقدا پێشەنگی ئەو کێشەنیشتیمانیانەبوو رووبەڕووی شۆڕش بووبوونەوە، لەگەڵ رۆڵی ئیستعمار لەدانانو سەنگین کردنی چەندین کۆسپ لە پێش رژێمەکانو هەمانکاتی تێنەگەیشتنو نەبوونی نیازپاکی ئەو رژێمانە لەچارەسەری بنەڕەتی کێشەکەو بەردەوامی چەندین ساڵی شەڕو کوشتارو بوونی توندوتیژیو نەبوونی رەوشی دیموکراتیو بزربوونو تواندەوەی گیانی برایەتی، لەگەڵ سروشتی نیشتمانیدا رێگربوون لەدیاریکردنو چەسپاندنی تەواوی مافە نەتەوایەتیە رەواو دادپەروەریەکانی بەشێکی گەلی عێراق.

هەر لە رۆژانی یەکەمیدا بەگیانی هەستکردن بە بەرپرسیاریەتیو

بڕوابوون بە دوورترین سنووری پابەندبوون بەبنەماکانی دیموکراتی شۆڕشگێڕ، شۆڕش کەوتە کارکردن لەسەر چارەسەرکردنی ئەم کێشە نیشتمانییە.. دیارە شۆڕش هەڵ قولاوی چاوگەی تیۆری پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستەو بڕواداره کەمافە نەتەوایەتیەکانی کوردو زنیدووکردنەوەی کلتوورو رۆشنبیری‌و زمان‌و نەریت‌و بە ئازادی پەیڕەوکرنیان‌و بەهێزکردنیان لە نێوان نەتەوە جیاجیاکاندا لە کرۆکی دیموکراتین، بۆیە پێویست دەکات بە دۆزینەوەو پەیداکردنی رێگای یەکخستن‌و بەهێزکردنی پەیوەندیەکانی نێوان ئەو نەتەوانە، بەشێوازێك یارمەتیدەربێت لە راپەڕاندن‌و گەشەپێکردنی هەموویاندا.

گومان لەوەدانییە تەواوی ئەو پرۆژەو نەخشانەی بەرەو لاوازکردنی پەیوەندیەکان سەردەکێشن‌و تۆوی دووبەرەکی دەچێنن، دژبە بەرژەوەندیە هاوبەشەکانی ولاتن، بەپێچەوانەشەوە رێکخستنی ریزەکان‌و پتەوکردنی پەیوەندیە نیشتمانی‌و مرۆڤدۆستیەکان لە نێوانیانداو بەکاربردنیان لەخزمەتی پێشکەوتنیاندا هۆکاردەبن لە پاراستنی یەکێتی‌و ژیانی هەمەلایەنەو رەخساندنی کەش‌و هەوای پڕ لە خۆشەویستی‌و دەستە بەرکردنی برایەتی.

لە چوارچێوەی سروشتی ئەم بنەمایانەداو لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٨و سەرەتای ساڵی ١٩٦٩کۆنگرەی حەوتەمی هەرێمایەتی پارتی بەعس گرێدرا، دەست پێشخەربوو لەدیاریکردنی هەڵوێستی ئایدیۆلۆژی خۆی بەرانبەر بەو کێشەنیشتمانییەو نەخشەکێشان لە دۆزینەوەی رێگای گونجاوو دروست لەچارەسەرکردنی،وەك لەبڕیارەکانی پاش کۆنگرە راگەیەنران‌و تیایاندا هاتووە :

کۆنگرە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، هێنانەدی ئامانج‌و خواستە نەتەوایەتیەکانی گەلی کورد لە عێراقدا پێشەنگی ئەو مەسەلانەن رووبەڕووی نەتەوەی عەرەب بوونەتەوە. پەیڕەوکردنی توندوتیژی هێزی سەربازی لەچارەسەرکردنی کێشەی کوردا مەودایەکی ترسناك‌و زیانێکی فراوانی بەهەردوو نەتەوەی کوردو عەرەب گەیاندو هێزە ئیستیعماری‌و کۆنەپەرست‌و

بەکرێگیراوانی ئەو هەڵەیان بۆ لە باربردنی هەر چارەسەرێك لە بەرژەوەندی دوژمنکارانەی خۆیان، لەرێی چەندین پیلانەوە دەستیان خستبوویە کاروباری عێراق و فشارێکی ئەو تۆیان بەسەردا سەپاند بوو، مافەکانی هەردوو نەتەوەکەیان تیادا زەوت کردبوو، بەردەوام لە هەوڵی لەناوبردن و لەباربردنی ئەو دەستکەوتانەشدا بوون کە رێی خەباتی دوورودرێژو قوربانیدانی فراوانەوە بەدیهاتبوون. لەتەوەرێکی دیکەدا کۆنگرە دووپاتی دەکاتەوەو دەڵێت: جارێکی تر کۆنگرە دڵنیابەخشە، بەوەی لە خەباتی سیاسی خۆیدا پارتی بەعس لەدیدگای بڕوابوونی نەتەوایەتی و مرۆڤایەتی و سۆشیالیستی و دیموکراتیدا خەبات دەکات و لەبازنەی نیشتمانی و پێشکەوتوو خوازیەوە رێز لە خواستە نەتەوایەتیەکانی جەماوەری گەلی کورد دەگرێت و بەو پەری رێزەوە دەڕوانێتە مافی رەوای جەماوەر لە عێراقداو رووکردنە پاکسازیکردنی کاروکردەوە ناپەسەندە بەجێماوەکانی دوای ئیستیعمارو خۆسازدانی تەواو بۆجەنگی چارەنووسازی ئێستامان لە فەلەستین و چڕکردنەوەی خەبات و قوربانیدان لە پێناوی بەدیهێنانی یەکێتی عەرەبی و سەربەخۆیی و سۆشیالیستی. ئاشکرایە شۆرش هەردەم پابەندە بەبنەماکانی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست وبڕ پارەکانییەوە، بەو هۆیەوە بڕیاریدا بەدانان بەمافە نەتەوایەتیە رەواکانی گەلی کوردو پەرەپێدانی تایبەتمەندیەکانی لە چوارچێوەی یەکێتی گەل و نیشتمان و دەستووردا.

لەم کاتەدا نەتەوەی عەرەب لە خەبات و تێکۆشانی بەربلاوو بێ وچاندایە دژ بە ئیمپریالیزم و زایۆنیزم و کۆنەپەرستی و هێڵی یەکەمی خەباتی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا گرتووە، هەر لەم کاتەدایە خەبات و تێکۆشانی گەلی عێراق، پەیوەندی توندوتۆڵی بە خەباتی نەتەوەی عەرەبەوە گرێداوەو لە پێناوی بەدیهێنانی دیموکراتیدا دژبە نەخشەو پیلانی هێزە کۆنە پەرستەکانی جیهان و ناوخۆ وەستاوە، شۆڕش هەردوو بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردو بزووتنەوەی

نەتەوایەتی عەرەب، بە بنەڕەتی یەکەمی یەکێتی نیشتمانیو یەکێتیو برایەتیو یەکرپزی کوردو عەرەب دەزانێت لە عێراق، دژ بەو هێزە دواکەوتووە کۆنەپەرستانە دەجەنگێتو ڕوودانی لە پێکهێنانی بزووتنەوەیەکی ئازادیخوازی یەکگرتووی دژ بە ئیمپریالیزمە، کە زیاتر برایەتیو هاوکاری دێرینی کوردو عەرەب پێکەوە گرێدەداتو کۆسپەو زیان بەخشەکانی سەرەڕێگای خەباتی هاوبەشیان رادەماڵێ.

ئیمپریالیزمو زایۆنیزم لە مێژە هەستیان بەوە کردووە، گرێدانی خەباتی هاوبەش گوڕو تینی زیاتر دەداتە هەردوو بزووتنەوەکەو لە زۆربەی شوێنە گرنگەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، بە تایبەتی لە فەلەستین سەرکەوتنی مەزن بەسەر نەخشەو پیلانەکانیاندا بەدەست دەهێنن. ئەوە هۆکار بوو لە هاندانی ئیمپریالیزمو بەکرێگیراوانی لە نانەوەی تەنگژەو زیاتر شێواندنی یەکێتیو برایەتی نێوان جەماوەری کوردو عەرەبو لاوازکردنی خەباتی نیشتمانی شۆڕشگێڕ لە عێراقدا. لە کاتێکدا شۆڕش گەیشتبوو، راستیە مەسەلەی کورد بەشێکی گرنگەو شۆڕشێکە دژبە ئیمپریالیزمو کۆنە پەرستی، لە هەر کاتێك زیاتر پابەند دەبێت بەجێ بەجێکردنی مافە نەتەوایەتیەکانی گەلی کوردو چارەسەرکردنی بنەڕەتی کێشەکەو بەبەشێك لە کێشەی نیشتیمانی دادەنێت. پیلانەکانی ئیمپریالیزمو زایۆنیزمو کۆنە پەرستی دژ بەگەلو کۆماری عێراق، خۆڕاوکوێرانە ملی رێگایان نەگرتووەو بەرێکەوتیش نەهاتوونەتەپێش، بەڵکوو دەرەنجامی هەوڵی دڵسۆزانەی حکومەتی شۆڕشو هاتنی مژدەی ئاشتی لە باکووری وڵات (کوردستان)و وڵامدانەوەی پرسۆزو میهرەبانیو دڵسۆزی سەرکردایەتی بەڕێز (مستەفا بارزانی) یەوە هات. هەر لەسەرەتاوە لەلایەن خۆیەوە شۆڕش، دەستەبەری هەمووکارێکی شیاوو پێویستی رەخساند، لە پێناوی گێڕانەوەی ئاشتیو سەلماندنی هۆکارەکانی ئاسایشو دڵنیابوون لە کوردستانی خۆشەویستدا، سەرەتا کەوتە جێ بەجێکردنو رایکردنی ئەم کارانە:

أ - ڕەوایەتیدان بەنەتەوەی کورد وەك ڕاستی بوونو دانان بەمافەنەتەوایەتیە ڕەواکانیدا، وەك لە بڕیارەکانی کۆنگرەی حەوتەمی پارتی بەعسی سۆشیالیستی عەرەبدا هاتووە، لەگەڵ ڕاگەیاندنو بلاَوکردنەوەی لەڕێی بەیاننامەی فەرمیو ڕۆژنامەکانی دەسەلاَتی شۆڕشگێڕو تۆمارکردنیان لەدەقەکانی دەستووری هەمیشەییو بەکردەوەکار لەسەر کردنیان.

ب - دامەزراندنی زانکۆی سلێمانی کۆڕی زانیاری کوردو ناساندنو سەلماندنو جێگیرکردنی تەواوی مافە ڕۆشنبیریو کەلتووریو زمانەوانییە نەتەوایەتیەکانی کورد، لەگەڵ پێویستی خوێندن بە زمانی کوردی لەتەواوی قوتابخانەو پەیمانگاو زانکۆکانو خانەی مامۆستایانو کۆلیژەکانی سەربازیو پۆلیس دا، لەگەڵ پێویستی بلاَوکردنەوەی نووسینو دانراو (مؤلفات)ە زانستیو ئەدەبیو سیاسیەکان، کە دەربڕی خواستو ئامانجە نیشتمانیو نەتەوایەتیەکانی گەلی کوردن، تالەو ئاراستەیەوە نووسەرانو شاعێرانو ئەدیبانی کورد بتوانن ڕێکخراوو سەندیکا تایبەتکانیان دامەزرێننو کاتەکانیان لە پێناوی دەرخستنو پەرەپێدانی تواناو بەهرە زانستیو هونەریەکانیان دەستەبەربکەن، بۆ ئەم مەبەستە بڕیاردرا بەدامەزراندنی خانەی چاپو پەخشی کوردیو دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری کوردیو بلاَوکردنەوەی ڕۆژنامەو هەفتەنامەو گۆڤاری مانگانە بەزمانی کوردیو فراوانکردنی ماوەی بەرنامەی کوردی لە تەلەفزیۆنی کەرکوك، تائەو کاتەی کەناڵی تایبەت بە پەخشی کوردی سەربەخۆ دادەمەزرێت.

ج – لەچوارچێوەی مافەڕەواکانی کورددادانانان بەمافی زیندووکردنەوەوەبەرزڕاگرتنی جەژنەنەتەوایەتیەکانی ڕۆڵەکانیاندا- ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاریدابەوەی جەژنی نەورۆزبکرێتەجەژنی نیشتمانی لەکۆماری عێراقدا.

د - هەروەها ئەنجومەن بڕیاری یاسای پارێزگاكانی ڕاگەیاندكە(لامەركەزی ئیدارەی خۆجێیەتی دەگرێتەوە،لەگەڵ بڕیاری بوون بەپارێزگای دهۆك.

ه - هەر لە پێناوی پەرەپێدانی گیانی برایەتی نەتەوایەتی گشتگیرو هەمەلایەن‌و لە پێناوی سڕینەوەی شوێنەوارە خراپەكانی باروذۆخی ناڵەبارو ناهەمواری ڕابردووو پەرەپێدانی دیاردەكانی ژیانی نوێی شارستانی‌و نیشتیمانی دەستەبەركردنی خۆشگوزەرانی، سەركردایەتی شۆڕش بڕیاریدا بە ڕاگەیاندنی لێبوردنی گشتی لە تەواوی خەڵكانی مەدەنی‌و سەربازی لە بەشداربوانی كارەساتە دڵتەزێن‌و توندوتیژیەكانی باكوورو بەخشینیان لە هەر تاوان‌و كارێكی نایاسایی پەیوەندیدار.

جەماوەری عێراق بەكوردو عەرەبیەوە پێشوازی گەرمی لە بڕیارەكانی ئەنجومەنی سەركردایەتی شۆڕش كرد، بەمە جارێكی تر هیوای بە ژیانێكی ئارامی پڕ لە ئاسودەیی‌و خۆشگوزەرانی پەیداكردووە. هەروەك ئەنجومەنی سەركردانی شۆڕش پێشتر ڕاستەوخۆ پەیوەندیكرد بە بەڕێز (مستەفا بارزانی) سەرۆكی پارتی دیموكراتی كوردستانەوە، پاش تاووتووكردنی مەسەلەكەو ئاڵ‌و گۆڕكردنی بیروڕاكان، لەلایەنەكانی پەیوەندیدار، گەیشتنە بڕواهێنان بەپێویستی ڕازیبوون بە ناوەرۆكی ئەم بەیاننامەیەو جێ بەجێكردنی، بە بڕوای هەردوولا بەیاننامەكە لە گەڵ بەخشینی دڵنیاییدا، سوورە لەسەر قوڵكردنەوەو پەرەپێدانی‌و بەجێ هێنانی تەواوی هۆكارەكانی بووژانەوەی باری ئابووری‌و بارەكانی دیكە لەناوچەی كوردستان، كە بە پلەی یەكەم ئامانج‌و توانای جەماوەری كوردە لە مومارەسەكردنی مافە ڕەواكانیداو بەشداریكردنی لە بنیادنانەوەی نیشتمان‌و خەبات لە پێناوی ئامانجە نەتەوایەتیە مەزنەكاندا. لەو دیدگایەوە ئەنجومەنی سەركردایەتی شۆڕش بڕیاریدا:

١ - زمانی كوردی شانبەشانی زمانی عەرەبی زمانی فەرمی دەبێت لەو ناوچانەی زۆرینەی دانیشتوانی كورد پێكدەهێنن، هەمانكات زمانی كوردی

زمانی خوێندن دەبێت لەو ناوچانەدا، وەزمانی عەرەبیش لە تەواوی ئەو قوتابخانانەدا دەخوێنرێت کە بەزمانی کوردی تیایاندا دەخوێنرێت، هەمانشێوە زمانی کوردیش لە تەواوی ناوچەکانی دیکەی عێراق وەك زمانی دووەم‌و بە پێی دیاریکردنی یاسا دەخوێنرێت.

٢ - بێ جیاوازیکردن لە نێوان کوردو نەتەوەکانی دیکەدا بەشداریکردنی برا کوردەکانمان لە بەڕێوەبردنی دەسەڵاتداو دانانیان لە بەڕێوەبەرایەتی‌و فەرمانگە گشتیەکان‌و فەرمانگە گرنگ‌و هەستیارەکانی دەوڵەت‌و وەزارەتەکان‌و سوپا، کەئەمانە لە کارە گرنگ‌و لە پێش چاوانەبوون جێ بەجێکردنیان ئامانجێك بووە لە ئامانجە سەرەکییەکانی شۆڕش.. لە کاتێکدا بڕیار لەسەر ئەم بنەمایە دەدات، هەمان کات جەخت دەکاتەوە لەسەر پێویستی هەرچی زووتر دەست بەکاربوون لە پێناوی بە ئەنجام گەیاندنیان بەڕێژمیەکی دادپەروەری‌و لەگەڵ پێشچاوخستنی تواناو ڕێژەی دانیشتوان‌و بێبەشبوونی برا کوردەکانمان لەسەردەمەکانی ڕابردوودا.

٣ - لە ئاستی چارەسەرکردنی بنەڕەتی بارودۆخی دواکەوتنی لایەنەکانی رۆشنبیری‌و پەروەردە لە ناوچەی کوردستاندا نەخشەیەکی بەم جۆرەی خوارەوە داڕێژرا :

أ - پەلەکردن لە جێ بەجێکردنی بڕیارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، سەبارەت بەزمانی کوردی‌و مافە رۆشنبیریەکانی گەلی کوردو پەیوەستکردن‌و ئامادەکردن‌و ئاراستەکردنی بەرنامە تایبەتیەکان بە کاروباری نەتەوایەتی کورد، لە ئێسگەو تەلەفزیۆن‌و بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری‌و راگەیاندنی کوردیەوە.

ب - گێڕانەوەی ئەو قوتابیانەی بەهۆی نالەباری بارودۆخی ناوچەکەوە لە خوێندن دابڕاون، لەگەڵ چاوپۆشیکردن لەتەمەنیان وچارەسەرکردنی کێشەکانیان.

ج - کردنــەوەی قوتابخانــەو پەرەپێـدانو فراوانکردنـی پرۆسـەی خوێنـدن لەناوچـەی کوردسـتان بەرزکردنـەوەی ئاسـتی پـەروەردەو فێرکردنـوو وەرگرتنـی قوتابیانی کورد لە زانکۆکانو کۆلێژی سەربازیو وەرگرتنیـان لـە خوێنـدنی باڵاو ناردنیـان بـۆ خوێنـدن لـە زانکۆکـانی دەرەوەی وڵات بەرێژەیـەکی رەواو یەکسـان لەگەڵ رێژەی دانیشتوانی ناوچەی کوردستان.

٤ - لەناوچـەکانی زۆرینـەی کـورددا فەرمانبـەرانی کـورد کاروبـاری یەکـە ئیدارییەکان هەڵدەسوڕێنن، یان کەسانێك بەباشـی زمـانی کـوردی دەزانـن، تائـەو کاتــەی ژمــارەی پێویســت لــە فەرمانبــەرانی شــارەزاو پســپۆڕ لــەو زمانــە دەستەبەردەکرێن، لەگەڵ دانانی لێپرسراوانی سەرەکی وەك (پارێزگـار – قایمقـام – بەرێوەبــەری ناحیــە- بەرێوەبــەری پــۆلیس – بەرێوەبــەری ئاســایش)و هاوشێوەکانیان لە ناوچەی کوردستان.... لە ئاستی پێشخستنو پەرەپێدانی دامو دەزگاکانی دەوڵەت لە ناوچەکە، بە راوێژ لەگەڵ لیژنـەی بـاڵای چاودێری بەسـەر جـێ بـەجێکردنی ئـەم بەیاننامەیـە، هەرچـی زووتـر دەسـت بـەکاردەبین لـە راپەڕاندو جێ بەجێکردنی برگەکانی، بەتایبەتی کارکردن لەسەر هێورکردنەوەی بارودۆخەکەو بلاوکردنەوەی هێمنیو ئارامیو ئاسایش لە ناوچەکەدا.

٥ - وەك مـافێکی سروشـتی گـەلی کـورد، برپـاردرا لەسـەر بـەرپاکردنی رێکخراوەکانی قوتابیانو لاوانو مامۆستایانو ئافرەتانو کارکردنیـان لـە پێنـاوی دەستەبەرکردنی تەواوی مافەکانیانو دیاریکردنی ئەرکـەکانیان لـە خزمـەتکردن بە گەلو نیشتمان.

٦ - برگـەی / ا: درێـژەدان بـەکارکردن بەهەردووبرگـەی (١،٢) لـەبریاری ئەنجومـەنی سـەرکردایەتی شۆڕش ژمـارە (٥٩)ی بـەرواری ١٩٦٨/٨/٥ تـا بـەرواری راگەیانــدنی ئــەم بەیاننامەیــە، کەهــەموو ئــەو کەســانە دەگرێتــەوە بەشــداری کارە توندوتیژیەکانیان کردووە لە ناوچەکەدا.

برگـەی / ب: گێرانـەوەی تـەواوی فەرمانبـەرانو کرێکـارانو راگـوێزراوانی

مـەدەنیو سـەربازی، بـۆ سـەر کـارو پیشـەکانیانو سـوود لێوەرگرتنیـان بـەپێی پێویستی ناوچەی کوردستان، بێ بەستنەوەیان بەمیلاکەوە.

٧- برگەی / أ: وەزارەتـی کاروبـاری بـاکوور هـەڵ دەستێت بـە پێـك هێنـانی لیژنەیـەکی تایبـەتی پسـپۆڕ لـە بـواری گەشـەپێدانو بووژاندنـەوەی ناوچـەی کوردسـتانو هەرچـی زووتـر قـەرەبوو کردنـەوەی زیـان لێکـەوتوانی ئـەم چـەند سـاڵەی دوایـیو تـەرخانکردنی بوودجـەی پێویسـتو هەرچـی زووتـر دەسـت بەکاربوون بەراپەڕاندنی کارەپێویستەکان.

برگـەی / ب: ئامادەکـاری نەخشـەو پلانـی پێویسـتی پەرەپێـدانو پـێش خسـتنی ئـابووری لەناوچـە جـۆر بـەجۆرەکانی عێـراق لەگـەڵ چـاودێریکردنی بارودۆخی دواکەوتنی ناوچەکوردیەکان.

لەگـەڵ بەرچـاوگرتنی دواکـەوتنو لاوازی بـارودۆخی بـواری ئـابووری لـە ناوچەی کوردستانو گرنگی پێدانی.

برگـەی / ج : - دەرکردنـی یاسـای تایەبـەت بـەدیاریکردنی مووچـەی خانەنیشـنی گونجـاو بـۆ خێزانـی شـەهیدانو کـەم ئەنـدامانی پێشـمەرگەی کوردستان.

برگەی / د :- لیژنـەی بـالآ هەڵدەسێت بـەجێ بـەجێکردنی پرۆژەکـانی نیشـتەجێکردنو چاکسـازیو خزمەتگوزاریـەکانو یارمەتیـدانی هـەموو زیـان لێکەوتوانو دەستەبەرکردنی کار بۆ بێکـاران لەگـەڵ دیاریکردنی دراوی پێویسـت بەیارمەتیدانو چاککردنی باری گوزەرانیان.

٨ - گێڕانـەوەی نیشـتەجێکراوان لەعـەرەبی هـاوردە بـۆ ناوچـەکانی خۆیـان، هەمانکات لەگەڵ گێڕانەوەی کـوردە راگوێزراوەکـان بـۆ نیشـتەجێکانی پێشوویان، لەگـەڵ نیشـتەجێکردنەوەی دانیشـتوانی گونـدە قەدەغـەکراوەکان لـە شـوێنە نزیکەکانداو قەرەبووکردنەوەیان لەو زیانانەی بەو هۆیەوە بەریانکەوتووە.

٩ - پەلـەکردن لـەجێ بـەجێکردنی یاسـای چاکسـازی کشـتوکاڵ لەناوچـەی

کوردستان‌و پاکسازیکردن‌و سڕینەوەی هەموو پەیوەندیەکی دەرەبەگایەتی‌و دابەشکردنی پارچە زەوی کشتوکاڵی بەسەر جوتیاران‌و بەخشینیان لە تەواوی باجە کشتوکاڵیەکەڵەکە بووەکانی ساڵانی رابردووی ماوەی شەڕوکوشتار.

١٠ - بە پێی رێککەوتننامەی ١١ی ئازار، راستکردنەوەی دەستوور بەم شێوەیەی خوارەوە راییکرا.

أ- گەلی عێراق لەدوونەتەوەی سەرەکی (نەتەوەی کوردو نەتەوەی عەرەب) پێکهاتووە، ئەم دەستوورە بڕیاردەری مافە نەتەوایەتیەکانی گەلی کوردو مافی هەموو کەمایەتیەکانە، لە چوارچێوەی یەکێتی خاکی عێراقدا.

ب - زمانی کوردی لەگەڵ زمانی عەرەبی زمانی فەرمی دەبن لەناوچەی کوردستان.

ج - جێگیرکردنی بڕگەکانی پێشەوە لە دەستووری هەمیشەییدا.

١١ - گەڕاندنەوەی ئێسگەو چەکە قورسەکان بۆ حکومەتی ناوەندی‌و بەپلە بەندی جێ بەجێکردنیان.

١٢ - یەکێك لە جێگرەکانی سەرۆك کۆمار کورد دەبێت.

١٣ - راستکردنەوەی یاسای پارێزگاکان، بەمەرجی گونجاندن لەگەڵ ئەم بەیاننامەیەو گۆڕانکاری تیاداکردنی.

١٤ - داوبەدوای راگەیاندنی بەیاننامەکە.

أ- بە راوێژکردنی لەگەڵ لیژنەی باڵای چاودێری لەسەر جێ بەجێکردنی بەیاننامەکە، راییکردن‌و جێ بەجێکردنی کاری پێویست لەسەر یەکخستنەوەی ئەو یەکە ئیداریانەی زۆرینەی کوردەکانی تیادا نیشتەجێن‌و بەپێی سەرژمێریکردنی نوێ رایدەکرێت، هەمانکات دەوڵەت لە هەوڵی پەرەپێدان‌و پێش خستنی ئەو یەکە ئیداریانەدایەو کارئاسانی دەکات لەسەر راهێنانی گەلی کوردو مومارەسەکردنی هەموو مافەکانی بۆ گەیشتن بە ئۆتۆنۆمی‌و بەهێز کردن‌و گەشە پێکردنی یەکەئیداریەکان.

ب- هەماهەنگیکردنی کاروبارە نەتەوایەتیەکانی کورد لە ڕێی کۆڕو کۆبوونەوەکانی لیژنەی باڵاو پارێزگاکانی ناوچەکەو رایکردنی کارە گرنگەکانی پەیوەندیدار بەم هەماهەنگی کردنەوە.

ج- بەکاربردنی سامانە سروشتیە پابەندبووەکان بەدەسەڵاتی ناوەندی کۆماری عێراقەوە.

١٥ - گەلی کورد بەرێژەی قورسایی دانیشتوانی کوردستان بەرانبەر ئاستی کۆی دانیشتوانی عێراق، بەشدارە لەدەسەڵاتی یاسادانانەدا.

هاوڵاتیانی کورد.. هێنانەدی یەکێتی نیشتیمانی بە تەنها ویستی ئێوەیە لەسەر بەردی بناغەی هۆشیاریو بەرپرسیاریەتی مێژوویتان، تەواوی ئەو هەوڵانە وردوخاش دەکات بیانەوێت ئەو یەکێتی یە لاوازبکەن، بەیەکگرتنی خەباتی بەردەوامتان، ئەمڕۆ ئەو تەم مژە پڕفرتو فێڵەی دوژمنانو چاوچنۆکان دەڕوێنێتەوەو پێکەوە لەگەڵ برا عەرەبەکانتان ڕێگای هێزو هۆشیاریو ویستو ئەرکو خەبات دەگرنە بەر لە پێناوی کێشەی مەزنی نەتەوایەتی عەرەب (کێشەی فەلەستین).

ئەی جەماوەری تێکۆشەری نەتەوەی عەرەب..

بەم شێوەیە لاپەڕەیەك لەلاپەڕە شکۆمەندەکانی مێژووی ئەم هەرێمە خەباتکەرو تێکۆشەرە هەڵدرایەوە، تالە سەردەستی ڕۆڵە شۆڕشگێڕو ئازادیخوازە بەئەمەکەکانیدا لاپەڕەیەکی نوێو پرشنگدار واڵا بکرێتەوەو جارێکی دیکە مێژووی پڕ لە ڕووناکی لەسەر ئەم خاکە پاکە، مەرجەکانی خۆشەویستیو برایەتیو پێکەوە ژیان بەرجەستە بکەنەوەو سەر لەنوێ مێژووی هاوبەشی هەردوو نەتەوە نوێ بکەنەوە، هەروەك ئەمڕۆو سبەینێو هەتاهەتایە هەروارێگا ببڕێتو شەرەفی خەباتی هاوبەش بە شێوازێکی نوێتر بە یەکەوە گرێ بدەنەوەو دەست لەناو دەست لە هەوڵی لەناوبردنی دوژمنانی هەردوو نەتەوەو دوژمنانی گەلانو مرۆڤایەتیدا کاربکەنو یەکریز دژ بە ئیمپریالیزمو کۆنە پەرستان

سەنگەر بگرن. لەم ئاراستەیەوە دەتوانین شارستانییەتی سەردەمو مێژووی هاوچەرخمان لەسەر بنەڕەتی داد پەروەری و یەکسانی و ژیاریان لەگەڵ گەلانی پێشکەوتووخوازدا پەرە پێ بدەین و نوێ بکەینەوە. بەرەو خەباتی هاوبەش و هیواو ئامانج و سەرکەوتنە نەتەوایەتیە هاوبەشەکانمان.

ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش
١١ ی ئازاری ١٩٧٠

## بەرهەڵستیکاریەکانی کورد

لە ئاستی هەندێ بەندو برگەی بەیاننامەکەو پرۆژەی یاسایی، کوردەکان چەندین تێبینی و رەخنەیان دەربڕی وەك:

١ - پێشەکی ناونەهێنان ودیاری نەکردنی رۆڵی کوردو (بارزانی) و پ. د. ك لە هەوڵی بەئاکام گەیاندنی ئاشتیدا.

٢ - سڕینەوەی مەشخەڵان و سەروەریەکانی شۆڕشی کوردو گرنگی نەخستنە سەر رۆڵی چەکی بەرگری لەمافە نەتەوایەتیەکانی گەلی کوردو کەمکردنەوەی نرخی ئەو لایەنەگرنگە.

٣ - ئەو برگانە بەگشتی لە ئاستیدا رۆڵی بنەڕەتی و سەرەکیان بەخودی حکومەت بەخشیوە، کەدەرچوونە لەکاراکردنی چەندین کاری سەرەکی و گرنگ و بەگومانەوە سەرنجی خستە سەرزمانی کوردی و سەلماندنی رێژەی دانیشتوانی کورد لە داموو دەزگاکانی دەوڵەت و تەگەرە خستنەپێش دانانی ئەو پۆستانەی لە بەڕێوەبردنی ناوچەکەدا دیاریکرابوون.. هەر لەو سەرەتایەوە ئەمانەو چەند برگەیەکی تریش بوو بوونە مین (لغم)ی سەرە رێگای ئاشتی و لە ساڵانی داهاتووی پاش راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ ی ئازاری ١٩٧٠ تەقینەوەو چەندین رووداو کارەساتی مەترسیداریان لێکەوتەوە. جگە

لەم برگانە، گرنگترینی ئەو خالانەی بە هەڵپەسێراوی مابوونەوە، بەنیازی گفتوگۆ لەسەر کردنیان لەسەردەمی ماوەی گواستنەوەدا، کەلە ١١ ی ئازاری ١٩٧٤ دەهاتە کۆتایی، مەسەلەی سنووری ناوچەی کوردستان و دیاریکردنی ئەو سنوورە بووە، هەروەك لەبەندی (١٤)ی رێککەوتننامەی ئۆتۆنۆمی دا هاتووە.. دەڵێت: بەراوێز لەگەڵ لیژنەی باڵای چاودێری لەسەر جێ بەجێکردنی بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ کار بۆکردن و گرتنەبەری رێوشوێنی پێویست لە پێناوی یەکخستنی پارێزگاکان و ئەویەکەئیداریانەی بەپێی ئاماری فەرمی و سەرژمێریەك بریارە ئەنجام بدرێت دانیشتوانیان زۆرینەی کورد پێکدەهێنن. بریار وابوو لە ماوەیەکی دیاریکراودا لە رێی ئامارێکی داد پەروەرانەی فەرمیەوە سەرژمێری ناوچەی کوردستان ئەنجام بدرێت، نەك هەر ئەنجام نەدراو سەری نەگرت، بەڵکوو حکومەتی بەعس پێچەوانەی بەیاننامەی ئازارو بەئاراستەیەکی دیکەدا رێوشوێنی چارەسەرکردنی ئەو برگانەی گرتە پێش، لەهەندێ ناوچەی هەستیارداو بەنیازی شێواندن و گۆرانکاریکردن لە پێکهاتەی دانیشتواندا، هەڵسا بەجێ بەجێکردنی کردەوەیەکی ئەندازەیی (هندسی) نیشتەجێکردن، بەتایبەتی لەناوچەکانی دەوروبەری کەرکوك و دابرانـدنیان لە کوردستان و لە چوارچێوەی ئۆتۆنۆمی.

## ماوەی گواستنەوەو پەرەسەندنی گومانەکان

د. عەبدولرەحمان بەزاز وتەیەکی هەیە دەڵێت: (بنەرەتی کێشەکە نەبوونی بڕواو متمانەیە لەنێوان کوردەکان و حکومەتدا). لەدەقی بەیاننامەی ١١ ی ئازاری ١٩٧٠ دا هاتووە دەڵێت: (ماوەی گواستنەوە چوارساڵە، ئەوەی لەسەری پێکهاتووین جێ بەجێدەکرێت). لەراستیدا دەبوو ماوەی گواستنەوە ماوەی بەهێزکردن و

دروستکردنی متمانەی نێوان بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردو حکومەتی بەعس بوایە، بەڵام گومان بردن بە بەعس شتێکی شاراوە نەبووەو نییە، وەك پێشتر ئاماژەی پێکرا، هەمیشە ئەو پارتە بەگومانو دوودڵییەوە سەرنجی لەکوردو کێشە رەواکەی داوە.

تێڕوانینو لێکدانەوەی بارودۆخی چوارساڵی سەردەمی گواستنەوە بەمجۆرەی خوارەوە نیازناپاکەکانی حکومەتی بەعسیان بەرانبەر بەکوردو بزووتنەوەکەی ئاشکراکرد.

## ١ - هەوڵی تیرۆرکردنی مەلا مستەفا بارزانی

رۆژی ٢٩ی ئەیلولی ١٩٧١ حکومەت بەنیازی گفتوگۆ شاندێکی لە پیاوانی ئایینی سوننەوشیعەی بێئاگا لەمەبەستو چەند سیخوڕێکی ناردە حاجی ئومەرانو سەردانی بارەگای بارزانیانکرد، بێ ئەوەی هەندێکیان لە سروشتی ئەو سەردانو پیلانە دارێژراوە ئاگاداربن کە بۆ کوشتنی بارزانی دارێژرابوو، بە بیانووی تۆمارکردنی قسەو گفتوگۆکانی ماوەی کۆبوونەوەکە، لەلایەنی بەرپرسی جێ بەجێکاری پیلانەکە ئامێری تۆمارکەری بەسەر ئەندامانی شاندەکەدا دابەش کردبوو، لە ساتەوەختێکی گونجاوو لەباردا تەواوی ئامێرەکان بە جەستەی زانا ئایینییەکانی شاندەکەدا تەقینەوە، هەمان کات لە دەوروبەری بارەگاکەیشدا ئۆتۆمۆبیلێکی مینرێژکراو بە رۆکێتی ئاراستەکراو روو بە شوێنی کۆبوونەوەکە تەقیەوە، بێ ئەوەی بارزانی زیانێکی ئەوتۆی بەربکەوێت، تەواوی ئەندامانی شاندەکەو سیخوڕەکانی هاوڕێیان لەتو پەت کران. گومان لەوەدا نەماو هەرزوو دەرکەوت، یەکێك لەدەزگا سیخوڕییەکانی رژێم بەناوی دەزگای ئاسایشی نەتەوایەتی لە پشتی پیلانەکەوە بووە، جگە لە بەجێ هێشتنی چەندین شوێنەواری ترسناكو ناجۆر لەسەر پاشە رۆژی پەیوەندی نێوان بزووتنەوەی کوردو حکومەت، دەرئەنجامی ئەم پیلانە زیاتر پیرۆزمەندی مەزنی

بەخشیەکەسایەتی مەلا مستەفا. دوای ئەو هەوڵە نەگریس و ناپەسەندە، لەگەڵ بەخۆداهاتنەوەی دەزگاکانی شۆڕش و ڕێکخستنەکانی پارتی، دەزگای پاراستنی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد توانی چەند هەوڵێکی دیکەی دوژمنانی کورد پووچەڵ بکاتەوە.

### ٢ - هەوڵی تیرۆرکردنی ئیدریس بارزانی

جگە لە هەوڵی تیرۆرکردنی ئیدریس بارزانی، سەرجەمی کادرو لێپرسراوانی پارتی و فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەئاشکراو بەدیاردیدی دام و دەزگاسیخوڕیەکانی ڕژێمی بەعسەوە کارەکانیان ڕادەپەڕاند، لەگەڵ پەرەسەندنی نیازە خراپ و چەوتەکانی ئەم دەزگایانەداو بەرەو کۆتایی چوونی ماوەی گواستنەوە، هەموو ئەمانە کەوتنە ژێر باری هەڕەشەی تیرۆرو لەناوبردن.

## حکومەت و جێ بەجێکردنی ئۆتۆنۆمی

بەرانبەر بە ڕازی نەبوونی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو ڕەتکردنەوەی پرۆژەی ئۆتۆنۆمی سەقەت، حکومەتی بەعس کەوتە هەنگاونانی پەلە لە جێ بەجێکردنی ئەو پرۆژە سەقەتەی بەناو ئۆتۆنۆمیەی لەلایەن خۆیەوەو دوورلەویستی سەرکردایەتی (پ. د. ك) بەم شێوەیەی خوارەوە داڕشتبوو..

١ - لەسەر بڕیاری کۆنگرەی هەشتەمی هەرێمایەتی گرێدراو لەکانوونی دووەمی ١٩٧٤، ئەم بڕگەیە خرایە سەر دەستووری بەعسی سۆشیالیستی عەرەب.. لەگەڵ ئەو کۆسپ و تەگەرانەی لە مێژوودا ڕێگەیان لەپێشکەوتنی بزووتنەوەی کورد گرتووە، بوونی لایەنی دواکەوتوو کۆنەپەرست و دابڕاو لەگەڵی کورد، گرنگترینی ئەو کۆسپانەبووە، کەهەندێ ڕەگەز تیایدا بەئاشکرا پەیوەندی بە

ئیمپریالیزم‌و کۆنە پەرستانەوە گرێداوە، بەڵام لەکرۆك‌و بنەڕەتیدا بزووتنەوەیەکی نەتەوایەتی‌و خاوەنی ئەو مافە ڕەوایەیەکەلە چوار چێوەی کۆماری عێراق ـا بەبەشێکی گرنگی بزووتنەوەی نیشتیمانی هەرێمی عێراق دادەنرێت، لەو ئاراستەیەوە مافی ئۆتۆنۆمی بنەمایەکی سروشتیە لەو مافە ڕەوایانەی گەلی کورد لە عێراقدا پێی دەبەخشرێت.

بەو هۆیەوە پارتی سۆشیالیستی عەرەب لە بیروبڕوایدا پارتێکی نەتەوەیی مرۆڤدۆستی سۆشیالیستی دیموکراتیە، ئاساییە تێگەیشتنی تەواوی ببێت لەسەر مافە ڕەواکانی جەماوەری کوردستان‌و تێکۆشێت لەپێناوی دەستەبەرکردنیان، لەم ڕووەوە بەرپرسیاریەتی بنەڕەتی‌و مێژوویی لە زامنکردنی ئەو مافانەدا لە ئەستۆدەگرێت وەك دەقێکی یاسایی‌و دەستووری جێ بەجێکردنیان دەچەسپێنێ. ئەوبەرنامە جێگیروگونجاوەی پارتی بەعسی سۆشیالیستی عەرەب پەیڕەوی دەکات، هەڵقوڵاوی بنەماکانی دیموکراتی‌و ئاشتیخوازی‌و پێشکەوتنخوازیە، کەدەگونجێت لە ڕێی هەماهەنگی‌و هاوکاری دڵسۆزانە لەگەڵ هێزە خێرخوازە نیشتمانییەکاندا بێتەدی کەلەبەرەی نیشتمانی نەتەوەیی پێشکەوتووخوازدا دەبینێتەوە. هەر لە سەرەتای شۆڕشی ٣٠ی تەمموزی ١٩٦٨ەوە بە لە بەرچاوگرتنی بنەماکانی سۆشیالیستی‌و دیموکراتی، پارتی بەعس چارەسەرکردنی بنەڕەتی ئەو کێشە ئاڵۆزو لێك ئاڵاوەی کوردی وەك پلەی یەکەمی کارەکانی گرتە ئەستۆ، بەشێوازێك دە ڤی تیۆری‌و کرداری شیاو وەربگرێت‌و دەقاودەق لەگەڵ هیواو خواستە نەتەوایەتیەکانی گەلی کوردو یەکێتی وڵات‌و بزووتنەوەی نیشتمانی پێشکەوتوو خوازدا یەك بگرێتەوەو دووربێت لە دژایەتیکردنی خەبات‌و تێکۆشانی نەتەوەی عەرەب. لە ڕاستیدا پارتی بەعسی سۆشیالیستی عەرەب، لەدیدگای سیاسی خۆیەوە توانی دەقێکی گونجاوو دروست، وەك بەڵگەنامەیەکی مێژوویی مەزنی هەڵقوڵاوی بەیاننامەی ١١ ی ئازاری ١٩٧٠ لەزەمینەی واقعدا بەرجەستەبکات، کەدادەنرێت بەخاڵی

وەرچەرخانی مێژوویی لەخەباتی جەماوەری کوردو بزووتنەوەی کوردایەتیدا.

٢- لە کۆبوونەوەی رۆژی ١١ی ئازاری ١٩٧٤، ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بەناوی گەلەوە، بەم شێوەیەی لای خوارەوە بڕیاری ژمارە (٢٤٧)ی سەبارەت بەراستکردنەوەی دەقی دەستووری کاتی راگەیەنراوی ١٦ ی تەمموزی ١٩٧٠ی بڵاو کردەوە.

بەندی یەکەم - ئەم برگەیەی خوارەوە دەخرێتە سەر بەندی هەشتەمی یاسای کاتی.

ج- بەگوێرەی دیاریکردنی یاساو ئەو بەڵگەنامانەی ئۆتۆنۆمی لە چاپەمەنییەکانی ئەمینداریەتی گشتی رۆشنبیریو لاواندا هاتووە، ئەو ناوچانەی دانیشتوانیان زۆرینەی کورد پێك دەهێنن دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی دەیانگرێتەوە.

٣- دەرکردنو راگەیاندنی یاسای ئۆتۆنۆمی لەسەر رۆشنایی بڕیاری ژمارە ٢٤٨ی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بەم شێوەیەی خوارەوە هاتووە:

بە پشت بەستن بە برگەی (أ) لە بەندی ٤٢ ی دەستووری کاتی، لە دانیشتنی رۆژی ١٩٧٤/٣/١١یدا ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بە ناوی گەلەوە یاسای ژمارە ٣٣ی ساڵی ١٩٧٤ ی دەرکرد.

بەندی یەکەم :

أ - بەخشینی ئۆتۆنۆمی بەناوچەی کوردستان، وەك لەم یاسایەدا دیاریکراوە، بەناوچە ناودەبرێت.

ب - بەپێی زۆرینەی دانیشتوانی کوردو سەرژمێری گشتی سنووری ناوچەی کوردستان دیاری دە کرێت، هەروەك لەدەقی بەیاننامەی ١١ ی ئازاری ١٩٧٠ داهاتووە، سەرژمێری ساڵی ١٩٧٥ دەکرێتە بنەڕەتی دیاریکردنی سروشتی

نەتەوايەتى،بەرانبەرزۆرينـــەى دانيشـــتوانى ئەوشـــوێنانەى ســـەرژمێرى دەيانگرێتەوە.

ج - ناوچەكە يەكەيەكى ئيدارى خاوەن كەسايەتى(مەعنەوى) دەبێت، لە چوارچێوەى دەسەڵاتى ياسايىو ئابوورى كۆمارى عێراقداو لە ژێر چاودێرى ئەم ياسايەو ياساى پارێزگاكاندا ئيدارەكان دابەش دەكرێن.

د - ناوچەكە بەشێكى دانەبڕاوە لەخاكى عێراق، گەلەكەيشى بەشێكە لە گەلى عێراقو جيا نابێتەوە.

ە - شارى هەولێر ناوەندى ئيدارەى ئۆتۆنۆمى دەبێت.

و - يەكە ئيدارى يەكانى ئۆتۆنۆمى بەشێك دەبن لە يەكە ئيدارى يەكانى كۆمارى عێراق.

بەندى دووەم:

أ - زمانى كوردى شانبەشانى زمانى عەرەبى زمانى فەرمى دەبێت لە ناوچەكەدا.

ب - زمانى كوردى لە ناوچەى ئۆتۆنۆمى زمانى پەروەردەو فێركردن دەبێتو زمانى عەرەبى شانبەشانى زمانى كوردى لەتەواوى پلەكانى پەروەردەو فێركردندا دەخوێنرێت.

ج - دامەزراندنى بنكەو قوتابخانەى خوێندنى عەرەبى تايبەت بە دانيشتوانى بەڕەگەز عەرەب لەگەڵ خوێندن بەزمانى كوردى تيايانىدا.

د - دانيشتوانى ناوچەى كوردستان مافى خۆيانە بە ئارەزوومەندى خۆيان، لەهەر قوتابخانەيەكداو بە هەر زمانێك جگە لە زمانى دايك بخوێنن.

ە - تەواوى پلەكانى پەروەردەو فێركردنى ناوچەكە لەژێر دەسەڵاتى پەروەردەى گشتى دەوڵەتدا دەمێنێتەوە.

**بەندی سێیەم:**

أ – بەپێ ی دەسەڵاتی یاسایی ئەو بڕیارانەی لەو ڕووەوە ڕاگەیەنراون، مافو ئەرکو ئازادی دانیشتوانی بەرەگەز عەرەبو کەمایەتیەکانی دیکە لە ناوچەکەدا پارێزراو دەبنو ئیدارەی ئۆتۆنۆمی لە ئاستیاندا بەرپرسیار دەبێت.

ب – لەبەر ڕۆشنایی یاساو ئەو بڕیارانەی لەم ڕووەوە دەرکراون، دانیشتوانی بەرەگەز عەرەبو بەشداردەبن لە نوێنەرایەتی کردنو وەرگرتنی بەڕێوەبەرایەتیە گشتیەکاندا.

**بەندی چوارەم:**

قەزا سەربەخۆیەو هیچ دەسەڵاتێك بەسەریدا باڵا دەست نییە، پێکهاتەکانی لەناوچەکانی کوردستاندا بەشێك دەبن لە سیستەمی قەزایی لە کۆماری عێراقداو جیابوونەوەی نییە.

**بەندی پێنجەم:**

لەچوارچێوەی دارایی دەوڵەتی ناوەندیدا، ناوچەی کوردستان یەکەیەکی دارایی سەربەخۆ دەبێت.

**بەندی شەشەم:**

أ - بوودجەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی، لەچوارچێوەی بوودجەی یەکگرتووی دەوڵەتدا بوودجەیەکی تایبەت دەبێت.

ب- بوودجەو ئامادەکردنی لەناوچەکەدا لەسەر هەمان سیستەمی ئامادەکراوی بوودجەی یەکگرتووی دەوڵەت دەبێت.

**بەندی حەوتەم:**

بوودجەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی لەم بەشانەی خوارەوە پێکدەهێنرێت:

١ - بوودجەی ئاسایی.

٢ - بوودجەی وەبەرهێنانی ساڵانەی ناوچەکە.

٣ - بوودجەی دەزگاو دامەزراوەکانی وەبەرهێنانی ناوخۆیی‌و دامەزراوەکانی ناوچەکە.

**بەندی هەشتەم:**

داهاتی بوودجەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی لەم رەگەزانە پێك دێت..

أ - داهاتی خودی ناوچەکە پێك دێت لە:

١ - داهاتی باج‌و داهاتی بڕیاردراوی شارەوانییەکان‌و ئیدارەکانی‌و رێکخستنیان بەپێی یاسای تایبەت.

٢ - نرخی کەل‌و پەل‌و کالاّ فرۆشراوەکان‌و دەرامەتی خزمەتگوزاریەکان.

٣ - بەشی دیاریکراو لەسوودو قازانجی ئەو دەزگایانەی لەناوچەکەدا بوودجە دەیانگرێتەوە.

٤ - باجی خانووبەرە بنەڕەتیەکان‌و بەشەکانی دیکەی وابەستە لەناوچەی ئۆتۆنۆمیدا.

٥ - باجی زەوی‌و زاری کشتوکاڵی‌و بەشی چاکسازی کشتوکاڵ.

٦ - باجی تەریکە.

٧ - باجی تۆمارگەی خانووبەرە.

٨ - باجی دادگاکان‌و ئەو بژاردنانەی وەك بژاردنی یاسایی دەسەپێنرێت.

٩ - پوولی دارایی.

١٠ - باجی تۆمارکردنی ئۆتۆمبیل‌و گواستنەوەی خاوەنداریەتی.

١١ - باجی پوولی پۆستەو گەیاندن.

ب - ئەو بەشەی لەبوودجەی دەوڵەتو لەبەرنامەی وەبەرهێنانی ساڵانەی پلانی پەرەپێدانی نەتەوەیی دیاری دەکرێت، بەمەبەستی پڕکردنەوەو داپۆشینی خەرجی بوودجەی ناوچەی ئۆتۆنۆمیو یەکسان کردنی لەگەڵ پەرەپێدانی ناوچەکانی دیکەی کۆماری عێراق.

**بەندی نۆهەم:**

ژمێریاری ناوچەی ئۆتۆنۆمی دەکەوێتە ژێر چاودێری ڕاستەوخۆی دیوانی چاودێری دارایی.

**بەندی دەهەم:**

لەناوچەکەدا ئەنجومەنی یاسادانان دەستەی یاسادانەری هەڵبژێرراو دەبێت، پێکهێنانو سیستەمی کارکردنی بەپێی یاسا بەڕێوە دەچێت.

**بەندی یانزەهەم:**

أ - سەرۆکو جێگری سەرۆکو ڕاستگری نهێنی ئەنجومەنی یاسادانان، لە ئەندامانی ئەنجومەن هەڵدەبژێررێن.

ب- بەئامادەبوونی زۆرینەی ئەندامان کۆبوونەوەکانی ئەنجومەن دەبەسرێنو بڕیارەکان دەردەکرێن، ئەگەر دەقەکان لەگەڵ ئەم یاسایەو یاسای ئەنجومەنی یاساداناندا جیاوازیان تیایدا نەبێت.

**بەندی دوانزەهەم:**

أ - دانانی پەیڕەوی ناوخۆ

ب - بڕیاردانی پێویست بەپەرەپێدانو ڕاپەڕاندنی پرۆژە کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریو ئابووریە ناوخۆییەکانو ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکە لە سنووری سیاسەتی گشتی دەوڵەتدا دەمێنێتەوە.

ج - بڕیاردانی یاسایی پێویست لە ئاستی پەرەپێدانی ڕۆشنبیریو کلتووری

نەتەوەیی لەناوچەکەدا.

د - بڕیاردانی یاسایی تایبەت بە فەرمانگەو ئیدارەو بەبەرژەوەندییە هاوجۆرەکانی حکومەتی ناوەندی، پاش راوێژکردن لەگەڵ لایەنە بەرپرسە تایبەتیەکاندا.

ە - دەربڕینی ڕەزامەندی لەسەر ئەو پرۆژە درێژخایەنانەی ئەنجومەنی جێ بەجێکردن لەکاروباری ئابووری و کۆمەڵایەتیدا ئامادەیان دەکات، لەگەڵ پرۆژەکانی پەرەپێدان و کاروباری پەروەردەو فێرکاری و تەندروستی و کارکردن بەگوێرەی پێویستی نەخشەسازی ناوەندی دەوڵەت و پێویستی جێ بەجێکردنی.

و - پێشنیارکردنی بوودجەی تایبەت بەناوچەی ئۆتۆنۆمی.

ز - بڕیاردان لەسەر ژمێریاری کۆتایی، پاش سەرنجدانی لەلایەن دیوانی چاودێری دارایی و بەرزکردنەوەی بۆ دەسەڵاتی یاسادانان بەمەبەستی بڕیار لەسەردانی.

ح - راستکردنەوەی بوودجەی تایبەت بەناوچەی ئۆتۆنۆمی و بڕیاردانی کۆتایی لەسەر دیاریکردنی لەحاڵەتێکدا پێچەوانەی یاساو نەخشەکانی پەرەپێدانی دەوڵەت نەوەستێتەوە.

گ - لێکۆڵینەوەو لێپرسینەوە لەئەندامانی ئەنجومەنی جێ بەجێکردن لە مەوداو سنووری کارە دیاریکراوەکاندا.

ی - بەخشینی متمانە بەئەنجومەنی جێبەجێکردن، یان بەئەندامێك یان بە زۆربەی ئەندامانی، هەروەها وەرگرتنەوەی متمانە لەهەر ئەندامێکی لادراو بەزۆرینەی دەنگی ئەو ئەندامانە دەبێت ئەنجومەنی یاسا دانانیان لێپێکهاتووە.

**بەندی سێنزەهەم:**

أ - ئەنجومەنی جێبەجێکردن دەستەی جێبەجێکەری ئیدارەی ناوچەی ئۆتۆنۆمیە.

ب - ئەنجومەنی جێ بەجێکردن پێکدێت لە سەرۆك و جێگری سەرۆك و ژمارەیەك لەئەندامانی بەیەكسانی لەگەڵ ژمارەی ئەو بەڕێوەبەرایەتیانەی لەبەندی چواردەهەمدا ناویان هاتووە، یان بەدووئەندام زیاتر.

ج - سەرۆکی راسپێراو لەنێوان ئەنجومەنی یاسا داناندا، یان هەرکەسێکی تر مەرجی ئەندامبوونی تێدابەدی بکرێت، ئەندامانی ئەنجومەنی جێ بەجێکردن و سەرۆك و جێگری سەرۆك هەڵدەبژێررێت و داوا لە ئەنجومەنی یاسا دانان دەکرێت بە بەخشینی متمانە، لەگەڵ بەدەستهێنانی متمانەی زۆربەی ئەندامانی ئەنجومەن، مەرسوومی کۆماری بەپێکهێنانی ئەنجومەنی جێ بەجێکردن دەردەچێت.

د - سەرۆك و ئەندامانی ئەنجومەن بەپلەی وەزیر دادەنرێن.

ﻫ - سەرۆك کۆمار دەسەلاتی لادانی سەرۆکی ئەنجومەنی جێ بەجێکردنی هەیە لە پۆستەکەی، لەو حاڵەتەدا ئەنجومەن هەڵدەوەشێتەوە.

و - لەحاڵەتی وەرگرتنەوەی متمانە لە ئەنجومەنی جێ بەجێکردن و هەڵوەشاندنەوەی، ئەنجومەن بەرپرسیار دەبێت لە راییکردنی تەنها کارەکانی رابردووی بەردەستی و بەردەوام دەبێت تا پێکهێنانی ئەنجومەنی نوێ، بەمەرجێك مانەوەی لە پانزە رۆژ تێپەڕنەکات.

بەندی چواردەهەم:

أ - پارێزگاکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی وابەستەدەبن بەسەرۆکی ئەنجومەنی جێبەجێکردنەوە.

ب – لە راییکردنی دەسەلاتەکانیدا، ئەنجومەنی جێبەجێکردن پشت بەم نووسینگانە دەبەستێت:

١- نووسینگەی ئەنجومەنی یاسا دانان.

٢- نووسینگەی پشکنینو بەدوادا چوون.

٣- نووسینگەی ئامارو پلاندانان.

یەکەم:

ئەم بەڕێوەبەرایەتیانە بە ئەنجومەنی جێ بەجێکردنەوە دەبەسرێنەوە..

١ - بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەو فێرکردن.

٢ - بەڕێوەبەرایەتی کارو نیشتەجێکردن.

٣ - بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵو چاکسازی کشتوکاڵ.

٤ - بەڕێوەبەرایەتی کاروباری ناوخۆ.

٥ - بەڕێوەبەرایەتی گواستنەوەو گەیاندن.

٦ - بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیریو لاوان.

٧ - بەڕێوەبەرایەتی شارەوانییەکانو گەشتو گوزار.

٨ - بەڕێوەبەرایەتی کاروباری کۆمەڵایەتی.

٩ - بەڕێوەبەرایەتی داراییو ئابووری.

دووەم:

کاروبارەکانی ئەم بەڕێوەبەرایەتیانەی خوارەوە بەم جۆرە دیاری دەکرێن..

١ - بەڕێوەبەرایەتی کاروباری ناوخۆ، بەڕێوەبەرایەتیەکانی پۆلیس- بەرگری شارستانی – باری کەسایەتی دەگرێتە خۆی.

٢ - بەڕێوەبەرایـــەتی کاروبـــاری کۆمەڵایـــەتی – بەڕێوەبەرایەتیـــەکانی تەندروستیو کاروباری کۆمەڵایەتی دەگرێتە خۆی.

٣ - بەڕێوەبەرایەتی کاروباری ئابووری بەڕێوەبەرایەتی گشتی دەبێت.

ج- بەرپرســیاریەتی بەڕێوەبەرایەتیــەکانی لای ســەرەوە، لــە ئەســتۆی ئەندامانی ئەنجومەنی جێ بەجێکردندا دەبێت، لەژێر ناونیشانی (ئەمینداریەتی گشتی)و هەریەکەیان بە پلەیەکی تایبەت دادەنرێن.

**بەندی پانزەهەم:**

**ئەنجومەنی جێ بەجێکردن ئەم دەسەڵاتانە بەڕێوەدەبات:**

أ - دەستەبەرکردنی یاساو ڕێکخستنی جێ بەجێکردنی.

ب - پابەندبوون بە دەسەڵاتەکانی قەزاوە.

ج - بلاوکردنــەوەی دادپــەروەری و دابینکردنــی ئاسایشــی گشــتی و پارێزگــاریکردنی بەرژەوەندیــە نیشــتمانی و ناوخۆییــەکان و پاراســتن و چاودێریکردنی ماڵ و سامانی گشتی و تایبەتی دەوڵەت.

د - بڕیاردان لەسەر هەموو پێویستیەك و دەسەلاتی جێ بەجێکردنی بڕیارە یاساییە ناوخۆییەکان.

ه - ئامادەکــاری و پلانــدانان لەئاســتی پــڕۆژە درێژخایەنــەکانی کاروبــاری ئابووری و کۆمەڵایەتی و پرۆژەکانی پەرەپێدان و کاروباری پــەروەردە و فێرکـردن و تەندروسـتی و کـارکردن بــەپێی پلانــە درێــژڕاوەکانی ناوەنــدی گشــتی دەوڵــەت و پێویستەکانی جێبەجێکردن و بەرزکردنەوەی ئاستیان.

و - چاودێری پــڕۆژە زینــدووەکان و تــەواوی دام و دەزگـاو دامــەزراوە گشــتی و خۆجێییەتیەکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی.

ز - دامەزرانــدنی فەرمانبــەرانی ئیــدارەی ئۆتۆنــۆمی بــەپێی یاســاکانی خزمەتکردن و میلاك لەو پۆستانەی پێویست بەفـەرمان، یـان بڕیـار (مرسـوم)ی کۆماری، یان ڕەزامەنـدنی سـەرۆك کۆمـار ناکـەن، دەسـەڵاتەکانی ئـەو یاسایانەیان بەسـەردا دادەنێرێـت، وەك لەسـەر فەرمانبـەرانی کۆمـاری عێـراق دانـراوە، بـەو مەرجە فەرمانبەرانی بەشەئیداریەکان کەزۆرینەی کوردپێکدەهێنن لە کوردەکان بێت، یان لەوانـە بێـت کـە شارەزایی تـەواویان لـە زمـانی کوردیـدا هەیـە، لەگەڵ چاودێریکردنی دەقی بەندی سێیەمی ئەم یاسایە.

ح - جێ بەجێکردنی بوودجەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی، لەسـەر ڕۆشـنایی بنـەما سەرەکیە باوەڕپێکراوەکانی سیستەمی ژمێریاری دەوڵەت.

گ - ئامادەکردنی راپۆرتی ساڵانە لەسەر بارودۆخی ناوچەکەو بەرزکردنەوەی بۆ سەرۆك کۆمارو ئەنجومەنی یاسادانان.

بەندی شانزەهەم:

جگە لەو دەسەڵاتە یاساییانەی لیژنەو دەستەکانی ئیدارەی ئۆتۆنۆمی بەڕێوەی دەبەن، مومارەسەکردنی دەسەڵات لەهەموو شوێنێکی کۆماری عێراقدا دەگەڕێتەوە بۆ دەستەکانی ناوەند، یانەوانەی نوێنەرایەتیان دەکەن.

بەندی حەڤدەهەم:

ا - پێکهاتەکانی پۆلیس و ئاسایش و رەگەزنامە لەناوچەی ئۆتۆنۆمیدا وابەستە دەبن بەبەڕێوەبەرایەتیەگشتیەکانیانەوە لەوەزارەتی ناوخۆو ئەو رێنمایی و دەسەڵات و یاسایانە دەیانگرێتەوە لەکۆماری عێراقدا رایدەکرێن.

ب - سەرۆکی ئەنجومەنی جێ بەجێکردن، یان هەر دەسەڵات پێدراوێك لە ئەندامانی ئەنجومەن، دەسەڵاتی هەیە لەسنووری کارو ئەرکەکانیدا هەر ئەرکێك بخاتە سەر ئەو پێکهاتانەی لەناوچەی ئۆتۆنۆمیدان و لەبڕگەی (أ)ی ئەم بەندەدا ناویان هاتووە، بە شێوازێك لە چوارچێوەی سیاسەتی گشتی دەوڵەت تێپەڕنەکات.

ج - دامەزراندن و گواستنەوەی بەڕێوەبەرانی پێکهاتەکانی برگەی (أ)ی ئەم بەندە بەفەرمانی وەزیری ناوخۆو بەراوێژکردن لەگەڵ سەرۆکی ئەنجومەنی جێ بەجێکردن دەبێت.

د - گواستنەوەی فەرمانبەرانی پێکهاتەکانی پۆلیسی ناوچەی ئۆتۆنۆ می، لەگەڵ چاودێریکردنی برگەی (ج)ی ئەم بەندە بەفەرمانی ئەمینداری گشتی کاروباری ناو خۆ دەبێت.

ﻫ - لەگەڵ پێش چاوخستنی دەقی برگەی (د)ی ئەم بەندە، دامەزراندن و گواستنەوەی ئەو فەرمانبەرانەی لە برگەی (أ)دا ناویان هاتووە، لە چوارچێوەی ئەو دەسەڵات و رێنماییانەدایە لە کۆماری عێراقدا پەیرەو دەکرێن.

**بەندی هەژدەهەم:**

أ - فەرمانگـەکانی سـەر بەدەسـەڵاتی ناوەنـدی لـە ناوچـەکەدا سـەر بـە وەزارەتــەکانی خۆیــان دەبــن‌و لەســنووری تایبەتمەنــدی خۆیانــدا ئەرکـەکانیان بـەڕێوە دەبـەن‌و کارەکانیـان رادەپـەڕێنن.. دەسـتەو پێکهاتـەکانی دەسـەڵاتی ئۆتۆنـۆمی دەتـوانن لـە ئاسـتی هـەرتێبینی کردنێکدا بـەڕاپۆرت وەزارەتـەکانیان ئاگادار بکەن.

ب - لەســنووری تایبەتمەندیـەکانی خۆیــدا، دەسـەڵاتی ناوەنــدی مــافی ڕێنمــاییکردنی بەڕێوەبەرایەتیــە خۆجێیەتیــەکانی هەیــە، وەك لــە بەنــدی چواردەهەمی ئەم یاسایەدا ناوبراوە.

ج - وەزیری دەوڵەت لەلایەن دەسـەڵاتی نـاوە نـدەوە دادەنرێـت، هەڵدەسێت بەهەماهەنگی کردن‌و یەکخستنی ئـەو چالاکیانەی حکومـەتی ناوەندویەکەکانی ئیدارەی ئۆتۆنۆمی ئەنجامی دەدەن، بـۆی هەیـە ئامـادەی کۆبوونـەوەکانی تـەواوی ئەویەکە ئیداریانەبێت، هەمانکات دەسـەڵاتی ناوەنـدی بـۆی هەیـە هـەروەزیرێکی تر بۆ ئەوکارە دیاری بکات لە جێی ئەو پتر کارەکەی پێ بسپێرێت.

د- سەرۆکی ئەنجومەنی جێ بەجێکردن لـە کۆبوونـەوەکانی ئەنجومـەنی وە زیراندا ئامادەو بەشدار دەبێت.

**بەندی نۆزدەهەم:**

أ - لیژنەیـەکی هەڵبــژێرراو لەئەنـدامانی دادگـای پیاچـوونەوە (محکمــه التمییز) پێکهاتووە لەسەرۆکی دادگاو چوار ئەنـدام، بـۆ مـاوەی سێ ساڵ چاودێر دەبن لەسەر بڕیارەکانی دەستەو لیژنەکانی دەسەڵاتی ئۆتۆنـۆمی، دەکرێـت کـاری چاودێری لیژنەکە بۆ دووەمجار نوێ بکرێتەوە.

ب - وەزیــری داد یــان وەزیــری دەوڵــەت دەتــوانن لــەماوەی ســێ ڕۆژ دوای ڕاگەیانـدنی هەربڕیارێك لـەبڕیارەکانی لیژنـەو دەسـتەکانی دەسـەڵاتی ئۆتۆنـۆمی

بدەن، لەحاڵەتێکدا لەگەڵ دەستوورو یاساو ڕێنماییە گشتیەکاندا جیاوازی بکات.

ج - لەئەنجامی یەکلاییکردنەوەی بڕیارەکانی لیژنەو دەستەکانی دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی، جێ بەجێکردن لەلێدانی بڕیارەکان رادەگیرێت.

د - لەماوەی سی ڕۆژلە پێشکەشکردنیان لیژنەی چاودێری مەسەلەی لێدان لە بڕیارەکان یەکلاییدەکاتەوەو دەبنە دوابڕیاری کۆتایی.

هـ - بڕیارەکانی لیژنەو دەستەکانی دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی لای لیژنەی چاودێری نارەوادەبنو لەبەرواری دەرچوونیانەوە، هەموویان یان بەشێکیان دەدرێنە دواوەو لەگەڵ هەموو شوێنەوارەکانیاندا دەسڕێنەوە.

و - لیژنەی چاودێری بڕیارەکانی خۆی بۆلایەنی لێدراوو سەرۆکی ئەنجومەنی یاسادانانو ئەنجومەنی جێ بەجێکردن رادەگەیەنێتو لەڕۆژنامەی فەرمیدا بڵاو دەکرێنەوە.

**بەندی بیستەم:**

أ - لەم حاڵەتانەدا سەرۆك كۆمار دەسەلاتی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی یاسادانانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی هەیە.

**یەکەم:** ئەگەر ئەنجومەن بەهۆی دەست لەکارکێشانەوەی نیوەی ئەندامانییەوە، تەگەرە کەوتە کارەکانیو ناتوانابوو لەبەکارهێنانی دەسەلاتەکانیدا.

**دووەم:** داواکردنی ئەنجومەن بۆ کۆبوونەوە، ئەگەر لەبەرواری داواکردنەوە بۆماوەی سی ڕۆژ (ژمارەی دیاریکراوی یاسایی — النصاب القانونی) تەواو نەکردبێت بۆ زیاتر لەدووجار.

**سێیەم:** بەهۆی پێنەدانی متمانەی یاسایی وەك لەبڕگەی (د)ی بەندی سێنزەهەمدا هاتووە، یان لەحاڵەتی گوێنەدانە بڕیارەکانی لیژنە چاودێری، وەك لەبەندی نۆزدەهەمی ئەم یاسایەدا دیاریکراوە.

ب - لەحاڵەتی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی یاسادانانندا، ئەنجومەنی جێ بەجێکردن لەڕاییکردنی دەسەڵاتەکانیدا بەردەوام دەبێت، تا سەر لەنوێ هەڵبژاردنەوەی ئەنجومەنی یاسادانان، بەمەرجێك دوای دەرکردنی فەرمانی کۆماری (المرسوم الجمهوری) بەهەڵوەشاندنەوەی لەنەوەد ڕۆژ تێپەڕنەکات.

**بەندی بیستو یەکەم:**

ئەم یاسایە لەبەرواری بڵاوبوونەوەی لەڕۆژنامەی فەرمیدا جێ بەجێ دەکرێت.

لەڕۆژی ١٧ی سەفەری/ ١٣٤٩ - ك - ڕێکەوتی ڕۆژی ١١ی مانگی ئازاری ساڵی ١٩٧٤ ئەم یاسایە ڕاگەیەنرا.

## هەنگاوەکانی جێ بەجێکردن

**دامەزراندنی دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی :**

١ - پێکهێنانی ئەنجومەنی یاسادانان لەکوردستانی عێراق لەو کەسایەتیە کوردستانیانە پێکدێت کە لەسەر خاکی کوردستان دەژین، کوردبێت یان عەرەب یان هەر نەتەوەیەکی دیکە، لەگەڵ لەبەر چاوگرتنی نوێنەرایەتیکردنی زۆرینەی کەسایەتی کورد لە ئەنجومەنەکە، لەگەڵ نوێنەرایەتیکردنی ئەندامانی سەرکردایەتی پارتی بەعسی عەرەب سۆشیالیستی نیشتەجێبوانی کوردستان. بەبەرواری ١٩٧٤/١٠/٥ ئەنجومەنی یاسادانان، یەکەم کۆبوونەوەی خۆی گرێداو بەڕێز بەکر مەحمود پشدەری بەسەرۆکی ئەنجومەن هەڵبژێرا، لەگەڵ هەڵبژاردنی تەواوی پێکهاتەکانی دیکەی ئەنجومەن.

٢ - دوابەدوای پێکهێنانی ئەنجومەنی جێ بەجێکردنو ئەمینداریەکان، وەك لەیاساکەدا هاتووە، بەڕێز ئەحمەد عەبدولقادر نەقشبەندی بەسەرۆکی

ئەنجومەنی جێ بەجێکردن دانرا، لەگەڵ دانانی ئەمینداران گشتی بۆ هەریەکێك لەئەمینداریەکان. بەم هەنگاوە لەدیدگای خۆیەوە حکومەتی عێراق پرۆژەی ئۆتۆنۆمی جێ بەجێکرد.

## گرژی وهەڵچوون و ئازارەکانی شەڕ

جێ بەجێکردنی پرۆژەی ئۆتۆنۆمی لەدیدگای حکومەتی بەعسەوە، نارەزاییەکی بەرفراوانی لای کوردەکان لێکەوتەوە، لەئاستی سەقەتی پرۆژەکەی حکومەت، سەرکردایەتی شۆڕشی کورد بەدواداچوونێکی فەرمی دژ بەو دەقە راگەیاند، وەك تیایدا هاتووە دەڵێت: (یاسایەکی لەت و پەت و ئۆتۆنۆمیەکی سەقەت کارتۆنی بێ ناوەرۆك). دیارەسەرکردایەتی شۆڕشی کورد پابەندبوو بەدروشمی (دیموکراتی بۆ عێراق ئۆتۆنۆمی راستەقینە بۆ کوردستان)[٤٠].

لەگەڵ سەر لەنوێ هەڵگیرسانەوەی ئاگری شۆڕش زۆربەی زۆری چین و توێژەکانی جەماوەری کوردستان پەیوەندیان پێوەکرد.. سەیر لەوەدا بوو نەك هەر حکومەت رێگری لێنەدەکردن بەڵکوو زیاتر هاندەرو پاڵنەری پەیوەندیکردنی ئەو خەڵکانە بوو بەڕیزەکانی شۆڕشەوە بێ هیچ پشکنین و لێپرسینەوەیەك بە بازگەسەربازیەکاندا تێدەپەڕین. دیار بوو ئەو سەردەمە سەرنجی حکومەت لەو ئاستەدا بوو، پەیوەندیکردنی بەلێشاوی خەڵکی کوردستان بەڕیزەکانی شۆڕشی کوردەوە، لەرووی بژێوی و دەستەبەرکردنی گرانی نیشتەجێکردنیانەوە قورسایی و بارگرانی تەواو دەبن لەسەر بزووتنەوەی کورد و پاشماوەی سەخت و سەنگین بەجێ دەهێڵن، نکوولی لەوە ناکرێت ئەو رەوشە پاشماوەی ناکارو نالەباری لەسەرشۆڕش و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد جێ هێشت. سەبارەت بەو مەسەلەیە مەسعود بارزانی دەڵێت: (دەرچوونی ئەو ژمارە گەورەو فراوانە لە خەڵکی شارو شارۆچکەو گوندەکانی کوردستان و گەیشتنیان بە

---

[٤٠] کوردستان و بزووتنەوەی کورد - مەسعود بارزانی -

ناوچـەکانی ژێـر دەسـەڵاتی شـۆڕش، هەڵمیـەکی یـەکجار ناکـارو کردەوەیـەکی سەرەڕۆیی نابەجێ بوو، هەرگیز بەو جۆرە چاوەڕوانیمان نەدەکردو هەستیشمان بەو ئاسەوارە رووخێنەرە نەدەکرد تا رووبەڕووی بووبنەوەو کەوتینە ناوەڕاستی واقعـی چـۆنییەتی لـەخۆگرتنیان‌و بـەڕێوەبردنی گـوزەران‌و نیشـتەجێکردنیان. گومـان لـەوەدا نـەبوو، رێکردنـەوەی حکومـەت لـە پـێش ئـەو خەڵکانـەی رێگـای ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕشیان گرتبوویەبەر، مەبەست تیایدا سەپاندنی ئەو سەنگ‌و قورساییە بـوو لەسـەر شـۆڕش، کۆچکردنی بەکۆمـەڵی لـەو شـێوەیە زۆر خراپ بەسەرماندا شکایەوە، جگە لە کەوتنەوەی کاریگەری ناکارو خـراپ لەسـەر چـالاکییە سیاسـیەکانمان لـەناو شـارو شارۆچـکەکان‌و چـۆڵ بوونیـان لـە نیشـتمانپەروەرانی کارامـەو گۆڕانیـان بـۆ بنکـەو مۆڵگـەی سـیخوڕانی رژێـم‌و بەکرێگراوانی‌و بوونەهۆی دابڕان‌و بێبەشبوونی شۆڕش لەسەرچاوەکانی خۆراك‌و زانیـاری گـرنگ دەربـارەی راپیکردنـی سیاسـەتی چـەوت‌و کـارو چـالاکیەکانی حکومەت.. ئەوەی جێی سـەرنج بـوو جـەماوەرو ژمارەیـەك لەفەرمانـدەکانی نـاو بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد گەیشتبوونە بـڕوای دووبارەبوونـەوەی رووداوی بـەنگلادێش، کوردسـتان لـە عێـراق جیادەبێتـەوەو دەوڵـەتی سـەربەخۆی دادەمەزرێنێ)[41].

## سەر لە نوێ شەڕ لە کوردستان

بزووتنـەوەی کـورد ئامـادەو سازی کارەساتەکانی رۆژانـی داهـاتوو بـوو، لـەو شـەڕە چـاوەڕوانکراوەی لەگـەڵ هێزەکـانی حکومـەت، بـەو هۆیـەوە دەسـتەیەك پسپۆری نەخشە داڕێژەری سەربازی پێکهێناو لەبـەهاری سـاڵی ١٩٧٤ دا بـە دەست پێشخەری هێرشی بەربڵاوی حکومەت بۆ سەرناوچەکانی دەشتی هەولێرو شاخی سەفین، بەکردەوە شەڕ دەستی پێکـردەوە، لەگـەڵ هەڵسانی فڕۆکـە جەنگیـەکانی

---

(41) سەرچاوەی پێشوو.

هێــزی ئاسمــانی بــە بۆردمــانکردنی ســەختی شــوێنەکانی کۆبوونــەوەو نیشتەجێبوونی کوردەکان‌و رووخاندنی پردە ستراتیجیەکان‌و هێرش کردنەسەر قوتابیــانی ئــاوارەبووی زانکــۆی سلێمانی‌و موشکبارانکردنی ژمارەیــەك شارو شارۆچکەو گوندەکان، هێزەپەلاماردەرەکانی عێراق تەواوی توانا سەربازیەکانیان لە چەك‌و تەقەمەنی سەنگین‌و کوشندە لەسەر خاکی کوردستان بەکارهێنا، لە راستیدا سەرەتا ئەو هێزانــە لەســەر رووبــەری خــاك هەنــدێ ســەرکەوتنیان بەدەستهێناو زیانێکی یەکجار گەورەو فراوانیان بەهێزی پێشمەرگەی کوردستان گەیاند، لە پێناوی سەرکەوتن‌و یەکلاییکردنــەوەی شەڕەکە، هێزەکانی حکومەت فشاری توندیان خستبوویە سەرناوچەکە، بەوهیوایە پێش هاتنی وەرزی زستان‌و کەڵەکــەبوونی بــەفرو ســڕبوونی کــردەوە ســەربازیەکانی، بگاتــە ســەرکەوتنی یەکجاری. لەگەڵ سەرکەوتنی سوپای عێراق لەچەند کردەوەیەکی سەربازیدا، بەوتــەی خــودی عێراقیــەکان زیانــە گیــانی‌و مادیــەکانی حکومــەت لــەژمارە نەدەهاتن.

## بۆچی ئەزموونی ئۆتۆنۆمی شکستی هێنا؟

لەگــەڵ دەســت خســتنە دەســتوورو گۆڕانکــاریکردن لــەمادەی حەوتــەمی دەســتووری خــودی پــارتی بــەعس‌و بــەناوی راســتکردنەوەی دەســتووری کــاتی عێراق‌و گۆڕانکاری کردن تیایدا، حکومەت هەڵسا بەڕاییکردنی کاری پێکهێنانی دام‌و دەزگاکــانی ئەنجومــەنی یاســادانان‌و ئەنجومــەنی جــێ بــەجێکردن‌و ئەمینداریەکان‌و بەلێشاو رژانــدن پژانــدنی دەســتکەوتی تایبەت وپەخشکردنی بەسەر کارمەنــدانی بــالآی دامــەزراوەکانی ئۆتۆنۆمیــدا.. جگە لــەدانانی هــەردوو ســەرۆکانی ئەنجومەنــەکانی یاســادانان‌و جــێ بــەجێکردن بەپلــەی وەزیــر لــە ئەنجومــەنی وەزیرانــی حکومــەتی عێــراق، هــەمانکات ئەمینــدارەکانیش پلــەی وەزیریــان پــێ بەخشــراو نیشــتەجێی شــیاویان بۆتــەرخانکراو بــە وەرگرتنــی

ئۆتۆمۆبیلی نوێو دیاری دارایی لەخەڵکانی دیکە جیاکرانەوە. حکومەتی عێراق جێ بەجێکردنی ئۆتۆنۆمی، بەدەستکەوتێکی تەواو گرنگو مەزنی خۆی لێکدەدایەوە، لەهەموو بۆنەو یادەوەرییەکدا ئاماژەی پێدەکردو تیشکی دەخرایە سەرو بەو پەڕی شانازییەوە دەردەخرا کەهیچ حکومەتێکی عێراقی لە رابردوودا توانای بەدیهێنانی ئەو خواستانەی نەبووە، تەنانەت حکومەتی بەعس وەك تانەو ناوزڕاندنێك ئاراستەی تورکیاو سوریاو ئێرانی دەکردو ئاماژەی بەناتوانایی ئەو دەوڵەتانە دەکرد لە چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە وڵاتەکانیاندا. دەگونجا ئۆتۆنۆمی چارەسەرێکی گونجاو بوایەو کوردەکان لەسایەیدا بەمافەنەتەوایەتیەکانیان شاد بوونایەو ژیانی پڕ لە ئاسوودەییو پڕ بەختەوەری دوور لە خوێنرێژی بەسەر بردایە، هەرچەند سەقەتی جێ بەجێکردنی ئەو ئەزموونە نەبوویە هۆکاری شکستی تەواوی مەسەلەکە. دەبینین خوێندنەوەی یاسای ئەنجومەنی یاسادانان لەکوردستانی عێراق، هۆکارێك بوو لەو هۆکارانە، جگە لە هۆکاری تریش، کە نووسەری ئەم دێڕانە لە دیمانەیەکیدا لەگەڵ یەکەم سەرۆکی ئەنجومەنی یاسادانانی ناوچەی کوردستانی عێراق، بەڕێز بەکر رەسوڵ پشدەری ئەنجامداوە، ئەوە ئاشکرادەکات کە بەڕێزیان لەیەکەم کۆبوونەوەی رۆژی ١٩٧٤/١٠/٥، تا کۆبوونەوەی حەوتەمی ساڵی سێیەمی دەورەی ئاسایی ١٩٧٦/١٢/١١ سەرۆکایە ئەنجومەنی لە دەستدابووەو دواتر پۆستی وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی لە بەغدا پێ سپێررا، دواتریش دانرا بە بەڕێوەبەری رێکخراوی کاری عەرەبی (منظمة العمل العربی) بۆ زیاتر شارەزابوون لە کارەکانی ئەنجومەن لێرە دا چەند برگەیەکی ئەو دیمانەیە دەخەینە بەردەست. سەرۆکی ئەنجومەن وەك کەسایەتیەکی کاریگەری ناو دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی، باسوخواس لە ئەزموونی خۆیو ئەو کێشەو ئاستەنگانە دەکات، رووبەرووی ئەنجومەنەکەی بوونەتەوە، وەك خۆی دەڵێت: (هۆکاری سەرەکی بوون لە خنکاندنی ئەزموونەکەو دارنینی لە ناوەڕۆکەکەی، تا ئەو کاتەی رووداوی دیکەیان بە دوای

خۆیاندا راکێشاو زۆر بە ئاسانی ئەنجومەنیش ژێر دەستەی مەبەستو نیازە تایبەتیەکان کران، هەرچەند لە تواناداە هەبوو ئەزموونەکە دەوڵەمەند بکرێتو بە مەزنی راگیرایە، بەڵام ئەوەی روویداو هاتە پێشەوە شتێکی تر بوو، وەك لێرەدا دەردەکەوێت).

## سوێندی یاسایی ئەندامانی ئەنجومەنی یاسادانان

سەرەتا بە تێبینی کردنی دەقی ئەو سوێندەی ئەندامانی ئەنجومەنی یاسادانان دەیانخوێندەوە، دەردەکەوێت چۆن دەقێكو بە چ مەبەستێکی دوور لەو خواستە بە ئەنجومەنی یاسادانان کاری لە سەر بکات.. ئەوەی جێی سەرنجە سوێندەکە جێ بەجێکەری ئامانجە سەرەکیو پرنسیپەکانی پارتێکی نەتەوەخوازی وەك پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی بەو دەقەکەی لەبەندی (٥٠) پەنجای یاسای ئەنجومەنی یاسادانانداهاتووە دەڵێت: (سوێند بەخودای مەزنو بە شەرەفمو بە بیرو باوەڕم پارێزگاری لە سیستەمی کۆماری بکەمو پابەند بم بە دەستوورو یاساکانییەوەو پارێزگاری بەرژەوەندیەکانی بکەمو لە پێناوی سەروەریو سەربەخۆیی وڵاتو سەلامەتی یەکێتی خاکی کۆماری عێراق شەونخوونی بکێشمو پارێزەری بنەماکانی شۆڕشی ١٧و٣٠/تەممووزی ١٩٦٨ بم، وەبەو پەڕی تواناوە بەلەخۆبوردەییو دڵسۆزیەوە کاربکەم لە پێناوی بەدیهێنانی ئامانجە مەزنەکانی گەل، لە یەکێتیو سەربەخۆییو سۆشیالیستی). دەبوو لەمەودای بەخشینی ئۆتۆنۆمی بەکوردەکانو بەڕێوەبردنی دۆخەکانی رۆشنبیریو ئازادی، ئەنجومەن لە چوارچێوەی عێراقێکی یەکگرتوودا پێکهێنرابوایە، بەڵام یەکێتی عەرەب کەئەنجومەنی پێ سوێند دەدرا، کەبەهەموو تواناو لەخۆبور دەییو دڵسۆزی کاربکات لەسەر جێ بەجێکردنی، لەوکارە سەیرو سەمەرانەیە، کەمەسەلەی گفتوگۆیەکی درێژخایەنی نێو بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردو حکومەتە یەك لەدوایەکەکان بووە، جگە لەوە مەسەلەیەکی

گرنگو سەرەکی شاندی کوردی بووە، لەگفتوگۆکانی پرۆژەی یەکگرتنی سێقۆڵی قاهیرەی ساڵی ١٩٦٣. وەك پێشتر ئاماژەی پێدرا، لە کاتێکدا هەستو سۆزو خەونی کوردستانی گەورە لە خوێنو گیانو هزری کوردەکاندا بنجی داکوتاوە، هیچ ژیریو لۆژیکێك بەوە رازی نابێت خۆیان لە پێناوی هێنانەدی ئامانجە نەتەوایەتیەکانی عەرەبدا بەخت بکەن.

لەو هەلومەرجەدا چی لەسەر کورد پێویست دەبێت؟.. پێویست بوو بە ئاراستەی بەهێزکردنی چەمکی ئۆتۆنۆمی راستەقینە لە زەمینی پیاوی راستە شەقامی کوردیدا خەبات بکرێت. بەڵام مەخابن هەر لە سەرەتاوە مەسەلەکان بە رێڕەوێکی دیکەدا گوزەریان پێکراو دەبوو پیاوانی بەرێوەبەری دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی بە ویستی رژێمی بەعس مامەڵەیان لەگەڵ کارەکانیادا بکردایەو هەر لەو رێگایەوە هاووڵاتی ئاسایی کورد لە ریزەکانی بەعس دا بەناچار ی رێك دەخران[٤٢]، دیارە بۆ هەندێ کەسی سوودمەند وەك دیاردەیەك لە پێناوی بەرژەوەندیە تاکەکەسیەکانی خۆیان دەچوونە ریزی رێکخستنەکانی پارتی بەعسو کردبوویانە هۆکاری گەیشتن بەپۆستەتایبەتە ئیداریەکان. ئەمانە لە بۆنەو یادەکاندا لە بەزۆر کۆکردنەوەی جەماوەرو بەناچاری وتنەوەی دروشمەکانی بەعسی وەك (نەتەوەی عەرەبی یەکگرتوو خاوەنی پەیامێکی نەمر) (أمة عربية واحدة ذات رسالة خالدة)و دروشمی ئامانجە سەرەکیەکانی بەعس لە یەکێتیو سەربەخۆییو سۆشیالیستی (الوحدة والحرية والأشتراكية) کە بە سێکوچکەی پیرۆز دەناسرا رۆڵی گرنگیان دەگێڕا.

---

(٤٢) کەسانێك بەناچاری لە رێکخستن و رێکخراوەکانی بەعسدا لە کوردستان رێکدەخران لەرێی فۆرمێکەوە دەبوو کەمەرجی ئەوەی لەسەر دانرابوو ئەگەر دە کەوت لەهەرپارت و رێکخراوێکی دیکەدا کاردەکات سزای لەسێدارەدانی خۆی لەسەر مۆردەکرد.. دیارە مۆرکردنی ئەو فۆرمە تەنها بەو کوردانە مۆردەکرا کە رێکدەخران . و.ك

## چاودێری لەسەرکارەکانی ئەنجومەن

لەسەر بنەڕەتی (دەسەڵاتی باڵا نوێنەری گەلە).. گریمان هیچ چاودێریەك بەسەرکارەکانی ئەنجومەنی یاسادانانەوە دانەنراوەونییە، هەرچەند نەبوونی چاودێری لەسەر ئەنجومەنی نوێنەرانی دەوڵەتی سەربەخۆو خاوەن سەروەری راسترە، بەو هۆیەوە ئەنجومەن خاوەنی دەسەڵاتی باڵا دەبێت لە بڕیاردانـدا. لەبەرئـەوەی ئـەم ئەنجومەنـە هەرێمیـەو لەچوارچێوەی دەوڵـەتی ناوەندیـداو بەپێی یاسای تایبەت ئۆتۆنۆمی پیادە دەکرێت، دەنگونجێت لەلایەن دەسەڵاتی ناوەندیەوە چاودێری لەسەر کارەکانیو بڕیارەکانی دابنرێت.

بەندی نۆزدەهەمی یاسای ئۆتۆنۆمی ئاماژە دەکات بەدانانی چەندین لیژنەی چاودێری بەسەرکاروبڕیارەکانی ئەنجومەنـەوەو لـە لیژنەیـەکی سـەرەکیو تایبەتیـدا کۆکراونەتـەوە کـەوەزیری داد سـەرۆکایەتی دەکـاتو دەسـەڵاتی رەخنـەگرتنو دانـەدواوەی ئـەو بڕیارانـەی لـە ئەسـتۆدایە پێچـەوانەی دەقـە دەستووریەکانو بەندە یاساییەکان دەوەستنەوە، لەگەڵ کارپێکردنو رایکردنی ئـەو بڕیارانـەی لەلایـەن سـەرۆکی لیژنـەی چـاودێریەوە وەزیـری داد لێیـان نەدرابێت.. پێویستە ئەوە بزانین لەسەر زەمینەی واقع وەزیر چۆن کارەکان رایدەکات. لەم کاتەدا سەرۆکی ئەنجومەنی یاسادانانی ناوچەی کوردستان ئـەم راستیەی درکاندو وتی: (لە راستیدا چەند لایەنێکی چاودێری جیاواز دوور لە یاساو دەسەڵاتی یاسایی وەك دەزگای ئاسایشی تایبەتو هەواڵگریو نووسینگەی باکووری پارتی بەعس، بەسەر تەواوی کاروچالاکیەکانی ئەنجومەنو بڕیارەکانیدا سەپێنراون، هەر لایەنێکیش لەم لایەنانە لەگەڵ زیادە رۆییو بازدان بەسەر یاساو پێشیلکردنی دەستووردا باڵا دەستی تەواویان هەبوو، جگەلەوە تواناداربوون بەخنکانـدنو سـڕینەوەی هـەر بڕیـارێکی ئەنجومـەن پـێش دەرچـوونی لەبنکەکەیدا).

# بەجێهێنان و ڕاییکردنی کارەکانی ئەنجومەن لە نێوان دوو سەردەمدا *

**یەکـــەم:** پــێش ڕێککــەوتنی جــەزایرو نســکۆی شــۆڕش و بزووتنــەوەی ڕزگاریخوازی کورد.

**دووەم:** دوای نسکۆی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد.

لەســەردەمی یەکەمــدا ئەنجومــەنی یاســادانان دوور لــە چــاودێریکردن کاروئەرکــەکانی خــۆی ڕادەپەڕانــدو حکومــەتی ناوەنــدی چاوپۆشــی تــەواوی لــەبڕیارەکان دەکــردو ئەنجومــەن سەربەســت بــوو لەچــۆنییەتی باســکردنی مەسەلەکانیدا، ئەوەی جێی سەرنج بوو بەچاك و بەخراپ هیچ وتەیەك سەبارەت بە بزووتنەوەی کورد باس و خواسی لێنەدەکرا.. ئەگەر لەبوارێکدا پێویست بەناو هێنانی بکرایە، وتەبێژ خۆی لەناو هێنان و قسەوقسەلۆك و وتەی نەشیاو دوور دەگرت، توندترین ناوبردنی بزووتنەوەی کورد لەو سەردەمەداتەنها بەیاخیبوو یــان تــاقمی مەلامســتەفا بــارزانی نــاودەبرا. گومــان لــەوەدا نــەبوو ئەنــدامانی ئەنجومەنی یاسادانان لەو خۆ پارێزیاندا، لە تۆڵەی بزووتنەوەکە دەترسان. لەو ڕووەوە سەرۆکی ئەنجومەن دەڵێت: ( لەکاتێکدا ئێمە وەك دامەزراوێکی یاسایی بێدەســەڵات بــووین لــە پارێزگــاریکردنی گیــانی خۆمــان، جارێــك نارنجۆکێــك هەڵدرابوویــە مــاڵی ئەنــدامێکی ئەنجومــەن و لــە ترســاندا بوورابوویــەوە، ئێمــە بۆخۆمــان لــەو حاڵەتــەدا دەژیــاین، ئــەویش داوای لێــدەکردین بیپــارێزین، وێنــە هاوجۆرەکانی ئەو مەسەلانەی لە سەردەمی یەکەمدا ڕوویانــدا بــوو، جارێك لە جاران لیژنەی باڵای کاروباری باکور (اللجنة العليا لشؤن الشمال) بە برووسکەیەك داوای لادانی (حەسانە)ی لەسەر ئەندامێکی ئەنجومەن کردبوو، لە ڕاستیدا ئەو ئەندامــە بــە تــاوانی دژ بــە ئاسایشــی دەوڵــەت دەســتگیرکرابوو.. لــەم ئاســتەدا سەرۆکایەتی ئەنجومەن لە وەڵامی برووسکەکەی لیژنەی باڵای کاروباری باکووردا

هەڵوێستێکی توندی گرتە بەرو سەرزەنشتی گرتنی پێشوەختو بێ ئاگادارکردنو وەرگرتنی رەزامەندی ئەنجومەن کرد، بێ ئەوەی لەلایەن حکومەتەوە هیچ کاردانەوەیەکی خراپی لێ بکەوێتەوە، ئەو هەڵوێستو وەڵامدانەوەیە نە پێشترو نە دواتر لە ناوخۆی سیستەمی دەسەڵاتداردا رووی نەداوەو رویش نادات.. لەگەڵ ئەوەیشدا دەرکەوت کێشەی دەستگیرکردنی ئەو ئەندامە بە هۆی پەیوەندیکردنییەوە بوو بە بزووتنەوەی کوردەوە کەلە شەڕی دژبە حکومەتدا بوو.. لەگەڵ ترسناکی مەسەلەکەیشدا ئەندامانی ئەنجومەن لە هەڵوێستێکی جوامێرانەدا بەرەنگار بوونەوەو کەوتنە بیانوو هێنانەوەو داکۆکیکردن لەو کێشەیە. ماوەیەك پێش رێککەوتنی جەزایرو لەکۆبوونەوەی سێنزەهەمی رۆژی ١٩٧٥/٢/١٠ ی ئەنجومەنی یاسادانانا ئەم رەستانە پێش چاو دەکەوتن..

- داواکارین بە ئاگادارکردنمان لەسەر دەقی دۆسیەی لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەو ئەندامەی ئەنجومەن، بەمەبەستی شارەزابوون لە دەقی دان پێدانانی ئەو تاوانەی خراوەتە ئەستۆی.

- نیگەرانو ناڕازین لەسەر شێوازی دەستگیرکردنی ئەندامێکی ئەنجومەن، دیارە دەزگای ئاسایش جگە لەپەلەکردن سەرپێچی یاسایشی کردوە.

- ئەو رووداوە پێشینەیەکی ترسناکی دەبێت لەسەر پاشە رۆژی ئەندامانی ئەنجومەن.

- پێویستە لیژنەیەکی تایبەتی لە ئەندامانی ئەنجومەن پێکبهێنرێتو پەیوەندی بەو هاوڕێیەوە بکاتو بەراپۆرتێك سەرۆکی ئەنجومەن لە راستی رووداوە کە ئاگاداربکات، دواتر ئەنجومەن دەڕوانێتە مەسەلەی لادانی (حەسانە) لەسەری.

- ئەنجومەن مافی هەیە لەدۆسیەی لێکۆڵینەوە لەسەر ئەندامێکی ئاگاداری ببێت، بەمەبەستی دڵنیابوون لەڕاستیو رەوینەوەی گومان لە هەڵبەستراویو داتاشراوی ئەو تاوانەو تۆمەت خستنەسەرە.

- پێویستە لە ئاستی کاردانەوە سیاسیەکاندا سەرنجی تایبەت هەبێتو هەڵوێستیان لەسەر وەرگیرێتو رای گشتی بەرانبەریان ئاگاداربکرێت.

- بۆ سەپاندنی تاوانو دانان بەتاواندا بەس نییە، هاورێکەیشمان هێشتا بێتاوانو لەسەر گومان گیراوە.

- داواکردنی لادانی (حەسانە) بەدەقی یاسایی لە دەسەڵاتی قەزادایەو هیچ لایەنێکی دیکە ئەو دەسەڵاتەی پێ نەبەخشراوە.

- لە کاتێکدا ئێمە ئەندامانی ئەنجومەن توانای پارێزگاریکردنی ژیانی خۆمانمان نییە ئایا ناگونجێت ئەندامی تاوانبارکراو لەمەترسی ژیانی خۆی پەیوەندی بە بزووتنەوەی کوردەوە کردبێت؟.

ئەوەی گرنگ بوو لە ئاستی ئەو دەقانەی لە کۆنووسی کۆبوونەوەکەدا هاتبوون هیچ کاردانەوەیەکی ناکار (السلبی) حکومەتیان نەکەوتە سەرو خاوەنی ئەو وتانەیش رووبەرووی هیچ جۆرە بەرپرسیاریەتیو لێپێچینەوەیەك نەبووە. کەچی دوای مۆرکردنی رێککەوتننامەی جەزایرو نسکۆی شۆرشو بزووتنەوەی کوردو دەستپێکردنی سەردەمی دووەمی ئەنجومەنی یاسادانان، مامەڵەو هەڵس وکەوتی حکومەت لەگەڵ باروودۆخە نوێکە گۆرانی یەکجاری بەسەرداهات. ئەگەر تێبینی بکرێت مامەڵەی حکومەت لەگەڵ ئەنجومەنی سەردەمی پێشوو، کەچی لە نێوان شەوو رۆژێکدا مامەڵەی نەرم ونیانی پێچەوانەبوویەوە، ئەوە بوو لە کۆبوونەوەی نائاسایی رۆژی ١٩٧٥/٣/٢٤- تەها یاسین رەمەزانی گەورە لێپرسراوی حکومەت تیایدا ئامادەبوو، دوو ئەندامی ئەنجومەن مەسەلەی (حەسانە)و رادەربرینی ئەندامان لە کۆبوونەوەکانداو رای جەماوەرو گەیاندنی داخوازیەکانیان خستە بەردەست سەرۆکی ئەنجومەن..

تەها یاسین رەمەزان زۆر بە توندی بەرەنگاریان بوویەوەو دوور لە هەموو نەریتێکی دیپلۆماسیو سیاسی لە روویاندا وەستاو ئەو جۆرە دەربرینو داخوازیانەی بە نارەواو نە جۆر وەسف کردو وتی: (ئێمە بە هیچ شێوەیەك رێگە

نادەین لە ناوچەکەدا مەلا مستەفا بارزانییەکی ترسەر دەربێنێ). دواتر ئەم وتەیەی رەمەزان وەك بەجێهێنانی ئەرکێکی مەزن و پیرۆز لە ئەنجومەندا پەیرەوکرا. هەرچەند مەبەستی خراپ و هیچ مەترسیەك لە داخوازی ئەو دوو ئەندامەدا نەدەبینرا، کەچی بووە بیانووی لادانیان لە ئەندامیەتی ئەنجومەن، لە کاتێکدا دەقی بەندی پانزەهەمی یاسای ئەنجومەنی پاسادانان ئاماژە بەو مەسەلەیە دەکات و دەڵێت: (ئەندامیەتی ئەنجومەن، یان هەڵوەشاندنەوەی، یان وازهێنان و دەست لە کارکێشانەوەی ئەندامێکی ئەنجومەن لەبەرواری رەزامەندی زۆرینەی ئەندامانی ئەنجومەنەوە، یان نەمانی مەرجێك لەمەرجەکانی پاڵاوتن بۆ ئەندامیەتی ئەنجومەن، ئەویش هەمانشێوە لەسەر رەزامەندی زۆرینەی ئەندامانی جێبەجێ دەبێت). وتەکەی تەها یاسین رەمەزان و دەرکردنی نایاسایی دوو ئەندامی ئەنجومەن، نامەیەکی کراوە بوو ئاراستەی ئەنجومەنی پاسادانان کرا وەك تیایدا هاتووە.. (ئێمە لە سەردەمێکی نوێدا دەژین، بزووتنەوەی کورد تێشکانی بەسەردا هاتووە). نامەکە هەڵگری ئەو مانایە بوو ئەنجومەن جگە لە دیکۆرێکی بێ قەبارەو بێ ناوەڕۆك شتێکی دیکە نییەو تەنانەت بوونیشی پێویست نییە. ئەندامانی ئەنجومەن زۆربە روونی و هەستی کراوەوە ناوەڕۆکی نامەکەیان وەرگرت و لێی گەیشتن و هێڵی سووریان لە پێش خۆیاندا داناو نەدەبوو لێی تێپەڕن. هەر لەو سۆنگەیەوە کەوتنە قسەو قسەڵۆکی هەڵبەستراو دژ بە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، وەك لە دووتۆی راپۆرتەکانی کۆبوونەوەو دانیشتنەکانی ئەنجومەندا ئەم رستانە دەخوێنرێنەوە..

هەرەسهێنانی سەرکردایەتی بەکرێگیراوی پاخیبوو.

هەرەسهێنانی سەرکردایەتی عەشایەری.

بەهاندانی لایەنە ئیمپریالیزمی و زایۆنیزمی و کۆنەپەرستانی ناوچەکە، سەرکردایەتی عەشایەری بەکرێگیراو لە دیدگای بەرژەوەندیە چینایەتیەکانییەوە دەستیاندایە شێواندنی دەستکەوتەکان.

رووتکردنەوەو ریسواکردنی چەمك و دەسەلاتی سەپێنراو ئەو بیرە تەسکانەی سەرکردایەتی عەشایەری بەکرێگیراو لە شەستەکانەوە پەیڕەوی دەکردن.

داڕووخان و شکست خواردنی تاقمی بەکرێگیراو.

بە پێی فەرمانی کارگێڕی ژمارە ٤٣٦ بەرواری ١٩٧٥/٥/٢ی دیوانی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی یاسادانان، بە مەبەستی تۆمەتبارکردنی بزووتنەوەی کوردو لەژێر پەردەی - ڕوونکردنەوەی هەڵوێست و ڕۆڵی سەرکردایەتی عەشایەری بەکرێگیراوی ئاژاوەگێڕ- دا، چەند لیژنەیەکی لە ئەندامانی ئەنجومەن پێکهێناو بەمەستی ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی بزووتنەوەی کورد لەخوێنرێژی و خەیانەتکاری سەرکردایەتی عەشایەری، سەردانی کوردستانیان کردو بۆ جەماوەریان ڕوونەدەکردەوە، ئەو سەرکردایەتیە چۆن لە پێش خۆڕاگری و هێزی نیشتمانی نەتەوەیی پێشکەوتووخوازدا ترسنۆکانە هەڵهات. لەوتەکانیاندا ئەندامانی ئەنجومەن باسیان لە گرنگی ڕۆڵی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست دەکردو وەك پێشڕەوی بزووتنەوەو خاوەن خەباتی نیشتیمانی ناویاندەبردو مێشکی خەڵکیان بەوە زاخاودەدایەوە، کە شکستخواردنی بزووتنەوەی کورد دەرەنجامی ڕێککەوتنی جەزایر نەبووە، بەڵکوو دەرەنجامی دژایەتیکردنی گەلی کوردو بەرەی نیشتمانی پێشکەوتوو خوازبووە، کە دەسەلاتی نیشتمانی لەسایەی سەرکردایەتی بەعسدا دەستەبەری کردبوو[٤٢].

سەرۆکی ئەنجومەنی یاسادانان هۆکارکانی شکستی ئەنجومەنی لە سەرنەکەوتنی ئەو کارانەی پێویست بوو بکرێن و نەکران و شکستخواردنی ئەزموونەکەیشیان گێڕایەوە بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە : -

١ - هەر بڕیارێکی ئەنجومەن دەدرایە لیژنەی چاودێری لە بەغدا، بێ وەڵام دەمایەوەو دەخرایە بەرگفەی ڕەشەبا.

---

(٤٢) کۆنووسی کۆبوونەوەی ژمارە ٢٢ ڕۆژی ١٩٧٥/٥/١٥ی ئەنجومەنی یاسادانان.

٢ - بوونی بیروڕای جیاواز لە نێوان ئەندامانی ئەنجومەنداو نەبوونی هەماهەنگی لە نێوانیاندا، جگە لە هەوڵی هەندێ لایەنی ناوچەکە (ناوچەی ئۆتۆنۆمی) بەنانەوەی کێشەی جۆراوجۆر لە پێش ئەندامان.

٣ - بێباوەڕی لێپرسراوانی بالآی بەعس لەناوچەکەدا بەرانبەر بە سەراپای پرۆژەی ئۆتۆنۆمی‌و دامەزراوە یاساییەکانی‌و دەستوەردان لەکاروبارەکان.

سەرۆکی ئەنجومەن لەدرێژەی قسەکانیدا وتی: (لێرەدا وێنەیەکی ئاشکراو سەیری سووکایەتیکردن بەبڕیارەکانی ئەنجومەن دەبینین کە بەم دەقە هاتووە.. - بڕیارماندا لەسەر بەچاپگەیاندنی ساڵنامەیەکی تایبەت بەناوچەی کوردستان‌و رازاوەبێت بەدیمەنە سروشتیە دڵگیرەکانی ناوچەکە، بۆ ئەم مەبەستە ژمارەی پێویستمان بەچاپ گەیاند.. لەگەڵ ئەوەدا وەزارەتی راگەیاندن هیچ پەیوەندیەکی یاسایی لەچاودێریکردنی کارەکانی ئەنجومەنی یاسادانان نەبووە، بیانووی بەچاپگەیاندنی ساڵنامەی لەو جۆرەی گەڕاندەوە بۆ دەسەڵاتی ناوەندی‌و بەفەرمانێکی دوور لەیاسا تەواوی ژمارەکانی سووتێنران، بێ ئەوەی ئەنجومەن توانای رووبەڕوو بوونەوەی ئەو وەزارەتەی لەدەستدابێت).

وێنەیەکی لەوەسەیرو سەرنج راکێشتر هەیە..!!! کەسایەتیەکی دەرەوە سەردانی عێراق دەکات‌و دێتە ناوچەی کوردستان‌و فەرشێکی ساختی کارگەی چنینی هەولێر، نەخشێنراو بەوێنەی تەلاری ئەنجومەنی نیشتیمانی‌و چەند نووسینێکی عەرەبی‌و کوردی پێشکەش دەکرێت، لەناکاوێکدا ئەنجومەن بەنووسراوێکی وەزارەتی راگەیاندن بەم دەقە هۆشیار دەکرێتەوە.. (نەخشاندنی وێنە لەسەر فەرش تەنها بەوێنەی سەرۆکی فەرماندە دەبێت‌و نوسینیش تەنها بە زمانی عەرەبی دەنووسرێت).. بەو هۆیەوە هیچ گرنگیەك بەڕەخنەی ئێمە نەدەدراو هیچ نر خێکیشمان بۆ دانەدەنرا، وەك ئەنجومەن لە توانای ئێمەدا نەبوو رەخنە ئاراستەی ئەو وەزارەتە بکەین.

لە ڕاستیدا ئەگەر حکومەتی عێراق لە جێبەجێکردنی ئۆتۆنۆمیدا ڕێگای دروستی پێش گرتبا، ئەزموونێکی سەرکەوتوو دەبوو، لەلایەک دەبووە پردێک لە بەهێزکردنی پەیوەندی هەردوو نەتەوەکەو لەلایەکی تریشەوە دەبووە پردی پەیوەندی نێوان پیاوانی دەسەڵاتداری ئۆتۆنۆمیو جەماوەری گەلی کوردو متمانە کردن بەیەکتری.. بەڵام تەنها کارتۆنێکی بێ ناوەڕۆکو بێ بارسایی دانرابوو.. هەروەک هاوڵاتیانی کورد ناوی (کارتۆنی)یان بەسەردا سەپاند بوو. بەو جۆرەو بە یەکجاری گرنگترین هەڵی چارەسەری کێشەی کورد بە چارەسەرێکی واقع بینانەو ژیرانە لە دەستدرا).

# بەشی شەشەم

## ڕێککەوتننامەی جەزایر و دەرهاوێشتەکانی

پێشتر ئاماژە بەوە کرا لە کۆبوونەوەی ٨ی ئازاری ١٩٧٤ سەدام حسەین بە ئیدریس بارزانی ڕاگەیاندو وتبووی: (ناچارمان مەکەن ملکەچی داخوازیەکانی شای ئێران ببین، بێگومان بەو پەڕی خۆشحاڵیەوە بە پیرمانەوە دێتو ئامادەیە بەرانبەر بەوە شتێکمان پێشکەش بکات)[٤٤]. بەسەر دەستپێکردنەوەی شەڕەکەدا ئەوەندە درێژەی نەکێشا، بە هۆی گێڕانی ڕۆڵی گرنگی هنری کیسنجەری وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا، پەیوەندی نهێنی لە نێوان عێراقو ئێران دەستی پێکرد، سەرەتا ئەستەمبوڵی تورکیا یەکەم کۆبوونەوەی سەعدون حەممادی وەزیری دەرەوەی عێراقو عەباس عەلی خەلعەتبەری وەزیری دەرەوەی ئێرانی گرتە خۆی. کۆبوونەوەکانی هەردوولا بەردەوام بوون تا مانگی ئازاری ١٩٧٥و لە ساتو وەختی بەستنی کۆنگرەی ڕێکخراوی (ئۆپک) لە جەزایری پایتەخت سەدامو شای ئێرانی بە یەك گەیاندو ڕێککەوتنی جەزایەری لێکەوتەوە، کە دواتر لە کۆبوونەوەی ١٣ی حوزەیرانی ١٩٧٥ی نێوان هەردوو وەزیرانی دەرەوەی عێراقو ئێران وردەکاریەکانی ڕێککەوتننامەکەیان لە بەغدا مۆر کرد.

---

[٤٤] مەبەستی سەدام حسەین لەو وتە هەڕەشە ئامێزەی ئەوە بوو، تەنانەت ئەگەر بەشێك لەخاکی عێراقیش بدات بە ئێران بەرانبەر بەپشتکردنە بزووتنەوەی کوردو شۆڕشەکە بەلایەوە گرنگ نییە. و.ك

## یەکەم: دەقی ڕێککەوتننامەی جەزائیر

لە پێناوی جێگیرکردنی بنەماکانی پاراستنی خاك‌و سنوورو ڕێگرتن لە دەستوەردانە کارو باری ناوخۆ، هەردوو لایەنی عێراق‌و ئێران بڕیاریاندا لە سەر..

١ - ڕاییکردن‌و جێ بەجێکردنی نەخشەی سنووری زەمینی هەردوولا بەپێی پرۆتۆکۆڵی قوستەنتەنییەی ساڵی ١٩١٣و کۆنووسەکانی کۆمسیونی نەخشە کێشانەوەی سنوور لە ساڵی ١٩١٤.

٢ - نەخشە کێشانەوەی سنووری زەمینی بە گوێرەی هێڵی (تالوك) کە هێڵی سەرەکی ناوەڕاستی ئاوە لە بەرژەوەندی کەشتیەوانی دەریایی، لە هێڵی زەمینییەوە دەست پێدەکات بەرەو قووڵایی ناوەڕاستی شەتولعەرەب‌و بەرەو دەریا درێژ دەبێتەوە.

٣ - بەجێ بەجێبوونی ئەم مەبەستەو پابەند بوون‌و دانانی چاودێری توندوتۆڵ‌و کاریگەر، بە درێژایی سنووری هاوبەشی هەردوولا متمانەو ئاسایشی یەکجاری دەگەڕێتەوەو لە پێناوی بنبڕکردنی هەر جۆرە کارێکی تێکدەرانە لە هەر شوێنێکەوە بێت.

٤ - هەردوولا لەسەر ئەو خاڵانەی سەرەوە گەیشتنە ڕێککەوتن‌و وەك ڕەگەزێکی دانەبڕاو لە چارە سەرکردنی هەمەلایەنەو گشتگیر پەسەندکران..

لەگەڵ ئەوەشدا شکاندنی سنووری هەر بنەمایەك لە بنەماکان دژبە ڕێککەوتننامەی جەزایر دەوەستێت.. لەو ئاراستەیەوەو بەمەبەستی وەرگرتنی پارمەتی برایانە لە پێناوی جێ بەجێکردنی ئەم بڕیارە لە پەیوەندی بەردەوامدا دەبن، لەگەڵ سەرۆك هەواری بومەدیەن. جگە لەوە هەردوولایەنی عێراق‌و ئێران بە فەرمی پارێزگاریکردنی ئاسایشی ناوچەکەو دوور ڕاگرتنی لە هەر جۆرە دەستێوەردانێکی دەرەکی ڕادەگەیەنن.

## دووەم: پەیمانی سنووری عێراق و ئێرانی ساڵی ١٩٧٥

دەقی پەیماننامەی سنووری نێودەوڵەتی، ڕێز لە دراوسێیەتی نێوان عێراق‌و ئێران‌و هەر سێ پرۆتۆکۆڵی وابەستە کراوانی تایبەت بە ئاسایشی سنووری زەمینی‌و ئاوی دەگرێت، وەك لە ١٣ی حوزەیرانی ١٩٧٥ دا ئەو دەقە لە لایەن وەزیری دەرەوەی عێراق سەعدون حەممادی‌و وەزیری دەرەوەی ئێران عەباس عەلی خەلعەتبەری‌و وەزیری دەرەوەی جەزایر عەبدولعەزیز بوتە فلیقەوە بەم دەقەی خوارەوە مۆرکرا..

ویستی دڵسۆزانەی سەرۆك کۆماری عێراق‌و خاوەن شکۆ شاهنشای ئیمپراتۆری ئێران لە سەر ئەو هەڵوێستەبوو بە ڕێککەوتنی ئازاری ١٩٧٥ هەردوولا گەیشتنە چارەسەری کۆتایی‌و هەمیشەیی تەواوی کارە هەڵپەسێرراوەکانی نێوانیان.. تیایدا هەردوولا هەڵسان بەڕاپیکردن‌و جێ بەجێکردنی کارەکان‌و سەرلەنوێ دارشتنەوەی نەخشەی سنووری زەمینی، لە سەر رۆشنایی پرۆتۆکۆڵی قوستەنتەنییەی ساڵی ١٩١٣و تەواوی کۆنووسی دانیشتنەکانی کۆمیسیوونی رەنگڕ شتنەوەو نەخشە کێشانەوەی سنوور لە ساڵی ١٩١٤ لە سنووری ئاویدا، بە گوێرەی دیاریکردنی هێڵی تالوك کە شەتولعەرەب دەکاتە دووبەشەوە. لە روانگەی پەیوەندیە لەمێژینەکانی دراو سێیەتی‌و ئایینی‌و رۆشنبیری‌و ژیاریەکانی نێوانیان، هەردوو گەلانی عێراق‌و ئێران ئارەزوو مەندن لە سەر بەهێزکردن‌و بە تینکردنی پەیوەندی دۆستانەو قوڵتر کردنەوەی پەیوەندیەکان، لە بوارەکانی ئابووری‌و رۆشنبیری‌و گەیاندنیان بەبەرزترین پلەو کار کردن لەسەر بنەمای ئاشتی‌و ئاسایشی هەرێمایەتی‌و ڕێزگرتنی سنوورو دەست نەخستنەکاروباری ناوخۆ. لەسەر ویستی هەردوولا لەسەر هێنانەکایەو بەرپاکردنی سەردەمێکی نوێ لە پەیوەندی دۆستایەتی نێوان هەردوو وڵات‌و ڕێزگرتن لە سەروەری نیشتیمانی‌و یەکسانی هەردوو دەوڵەت لەسەروەری‌و بروابوونیان بەو شێوازە لە چەسپاندنی بنەماکان‌و بەجێگەیاندنی ئەو ئامانج‌و

مەبەستانەی لەبەڵگەنامەکانی نەتەوەیەکگرتووەکاندا داڕێژراون، بڕیار لەسەر بەستنی ئەم پەیماننامەیە دراو، دەسەڵات درایە نوێنەرانی دیاریکراوی هەردوولا بە بەئەنجام گەیاندنی.

سەرۆك کۆماری عێراق

بەڕێز سەعدون حەممادی وەزیری دەرەوەی عێراق

خاوەنشکۆ ئیمپراتۆری شاهنشای ئێران

بەڕێز عەباس عەلی خەلعەتبەری وەزیری دەرەوەی ئێران.

لەسەر ئەم بنەمایانەی خوارەوە پێکهاتن..

**بەندی یەکەم:**

هەردوولایەنی بەڕێزو مەزنو پەیمان بەستوو جەختیانکردەوە لەسەر سنووری نێودەڵەتی نێوان عێراقو ئێران، کە ئەو سنوورەیە لەسەر بنەڕەتو دەسەلاتی پرۆتۆکۆڵی سنووری زەمینیو پاشکۆکانی پرۆتۆکۆڵی ناوبراو هاوپێچی ئەم پەیماننامەیە نەخشە کێشراوەتەوە.

**بەندی دووەم:**

هەردوولایەنی بەڕێزو مەزنی پەیمانبەستوو جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە سنووری نێودەڵەتی لەشەتولعەرەب، ئەو سنوورەیە لەسەر بنەڕەتی ئەو دەسەلاتانەی پرۆتۆکۆڵی سنووری ئاویو پاشکۆکانی پرۆتۆکۆڵی ناوبراوی ئەم پەیماننامەیە دیاریکردوون.

**بەندی سێیەم:**

بەپشتبەستن بەو حوکمانەی لە پرۆتۆکۆڵی ئاسایشی سنووری وابەستەکراو بەم پەیماننامەیەوە هەردوولایەنی بەڕێزو مەزنی گرێبەستوو، بەڵێن دەدەن

بەدانانی چاودێری توندو کاریگەری بەردەوام لەسەر سنوور، بەمەبەستی ڕاگرتنی هەموو جۆرە ئاسانکاریو ڕێگرتنو بەربەستکردنی هەموو جۆرە شێوازێکی تێکدەرانە لەهەر شوێنیکەوە بێت.

بەندی چوارەم:

هەردوولایەنی بەرێزو مەزنی پەیمان بەستوو جەخت دەکەنەوە لەسەر چەسپاندنو جێگیرکردنی برگەو ناوەڕۆکی هەرسێ پرۆتۆکۆڵو پاشکۆکانی ئاماژەپێکراو لە بەندەکانی (١و ٢و ٣) وەك یەکەیەکی گشتگیرو لەیەك دانەبڕاو، بەهەر هۆیەکەوە بێت لە ڕێککەوتنەکە جیانابنەوەو بەزانیننیان پەسەند نییە، دەستێوەردانو گۆڕانکاری لە هەر برگەو بنەمایەکدا بە ئاشکرا دژ بە کرۆکی ڕێککەوتننامەی جەزایرە.

بەندی پێنجەم:

لە بازنەی پارێزگاریکردنی بەندو برگەکانی سنوورو ڕێزگرتنی وردی سەلامەتی هەرێمایەتی نیشتمانی هەردوو وڵات، هەردوولایەنی پێکهاتوو جەخت دەکەنەوە لەسەر هێشتنەوەی هێڵە سنووریەکانی زەمینیو ئاوی، وەك هێڵی هەمیشەییو جێگیر وەك لە ڕێککەوتنەکەدا هاتووە.

بەندی شەشەم:

١ – لە سەرو بەندی سەرهەڵدانی هەرجیاوازیەك سەبارەت بە لێکدانەوەی چۆنییەتی جێبەجێکردنی ئەم ڕێککەوتننامەیەو هەرسێ پرۆتۆکۆڵو پاشکۆکانیان لە چوارچێوەی ڕێزگرتنی وردی هێڵە سنووریەکانی دیاریکراو لە هەردوو بەندەکانی (١و ٢)ی سەرەوە چارەسەر دەکرێت، لەگەڵ تێبینی کردنی پارێزگاری لەسەر ئاسایشی سنووری عێراقو ئێرانْ بە پێی بەندی سێیەم.

٢ - هەنگاوی یەکەم هەردوولایەنی پێکهاتوو، لەڕێگەی گفتوگۆی ڕاستەو خۆی نێوانیانەوە لەماوەی دوو مانگ لەبەرواری پێشکەشکردنی داواکاری هەر لایەنەکیانەوە، ناکۆکیەکان چارەسەردەکەن.

٣ – لە حاڵەتی نەگەیشتنە چارەسەر، هەردوو لایەنی بەڕێزو مەزنی پەیمانبەستوو بەهۆی لایەنی سێیەمەوە لە ماوەی سێ مانگدا پەنا دەبرێتە بەر هەوڵی چاکەخوازی لە چارەسەرکردنی ناکۆکی نێوانیان.

٤ – لە حاڵەتی سەرنەگرتنی هەوڵی چاکەخوازی یان ڕەتکردنەوەی یەکێك لە لایەنەکان، لە ماوەی یەك مانگداو لە ڕێی ناوبژیوانەوە ناکۆکیەکان ڕێگای چارەسەر دەگرنەبەر.

٥ - لە بارودۆخی شکستی هەوڵی ناوبژیوانی نێوان هەردوو لایەنی پەیمانبەستوو، دوای بەرواری نەگەیشتنە ئەنجام، لایەنەکیان مافی ئەوەی هەیە لە ماوەی پانزە ڕۆژدا پەنا بباتە بەر دادگای ناوبژیوانی بە ئامادەبوونی نوێنەری هەردوولاو هەڵبژاردنی نوێنەری باڵا لە نێوانیاندا.. ئەگەر لە ماوەی سێ ڕۆژدا نوێنەریان دیاری نەکرد، یان نەگەیشتنە ڕێککەوتن، لایەنی داواکار بە پێی ڕێنماییەکانی دادگای ناوبژیوانی هەمیشەیی، داوا لە دادگای دادی نێودەوڵەتی دەکات بە دانانی دوو نوێنەر یان نوێنەرێکی باڵا.

٦ - دادگای ناوبژیوانی هەمیشەیی هەردوولایەنی بەڕێزی پەیمانبەستوو ناچار دەکات بە جێبەجێکردنی بڕیاری کۆتایی.

٧ - هەردوولایەنی بەڕێزو مەزنی پەیمانبەستوو پێکەوە بە هاوبەشی خەرجی دادگای ناوبژیوانی هەمیشەیی دەکێشن.

**بەندی حەوتەم:**

ئەم پەیمانە هەرسێ پرۆتۆکۆڵو پاشکۆکانیان بە گوێرەی بەندی ١٠٢ ی

پەیماننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان تۆمار دەکرێن.

**بەندی هەشتەم:**

هەردوو لایەنی پێکهاتووی پەیمانبەستوو، بەپێی یاسای ناوخۆ رەزامەندی دەدەن لەسەر ئەم پەیمانەو هەرسێ پرۆتۆکۆڵو پاشکۆکانیان... لەبەرواری ئاڵو گۆڕکردنی بەڵگەنامەکان لەتاران پاش مۆرکردنیان لەنێوان هەردوو نوێنەرانی دەسەڵات پێدراوی هەردوولایەنی گرێبەستووی ئەم پەیمانەو هەرسێ پرۆتۆکۆڵی وابەستەکراو، دەچنە مەودای جێ بەجێکردنەوە.

لە ١٣ ی حوزەیرانی ١٩٧٥ لە بەغدا نووسراوە

| | |
|---|---|
| عەباس عەلی خەلعەتبەری | سەعدون حەممادی |
| وەزیری دەرەوەی ئێران | وەزیری دەرەوەی عێراق |

ئەم پەیمانەو هەر سێ پرۆتۆکۆڵی وابەستەکراو بە ئامادەبوونی بەڕێز عەبدولعەزیز بووتە فلیقەی ئەمینداری ئەنجومەنی شۆڕشو وەزیری دەرەوەی جەزائیر گەیشتە مۆرکردن.

## پرۆتۆکۆڵی یەکەم: دیاریکردنی سنووری ئاوی

لەسەر بنەڕەتی بڕیاری راگەیەنراوی جەزائیر لە ٦ ی ئازاری ١٩٧٥ هەردوولایەنی پێکهاتوو بڕیاریاندا لەسەر:

**بەندی یەکەم:**

هەردوولایەنی پەیمانبەستوو دان بەوە دادەنێن دیاریکردنی سنووری ئاوی نێودەوڵەتی نێوان عێراقو ئێران بەم شێوەیەی لای خوارەوەو بە گوێرەی هێڵی

تالووك لەناوەڕاستی شەتولعەرەب رایدەگرێت..

١ - پرۆتۆكۆڵی تاران لە ١٧ ی ئازاری ١٩٧٥

٢ - راپۆرتی وەزیرانی دەرەوە لە ٢٠ ی نیسانی ١٩٧٥ لەبەغدا، لە دووتۆی مەسەلە پەیوەندیدارەكانی دیكەدا، بڕیار درا لە سەر راپۆرتی لیژنەی رووڵێنراو بە دیاریكردنی سنووری ئاوی مۆركراو لە ١٦ ی نیسانی ١٩٧٥ لەسەر پشتی كەشتی عێراقی (شۆڕش) لەناو رووباری شەتولعەرەب.

٣ - راستكردنەوەو لێكۆڵینەوە لە نەخشە ئاویە هاوبەشەكانو گواستنەوەو تێپەڕاندنی خاڵە جواگرافیە سنووریەكانی ساڵی ١٩٧٥و دیاریكردنیان لەسەر ئەو نەخشانەی پسپۆڕانی تایبەت بە زانستی ئاوو دەریاوانی لە لیژنەی هونەری تێكەڵاو مۆركردنیان بە مۆری سەرۆكانی شاندەكانی عێراقو ئێرانو جەزائیر لەو لیژنەیە، ئەو نەخشانەی لەسەرەوە دەستنیشانكراونو لەخوارەوە دەركەوتوون بەم پرۆتۆكۆڵەوە پەیوەستكراونو بوونەتە بەشێكی لێدانە بڕاوی.

**نەخشەی ژمارە (١):**

دەروازەی شەتولعەرەب/ ژمارە ٢٨٤٢ لەلایەن ئەدمیراڵیەتی بەریتانیاوە بلاّوكراوەتەوە.

**نەخشەی ژمارە (٢):**

لە بەندەاوی ئاوخۆوە بۆ خاڵی ناوجەرگەی ژمارە ٢٨٤٣ راگەیەنراوو بلاّوكراوەی ئەدمیراڵیەتی بەریتانی.

**نەخشەی ژمارە (٣):**

لەخاڵی ناوجەرگەوە تا عەبادان ژمارە ٢٨٤٤ راگەیەنراو ئەدمیراڵیەتی بەریتانیا.

**نەخشەی ژمارە (٤):**

لە عەبادانەوە بۆ دوورگەی (ام الطویلە)ی ژمارە ٢٨٤٥ راگەیەنراوی ئەدمیراڵیەتی بەریتانیا.

بەندی دووەم:

١- هێڵی سنووری شەتولعەرەب لە هێڵی زەمینی نێوان ئێران و عێراقەوە بۆ ناوەڕاستی شەتولعەرەب (هێڵی تالووك) دەستپێدەكات و بەرەو دەریا شۆڕدەبێتەوە.

٢ - هێڵی سنووری ناوبراوی ناسراو لەبڕگەی یەکەمی سەرەوە لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەدا گۆڕانکاری بەسەردادێت، کەبنەڕەتیان دەگەڕێتەوە بۆ هۆکارە سروشتیەکان و بەهیچ گۆڕانکاریەکی دیکە کارناکرێت، ئەگەر هەردوولایەنی پەیمانبەستوو نەگەیشتنە ڕێککەوتنێکی تایبەت لەو بارەوە.

٣ - بە بەشداری دەزگا هونەریە پسپۆڕەکانی هەردوولایەنی پەیمانبەستوو، لێکۆڵینەوە دەکرێت لەو گۆڕانکاریانەی لەبڕگەی دووەمی سەرەوەدا دیاریکراون.

٤ - لەحاڵەتی گواستنەوە، یان گۆڕانکاری لە ڕێڕەوی ئاوی شەتولعەرەب، یان گۆڕانکاری لەسەرچاوەکەیدا بەهۆی دیاردە سروشتیەکانەوە، لە حاڵەتێکدا کاربکاتە سەر خاوەنداریەتی نیشتمانی هەرێمایەتی هەردوو دەوڵەت و ماڵو موڵك و سامانی جێگیرو نەگوێزراوە لەخانوو بەرە، یان هەرشتێکی تر، هێڵی سنووری تالووك وەك لە بڕگەی (١)ی سەرەوەدا هاتووە وەك خۆی دەمێنێتەوە.

٥ - ئەگەر هەردوولایەنی پەیمانبەستوو نەگەیشتنە ڕێککەوتنی هاوبەش، هێڵی سنووری نوێ لە ڕێڕەوی ئاوی دەگیرێتە پێش و لەسەر خەرجی هەردوولا هێڵەکە دەگەڕێتەوە سەر ڕێڕەوی دیاریکراوی ساڵی ١٩٧٥ وەك لە هەرچوار نەخشە هاوبەشەکەدا ئاماژەی پێکراوەو لەبڕگەی (٢)ی بەندی یەکەمی سەرەوەدا هاتووە، ئەگەر هات و لایەنێك لەلایەنەکان لەماوەی دووساڵدا ئەوەی لەلایەنی بەرانبەر داواکرد.

٦ - ئاڵو گۆڕکردنی زانیاری لە نێوان هەردوولایەنی دەسەڵات پێدراوی

هەردوو دەوڵەت سەبارەت بەمسەو گەرکردنی ئاسانترین ڕێگای پاراستنی ستوونە سنووریەکان (الدعائم الحدودیە).

٧ - هەردوولایەنی پەیمانبەستوو بەڵێن دەدەن بەجێ بەجێکردنو رایکردنی هەمووکارێکی پێویست، لەپێناوی مسەوگەرکردنی پارێزگاریکردن لەستوونەسنوورەیەکانو دادگاییکردنی کەسانێك گۆڕانکاری تیایاندا دەکاتو لە ڕێو شوێنی دیاریکراوی خۆیان لایاندەدات.

هەردوو لایەنی پەیمانبەستوو ڕێککەوتن لەسەر حوکمەکانی ئەم پرۆتۆکۆڵەو بێ پەروا مۆرکرا، لەمەبە دواوە هەرکێشەیەکی سنووری لەنێوان عێراقو ئێراندا ڕێك دەخرێت.

لە ١٣/حوزەیرانی/١٩٧٥ لەبەغدا نووسرا

| | |
|---|---|
| عەباس عەلی خەلعەتبەری | سەعدون حەممادی |
| وەزیری دەرەوەی ئێران | وەزیری دەرەوەی عێراق |

عەبدولعەزیز بوتەفلیقە

ئەندامی ئەنجومەنی شۆڕشو وەزیری دەرەوە جەزائیر

## پرۆتۆکۆڵی دووەم: پەیوەندیدار بەئاسایشی سنووری عێراقو ئێران

لەبەر ڕۆشنایی بڕیارەکانی ڕێککەوتنی جەزایەری ٦ ی ئازاری ١٩٧٥و لەگەڵ لەبەر چاوگرتنی گێڕانەوەی بڕوا بۆ سروشتی جاران و پارێزگاریکردنی ئاسایشی سنووری عێراقو ئێران سوور بوونی هەردوولا لەسەر چاودێری بەردەوامو توندو تۆڵی، وە لەپێناوی ڕێگرتن لە هەموو ڕووداوو سنوور بەزاندنی شێوازەتێکدەرانەو کردەوەی سەرپێچیو یاخیبوون، ئاماژە بە پرۆتۆکۆڵی تاران

لە بەرواری ١٥ی ئازاری ١٩٧٥و راپۆرتی کۆبوونەوەی مۆرکراوی وەزیرانی دەرەوە لە ٢٠ ی نیسانی ١٩٧٥ی بەغداو راپۆرتی ٢ ی ئازاری ١٩٧٥ ی مۆرکراوی وەزیرانی دەرەوە لە جەزائیر، هەردوو لایەنی پەیمانبەستوو رێککەوتن لەسەر ئەم بڕیارانە..

## بەندی یەکەم

١ - ئاڵو گۆڕکردنی زانیاری لە نێوان هەردوو لایەنی پەیمان بەستوو، سەبارەت بەجموجووڵی ئەو رەگەزە ئاژاوە گێڕانەی بەنیازی کردەوەی تێکدەرانەو سەرپێچیو یاخیبوون دەیانەوێت دزە بکەنە ناوخاکی یەکێك لەو دوو وڵاتە..

٢ - گرتنەبەری جێیو رێی گونجاو بەرانبەر جموجووڵی ئەو رەگەزانەی لە برگەی (١) دا ئاماژەی پێکراوە، هەروەك لەسەری رێککەوتوون، هەرچی زووتر هەرلایەنێك ئەوی تر ئاگاداربکاتەوە، لەگەڵ دیاریکردنی ناسنامەو ناساندنی ئەو کەسانەو رێگریکردنیان لە ئەنجامدانی هەر کردەوەیەکی تێکدەرانەو لەگەڵ جێ بەجێکردنی کاری پێویست دژ بە کەسانێك بە نیازی ئەنجامدانی تاوان لە ناوخۆی هەرێمی یەکێك لەو دوو دەوڵەتەدا دژ بە هەرێمەکەی تر کۆدەبێتەوە.

## بەندی دووەم

هاوکاری هەمەجۆر لە نێوان هەردوولایەنی دەسەڵات پێدراو سەبارەت بە داخستنی سنوور بە مەبەستی رێگرتن لە دزەکردنی رەگەزە تێکدەرەکان، لەگەڵ پابەندبوونی دەسەڵاتدارانی سنوورو بەرزترین ئاستی وەزارەتی بەرگری وەزارەتی دەرەوەو وەزارەتی ناوخۆی هەردوو وڵات.

## بەندی سێیەم

کەلێنو کەلەبەرەکانی دزەکردنی ڕەگەزتێکدەرو یاخیبووەکان بەم شێوەیەی خوارەوە دەستنیشان کراون..

١ - ناوچەی سنووری باکوور – لە خاڵی دووڕیانی سنووری عێراق – ئێرانەوە تا خانەقینو قەسر شیرین – لە ناوخۆی (٢١)خاڵدا.

٢ - ناوچەی سنووری باشوور لە خانەقینو قەسرشرین – دەرەوە تا کۆتایی سنووری عێراقو ئێران (١٧) خاڵ.

٣ - خاڵە دیاریکراوەکانی دزەکردنی سەرەوە لە پاشکۆدا دیاریکراون.

٤ - هەرخاڵێکی دیکەی دیاریکراوی دزەکردن دەکەوێتە ریزی ئەو خاڵانەوەو دواتر دەردەکەوێتو پێی دەزانرێت، هەردوولا پابەند دەبن بە داخستنو چاودێریکردنی.

٥ - تەواوی خاڵەکانی ڕێڕەوە سنووریەکان جگە لەو خاڵانە کەوتوونەتە ژێر چاودێری لێپرسراوانی گومرگەوە، قەدەغەکراون لە تێپەڕبوون.

٦ - لە چوارچێوەی پەرەپێدانی پەیوەندیە هەمەلایەنەکاندا، هەردوو وڵاتی دراوسێ بە پێی ڕێککەوتنی نێوانیان ڕێڕەوی دیکەی گومرگی دادەمەزرێت.

## بەندی چوارەم

١ - هەردوولایەنی پەیمانبەستوو بەڵێن دەدەن بەدانانو دیاریکردنی هۆکارە مرۆیـیو مادیە پێویستەکان، بەمەبەستی زامنکردنی داخستنی سنوورو چاودێریکردنی بەشێوەیەکی کاریگەر، کەڕێگربێت لە پێش دزەکردنی هەموو ڕەگەزێکی تێکدارانە لەخاڵەدیاریکراوەکان، وەك لە بەندی سێیەمدا ڕوونیکردوەتەوە.

٢ - بەهۆی شارەزابوونی پسپۆڕان لەو مەسەلانەدا، دەبێ لە حاڵەتی درووستبوونی ناکۆکی لە نێوانی لێپرسراوانی سنوورەکاندا، سەرۆکانی

ئیدارە پەیوەندیدارەکان لە بەغدا یان لە تاران لە پێناوی نزیکبوونەوەو یەکخستنی دیدو بۆچوونەکانیان کۆببنەوەو دەرەنجامی کۆبوونەوەکانیان لە راپۆرتی خۆیاندا تۆمار بکەن.

## بەندی پێنجەم

١ - کەسانی تێکدەرو گێرەشێوێنی دەستگیرکراو لە هەر هەرێمێك، دەدرێنەوە بە دەسەڵاتدارانی تایبەتی لە لایەنی بەرانبەرو بە پێی یاسای دیاریکراو سزادەدرێن[٤٥].

٢ - هەردوولایەنی پەیمانبەستوو وەك لە برگەی (١)دا هاتووە، سزاکان دیاریدەکەن و یەکتر لە جێبەجێکردنیان ئاگادار دەکەن.

٣ – بە گورجی و بێ داوکەوتن ئاگادارکردنی لێپرسراوانی بەرانبەر لە کەسانی هەڵاتووی سنوور بەزێن و ئەنجامدانی کاری پێویست و هەماهەنگیکردن لە دەستگیرکردنیان.

## بەندی شەشەم

لە پێناوی رێگریکردن لە کەسانی تێکدەرو یاخیبوو لە بەجێهێنانی نیازەکانیان، بە پێی بڕیاری هەردوولایەنی پەیمانبەستوو ناوچە قەدەغەکراوەکان دیاریدەکرێن.

## بەندی حەوتەم

پێکهێنانی لیژنەیەکی هاوبەش لە سەرۆك و لێپرسراوانی ئیدارە

---

[٤٥] یەکەم قوربانی ئەم بەندە هەرسێ شەهیدان ((جەعفەر عەبدولواحد و ئەنوەرزوراب وشێخ شەهاب بوون کەرژێمی شا دەستگیری کردن و دانییەوە دەستی رژێمی بەعس و لەسێدارەدران. و.ك

سنووریەکان و نوێنەرانی وەزارەتەکانی دەرەوەی هەردوولا، بە مەبەستی زیاتر پەرەپێدان و چڕکردنەوەی هاوکاری بەسود، کە پێویستە لیژنەکە ساڵانە لە سەرەتاو ناوەڕاستی ساڵدا دوو کۆبوونەوە گرێبدەن. لە هەمان کاتداو بە مەبەستی لێکۆڵینەوە لەسەر بەکارهێنانی گونجاوترین هۆکارە (مادی و معنوی)ویەکان، لەسەر داخوازی یەکێك لە لایەنەکان کۆبوونەوەی نائاسایی بە داخستنی سنووروچاودێری توندو، کارایی لە جێبەجێکردنی دەسەڵاتە بنەڕەتیەکانی هاوکاری و دیاریکراوی ئەم پرۆتۆکۆڵە دەبەسرێت.

## بەندی هەشتەم

بڕیارەکانی پرۆتۆکۆڵە پەیوەندیدارەکان بەچاودێریکردنی سنوور، ڕێگرنابێت لە پێش ڕێککەوتنە تایبەتەکانی نێوان عێراق و ئێران، سەبارەت بە مافەکانی لەوەڕگاکان و کارەکانی کۆمسیۆنی سنوور.

## بەندی نۆیەم

بە مەبەستی دابینکردنی ئارامی و ئاسایشی سنووری هاوبەش لە شەتولعەرەب و بەربەستکردنی ڕێگا لە پێش ڕەگەزە گێرەشێوێن و تێکدەرەکانی هەردوولا لە دزەکردن، لێپرسراوانی هەردوولا هەڵدەسن بەجێبەجێکردنی کاری پێویست لەسەر دامەزراندنی چەندین ناوەندی چاودێری و بە هێزکردن و پشتیوانیکردنیان بە پاسەوانانی دەریایی و کەشتیە دەریاییەکان.

| | |
|---|---|
| عەباس عەلی خەلعەتبەری | سەعدون حەممادی |
| وەزیری دەرەوەی ئێران | وەزیری دەرەوەی عێراق |

بە ئامادەبوونی بەڕێز عەبدولعەزیز بوتەفلیقە ئەندامی ئەنجومەنی شۆڕش و وەزیری دەرەوەی جەزائیر

## دەرهاوێشتەكانی ڕێككەوتنی جەزائیر

### ١ - سەبارەت بە دەوڵەتی عێراق:

دەست هەڵگرتن و وازهێنان لەسەرومری نیوەی شەتولعەرەب و چەند شوێنێكی خاكی عێراق لە بەرژەوەندی ئێران، بەمەش ئەو داخوازییە دێرینەی شای ئێران هاتەدی، كە لە رابردوودا هەموو حكومەتە پێشووەكانی عێراق رەتیان دكردەوە. دیارە ئەم مەسەلەیە تۆوێك بوو رووداوەكانی ساڵانی داهاتووی لێكەوتەوەو بوونە هۆكاری هەڵگیرسانی شەڕی نێوان عێراق و ئێران، وەك دواتر دێینە باسكردنی.

### ٢ - سەبارەت بەكوردو بزووتنەوەكەی:

ڕێككەوتنەكە شوێنەوارێكی رووخێنەرو وێرانكەری لێكەوتەوە، راستەوخۆ لەگەڵ گەڕانەوەی لەجەزایرو گەیشتنەوەی بەتاران شای ئێران فەرمانیدا بەسەرۆكی ئەركانی سوپابەكشاندنەوەی تەواوی دام و دەزگاو كەرەسە سەربازییەكان لە بزووتنەوەی كوردو گێڕانەوەیان بۆ ناوخاكی ئێران، كەزوو بەزوو فەرمانەكە جێ بەجێكرا. سەبارەت بەو بارودۆخە رۆژی ١١ ی ئازاری ١٩٧٥ شا پێشوازی كرد لە مەلا مستەفا بارزانی و پێی وت: (من ناچاربووم بەمۆركردنی ئەو ڕێككەوتنە، ئەگەر نەمكردایە لەگەڵ بەعسیە عێراقیەكان تووشی شەڕێكی سەخت دەبووم، ئەوكاتە سۆڤیەت بەتەواوی قورساییەوە بەشدار دەبوو، لەبارێكی ترەوە بەتەواوی ئەم ڕێككەوتنە لەبەرژەوەندی ئێران بوو، هەروەك دیتان چۆن ڕێككەوتنی ١١ ی ئازاری ١٩٧٠ لە بەرژەوەندی ئێوەدا بوو). لەدرێژەی قسەكانیدا شا وتی: (تاكۆتایی مانگی ئازار ماوەتان پێدراوەو سنوور لە پێشتاندا كراوەیە، هەركەسێك بیەوێت بێتە ئێران و تیایدا بمێنێتەوە سەربەستە، بەكۆتاییهاتنی ئەو ماوەیە سنووردادەخرێت). لە ئاستی ئەم رووداوەدا بە جۆرێك چەواشەبوون و

شڵەژاوی ڕوویکردبوویە کوردەکان نەیاندەزانی چۆن هەڵس و کەوت بکەن و ڕوولەکوێ بنێن.. ئایا بەردەوامبن لەسەر شۆڕش؟ یان بزووتنەوەکەیان هەڵوەشێنن و دەستبدەنە شەڕی پارێزانی و پەنابردنە بەرشاخ و چیاکان؟ یان تائەم ئاستە ئەوندەیان بەسەکێشەکەیان گەیشتوەتە ئاستی نێودەوڵەتی؟ لەم بارەوە بارزانی دەڵێت: (پیربووم و تەمەن یارمەتیم نادات لەسەر شەڕی پارێزانی و گورجوگۆڵی و جموجوڵی شاخەوشاخکردن لەشەوو ڕۆژەکاندا بەوهۆیەوە دەبینم درێژەدان بەشۆڕش لەبەرژەوەندیمان نابیت، زیانێکی ئەوتۆی تیادا بەدی ناکەم ئەگەر ماوەیەك خەباتمان ڕاگرین، دەبێ هەلێکی دیکە بۆگەلی کورد بڕەخسێت و درێژە بەخەباتی بدات، ئەگەر کەسێك توانای سەرکردایەتی پارتی و ڕابەرایەتیکردنی شەڕی پارێزانی ببێت ئامادەم دەستی هەموو یارمەتی و هاوکاریەکی بۆ درێژ بکەم). دواتر وەك دەرکەوت ڕاگرتنی یارمەتیدانی بزووتنەوەی کورد لەلایەن شای ئێرانەوە کۆتایی مەسەلەکە نەبوو، بەڵکوو لەوەیش مەترسیدارتربوو. لەو بارەوە نوێنەری فەلەستین لەتاران هانی ئەلحەسەن دەڵێت: (ئاگاداربوونم لەسەر بەڵگەنامە نهێنییەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئێران، دڵنیابووم ئەو پیلانەی دژبە ئێوە ڕێکخرابوو ترسناکترین کاریگەری هەبوو بۆسەر چارەنووسی گەلەکەتان). هەروەك ئاشکرابوو شای ئێران ڕازیبوو لەحاڵەتی بەردەوامبوونی شۆڕش، یەکە سەربازیەکانی سوپای عێراق لە باکوورەوە بچنە ناوخاکی ئێران و بەهاوکاری سوپاکەی لە پشتەوە گەمارۆی شۆڕشگێڕان بدەن و هێرشی بەربڵاو بکەنە سەریان، لەو مەسەلەیەدا شای ئێران بەنامەیەکەوە جەنەڕاڵ عەبدولعەلی مەنسوری سەرۆکی ساواکی ڕاسپاردەلای (مەلا مستەفا بارزانی) وەك تیایدا هاتووە.. (لەدیداری جەزایر بەڵێن دراوە بەعێراق ڕێگەی شەڕو کوشتار لە کورد بگرێت.. بەو هۆیەوە لەبە دواداچوون و دژایەتیکردنیان و لە جێ بەجێکردنی ڕێککەوتنەکە

لەپێش هێزەسەربازیە عێراقیەکاندا سنووری ئێران کراوەیە[٤٦]. جگە لەو بارودۆخە ناهەموارو دژوارەی رووبەرووی کوردو بزووتنەوەکەی بووبوویەوە، هەموانیش پشتیان لێکردو لێی دوور پەرێز وەستان.

- جگە لە وازهێنانو کشانەوە لە پارمەتیدانی شۆرشو بزووتنەوەی کوردو پشتلێکردنی، ئێران ئامادەیش بوو بەیەکجاری بیتوێنیتەوەو شوێنەواریشی بسڕێتەوە.

- لەگەڵ پشتلێکردنیدا، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئامادەنەبوو تەنانەت وەلامی پرسیارەکانی بزووتنەوەکە بداتەوە.

- یەکێتی سۆڤیەت بەو بارودۆخە ناهەموارەی کورد تەواو ئاسوودەو خۆشحاڵبوو، بەزمانی حاڵ بەئاشکرا دەیگوت، ئەوەیە دەرەنجامی هاوکاریتان لەگەڵ رۆژئاواو بڕوا کردنتان بە بەڵێنەکانیان.

- تەنانەت ئەو ئیسرائیلەی دژبە حکومەتی عێراقو لاوازکردنی تواناکانی بوو لە هەموان زیاتر یارمەتیدەری بزووتنەوەی کورد بوو، بەهۆی پەیوەندی بەتینییەوە لەگەڵ شای ئێران، بەیەکجاری هەڵوێستی گۆڕا. سەبارەت بەوە مەسعود بارزانی دەڵێت: (پێشتر ئیسرائیل ئەو بەڵێنەی دابوو ئەگەر ئێرانیش سنووری بەرووی شۆڕشدا دابخات، ئەو یارمەتیدانی بەردەوام دەبێتو لەڕێی ئاسمانییەوە پێداویستیەکانی بۆ دادەبەزێنێ بۆ ئەم مەبەستە دەشتاییەکانی (قسرتو هێرت) دەستنیشانکران. لەدرێژەی وتەکانیدا مەسعود بارزانی لە ئاستی هەڵوێستی نوێی ئیسرائیلی دوای بارودۆخی نسکۆ دەڵێت: (ئیسرائیل رایگەیاند دژواری بارودۆخی ستراتیژی رێگرە لە جێ بەجێکردنی بەڵێنەکانی لە ئاستی شۆڕشی کورد).

لێرەدا مەلا مستەفا بارزانی لەبەرگریکردنو رووبەڕوو بوونەوەی هەردوو سوپای هاوچەرخی ئێرانو عێراق بێ هیوا بوو، لەوە گەیشت لە سێبەری

---

[٤٦] ڕەوتە سیاسیەکان لە کوردستانی عێراق/د/ سەلاح ئەلخرسان.

بێدەنگیو چاو داخستنی کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا بزووتنەوەکە دەخەنە ناو بازنەیەکی تەسکەوە.. ئەوەبوو شەوی ۱۹۷۵/۳/۲۰ کۆتاییهێنان بە شۆڕشو کشانەوە بۆ خاکی ئێران ڕاگەیەنراو (مەلا مستەفا) لەگەڵ مەسعودو ئیدریس بەرەو تاران ناوچەکەیان بەجێ هێشتو دواتر بەرەو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو مانەوەی تاکۆچکردنو لەدنیا دەرچوونی لەخەستەخانەی هێزی دەریایی لەیەکەم ڕۆژی مانگی ئازاری ۱۹۷۹ دا. **بەم شێوەیە لاپەڕەیەك لەلاپەڕەکانی خەباتی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە عێراق دادرایەوە.**

لە خەیاڵو ئەندێشەکانی خۆیدا، حکومەتی عێراق گومانی بەوە بردبوو، لەڕێی ڕێککەوتنی جەزایرو ملکەچکردنی بۆ ویستو داخوازیە دێرینەکانی شای ئێرانو دەستهەڵگرتنی لە سنووری ئاویو ناوچە زەمینییەکانو دووبەشکردنی سەروەری بەسەر شەتولعەرەب، کە پێشتر بە تەواوی لە بازنەی سەروەری خۆیدا بوو، لەگەڵ پەیڕەوکردنی سیاسەتی خاکی سووتاو (سیاسە الأرض المحروقە)و دانانی پشتێنەی دابڕاندنو دیاریکردنی خاکی قەدەغەکراوو ڕاگواستنەوەی هاوڵاتیانی کوردو کۆکردنەوەو نیشتەجێکردنیان لەکۆمەڵگا زۆرە ملیەکانو دامەزراندنی دامو دەزگا کارتۆنییەکانی ئۆتۆنۆمی، بەیەکجاریو بۆ هەتاهەتایی بزووتنەوەی کوردی لەناو بردووە. دیارە ئەو ئامانجە نەك هەرنەهاتەدی، بەڵکوو ڕاییکردنو جێ بەجێکردنی ئەو هەموو کارانە نەبوونە هۆی سەر هەڵدانی بچووکترین ناکۆکیش لە کوردستاندا. ئەستەمی یەکەم ئەم قەقنەسە باڵدارەبوو لەژێر تیشکی گەرمی سووتێنەری خۆرەتاودا دەژیو دەسوتێتو سەرلەنوێ بێچووەکانی لە خۆڵەمێشەکەیدا سەردەردێنێتەوە.. ئەمەیش تا ئاستێك ئەستەم نەبوو.. بەڵام ئەو ئەستەمەی لە کوردستان بەدیهاتو بە دامەزراندنی (ی. ن. ك)و گەڕانەوەی بە پەلەی (پ. د. ك) بۆ گۆڕەپانی خەباتو بەرپاکردنەوەی شۆڕش، لەژێر ناوی سەرکردایەتی کاتیدا کارکردنیان لە ناوچەکەدا، سەرلەنوێو جارێکی تر بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بەخۆیدا هاتەوەو جارێکی تر بەرووی دوژمنانیدا ڕاپەڕیەوە، ئەمەکارێکی ئەستەم نەبوو، بەڵام ئەوەی لە

کوردستان هاتەدی، راپەڕینەوەی بزووتنەوەی کوردو هەلگیرسانەوەی بڵێسەی ئاگری شۆڕش بوو، کە ئەمجارەیان لەسایەیدا پارتو ڕێکخراوە کوردەکانی دیکەیش لە خەباتی سیاسیو چەکداریدا شوێن پێی هەردوولایەنی سەرەکیان هەلگرت. هەرچەند لەو سەردەمەدا شۆڕشەکە کەمێك سنووردارو تاڕاستێك بەرتەسك دەبینرا، ئەوەی کاریگەری هەبوو، دەستپێکردنەوەو بەگژداچوونەوەی چەوساندنەوەو خەفەکردنی گیانی نیشتمانپەروەری بوو، کە ڕژێمی بەعس لە هەوڵی رەگەز پەرستانەیدا، راستی بەرپابوونەوەی شۆڕشەکەو سڕینەوەو سەرکوتکردنی بەلاوەگرنگ بوو، کەوەك کێشەی گەلو نەتەوەیەك ناسراوەو بەمەترسی دەزانێت بۆسەر دوارۆژی دەسەلاتەکەی.

## دامەزراندنی (ی. ن. ك)

پێشتر سەبارەت بەدووبەرەکیو دووکەرتبوونی بزووتنەوەی کوردو دوا ناکۆکی نێوان (م.س)و (بارزانی)و بارزانییەکان وەستاین[47]- سەردەمێکی دوورودرێژ پەیوەندیەکانی هەردوولا لە نێوانی دۆستایەتیو ململانێدا دەگوزەرا.

لەگەڵ بەدوایەکداهاتنی رووداوەکانو پاش مۆرکردنی رێککەوتننامەی جەزایر، جەلال تالەبانی وەك بالۆێزێکی گەڕۆك لە دەرەوەی ولات چالاکیە دیپلۆماسیەکانی بزووتنەوەی کوردی گرتە ئەستۆی، لەوسەردەمەدا نامەیەکی ئاراستەی مەلا مستەفا بارزانی کرد، تیایدا دەڵێت: (توانای بەرگریکردنمان هەیە،

---

[47] وادیارە نووسەر کەمێك لە تێنەگەیشتنی پێوەدیاربێت، لەڕاستیدا ناکۆکی لە نێوان ((م.س و بارزانییەکاندا نەبوو، ناکۆکی و دابڕانی تاقمێك لە ئەندامانی (م.س) بوو لەسەرکردایەتی بارزانی و ناوی بالّی م.س ی بڕی بەسەرخۆیدا، بەلاّم پ. د. ك وەك زۆرینەی سەرکردایەتی و هێزەکانی ل. ش.ك لەگەڵ بڕوابوونیان بەڕابەرایەتی بارزانی نەمر وەك خۆیان مابوونەوەو لەجاران زیاتر گۆڕو تینداربوون لە خەباتی سیاسی و پێشمەرگایەتیدا. و.ك

سوریاو لیبیاو فەلەستینو تەواوی جیهان هاوکاریمان دەکەن، ئەگەر ئێوە بۆماوەی شەش مانگ خۆڕاگربنو بەرگری بکەن، ئێمە وەك پشتیوانێك دەگەڕیینەوە لاتان). لەگەڵ تێگەیشتنی تەواوی لەبارودۆخەکە مەلا مستەفا بارزانی بەمجۆرە وەڵامی نامەکەی دایەوەو هەڵگرەکەی راسپارد بەگەیاندنیو دەڵێت: (لەکوێوە هاتویت لەو شوێنەوە بگەڕێرەوە، جەلال تاڵەبانی چۆن دەیەوێت بەردەوامبین لە شۆڕشو بەرپاکردنەوەی.. ئەگەر من ئەو توانایەم نەمابێت ئەو چۆن دەتوانێت ئەو ئەرکە لە ئەستۆبگرێت)[٤٨]. دوابەدوای ئەو مەسەلەیە جەلال تاڵەبانی بڕیاریدا ئەرکی سەرلەنوێ بەرپاکردنەوەی شۆڕش بگرێتە دەست، بۆ ئەو مەبەستە سەردانی چەند وڵاتێکی عەرەبی کردو پەیوەندی چڕو بەردوامی کرد بە ژمارەیەك کەسایەتیو سەرکردە کوردەکانەوە. وەك تێبینی دەکرێت ئەو وەختە حکومەتی عێراق جگە لە مەلا مستەفاو هەردوو کوڕەکەی مەسعودو ئیدریس، بڕیاری لێبوردنی گشتی بۆ تەواوی بەشداربوانی شۆڕشی کورد لە کوردستان راگەیاندبوو. ئیتر لەوە بەدوا (ی. ن. ك)دامەزراو لە رۆژی ١٩٧٥/٥/٢٢ لە چایخانەیەکی دیمەشقی پایتەختی سوریا کۆبوونەوەی دامەزراندنی گرێدرا. لەسەرەتای دامەزراندنی یەکێتی یەوە لایەنو کۆمەڵە نیشتمانییە بەرهەڵستکارەکانی رژێمی عێراقەوە بەگەرمی پێشوازیو پشتیوانی لێکراو لە دەستپێشخەریەکدا کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانی مارکسی لینینی، یەکگرتنی خۆی بەو رێکخستنە نوێیەوە راگەیاندو بوویە بڕبڕەی پشتی، بەمەبەستی زیاتر پێشخستنی یەکێتی جەلال تاڵەبانیو چەند سەرکردەیەکی دیکە، کەوتنە بیرکردنەوە لە چۆنییەتی جێ بەجێکردنی تیۆرەکانی بیرمەندانی جیهانی سەربەڕێبازی مارکسیو سەپاندنیان بەسەرکۆمەڵگای کوردواریدا لە کوردستانی عێراق. لەئاستی پراکتیزەکردنی ئەو تیۆرانەدا ئەزموونی وڵاتی چین لە ئەزموونی سۆڤیەت گونجاوترو لەبارتر دەزانرا، کەتیایدا بڕوا خرابوویە

[٤٨] سەرچاوەی پێشوو – سەلاح ئەلخرسان.

سەرچینێکی کرێکاری یەکگرتوو، لەکاتێکدا کۆمەڵگای کوردی بەسروشت جووتیاریەو لەوەدا لەگەڵ کۆمەڵگای چینی یەکدەگرێتەوە.

لەو دیدگایەوە جەلال تاڵەبانی یەکەم کۆڵەکەی بنەڕەتی مارکسی لەناو بزووتنەوەی کوردا پێکهێناو گۆڤارێکی بەناوی رزگاری دەرکردو بەرنامەیەکی رۆشنبیری رێکخست بۆ کەسانێك بیانەوێت پەیوەندی پێوەبکەن، مادەکانی بریتی بوون لە وانەبێژی‌و خوێندنی نامیلکە مارکسیەکان‌و لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی چین‌و توێژەکانی کۆمەڵگای چین‌و چی بکەین- ی لینین‌و بەیاننامەی (مانیفێست)ی کۆمۆنیست‌و نووسینەکانی ماوتسی تۆنگ‌و مێژووی پارتە کۆمۆنیستەکان لە جیهانداو یادداشتەکانی کیم ئیل سۆنگ‌و چەندین نامیلکەی دیکە. لەگەڵ بانگەوازی دامەزراندنی (ی. ن. ك)و هەڵبژاردنی جەلال تاڵەبانی بەسکرتێری گشتی‌و هەستانی بەگەشت‌و سەردانی ولاّتانی عەرەبی‌و ئەوروپایی، بەمەبەستی ناساندنی مەسەلەی کوردو رێکخستنی چەندین دیدار لەگەڵ لێپرسراوانی ئەو ولاّتانەو کەسایەتیە کاریگەرەکانیان. بەهۆی نزیکی بەخاکی کوردستانی عێراقەوە ی. ن. ك سوریای کردە پەناگاو بنکەی سەرکردایەتی‌و خاڵی دەرچوونی بەرەو راپەڕاندنی ئەرکەکان لەخاکی کوردستان‌و بەڕێوەبردنی کارەکانی بزووتنەوەو ئاراستەکردنی هێزەکانی بەئەنجامدانی چالاکیەکانیان. لە پێناوی بە ئاشتی چارەسەرکردنی کێشەی کورد، دەستەی دامەزرێنەری (ی. ن. ك) رویاننا لە جۆرج حەبەش –ی ئەمینداری گشتی بەرەی میللی رزگاریخوازی فەلەستین بە هەڵسانی رۆڵی ناوبژیوان لە نێوان یەکێتی‌و حکومەتی بەغدا. لە وەلاّمدانەوەی ئەو هەوڵەدا سەدام حسەین دەڵێت: (ی. ن. ك) توانای ناردنی دە چەکداری بۆ شاخەکانی نییە)[٤٩]. بە مەبەستی زیاتر ناشنابوون بە شۆڕشی کوردو ناساندنی سەرکردایەتیەکەی‌و دیاریکردنی وەك بەشێکی کاریگەری شۆڕشی گەلی عێراق، دژ بە رژێمی بەغدا، ی. ن. ك

---

[٤٩] سەرچاوەی پێشوو.

لەگەڵ بەرەی نیشتمانی عێراق گەیشتنە ڕێککەوتن و ئەنجامدانی کردەوەکان. لەسەر گۆڕەپانەکە. لەسەر بنەمای ڕێککەوتنەکە یەکێتی چەندین دەستەی چەکداری بچووکی بە تەواوی چەك و جبەخانەی جەنگی و پێداویستەکانیانەوە ڕەوانەی ناوچە دیاریکراوەکان کرد، هەمانکات شەپۆلەکانی ئێزگەی رادیۆیی کەوتنە پەخشی بەرنامەکان. بە تێپەڕاندنی سنووری تورکیا، یەکەم دەستەی چەکداری کورد لە حوزەیرانی ۱۹۷٦ لە شاری قامیشلی سوریاوە بەرەو خاکی کوردستانی عێراق پەڕینەوەو گەیشتنە نزیکی زاخۆ[٥٠]. لەگەڵ گەیشتنی ئەو دەستەیە بە خاکی کوردستان، هێزە ناوخۆیی و ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەران کەوتنە جموجووڵ و چالاکی شۆڕشگێڕی، لەو ئاستەدا یەکێتی بانگەوازی خەباتی چەکداری راگەیاند. لەسەرو بەندی پەرەسەندنی کردەوە شۆڕشگێڕییەکانی دژبە ڕژێمی بەعس، لە شاری بەغدا ڕێکخراوی (تۆڵەی خوێنی شەهیدان) بە هەماهەنگی ڕێکخراوی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان (ی. ن. ك) دامەزراو لقێکی تایبەت بە ئەنجامدانی کردەوەکانی تۆڵە لە ژێر ناوی ڕێکخراوی (هەڵۆی سوور)[٥١]ی لە بەغدا لێکەوتەوەو دژبە تاوانەکانی دژ بە گەل دەستیدایە کوشتنی ژمارەیەك لە تاوانباران و بڵاوکردنەوەی بەیاننامەکانی لەو بارەوە. لەگەڵ بەسەرچوونی کات و لە چوارچێوەی بەرەیەکدا یەکێتی لەگەڵ هەردووباڵی – (کۆمەڵەی مارکسی لینینی)و (بزووتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان) یەکی گرتەوە، بەڵام جیاوازی تێگەیشتنی سیاسی و ئایدیۆلۆژی هۆکارێك بوو لە سەرهەڵدانی ناکۆکی و دژایەتی لە نێوان هەردوو باڵی کۆمەڵەو بزووتنەوەی سۆشیالیستی، کە لەو هەل و مەرجەدا سروشتی ئایینی و کلتووری

---

[٥٠] بەرپرسی ئەو یەکەم دەستەچەکدارە ئیبراهیم عەزۆ بوو. و.ك

[٥١] بەرپرسی ڕێکخراوی هەڵۆی سوور مولازم (جوامێر)بوو. کەپاشان لەرێی خەیانەتکارێکەوە ڕژێمی بەعسی دەستگیری کردو لەسێدارەی دا. و.ك

عەشایەری لە کۆمەڵگای کوردەواریدا ترسناکترین مەسەلەیەك بوو رووبەرووی یەکێتی دەبوویەوە، لەکاتێکدا دەبینرا باڵی کۆمەڵەی رەنجدەرانی مارکسی لینینی لە رووی دژایەتیکردنی ئایینییەوە بێ ئابڕوو بەشێوەیەك لە شێوەکانی گومڕایی‌و بێباوەڕی‌و دژایەتیکردنی ئایین سەرنج ئەدراو بووبوویە جێی بێ متمانەیی خەڵکی کوردستان. بەڵام بوونی بزووتنەوەی سۆشیالیستی لە ریزی ئەو رێکخستنەداو رابەرایەتیکردنی لەلایەن هەندێ کەسایەتی بەتەمەن‌و خاوەن ئەزموونەوە، تائاستێك بەشداربوون لەکەمکردنەوەی ئەو مەترسیەو فراوانکردن‌و پەرەپێدانی دەسەڵاتی یەکێتی لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی عێراق. ناکۆکی نێوان باڵەکانی ناو یەکێتی، تەنها لایەن تیۆری‌و ئایدیۆلۆژی نەگرتبوویە خۆی، بەڵکوو چۆنییەتی شێوازی شەڕکردنیشی گرتبوویەوە، لەلایەن خۆیەوە کۆمەڵەی رەنجدەران بڕوای خستبوویە سەر ئەزموونی ڤیەتنام‌و کەمبۆدیا لە رێکخستنی دەستەی چەکداری بچووك‌و گورزوەشێن‌و دەربازبوون‌و دوورکەوتنەوە، لەکاتێکدا بزووتنەوەی سۆشیالیستی وەك ئەزموونی شۆڕشەکانی ئەیلول‌و گوڵان شێوازی شەڕی بەرەیی‌و رزگارکردنی رووبەری فراوانی خاك‌و گوندەکانی لاپەسەندبوو.

# بەشی حەوتەم

## قەقنەس لە خۆڵەمێشی سووتاوی خۆیدا دەژێتەوە

### پ. د. ک.. سەرکردایەتی کاتی

نسکۆی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردو پچڕانی پەیوەندی لە ریزی شۆڕشی ئەیلول و کەسایەتیە کاریگەرەکانیدا ئیدریس و مەسعودی کوڕانی مەلا مستەفا بارزانی لە هەوڵی یەکخستنەوەی دابەشبوون و پەرتەوازەیی لە ریزەکانی پارتیدا کەوتنە پەیوەندیکردن، لەگەڵ نالەباری دۆخی دەربەدەری و ئاوارەبووندا، چەندین کۆبوونەوەو دیداری تایبەتیان لەگەڵ خەڵکانی ئاوارەبووی ئێراندا ئەنجامدا، بەنیازی گێڕانەوەی بڕوا بەیەکتربوون و هیواخستنەوە دەروونەکان، لیژنەیەکی تایبەت بەکاری رێکخستن و زیندوو کردنەوەی کاری پارتایەتی پێکهێنراو لە مانگی گوڵان (ئەیلول)ی ١٩٧٥ سەرکردایەتی پ. د. ك — لە سروشت و سەردەمێکی تەواو نالەبارو ناهەمواردا دەستیدایە کارەکانی و چەندین شانەی رێکخستنی رەوانەی کوردستان کردەوە.. ئەم هەنگاوە هاوکاتبوو لەگەڵ دامەزرانەدنی ی. ن. ك-و راکێشانی ژمارەیەك کادروفەرماندەی پ. د. ك- بۆ ریزەکانی و جارێکی تر سەرهەڵدانی ناکۆکی و زیندووبوونەوەی دژایەتیە کۆنەکەی نێوان هەردوولا. لەپلانێکی توکمەو پەرەسەندوودا، سەرکردایەتی کاتی توانی پەیوەندی بکاتەوە بەو کادرو پێشمەرگانەی لێبوردنی گشتی رژێم گرتبوونییەوەو گەڕابوونەوە ناوخۆی کوردستان. مەترسیەك جێی نیگەرانی و دژایەتیکردنی سەرکردایەتی کاتی بوو، هەڵوێستی توندی دەسەڵاتدارانی رژێمی

شابوو لە ئاستی ئەنجامدانی هەر چالاکیەکی سیاسی لە ریزی پەنابەرانی کوردا، بەرانبەر هەڵوێستی رژێمی شا بە ناچاری‌و بەنهێنی‌و خۆپاراستن‌و حەشاردان لەپەناگاشاخاویە سەختەکانی سەر سنووری عێراق، هەندێ دەستەی چەکدار ئاودیوی خاکی تورکیا کران. هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی چەکداری کەبەکردەوە پاش ساڵێك لەنسکۆ، لەرۆژی ١٩٧٦/٥/٢٦ یەکەم مەشخەڵی گڕکانی شۆڕش بە ئەنجامدانی چەندین چالاکی لەناکاوو غافلگیرو هێرشبردنەسەر سەر بازگەکانی سوپای رژێمی عێراق لە ناوچە سنووریەکانی نزیکی خاکی تورکیا داگیرساو (پ. د. ك) جارێکی تر بە رابەرایەتی سەرکردایەتی کاتی رێگای سەختی خەبات‌و تێکۆشانی گرتەوەبەر.

## جارێکی تر نوێبوونەوەی ناکۆکی کوردو کورد

پێویستبوو هێزەکانی ی. ن. ك بۆ گەیشتنیان بەخاکی کوردستان بە هێڵی سنووری نووساو بە تورکیادا گوزەریان بکردایە، جێگربوونی هێزەکانی پ. د. ك (سەرکردایەتی کاتی) لەو هێڵە سنووریەدا گەورەترین مەترسی بوو لە پێش هێزەکانی یەکێتی‌و بەتێپەرکردنیان رووبەرووی شەرێکی سەخت بوونەوەو شکست‌و زیانێکی فراوانیان پێگەیشت، لە پێناوی راگرتنی شەرەکەدا پارتی بەعس باڵی سوریا بە رۆڵی ناوبژیوان لە نێوانیاندا کەوتەکارو هەردوولایەنی ناکۆك‌و بەرەی نیشتیمانی عێراقی گەیاندە رێککەوتن‌و پێکهێنانی بەرەی بەرەنگار بوونەوەو لە دژ وەستانی رژێمی بەغدا، لەو بارەوە رێککەوتننامەیەکی سێ قۆڵیان بەم دەقەی خوارەوە مۆرکرد.. لەپێناوی بەرژەوەندی گشتی وڵات‌و بەنیازی هەماهەنگی کارای کردەوە شۆڕشگێڕیەکان لەسەر خاکی کوردستان‌و یەکخستنی توانای جەنگاوەرانی شۆڕشگێڕ دژبە دەسەڵاتی فاشیزم‌و گەیاندن‌و بەدەستهێنانی چەك‌و تفاقی جەنگی‌و یارمەتی دارایی بە جەنگاوەران‌و دەستەبەرکردنی پێداویستیەکانی درێژەدان بەسەرکەوتنی شۆڕشی بەرپاکراوی

کوردستانی عێراق، وەك بەشێکی گرنگی شۆڕشی گەلی عێراقی دیموکراتخوازو خەباتگێڕ، بەرەی یەکگرتوو زەمینەیەکی لەبارە بۆ یەکخستنی تواناکانو جێگیرکردنی ئەم هەنگاوانەی لای خوارەوە..

**یەکەم:** بێ لێکدانەوەی ئینتیمای سیاسیو حیزبی سەرجەم جەنگاوەرانی شۆڕشگێڕی دژ بەفاشیزم لە کوردستانی عێراق، سەربازەبن لە سوپای شۆڕشگێڕی عێراقی دیموکراتی، لە رووی چەكو خۆراكو تەقەمەنیو دابینکردنی پێداویستەکانی پشتیوانی درێژەدان بە شەڕ، بێ جیاوازی یەکساندەبن.

**دووەم:** هاوکاریو هەماهەنگیکردنی مەیدانی لە نێوان هەرسێ لایەنو جێگیربوونیان لەناوچە جۆراو جۆرەکانو ئەنجامدانی کردەوەکانیان لەسەر یەکخستنی تواناکانی هێزی پێشمەرگە وەك هێزێکی یەکگرتووی هاوکار لە شەڕی دژ بە رژێمی فاشیزم.

**سێیەم:** لە پێناوی مسۆگەرکردنو گەیاندنی تفاقە جەنگیەکان بەجەنگاوەران، بەپێی رێککەوتنی پێشوەخت، هەرچی زووتر جێگیرکردنی لیژنەکانی هاوکاریو هەماهەنگی لەرێڕەوە ستراتیژیو لەناوچە گرنگەکانی سەر خاکی کوردستانو چرکردنەوەی هەوڵەکانیان لە هێنانەوەی جەنگاوەرانی نیشتەجێبووی دەرەوەو پەیوەستکردنەوەیان بەبراجەنگاوەرەکانیان لە کوردستان.

**چوارەم:** هاوبەشیکردنو هەماهەنگیکردنی تاكو بەکۆمەڵ لە بەدەستهێنانی چەکی پێشکەوتووی پێویست، لەپێناوی درێژەدان بە شۆڕش، لەگەڵ پێکهێنانی لیژنەی هاوبەش لە بەدواداچوونو بەدەستهێنانی سەرچاوەی چەكو کڕینی و، هەرچی زووتر یەکخستنی هەوڵەکان لەیارمەتیدانی جەنگاوەران.

**پێنجەم:** ئاراستەکردنی شانەو دەستەکانی رێکخستنو کارکردنیان بەگیانی هاوکاریو برایەتیو راگرتنی شاڵاوەکانی راگەیاندنی دژبەیەك.

**شەشـــەم:** هەرلایـــەنێك لـــەم ســـێ لایەنەهەڵدەســـێت بـــەئاگادارکردنی سەرکردایەتیو دەزگای بەرپرسی خۆی بەجێ بەجێکردنی ئەم ڕێککەوتننامەیە.

| | | |
|---|---|---|
| پارتی بەعسی سۆشیالیستی عەرەبی | ی. ن. ك | پ. د. ك (سەرکردایەتی کاتی) |
| باقر یاسین | جەلال تاڵەبانی | مەسعود بارزانی |

سەرلەنوێ کردەوەکانی بزووتنـەوەی کورد دژبەحکومـەت لەلایـەكو شـەڕی دژبەیەکی ناوخۆو جیاوازی بیروڕای تاقمو ڕەوتو لایەنەکانی لە لایەنی دیکەوە، ناوچـەی کوردســتان جـارێکی تـر چـالاکیو کـردەوەی فراوانـی لـە خۆگرتـەوە، تائاستێك حکومەتی بەغدا توانـای شاردنەوەی ئـەو مەترسیەی لـە دەستدابوو.. هەروەك لە ڕاپۆرتی دەزگایەکی هەوالگیریدا هاتبوو دەڵێت: (لەگەڵ بەسـەربردنی کاتو شارەزابوونی هێزەکانی پێشمەرگە، لەسەر هونەری شـەڕی نـوێی پـارتیزانی (حـرب العصـابات) توانیـان لەکاریگـەری هێزوتوانـای تانـكو زرێپۆشـەکانمان کەمبکەنـــەوەو یەکەســـەربازیەکانی فەیلـــەقی یـــەکیش توشـــی شـــەکەتیو ماندوبوونیو هیلاکی سەخت بکەن، جگە لەوە لەسەر ڕووبەرێکی فراوانی نێـوان شارۆچـکەی زاخـۆی سەرسـنووری تورکیـاو بـاکووری شـاری موسـڵو باشـووری خانـــەقین کردەوەکانیـــان ئـــەنجام دەدەن.لەوبارودۆخـــەدا مـــەودای هەڵکشـــانو فراوانبوونو پەرەسەندنی کـردەوە شۆڕشـگێڕیەکان بـەهۆی نوێبوونـەوەی شـەڕی نێـوان{(ی. ن. ك)و (پ. د. ك) تووشـی جـۆرە داڕووخانێـك بوونـەوەو دەرەنجـام لەسەر بنەڕەتی ڕێککەوتنی پێشوویان گەیشتنە کۆتاییو ڕاگرتنی شەڕەکەیان.

## گفتوگۆی ی. ن.ک لەگەڵ حکومەت

ی. ن. ك و حکومـەت کەوتنـە گفتوگـۆ – پێشـتر روونمـان کـردەوە، لەگـەڵ هـەنگاوی یەکـەمی دامەزراندنیـداو بەمەبەسـتی چارەسـەرکردنی کێشـەی کـورد بەشـێوازی ئاشـتی یـەکێتی نوێنـەری نـاردە بەغـدا، هـەروەك ئـەو جـارە گـوێی لێنەگیرا دواتر وەك لە خوارەوە هاتووە چەند جارێکی تـر گفتوگۆ لـە نێوانیانـدا ئەنجامدراوە.

## گفتوگۆی ساڵی ۱۹۷۷

لـە رێـی کەسـایەتیەکی کـوردەوە (ی. ن. ك) بیروبۆچـوونی خـۆی دەربـارەی گفتوگـۆ راگەیانـد، روونیکـردەوە کـە عێـراق بەتـەواوی لایـەن و پێکهاتەکانییـەوە ئامانجێکـە لـە ئامانجـەکانی ئیسـتیعمارو زایـۆنیزم و کۆنەپەرسـتی، بێگومـان بـەهێزکردنی برایـەتی و پەیوەنـدی مێـژوویی نێـوان هـەردوو گـەلی بـرا کـوردو عەرەب رۆڵی کاریگەری دەبێت لـە روو بـەڕوو بوونـەوەو بەرەنگاربوونـەوەی ئـەو نەخشـەو پیلانانـە، بەدڵنیاییـەوە (ی. ن. ك) بـڕواداره بەیەکخسـتنی خـەباتی چارەنووسسازی نێـوان ئـەم دوو گەلـەو بـرەودان بەمەسـەلە هاوبەشـەکان و بـەرز راگرتنی ئەو برایەتیەو دوورکەوتنەوە لەناکۆکی و دژایەتیکردنی یەکتری.

یەکێتی لـە ئاسـتی چارەسـەرکردنی کێشـەکاندا بـەم شـێوەیەی لای خـوارەوە دیدو بۆچوونی خۆی پێشکەش دەکات..

۱ - گێڕانەوەی بڕوا لە نێوان دەسەڵات و گەلی کورددا.

۲ – کۆتاپهێنـــان بەسیاســـەتی راگواســـتن و گێڕانـــەوەی راگـــوێزراوان بـــۆ شوێنەکانی پێشوویان.

۳ - ئازادکردنی زیندانیان و دەستگیرکراوان و دەست بەسەرکراوان.

٤ - جـێ بـەجێکردنی تـەواوی بەنـدەکانی بـەیانی ۱۱ ی ئـازاری ۱۹۷۰ و جـێ بەجێکردنی یاسای ئۆتۆنۆمی بەسەرپەرشتی نوێنەرانی کورد.

٥ - ڕێگەپێدانی ئازادیە دیموکراتیەکانو ئازادی کاری سیاسی.

٦ - بڕوابوون بەهێزی پێشکەوتوو خوازی کوردو ڕێگەپێدان بەگێڕانی ڕۆڵی بەرپرسیاریەتی لە دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمیدا.

لەگەڵ بێئاکام بوونو نەگەیشتنە ئەنجامی گفتوگۆ، جارێکی تر هەلگیرساندنەوەی شەڕی نێوان هێزە سەربازیەکانی حکومەتو هێزەکانی یەکێتی لێکەوتەوەو گفتوگۆیش گەیشتە کۆتایی. لەسەر دەمێکی دواترو جارێکی تر شەڕی نێوان (ی. ن. ك)و سەرکردایەتی کاتی (پ. د. ك) سەری هەڵدایەوەو بەگشتی زیانی گەورە بە (ی. ن. ك )گەیشت.. هاوکات شەڕی کورد بە کورد بەهاوکاریکردنی ڕژێمی شای ئێران سوپای عێراق هێرشێکی بەربلاوو ڕامالەری کردەسەر هێزەکانی (ی. ن. ك)، پێش گەیشتن بە ئامانجەکانی، بارینی بەفرێکی زۆر هۆکاربوو لەبەر پەرچدانەوەی هێرشەکەو کوژرانو بەهەلاکەت گەیاندنی ژمارەیەکی زۆری سەربازانیو ژێر بەفرخستنیان.

ئەم کردەوەیە ڕاستی ئەو پەندە کوردیە دەسەلمێنێ کە دەڵێت: (هەموان پشتیان بەرداینو هیچ هاوکاریەکمان بۆ نەماوەتەوە جگە لە شاخ).

دەرئەنجام لەگەڵ سەرکەوتنی هێزەکانی یەکێتی دا هێزەکانی سوپای عێراق بەسەر شۆڕی بەرەو دوا کشانەوە.

## گفتوگۆی ساڵی ١٩٨٣

بۆ جارێکی ترو بە هەوڵی ناوبژیوانیکردنی د. عەبدولڕەحمان قاسملوی سکرتێری گشتی ح. د. ك - ئێران جارێکی تر (ی. ن. ك)و حکومەتی بەغدا گەیشتنەوە سەرمێزی گفتوگۆ.

بەلێکدانەوەو بۆچوونی یەکێتی شەڕی بەرپاکراوی ١٩٨٠/٩/٢٢ عێراقی خستبوویە لاوازترین بارودۆخەوە، زیاتر شکستەیەك بەدوا یەکەکانی سوپای عێراقو تووشبوونی بە شەڕی بەرەکانی باشوورو ناوەڕاستەوە، کێشی هێزی

لەبەرژەوەندی ئێران راستکردبوویەوەو بوو بووە هۆی پەرسەندنو هەڵکشانی کردەوەکانی بزووتنەوەی کوردو زیاتر گورو تیندانە کردەوە شۆرشگێرپەکان لەناوچەکەو رزگارکردنو ژێر دەست خستنی ناوچەیەکی بەربلاّو لەخاکی کوردستان.. لە هەمانکاتیشدا ناوچەی کوردستان کەتبوویە بەر هەرەشەی پەلاماردانی ئێرانو داگیرکردنی خاکی عێراق. لەو بارەوە جەلال تاڵەبانی دەڵێت: (بەدوو هۆکار ئێمە رازی نابین ئێران خاکی عێراق داگیربکات..

یەکەم: لە حاڵەتی بەرپابوونی رژێمێکی ئیسلامی لەسەر شێوازی ئێران لە عێراقدا، کەتیایدا ئێمە دەکەوینە نێوان دووبەرداشو دەپلیشێینەوە.

دووەم: ئێمە عەلمانینو ئەو سەردەمە زیاتر لە ئێستا چەپرەو تربووین، باڵێکمان مارکسی لینینیو باڵەکەی دیکەمان سۆشیالیستی، بەو هۆیەوە بەدەست پێشخەریکردنی گفتوگۆ لەگەڵ حکومەت قایل بووین). ئەوەبوو لە رۆژی ۱۹۸۳/۱۲/۱۰ گفتوگۆ لە نێوان هەردوولادا لە دیمەشق دەستی پێکردو کوردەکان جارێکی تر هەمان داخوازی پەیوەندیدار بە ئۆتۆنۆمیو دیاریکردنی سنووری جوگرافی ناوچەکەو نوێنەرایەتی کورد لەدامو دەزگاو دامەزراوە دەوڵەتیەکانی ناوەندیان پێشکەشکردەوە، هەرچەند تائاستێك گفتوگۆ بەرێوەبرا، کەچی ئەو جارەیش هیچ دەرەنجامێکی باشی لێنەکەوتەوە، لە ناوەراستی کانوونی یەکەمی ۱۹۸۵ گەیشتە رێگای داخراو. یەکێتی لەوە گەیشت هۆکاری گۆرانکاری هەڵوێستی رژێمی بەغدا لە ئاستی راگرتنی گفتوگۆ لەو کاتەدا دەگەرێتەوە بۆ دەستێوەردانی تورکیاو خۆ هەڵقورتاندنی لە کاروباری عێراق. سەرنەگرتنی گفتوگۆو پووکانەوەی ئامانجەکانی کوردو لە دەستدانی دەستکەوتەکانی بۆ تورکیا گرنگی سیاسی هەبوو، دڵنیابوو هەردەستکەوتێك بۆ کوردەکانی عێراق، کاریگەری توندی دەبێت بۆسەر کوردەکانی تورکیا، بەتایبەتی لەو سەردەمەدا بزووتنەوەی کورد بەرابەرایەتی پارتی کرێکارانی کوردستان (p.k.k) بە جۆرێك لە گەشەکردندابوو، بۆ حکومەتی ئەنقەرە بووبوویە کێشەیەکی ترسناك.

هەرچەند سەبارەت بەو مەسەلە گرنگە بەڵگەنامەکانی یەکێتی ئاماژەیان بەو ڕاستیە نەکردوە کە هۆکاری ڕازیبوونی ڕژێمی بەغدا لەسەر ئەنجامدانی گفتوگۆ، مەبەست پێچەوانە بوونەوەی هاوسەنگی بوو لە شەڕەکەداو گۆڕانی بارودۆخەکە لەبەرژەوەندی ئێران و بوونی خاکی عێراق بەشەرگەی نێوان هێزەکان و کوژران و بەدیلگرتنی هەزاران سەربازی عێراقی لەشاری خوڕەم شەهر (المحمرە) و بەدواداهاتنی شەڕەکانی دیکە. لەو هەل و مەرجەدا ڕژێم پێویستی بەهەناسە هەڵکێشان و پشوویەك هەبوو، بۆیە بەم مەبەستانەی خوارەوە ڕازیبوو بە ئەنجامدانی گفتوگۆ لەگەڵ ی. ن. ك.

دابڕاندنی ناوچەی باکوور (کوردستان) و یەکلایی کردنەوەو ڕاکێشانی بزووتنەوەی کوردو شەڕپێکردنی جەنگاوەرانی شانبەشانی سوپای عێراق دژبە ئێران، لەو کاتەدا سەدام حسەین لەووتەیەکیدا دەڵێت: (شاخ خەڵکەکەی دەپارێزێت). زیاتر درزخستنە ریزەکانی بزووتنەوەی کوردو دوورخستنەوەی باڵەکانی لە یەکتری و پەرەپێدانی ناکۆکیەکان و لاوازکردنی بۆ ماوەیەکی دووورودرێژ مەبەستی سەرەکی سەرۆکی ڕژێم بوو. سەرنەگرتنی گفتوگۆ پەیوەندی بزووتنەوەی کوردی بەئێرانەوە گرێداو هەردوولایەنی گەیاندە مۆرکردنی ڕێککەوتننامەی بەرگری سەربازی و سیاسی، لەگەڵ ئەوەیشدا بەناوبژیوانیکردنی دەسەڵاتی تاران لە ڕۆژی ١٩٨٦/١١/٧ (ی. ن. ك) و (پ. د. ك) گەیشتنە ڕێککەوتن و کۆتاییهێنان بە ناکۆکیەکانی نێوانیان.

# بەشی هەشتەم

# بزووتنەوەی کوردو شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران و شەڕی عێراق و ئێران

## شۆڕشی خومەینی

لە ١٩٧٩/٢/١١ بەسەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی دەسەڵاتی شا لە ئێراندا رووخا، پێش رووخانی، سەرکردایەتی (ی. ن. ك) لە پاریس چاوی کەوت بە ئایەتوڵا خومەینیو ئامادەیی خۆی بۆهەرکارێك لەیارمەتیدانی شۆڕشی ئیسلامی چاوەڕوانکراو دەرخست، بەخۆشحاڵیو سوپاسەوە خومەینی پێی راگەیاندو وتی: (ئەگەر خودا ویستی لەسەر بێت بەم نزیکانە ئێران رزگار دەکرێتو لەتاران دەتانبینین)[٥٢].

## شەڕی عێراق و ئێران

پێشتر سەبارەت بەکێشەی سنووری نێوان عێراقو ئێران باسی لێکرا، کە هۆکاری سەرەکیو راستەوخۆ بوو لە پشتیوانیکردنو یارمەتیدانی بێ سنووری بزووتنەوەی کورد. هەروەها باسی رێککەوتنی جەزائیر کرا چۆن عێراقی ناچارکرد بە ملکەچکردن بۆ داخوازیەکانی شای ئێران لەشەتلولعەرەبو

---

(٥٢) سەرچاوەی پێشوو/ سەلاح ئەلخرسان

مۆرکردنی ئەو ڕێککەوتنە لە ئازاری ١٩٧٥. بەسەرکەوتنی شۆڕشی ئێران درزێکی بەرفراوان کەوتە ریزەکانی‌و ناکۆکیەکانی ناوخۆی گەیاندیانە نزمترین ئاستی لاوازی، هەمانکات بیرکردنەوەی خومەینی لە هەناردەی شۆڕش بۆ دەرەوەی ئێران بشێوی‌و دڵەڕاوکێیەکی زۆری خستە ناوخۆی عێراقەوەو کاریکردە سەر پەیوەندیەکانی هەردوو وڵاتو هەر زوو کەوتنە شاڵاوی ڕاگەیاندن‌و خەتابارکردنی یەکترو تۆپبارانکردنی سنوورەکان لە ١٩٨٠/٩/١٧، گژربوونەوەی بەردەوامی بارودۆخەکە ئەنجومەنی نیشتمانی عێراقی ناچارکرد لە ڕۆژی ١٩٨٠/٩/٢٢ دا یەك لایەنە بڕیاربدات لەسەر سڕینەوەی ڕێککەوتننامەی جەزائیرو پەنابردنەبەر هێزی سەربازی‌و پەلاماردانی ئێران‌و چوونەناو خاکی‌و گێڕانەوەی شەتولعەرەب بۆ ژێر دەسەڵاتو سەروەری وڵاتەکەی. بەو جۆرە شەڕی نێوان عێراق‌و ئێران هەڵگیرساو هەشت ساڵ درێژەی کێشا. هەڵگیرسانی شەڕی عێراق‌و ئێران هەلێکی مێژوویی ڕەخساند لە پێش پەرەسەندنی شۆڕشی کوردو گەشەکردنی چالاکی‌و کردەوە شۆڕشگێڕیەکانیدا. لەمەودای چۆڵەوانی سەربازی ڕژێم لەناوچەی کوردستان‌و خەریك بوونی هێزەکانی بەشەڕی ئێرانەوە، بزووتنەوەی کورد زیاتر پەیوەندی خۆی لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران چڕتر کردەوەو گەیشتە ئاستی هاوکاریکردنی نێوان لایەنە کوردیەکان‌و هێزەکانی ئێران.. زۆربەی کات سەدام حسەین ی سەرۆکی عێراق ئەو لایەنانەی بەخیانەتکارو ڕێنشاندەرو گەیەنەری هێزە ئێرانییەکان بەناوچەی کوردستان‌و هاوکاریکردنیان تۆمەتباردەکرد.

## ئەنفال و تۆڵەسەندن و لەناوبردنی بەکۆمەڵ[٧]

ڕژێمی بەغدا لە تەواوی ناوچە بەرینەکانی هەرێمی کوردستاندا دەستی دایە پەیڕەوکردنی سیاسەتی خاکی سووتاوو لەناوبردن‌و کوشتنی بەکۆمەڵ.

دوابەدوای ڕێککەوتنی جەزائیر لە ئازاری ١٩٧٥و داڕووخاندنی شۆڕشی

ئەیلول‌و بزووتنەوەی کوردایەتی حکومەتی عێراق هەستا بەدانانی هێڵی سنووری دیاریکراوو قەدەغەکردنی هەر جۆرە نیشتەجێبوون‌و جموجوڵێکی گومان لێکراو لە بەشێکی فراوانی خاکی کوردستاندا، هەندێك جاریش بە گوێرەی پێویستی ئاسایشی سەربازی هێڵەکە تەسکتر دەکرایەوەو دانیشتوانی ئەو ناوچانەی بۆ ناوچەیەکی تر دەگواستەوە، ئەو خێزانانەی یاسای لێبوردن دەیگرتنەوەو دەگەڕانەوە، راپێچی ناوچەکانی باشوور دەکران، پاش چەند ساڵێك هێشتنەومیان دەیانگێڕانەوە بۆ ناوچەی کوردستان‌و لەنیشتەجێ زۆرەملیەکاندا نیشتەجێ دەکران.

پێش باسکردنی کردەوەی ئەنفال کە عەلی حەسەن ئەلەجید- ناسراو بە عەلی کیمیاوی – ئامۆزای سەدام حسەین–و راسگری نووسینگەی باکووری پارتی بەعس بۆ جێ بەجێکردنی نیازەکانی‌و سەپاندنی ئاسایش لە کوردستان، دەسەڵاتی رەهای سەرۆك کۆماری پێ بەخشرابوو، ئەم بەڵگەنامەیە دەخرێتە بەردەست مەودای توندی‌و بێویژدانی لە جێ بەجێ کردنی ئەو ئەرکە ئاشکرادەکات کەپێی سپێرراوە..

## بەڵگەنامە

نامەی فەیلەقی یەك (س. ف/١٧٢٥ بەرواری ١٩٨٧/٦/٢١) راسپێرراو بەنامەی (ف. ل. اس/١٠٨٩ بەرواری ٦/٢٢) بەم شێوەیە دەستپێدەکات..

١ - سەرجەم گوندە قەدەغەکراوەکان لەڕووی ئاسایشەوە تائێستا پەناگاو ئارامگای گێرە شێوێنان‌و تێکدەرانی بەکرێگیراوی ئێران‌و هاو شێوەکانیانن لەخیانەتکارە عێراقیەکانی دیکە.

٢ - گۆڕانی ناوچەکە بۆ ناوچەی قەدەغەکراوی سەربازی‌و نەهێشتنی ئاژەڵداری‌و نیشتەجێبوون تیایداو گوللەبارانکردنی هەرجۆرە بزوان‌و جموجوڵێك، بێ وابەستەبوون بەهەر رێنماییەکەوە.

٣ - قەدەغەکردنی هاتوچۆ بەمەبەستی وەبەرهێنانی کشتوکاڵو بەخێوکردنی ئاژەڵ، تەواوی داموو دەزگا بەرپرسەکان بەرپرسیاری لەدواداچوونو بەگرنگ وەرگرتنی ئەم مەسەلەیەن، هەریەك لە بازنەی تایبەتمەندی خۆیدا.

٤ - بەگوێرەی نەخشەداڕێژراوەکان، لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە سەرکردایەتیە بەرپرسەکان هەڵدەستن بە تۆپبارانکردنو بەکارهێنانی فڕۆکەی سەمتیو فڕۆکەی جەنگی دژ بەگەورەترینو فراوانترین خۆ حەشاردەرانو پەناگیران لەناوچە قەدەغەکراوەکاندا.

٥ - هەرکەسێك تەمەنی لەسەرووی پانزە ساڵەوە بۆ حەفتا ساڵ لە بازنەی ناوچە سەربازیە قەدەغەکراوەکاندا دەسگیربکرێت، دوای لێکۆڵینەوەی دەزگاکانی ئاسایشو سوود وەرگرتن لە زانیاریەکان سزای لە سێدارەدانی بەسەردا دەسەپێنرێت.

٦ - دەزگا جۆراو جۆرەکان هەڵدەستن بەئەنجامدانی لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەو کەسانەی خۆیان دەدەنەوە دەستی دامەزراوە حکومیەکان.

٧ - هەرکەلو پەلێك دەکەوێتە چنگی ڕاوێژکارانی فەوجەکانی بەرگری نیشتمانیو چەکدارەکانیان بێ بەرانبەر دەدرێتەوە بەخۆیان.

لەسەر بەڕێوەبەرایەتی جەحفەلەکان پێویستە تەواوی ڕاوێژکارانو ئامرسریەو ئامر مەفرەزەکان ئاگاداربکەن ڕاپۆرتی تێروتەسەل لەسەر چالاکیەکانیان بەرزبکەنەوە. جگە لەم بەڵگەنامەیە چەندین بەڵگەنامەی دیکە هەن مەودای دڵڕەقیو توندوتیژی دوور لە ویژدانو دەروون هەژێنی ئەو کردەوانە دەردەخەن دژ بە کوردەکان ئەنجامدراون.

عەلی کیماوی بەڵێنی دابە سەدام حسەین پاش ساڵێك لەوەرگرتنی دەسەڵاتیو بەرپرسیاریەتی سەر ناوچەی باکوور(کوردستان)، دەتوانێت بەو پەڕی سەربەستیەوە لەهەر بەشێکدا هاتوچۆبکات.

لەبەدیهێنانی ئەو ئامانجەدا عەلی کیمیاوی بڕوای خستەسەر پەیڕەوکردنی سیاسەتی خاکی سووتاوو ڕێنماییدان بەنەهێشتنو سڕینەوەی شوێنەواری تەواوی گوندەکانی ناوچەی کوردستانو فراوانکردنی پشتێنەی ئاسایشی دوای ڕێککەوتنی جەزائیر، بەو نیازەو بەپێی نەخشەیەکی داڕێژراوی پێشوەختو پلە بەپلە، تەواوی ناوچەی کوردستان بگرێتەوە، جگە لەو شارو کۆمەڵگا زۆرەملێ یانەی بۆ ڕاگوێزراوانی گوندەکان بەرپاکراون.. هەمانکات جگە لەڕێگاو بانە گشتیە سەرەکیە دیاریکراوەکان، لەهەر جێگایەکی دیکەی دەرەوەی ئەو ڕێگایانەدا هەر جۆرە جموجوولێك دەکەوێتە بەرپەلاماری هێرش ئەو فڕۆکە سەمتیانەی بە بەردەوامی چاودێری ناوچەکان دەکەنو بەئاسمانی ئەو ناوچانەدا دەسووڕێنەوە. لەگەڵ جێ بەجێکردنو ڕاییکردنی کارەکانو ڕێنماییەکاندا دوو کردەوەی ئەنفال کە ناوەکەی لە سورەتێکی قورئانی پیرۆزەوە وەرگیراوە خرانە مەودای جێ بەجێکردنەوە. بنکەو بارەگاکانی (ی. ن. ك) ئامانجی سەرەکی کردەوەی یەکەمی ئەنفال بوو کە بەتۆپبارانی چڕو بە کارهێنانی چەکی کیمیاوی دەستپێکردو بەدوایدا هێرشو پەلاماری هێزە زەمینییەکان بەپشتیوانیکردنی سەکۆ مووشەك هەلگرەکانو فڕۆکە هێلیکۆپتەرە سەربازیەکانی هێزی ئاسمانی ئەنجامدرا. هەرچەند یەکێتی مگۆڕبوو لەسەر بەرنگاربوونەوەو لە دژوەستان وبەرگریکردن بەلاَم بنکەکانی یەك لەدوایەك کەوتنەکشانەوە. بە کۆتاییهاتنی کردەوەی یەکەم، کردەوەی ئەنفالی دووەم بەهێرشبردنە سەربنکەو بارەگاکانی یەکێتی لە شوێنەکانی دیکە دەستی پێکردو هێزەکانی ڕژێم بەیەکجاری دەستیان کێشا بەسەر ئەوناوچانەی جێی مەبەست بوون. ڕژێم بەردەوام بوو لە سەرجێ بەجێکردنی نەخشەکەیو بێ خۆتەفرەدان کەوتە جێ بەجێکردنی کردەوەی سێیەمی ئەنفالو پەلاماردانی ناوچەکانی چالاکی یەکێتی، کەلە ڕاستیدا ئەم ناوچانە پڕبوون لە خەڵکی جێگیرو دانیشتوانی بێلایەن، هەر چەند لەدیدو بۆچوونی ڕژێمدا بەیاریدەدەرو هاوکاری

هێزەکانی یەکێتی لێك ئەدرانەوە، بەو هۆیەوە ئەم کردەومیە لەکردەوەکانی یەکەم و دووەم خوێناویترو دڕندانەتر بوو، لەکاتێکدا بەهەزاران هاووڵاتی بێتاوان کرانە قوربانی، لەم چوارچێوەیەشدا هەشت هەزار بارزانی پاش دەستگیرکردنیان راپێچی دەرەوەی ناوچەکە کران و تائێستایش چارەنووسیان بەنادیاری ماوەتەوە. کوردەکان تێکڕا قوربانیانی کردەوەکانی ئەنفال بە (١٨٢٠٠٠) هاووڵاتی مەزندە دەکەن، بەڵام دوای شەڕی گەردەلوولی بیابان و لەماوەی گفتوگۆی ساڵی ١٩٩١ ی نێوان بزووتنەوەی کوردو حکومەت لەپرسیارێکدا عەلی حەسەن ئەلمەجید ناسراو بە عەلی کیمیاوی دانی تەنها بەسەد هەزار ئەنفالکراوی بێ سەروشوێنکراو دانا، بێشەرمانە بزووتنەوەکەی بەزیادە رۆیی لەو ژمارەیەدا خەتابارکرد.

بەپێی ئاماری تۆمارکراوی رێکخراوە نێودەوڵەتیەکانی دوای کشانەوەی ئیدارەکانی رژێم لە کوردستان، جگە لەزیانەکانی سەرەوە، زیانە مادیەکانی کردەوەکانی ئەنفال بریتی بوون لەوێرانکردنی (٤٠٠٠) گوندو (٩) قەزاو (٣٠) ناحیەو تێکڕای ژمارەی خانوەکانیان بریتی بوون لە (١٣٤٦٧٥) خانوو، جگە لە نیشتەجێکانی پڕۆژە ئابووری و خزمەتگوزاریەکانی وەك قوتابخانەو خەستەخانەو مزگەوت و ناوەندەکانی رۆشنبیری و پرۆژەکانی بەرهەمهێنان و لەناوبردنی سامانی ئاژەڵداری.

## کارەساتی کوشتاری هەڵەبجە

لەبازنەی هەماهەنگی و هاوکاریکردنی نێوان بزووتنەوەی کوردو هێزەکانی سوپای پاسدارانی ئێران ئاژانسەکانی دەنگوباس هەواڵی داگیرکردنی شاری هەڵەبجەی سەرسنووریان بلاوکردەوە، لایەنەکانی بزووتنەوەی کورد لەو بڕوایەدابوون کردنەوەی بەرەیەکی نوێی شەڕ فشاری هێزە سەربازیەکانی رژێم لەسەر هێزە کوردیەکان لە کردەوەکانی ئەنفالدا کەم دەکاتەوە. ئەوە بوو لە ١٦ی

ـازاری ١٩٨٨ فڕۆكـە جەنگیـەكانی عێـراق نزیكـەی (١٠٠) تـەن گـازی كیمیـاوی ـەبوردەمانی شـاری هەڵەبجـەدا بـەكار هێنـاو لـە چـركە سـاتێكدا پێـنج هـەزار هـاووڵاتی كوشـتو زیـاتر لـە دەهـەزاری دیكـەی برینـداركرد، كـە زۆربـەیان گوازرانــەوە بـۆ خەسـتەخانەكانی ئێـران، ئەنجامـدانی تـاوانی هەڵەبجـە لـە ژێركاریگەری پەردەپۆشكردنی راگەیاندنەكاندا بەزەقی دوو روویـیو خـۆڵ گێل كردنی نێودەوڵەتی پێوەدیاربوو بـەهیچ شێوەیەك باسو خواسـی لەسـەر نـەكرا تـادوای كۆتاییهـاتنی شـەڕی دووەمـی كەنـداو، دیـارە مانـەوەی بەرژەوەندیـەكانی رۆژئاوای ئەو سەردەمە لەسەركەوتنی عێراق لەشەڕی دژبە ئێراندا دەبینرا..

لەئاسـتی راسـتی ئـەو مەسـەلەیەدا جـەلال تاڵـەبانی دەڵێـت: (حكومـەتی ئەمـەریكا بەفـەرمی لـە هێشـتنەوەی رژێمـی بـەعس ئاگـاداری كـردووەو رێگـای سـەركەوتنی ئێـرانیش لەشـەڕەكەدا نـادات، تەنانـەت ئەگـەر پێویسـتیش بكـات لەبەرژەوەندی عێراق هێزی سەربازی بەكاردێنێ)[٥٣].

بەشێوەیەكی ئاشكرا كـردەوە ناپەسـەندو ناڕەواكانی حكومـەت كاردانـەوەی خراپیـان لەسـەردەروونی كوردەكـان بـەجێ هێشـتو بۆیـان روونبوویـەوە بەغـدا لەجێ بەجێكردنی نەخشەی لەناوبردنیاندا بەردەوام دەبێت.

لەو بارەو دۆخەدا كردەوەكان مەودایەكی بەربلاْو فراوانیان گرتبوویەبەرو لەسـیناریۆیەكدا جـێ بـەجێی دەكـردن، سـەرەتا بـەكارهێنانی چـەكی كیمیـاویو بەدوایدا هێرشی سەربازی بەمەبەستی پاكسازی لەهەرناوچەیەك ئەنجام دەدرا.

---

[٥٣] رۆژنامەی شیحانی ئەردەنی/ سەلاح ئەلخرسان.

## ڕاگرتنی شەڕی عێراق – ئێران

لە ٢٢ ی تەمموزی ١٩٨٨ شەڕی نێوان عێراق‌و ئێران ڕاگیراو هەلی یەکلایی بوونەوەی کردەوە سەربازیەکان دژبە بزووتنەوەی کوردو پەلاماردانی ناوچە جۆربەجۆرەکانی کوردستان هاتە دەست. ناوچەی بادینان کە هێزەکانی (پ. د. ك) یان تیادا بوو ڕووگەی سەرەکی هێرشی سەربازی دوای شەڕی نێوان عێراق‌و ئێران بوو، لەیەکەم پەلاماردانیدا جگە لە وێرانکاری‌و کوژرانی زیاتر لە سێ هەزار کەسی دانیشتوی بێتاوانی لێکەوتەوەو هەزارانیش بەناچاری پەنایانبردە خاکی ئێران‌و تورکیا، مەترسی ئەو دوو وڵاتە لەپەنا بەران‌و کاریگەریان بۆسەر کوردەکانی خۆیان هۆکاربوو لە دوورخستنەوەیان‌و گیرکردن‌و توندکردنیان لەچەندین خێوەتگای داخراوو لەژێر چاودێری توندی پاسەوانەکانیانەوە.

کۆتاییهاتنی شەڕی عێراق‌و ئێران گەلی کوردی بەرەو تاریکترین ڕۆژگارەکانی بردو لە ژێر سێبەری بێدەنگی بەئەنقەستی کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا ڕووبەڕووی نالەبارترین‌و ترسناکترین شالاوی دڕندانەبوویەوە.. وەك دەرکەوت لەوەدا دەوڵەتان سەرنجیان خستبوویە سەر عێراقی دوای شەڕو بەدەستهێنانی گرێبەستەکانی ئاوەدانکردنەوەی، هاوکاریکردنی نێودەوڵەتی عێراق ساڵی ١٩٨٩ گەیشتە ئەو ئاستە بەبەشداریکردنی زۆربەی دەوڵەتان پیشانگایەکی چەکی لەبەغدا کردەوە. بێگومان بەشداریکردن لەو پیشانگایەدا مانای پیرۆز ڕاگرتنی ئەو کردەوە سەربازیانە بوو عێراق ئەنجامی دابوون‌و چاو داخستن‌و خۆهەڵەکردنیش بوو لەو تاوانانەی لە عێراقدا دژبە مرۆڤایەتی ئەنجامدەدران.

# بەشی نۆهەم

## بۆ یەکەمجار دوور لە بەغدا

### راپەڕین

لــە ئــابی ١٩٩٠ ســەدام حســەین کــوەیتی داگیرکــردو بــەناوی پارێزگــای نۆزدەهــەمی عێراقــەوە نــاوی (کازمــە)ی بەســەردا ســەپاند. لەگــەڵ بــەزین و پاشەکشــەپێکردنی ســوپای عێــراق، راپــەڕینی خــەڵکی شــاری بەســرە روویــدا، ئەفسەرێکی پلەنزمی ورە رووخاوی سەرشۆڕی سوپای عێراق، کاتی گەڕانــەوەو تێپــەڕبوونی بــەدەورو بــەری شــاری بەســەرەدا رووبــەڕووی پەیکــەرێکی ســەدام حسەین دەبێتــەوە بەهــەڵگرتنی هــەموو رەق و خــەم و شــێوازی بــاری دەروونــی خۆیەوە بەدەمانچەکەی دەستی چەند گوللەیــەك ئاراستەی پەیکەرەکە دەکات.. ئــەم کردەوەیــە دەبێتــە ســەرەتای دەســتپێکی راپــەڕینی جــەماوەری لــەمانگی شەعباندا، کە بەڕاپەڕینی شەعبانی ناوی دەرکرد، زووبەزوو کڵپەی گڕی هــەموو شــوێنێکی عێراقــی گرتــەوەو گەیشــتە بــاکووری وڵات (کوردســتان)و شارۆچکەی رانییە بــووە سەرچاوەی تەقینــەوەی گڕکانی راپەڕیوان و بــە دەروازەی راپــەڕین خۆی ناساندو هەموو کوردستانی گرتــەوەو لەماوەیــەکی زۆر کەمــدا رزگار کراو کەوتە ژێر دەسەڵاتی کوردە شۆڕشگێڕو راپەڕیوەکانــەوە، هۆکارێکی ســەرکەوتنی راپــەڕین لــە کوردســتان، هاوکــاریکردنی فەوجەچــەکدارەکانی بەناوبــەرگری نیشتمانی سەربەڕژێم بوو- لێرە هەڵوێستەیەك دەکەین لەئاستی ناساندنی ئــەو

فەوجانـەدا، بـزانین کـێن‌و کاریـان چـی بـوو. زۆربـەی کوردەکـان لەچوارچێوەی کۆمـەڵگای خێڵـەکی‌و عەشـایەریدا ژیـان دەگـوزەرێنن، بەچـەند هۆکارێکـەوە لەناوخۆیاندا بەشەڕ دەهاتن، وەك دەزانـن حکومەتەیـەك لەدوایەکـەکانی عێـراق لە بەرژەوەندی دەسـەڵاتی خۆیـان هەنـدێکیانیان بـۆلای خۆیـان رادەکێشاو دژبـە نـەیارەکانیان هـانی دەدان، بەتایبـەتی دژ بـە بزووتنـەوەی رزگـاریخوازی کـورد بەکاریان دەهێنـان‌و پشتیوانیان لێدەکردن.. لەو دیدگایەوە کە کوردەکان بەردەوام سەوداسـەری هـەڵگرتن‌و بـەکارهێنانی چـەك بـوون، حکومـەت تاکـەکانی هەنـدێ لەخێڵەکانی وەك میلیشیا دژبـە بزووتنـەوەی رزگـاریخوازی کـورد چەکداردەکرد، ئەمـەلای زۆربـەی زۆری گـەلی کـورد بـە (جـاش ناسـران). هەڵگیرسـانی شـەڕی عێراق‌و ئێران پێویستی بەرەکانی شەڕ بەسـەربازو پەلکێشکردنی هاولاّتیـان بـۆ ریـزی سوپاو تونـدکردنیان لەبەرەکانـدا، لـە باوەڕنـەبوونی خـەڵکی کـورد بـەو شـەڕەو خۆدزینـــەوەو خۆقوتـارکردن لـە داخوازیـەکانی سـەربازگیری رژێـم پێچەوانەی عێراقیەکانی دیکە کوردەکان بە تۆمارکردنی ناوەکانیـان لای سەرۆك جاشەکان لەسەربازگیری‌و خزمەتکردنی سوپا رزگاریان دەبوو. لەڕاستیدا هەنـدێ لەو چەکدارانە دڵسۆزیەکی ئەو تۆیان بۆ حکومەت نەدەبوو، جگە لـەوەی لـە زۆر رووەوە یاریـدەدەری بزووتنـەوەی کوردایـەتی بـوون، لەگـەڵ روودانـی راپەڕینـدا بەتەواوی چەکەکانیانەوە دژ بـەهێزەکانی حکومـەت وەستان‌و تێکەڵ بەخـەڵکی راپـەڕیوو شۆڕشـگێڕانی بزووتنەوەکـە بوونـەوە. بـەهۆی لێکدانـەوەی نادروسـت لەئاسـتی راپـەڕین‌و دەرئەنجامەکـەی‌و مەترسـیکردنی لەدابەشـبوونی عێـراق‌و دامەزراندنی کیانێکی کوردی‌و بەدواداهاتنی چەندین دەرهاوێشتەی نـەخوازراوو پەیوەستبوونی باشووری شیعەنشین بە کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە.. ئەمەریکا بێ هـیچ رووگیریـەك پشـتی کـردە خـەڵکی راپـەڕیوی عێـراق.. لەگـەڵ نـەگونجانی بارودۆخەکەو مەترسیەکانیشدا بەدوور نەدەزانرا، دواتر خودی ئەمەریکا بیرلـەو دابەشـکردنە بکاتـەوە، هەرچـەند لەگـەردە لـوولی بیابانـدا ئەمـەریکا لەبێخـدا

نینۆکی سەدام حسەینی دەرهێنا، بەڵام لەبەدیهێنانی ویستەکانو پاراستنی بەرژەوەندیەکانیدا بەرژێمێکی نموونەییو بێهاوتای دەزانی لەناوچەکەدا، لەو دیدگایەوە بڕیاری سەرکوتکردنی راپەڕینی داو، رژێمی هاندا لەبەکارهێنانی فڕۆکەکانیو هێزەکانی گاردی کۆماری دژبە راپەڕینو خەڵکی راپەڕیوو. هێزە سەربازیەکانی عێراق لەباشوورەوە کردەوەکانیان چڕکردەوە، لەگەڵ سەرکوتکردنی خەڵکی باشوورو کپکردنەوەی راپەڕینەکەیان هێزەکان روویانکردە کوردستان، پاش شەڕێکی سەخت لەشاری کەرکوكو هەولێرو سلێمانی، لەگەڵ قوربانیدانێکی فراواندا جەنگاوەرانی کورد پەنایان بردەوە بەرشاخەکان. ئەم رووداوانە جارێکی تر ئێشو ئازارو مەینەتیەکانی رابردووی ئەنفالو کیمیابارانی هەڵەبجەیان هێنایەوە یادو ترسو دڵەراوکێ باڵی بەسەر تەواوی دانیشتوانی شارو شارۆچکەکاندا کێشاو بەکۆمەڵ کەوتنە کۆچ کردن بەرەو نادیارو زیاتر لەیەك ملیۆن هاوولاتی بەرەو ئامێزی گەرمی شاخە سەختەکانی سنوورەکانی تورکیاو ئێران رێگایان گرتەپێش، بەهۆی نالەباری کەشو هەواو بەفرو بارانو سەرماو گیربوونو چەقین لەناوقوڕو لیتەدا ژمارەیەکی زۆرگیانیان لە دەستدا. ئەو کارەساتە مرۆییە ترسناکەی کەناڵە ئاسمانییەکانو میدیا جیهانییەکان راستەو خۆ گواستیانەوە، بووە هۆی توورەبوونو هەژاندنیو بزدانی کۆمەڵگا رۆژئاواییەکانو هەڵوێست وەرگرتنیان لەئاستی ئەو کارەساتە مرۆییە ناهەموارەدا. لە ٥ ی نیسانی ١٩٩١ بڕیاری ژمارە (٦٨٨)ی ئەنجومەنی ئاسایش کردەوە ترسناکەکانی سەرکوتکردنو چەوساندنەوەی دانیشتوانی مەدەنی لەزۆربەی ناوچەکانی عێراقو بەتایبەتی لەناوچەی کوردستان زۆر بەتوندی ریسواو خەتابارکردو داوایشی لەرژێمی بەغداکرد هەرچی زووتر دەست لەو کردەوانە راگرێت.. هەرلەو میانەدا بڕیارەکەی ئەنجومەن داواکاربوو لەحکومەت لەئاستی ئەنجامدانی کارەکانی رێکخراوە خێرخوازەکان ئاسانکاری بکاتو لەگەیاندنی خزمەتگوزاریە

مرۆییەکانیان ڕێگری نەکات[54]. لەناوەڕاستی مانگی نیساندا بەبڕیاری هێزە هاوپەیمانەکان، باکووری هێڵی ئاسۆیی(36) بەناوچەی ئارامو پاراستنی کورددکان دیاریکرا، کەتیایدا هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان سەربە (پ. د. ك) هاوکات لەگەڵ هەڕەشەی هێرشی هێزەکانی هاوپەیمانان دژبە هێزە سەربازیەکانی ڕژێمی بەغدا لەناوچەی (کۆڕێ)ی نێوان هاوینەهەواری سەلاحەدینو شارۆچکەی شەقلاوە لەداستانێکی کەم وێنەو نەبەردێکی دلێرانەدا بەرەنگاری هێزە پەلاماردەرەکانی عێراق بوونەوەو شکستیان بەپێشڕەویەکەی هێنا[55].

دوابەدوای شەڕەکە، گەیشتمە ناوچەکەو بەچاوی خۆم تەواوی تانكو زرێپۆشو زیلە سووتاوە جێماوەکانی گاردی کۆماریم بینی، بەهەلم زانی وەك لەخوارەوە داهاتووە، گفتوگۆیەکی لەناکاوو کتوپڕ لەگەڵ سەرۆکی (پ. د. ك) بەڕێز مەسعود بارزانی ساز بکەمو بەم پرسیارە بچمە ناو مەسەلەکانەوە.

- یاداوەریەکانتان لەسەر شەڕی کۆڕێ؟

- پێش وەڵامدانەوە، لەزەردەخەنەیەکی دوورودرێژی ڕوخساریدا وشەکانم خوێندەوە، بەم جۆرە کەوتە گێڕانەوەی یاداوەریەکانی.

(ڕۆژی ١٣ ی ئازار لەشەقلاوە بووم نامەیەکی سەرۆکایەتی کۆمارم پێگەیشت، بریتی بوو لەپێشنیاری گفتوگۆکردنمان لەگەڵ حکومەت.. لەلایەن خۆمەوە پێشنیارەکەم خستەبەردەستی سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی، کە پێکهاتبوو لە { (پ. د. ك)و (ی. ن. ك)و (پارتی سۆشیالیستی کورد- پاسۆك)و (پارتی سۆشیالیستی کوردستان)و (پارتی کۆمۆنیستی عێراق)و (پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان)و (پارتی زەحمەتکێشانی کوردستان)و (بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشووری }.. لە ١٤ ی ئازاردا وەڵامەکە ئامادەکراو بەنێرراوەکەی حکومەت سپێررا، لەکاتی گەڕانەوەیدا لەسەر ڕێگای هەولێرو کەرکوك ئۆتۆمۆبیلەکەی

(54) کوردەکان – داڤید ماکنۆیل/ لەچاپکراوەکانی ناوەندی ئیبن خەلدون بۆ پەرەپێدان.

(55) سەرچاوەی پێشوو.

دەکەوێتــە بــەربوردومانی هێزەکــانی رژێــم، هــەرجۆرێك بــوو نێرراوەکــەی ســەرۆکایەتی کۆمــار لەڕووداوەکــە قوتاردەبێــت، بــەلاَم نامەکــەی ئێمــە لەئۆتۆمۆبیلەکا یدا بووبوو بە خۆراکی ئاگر.. دیارە ئێمە بێئاگای ئەو رووداوە بووین، بە بۆچوونی ئێمە نامەکەمان گەیشتوەتە جێی مەبەستو پشتگوێ خراوە، وەختێك لەوەلاَمەکەی بێ هیوا بووین کەوتینە خۆسازدانی رزگارکردنی کەرکوكو لەڕۆژی نەورۆزدا کەوتە ژێر دەسەلاَتی هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان، لەهەلێکی دیکەدا نێرراوەکەی حکومەت گەڕایەوە لامانو لەڕووداوو بەسەرهاتەکەی خۆی ئاگاداری کردین. هەمان کات لەهێرشێکی پێچەوانەدا هێزەکانی گاردی کۆماری شاری کەرکوکیان گێڕایەوە ژێر چنگی خۆیان. وەك لەباروەدۆخی دواکەوتنی نامەکە گەیشتینو بەڕێکایەکی تردا وێنەیەکی وەلاَمەکەمان ناردەوە، حکومەت لەو مەسەلە بێئاگا بوو، بەو شێوەیە لێکی دابوویەوە پاش لەدەستدانی کەرکوك، لەڕووی لاوازیمانەوە وەلاَمەکەمان داوەتەوەو ئەمەیش نامەی خۆبەدەستەوە دانمانە، هێزەکانی رژێم بەرەو هەولێر کەوتنە پێشرەوی‌و تەنها هەلبژاردەی خۆبەدەستەوەدانی بێ مەرجیان خستەبەردەستی ئێمەو دانەوەی چەکەکانمان بەوان. لەو ئاستەدا هیچ وەلاَمی حکومەتمان نەدایەوە، تەنها بەسەر زارەکی نێرراوەکەمان راسپارد رژێم لەوە ئاگاداربکات، ئێمە زۆربە توندی ئەو شێوە داخوازیە رەت دەکەینەوە، لەو زمانەیش ناگەین‌و ئامادەیش نین لێی بگەین‌و تاکۆتایی ئامادەی بەرگری لەخۆ کردنین ئەگەر بە راستی لە واقیعەکە بکۆلێنەوە، ئەو هەلوێستە لەهاوکێشەی هێزو باروەدۆخی ئێمە بەراورد بکەین، زۆربە باشی حکومەت هەستی بەوەکردبوو بۆیە بەو زمانە وشکە قسەی لەسەر دەکرد.. رژێم دەیزانی لەڕووی ژمارەو چەك‌و پێداویستی جەنگیەوە هێزەکانمان لاوازن، هەمان کات بواری بەراوردکاری لە نێوانی ئێمەو هێزەکانی گاردی کۆماریدا نەدەبینرا.. لەگەل هەموو ئەمانەیشدا بۆ ئێمە لایەنی ورەو بڕوابەخۆبوون گرنگی خۆی هەبوو

ئەمەلەلایەك‌و لەلایەکی دیکەوە یادەوەریەکانی ئەنفال‌و چەکی کیمیاوی‌و کوشتاری بەکۆمەڵی هەڵەبجە لەبیرو هۆشدا ماونەتەوە، جەماوەری گەلی کورد لەوە دڵنیایە هێزە سەربازیەکانی عێراق لەخۆئامادەکردنی سەرلەنوێ دووبارە کردنەوەیانــدان، هەوڵمانــدا دیسانەوە گیانی بەرگری‌و بەرەنگاربوونەوە لای هاوڵاتیان بەهێزتر بکەین.. لەپێش جەماوەری ڕەواندزدا بەڵێنم دا یەکەم کەسبم لەسەنگەری پێشەوەی بەرەی شەڕو بەرەنگاربوونەوەی هێزەکانی ڕژێم.. من بۆ خۆم بڕوام بەوە بەتین بوو هیچ وەخت ئامادە نەبووم دەربەدەرببمەوەو ژیانی ئاوارەیی لە ئێران‌و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەڵبژێرمەوە، یان سەربەستی‌و ئازادی بۆ گەلەکەم بەدی دێنم، یان لەناوخاکی خۆمدا گۆڕی خۆم بەدەستی خۆم هەڵدەکەنم.. نا.. هەزاران نا.. جارێکی دیکە ناگەڕێمەوە بۆ ژیانی دەربەدەری‌و پەنابەری. لەکاتی وتارەکەم لە ڕەواندز تەنها ٩٧ پێشمەرگەم لەگەڵدابوون، کاریگەریەکی ئەوتۆی لەسەردەروونەکان جێ هێشتبوو بووە هۆی ڕاکێشانی زیاتر لە (٢٠٠) کەسی تر، کە دەبوو بەرەنگاری ئەو سوپا بەهێزە ببووناپەتەوە. لێکماندایەوە لەبارترین شوێنی بەرنگاربوونەوەی هێزە هێرشبەرەکانی گاردی کۆماری ناوچەی کۆڕێ بەو ناوچەیەکی بەرزونزم‌و هەورازو نشێوو سەخت‌و پێچاوپێچەو ڕێگای تێپەڕبوونی هێزەکان ڕوو بە هەولێر لێژاییەکی زۆر توندەو لەپشتەوە بەربەستێکی ئاوی شاخێکی بڵندەو لای چەپیشی شاخێکی بڵندترو دەربازبوون لەو نێوانەدا کارێکی ئەستەمە.. بیرکردنەوەی سەرەکی پەنابردن بەپشتیوان‌و هاوڕێی هەمیشەیی‌و دێرینی کورد (شاخ) بوو، کە پێشمەرگەکان بەدێژایی‌و بەرایی ناوچەکە چەندین پێگەو سەنگەرو بۆسەیان نابوویەوەو بەیەکجاری باڵیان کێشابوو بەسەر ڕێگاو ڕێڕەووتەواوی گوزەرەگاکاندا. ڕۆژ ٧ ی نیسانی ١٩٩١ لەکاتێکدا تانکەکانی گاردی کۆماری بەرەو ناوچەی کۆڕێ لە پێشڕەویدا بوون‌و کەوتبوونە ژێر چاو ـێری دیدەبانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، پیاوانی بۆسەکان ئارام‌و دڵنیا لەجێگاو سەنگەرە

دیاریکراوەکانی خۆیانەوە چاوەڕێ بوون، تاتانکەکان گەیشتنە مەودای ئاگری چەکەکانیان، ئیتر ئەوەبوو یەکەم مووشەك راستەوخۆ ئاراستەی تانکێك کراو تێکشکێزا، ئەم پەلامارە سەرەتاییە ترس و بێمکی زۆری خستە دەروونی هێزە هێرشبەرەکان و مووشەك دوای مووشەك رووبەڕوویان دەبوویەوە، پاش تێکشکاندنی سی تانکی دیکە هێزەکان بەناچاری گەڕانەوە ئەو شوێنانەی لێوەیان دەرچوو بوون. لەگەڵ گەیشتنی هەواڵی ئەم سەرکەوتنە مەزنە بەهاولاتیان و دەنگدانەوەی لەتەواوی ناوچەکەو ناوزەدەکردنی بەشەڕێکی ئەفسووناوی، ژمارەیەکی زۆر پەیوەندیان کرد بەهێزەکەمانەوە. لە رۆژی ١٠/نیسان دوای سێ رۆژ هێزە بەزیوەکانی گاردی کۆماری توندترو چڕتر لە هێرشی پێشوو دیسانەوە هێرشیان هێنایەوە سەرناوچەکە، ئەوەی گرنگتربوو هێزەکانی ئێمە لە شەڕی پێشوو ئامادەترو توکمەترو ورەبەرزتر بوون، توانیمان بەسەرکەوتوویی ئەم هێرشەیش تێك بشکێنین و ژمارەیەکی زۆری ئەفسەرانی گاردی کۆماریش بەدیل بگرین دواتر لە ژێر چاودێری هێزەکانماندا درانەوە بەدەسەڵاتدارانی عێراق، پاش ئەم سەرکەوتنە مەزنە ئەوندەی نەخایاند، برووسکەی برای بەڕێزمان مام جەلال م گەیشتە دەست، لەوە ئاگاداری کردم سەرلەنوێ بەغدا داوای گفتوگۆی کردوەتەوە، بەخۆشحاڵیەوە پێشوازیمان لەو هەنگاوە کردو گفتوگۆ دەستی پێکرد.

## گفتوگۆ لەگەڵ بەغدا

پاش مانگێك لە کۆبوونەوەی لایەنە بەرهەڵستکارەکانی عێراق بەلایەنە کوردیەکانیشەوە، بڕیاردرا بەبڕواخستنەسەر توانای خودی عێراقیەکان کار لەسەر رووخاندنی رژێمی دکتاتۆری بکرێت و شوێنەواری یاسا سەپێنراوەکانی بسڕ تەوە. لەگەڵ ئەوەشدا بەرەی کوردستانی لەسەر داخوازی رژێم بڕیاریدا

بچێتە ناو ئەو گفتوگۆیەوە.. دوای لێکدانەوەو تاووتوێکردنی لایەنە کاراو ناکاراکانو گرێدانی چەندین کۆبوونەوەو راوێژی چڕو بەرهەڵستکاری هەندێ لایەن، لەکۆتاییدا راکان لەسەر ئەنجامدانی گفتوگۆ یەکیان گرت.. بەلێکدانەوەی لایەنەکانی بەرە دوابەدوای دەرەنجامو دەرهاویشتەکانی گەردەلوولی بیابانو بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایشو بڕیاری تایبەتی هێزە هاوپەیمانەکان بەدیاریکردنی ناوچەی ئارام، سەدام حسەینو حکومەتو سوپاکەی لەلاوازترین بارودۆخدا دەبینران، لەبارودۆخو هەلێکی لەو جۆرەدا دەتوانرێت مەزنترین دەستکەوت بۆ گەلی کورد بێتەدی، وە هەر دەسەڵاتێك بەدوایداهات پابەندی جێ بەجێکردنی دەبێت. دیارە ئەم بڕیارە ئەوەیشی بەرچاوگرتبوو کە چارەسەری کێشەی کورد لەناوخۆی عێراقدا دەکرێت. بێ هیچ ئاکامێك بەرەی کوردستانی لەڕێی شاندێکەوە ماوەیەك خەریك بوو بە گفتوگۆکردن لەگەڵ رژێمی بەغدا. داخوازی کوردەکان فراوانکردنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی بوو بەگرێدانی کەرکوكو خانەقینو مەندەلی بەخاکی کوردستانەوە، لەگەڵ قایل نەبوونی بەغدا بەو خواستە، کوردەکانیش داخوازی رژێمیان بەپچڕاندنی پەیوەندیە دەرەکیەکانیان رەتکردەوە. لە بێئاکامبوونی گفتوگۆ هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان شارە سەرەکیەکانیان خستەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، بەنیازی بەجێهێشتنی چۆڵەوانی لەبەڕێوەبردنی ناوچەکەو دروستکردنی بارگرانی لەسەر بەرەی کوردستانی، لەتشرینی یەکەمدا بەبڕیاری سەدام حسەین تەواوی بەڕێوەبەرایەتیو دامەزراوە مەدەنییە دەوڵەتیەکان کشانەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی رژێم لەکاتیکدا کوردستان وەك هەموو ناوچەکانی دیکەی عێراق کەوتبوویە ژێر کاریگەری ئابڵۆقەی ئابووری نێودەوڵەتیەوە، هەمان کات رژێمیش ئابڵۆقەیەکی تاسێنەری لەسەردانا.

## بەڕێوەبەرایەتی کوردی لەناوچەکەدا

بەمەبەستی نانەوەی بشێوی‌و ناچارکردنی بزووتنەوەی کورد بەپەنابردنە بەر بەغداو گەڕانەوەی دەسەڵاتی ڕژێم، چالاکی تەواوی بەڕێوەبەرایەتیەکان راگیرا.. بەڵام وەك ئەرکێکی نیشتیمانی پێویست بەرەی کوردستانی لە ئاستی ئەو دۆخە هەڵوێستی کارای وەرگرت‌و بڕیاریدا لەسەر بەڕێوەبردنی ناوچەکەو هەڵسووڕاندنی کاروبارەکانی وەك جاران، بێ بەر هەڵستیکردنی هیچ لایەنێك بەگردەوە بەڕێوەبەرایەتیەکان درێـژەیان بەکارە فەرمیەکانیانـدا.. بەڵام کێبەرکێی نێوان پارتە کوردیەکان لەسەر دەسەڵات بەتایبەتی کێبەرکێی نێوان { (پ. د. ك)و (ی. ن. ك) } وەك دووپارتی سەرەکی گەیشتە ئاستێکی تەواو مەترسیدارو لەهەر ساتێکدا چاوەڕێی تەقینەوەی لێدەکرا. لەپێناوی نەهێشتنی ئەو بار گرژیە پەنا برایە بەر هەڵبژاردنی‌گشتی‌و رای گەل لەنیسانی ۱۹۹۲ دا. دواتر بەپێی پێویست باس لە ڕێژەکان دەکرێت. لەگەڵ بەردەوامبوونی ناکۆکی نێوان (پ. د. ك)و (ی. ن. ك) کە هەڕەشەیەکی مەترسیدار بوو بۆسەر پاشەڕۆژی دەستکەوتەکانی کوردو بەرژەوەندیە باڵاکانی.. ئەنجومەنی وەزیرانی پێکهێنرا.

لەخوارەوە کەمێك لەگەڵ ناکۆکیەکاندا دەوەستین:

## ناکۆکی نێوان کورد

سەرەتا دەبێ دووباتی ئەوەبکەینەوە، بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد یەکەم‌و دوابزووتنەوەیەك نییە ناکۆکی کەوتبێتە ریزەکانی، تەواوی بزووتنەوە رزگاریخوازەکان لەم سەر بۆ ئەوسەری جیهان، لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا لەو شێوازە توندتر ومەترسیدارتر ناکۆکیان بەخۆیانەوە دیوە. بارودۆخی بزووتنەوەی کورد لەعێراق‌و هاوچەشنەکانی لەناو دەوڵەتانی دراوسێ گێڕانی

ڕۆڵی کارایان‌و جاروباریش ڕۆڵی ناکاراو پشتیوانیکردنی ئەم پارت لەسەرحیسابی پارتێکی تـرو سروشـتی ناوچـەکەو پەیوەندیـە دەرەکیـەکان لـەڕێی دەوڵـەتانی دراوسێ‌و هـەمان کـات پەیوەندیـەکانی حکومـەتی عێـراق‌و دەوڵەتانی دراوسێ‌و هەڵکشـان‌و داکشـانی ئـەو پەیوەندیانـە لەکاتێکـەوە بـۆ کـاتێکی تـرو ڕاکێشـانی ڕەوتێك بۆ ڕیزی خۆی دژ بـە ڕەوتـی بەرانبـەرو هەنـدێ کـاتیش زۆر بـەگورجی پشـتکردنە ڕەوتـی دۆسـت‌و لاکردنـەوە بەلاکـەی دیکـە، هـەموو ئەمانـەو چـەند هۆکارێکی تر پەرەسەندنی ناکۆکیـەکانی نـاو بزووتنەوەکـەیان خسـتبوویە ڕیـزی پێشەوەی مەسەلەکان‌و هەندێ کاتیش جێگرەوەو بەدیهێنـەری نیازو ئامانجەکانی وڵاتـانی دەرەوە بـوون. لێـرەدا بـەکورتی ئامـاژە بەناکۆکیـەکانی کـوردو کـورد دەکەین‌و لەسەریان دەدوێین.

١ - دوابەدوای دامەزراندنی —پ. د. ك— لە ١٦ ی ئابی ١٩٤٦ تیایدا سێ ڕەوت سەریان هەڵدا..

أ - ڕەوتی جەماوەری مەلا مستەفا بـارزانی ڕابەرایـەتی دەکـرد، لەوەختێکـدا کەوتبوویە سەر ڕێڕەوە بەناوبانگە مێژووییەکەی بەرەو یەکێتی سۆڤیەت.

ب - ڕەوتی چەپی مارکسی، پێکهاتبوو لەئەنـدامانی پێشـووی پـارتی شـۆڕش بەڕابەرایەتی هەمزە عەبدوڵا.

ج - ڕەوتی نەتەوەیی شۆڕشگێڕ، بەڕابەرایەتی برایم ئەحمەدو دواتر جەلال تاڵەبانی.

٢- بـەهۆی کاریگـەری کەسـایەتی بـارزانی‌و ڕۆڵـی سیاسـیەوە بـەردەوام سەرکردایەتی پارتی لەدەستدا دەمایەوە، لەکاتێکدا بـەگوێرەی پێویسـتی سـەردەم سکرتارییەت لە نێوانی هەمزە عەبدوڵاو برایم ئەحمەد ئاڵ‌و گۆڕ پێدەکرا.

٣- بە دوورخستنەوەی هەمزە عەبدوڵا لەپارتی، ئەنـدامانی چـەپی مارکسی ڕوویانکردە ڕەوتی ڕۆشنبیرانی نەتەوە خوازو پارتی لەم دوو ڕەوتەدا مایەوە.

بێگومـان لـەدووتوێ ئـەم بـیرو بۆچـوونە جیاوازانـەدا دەبـێ نـاکۆکی

لەهەڵوێستەکاندا رووبدات. نکوولی لەوەناکرێت لەهەموو گێروگرفتو ناکۆکیەکاندا لایەنی سەرکەوتوو تەنها ئەولایەنە بوو مەلا مستەفا بارزانی رابەرایەتی دەکرد، دیارە دواجار ئەو ناکۆکیانە لەسەر دەسەڵات گەیشتنە ئاستی تەقینەوەو ساڵی ١٩٦٤ بەم جۆرەی خوارەوە دووبەرەکیو ناکۆکی ریزەکانی پ. د. كو بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردی گرتەوە.

- چەند مانگێك پاش دژە کوودەتاکەی عەبدولسەلام عارفو وەلانانی باڵی بەعس لەدەسەڵات، لە ١٠ ی شوباتی ١٩٦٤ بارزانیو حکومەتی نوێ گەیشتنە رێککەوتنی ئاشتی.

- لە کاتێکدا بارزانیو عەبدولسەلام عارف گەیشنە مۆرکردنی رێککەوتنی نێوانیان، برایم ئەحمەد کۆتایی بە گەشتەکەی ئەورووپای هێناو گەڕایەوە بۆ کوردستان، بەبیانووی بڕیاردانی لانی کەمی داخوازیەکانی کورد کەوتە دژایەتیکردنی رێککەوتنەکە.

- لە ١٩٦٤/٣/٢ برایم ئەحمەد بەناوی مەکتەبی سیاسی پارتیەوە سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد یادداشتێکی دایە حکومەت.

- زۆر بەپەلە بارزانی بەغدای لە بێئاگایی خۆی لەو یادداشتەی بەناوی مەکتەبی سیاسیەوە ئاگادارکردەوەو دەریخست کە رەزامەندی ئەوی لەسەر نەبووە.

- بەناوی مەکتەبی سیاسیەوە برایم ئەحمەد کۆنفرانسی ماوەتی رێکخستو تیایدا بڕیاری لادانی مستەفا بارزانی لەسەرۆکایەتی پارتی راگەیاند.

- لەکاردانەوەیەکی زۆر خێرادا هێزەکانی پارتیو خێڵەهاوپەیمانەکانی کۆبوونەوەو ژمارەیەکی بەشداربووی کۆنفرانسی ماوەتیان دەستگیرکرد، لەکاتێکدا ژمارەیەکیان بەرەو نادیار هەڵهاتن.

- لەو بارودۆخەدا بەسەرۆکایەتی خۆی، بارزانی کۆنگرەی شەشەمی پارتی گرێداو سەر لەنوێ پارتی رێکخستەوەو بڕیارەکانی کۆنفرانسی ماوەتی

هەڵوەشاندەوەو برایم ئەحمەدو جەلال تاڵەبانیو دوانزە ئەندامی مەکتەبی سیاسی دەرکرد.

- باڵی دابڕاوی مەکتەبی سیاسی شاڵاوێکی چڕی ڕاگەیاندنی دژ بە ڕابەرایەتی بارزانی ڕێکخستو هانی هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستانو ڕێکخستنەکانی پارتی دەدا، بەپاخیبوون لەو ڕابەرایەتیە. لەم ئاستەدا هێزی پێشمەرگەی کوردستان، بەسەر پەرشتی ئیدریس بارزانی هێرشی کردەسەر بنکەو بارەگاکانی ماوەتو ناچارکردنیان بەهەڵهاتن بەرەو سنوور.. ئەو تاقمە چەند جارێك هەوڵیاندا دەست بەسەر بارەگاکانیاندا بگرنەوە، جار دوای جار ڕووبەڕووی شکست دەبوونەوە. هاوکاتی شکست خواردنی گفتوگۆو نەگەیشتنە ئەنجام لە ئەیلولی ١٩٦٥ جارێکی دیکە دژ بە دەسەلاتی عەبدولسەلام عارف شەڕ هەلگیرسایەوە، بەنیازی گەڕانەوەی چەکدارانی باڵی برایم ئەحمەدو پارمەتیدانی شۆڕش دژ بە حکومەت، ئێران بۆ گرێدانەوەیان بەڕۆڵی ناوبژیوان خۆی دەرخست، ئەوە بوو جگە لە برایم ئەحمەد سەرکردایەتی شۆڕش بەگەڕانەوەی هەموویان ڕەزامەندی نواند.

- لەگەڵ هاتنی بەعس بۆ دەسەلات لە١٧ ی تەمموزی ١٩٦٨، بەمەبەستی کەڵك وەرگرتن لە ناکۆکی نێوان ڕیزەکانی بزووتنەوەی کوردو دوو بەشبوونی حکومەتی نوێ تەواوی سەنگو قورسایی خۆی خستە سەر کۆمەڵی دابڕاوی دژ بە سەرکردایەتی مەلا مستەفا بارزانیو لەڕووی سیاسیو سەربازیەوە پشتیوانی لێدەکرد.. ڕژێمی بەعس بەفەرمی دانی نا بەڕەوایەتی ئەو باڵە بەناوی (پ. د. ك)و ڕێگە پێدانی بەدەرکردنو بلاوکردنەوەی ڕۆژنامەی (نور)و سپاردنی سەرۆکایەتی کۆڕی زانیاری کورد بە برایم ئەحمەد. ڕژێمی بەعس هاندەری سەرەکی سەرهەڵدانەوەی شەڕی نێوان چەکدارانی لە شۆڕش دابڕاوو هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان بوو.

- چەکدارەکانی م.س هاوشانی هێزەسەربازیەکانی ڕژێم بەشداری

هێرشەكانیان بۆ سەر هێزەكانی پێشمەرگەی كوردستان دەكرد. لەگەڵ ئەوەشدا بارودۆخەكە بێ هیچ گۆڕانكاریەك وەك خۆی مایەوە. پاش تێپەڕبوونی ساڵێك لە دەسەڵاتی بەعس دا، سەرانی رژێم گەیشتنە ئەو بڕوایە نوێنەری كاریگەرو راستەقینەی بزووتنەوەی كورد تەنها مەلا مستەفا بارزانی یەو دەخوازێت لەگەڵ ئەودا بگەنە چارەسەری كێشەكەو لەگەڵ ئەوەیشدا گفتوئەنجام بدەن..

ئەوە بوو لەكۆتاییدا هەردوولا گەیشتنە مۆركردنی بەیاننامەی ١١ ی ئازاری ١٩٧٠و بڕیاردانی دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی ناوچەی كوردستان.

- دوابەدوای رێككەوتنی جەزایری ساڵی ١٩٧٥و نسكۆی شۆڕش، جەلال تاڵەبانی لەدانانی چەك كەوتە بەرهەڵستیو لەهەوڵی بەردەوام بوونو درێژە پێدانی شەڕو رووبەڕوو بوونەوەی دوژمناندا كاری دەكرد.. لەگەڵ بێ ئاگامبوونی لەو هەوڵە، هەستابەدامەزراندنی (ی. ن. ك) كەپێشتر باسی لێوەكرا.

## هەڵبژاردن

بەمەبەستی دارشتنی پڕۆژەی یاسایی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی كوردستانی عێراق، سەركردایەتی بەرەی كوردستانی، لەدادوەرەكانو پارێزەرانی كورد، لیژنەیەكی پسپۆڕیان پێكهێنا، لە ١٩٩٢/١/٢٨ پڕۆژەكە هاتە كۆتاییو لەژێر ناوی یاسای ژمارە (١) لەلایەن بەرەی كوردستانییەوە پەسەندكرا[٥٦]. دوای پەسەندكردنی یاساكە رۆژی ١٩٩٢/٥/١٧ بەرۆژی هەڵبژاردن دیاری كراو داوا لە كۆمەڵەی چاكسازی بەریتانیاكرا بەیارمەتیدانی هەڵبژاردنو چاودێریكردنیو وەلامدانەوەی كۆمەڵە ناردنو گەیاندنی پێداویستەكان بوو بەسەركردایەتی بەرەی كوردستانی، لەنێوان ئەو پێداویستیانەدا مەرەكەبی نیشانەكردنی پەنجەی دەنگدەران هۆكاری دووبارە نەبوونەوەی دەنگدان بوو. لەو رووەوە كێشەیەك سەری هەڵدا، ئەوە بوو رۆژێك پێش ئەنجامدانی هەڵبژاردن، یەكێك لە لیژنەكان

[٥٦] دیموكراتی- پەرلەمان- لەچاپكراوەكانی پ. د. ك .

لیژنەی باڵای سەرپەرشتیارو چاودێری لەئەندازەو پلەی کاریگەری مەرەکەبەکە ئاگادارکردەوە، کە زوو ئاسەوارەکەی نامێنێو کاڵ دەبێتەوەو بەئاسانی ڕێگای ساختەکاری پێ دەگیرێتەبەرو هەڵبژاردن دەخاتە بەر هەڕەشەی شکستەوە. بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە پێشتر هیچ لێکدانەوەیەکی بۆ نەکرابوو، لیژنەی باڵا بۆ چەند ڕۆژێك هەڵبژاردنی دواخست.. پاش بەدواداچوونو ڕاوێژی چڕو پڕ، مامۆستایانی کۆلێژی زانستی دەستنیشانکرانو ئەرکی چارەسەری ئەو گرفتەیان پێ سپێررا. مامۆستایان لەو کارەدا پەنایان بردەبەر (نەترانی زیوی)و دەستەبەر کردنی لەرێی تاقیگەو کارگەکانی وێنەی فۆتۆگرافەوە.. لەماوەیەکی کورتدا هەموو کارێکی پێویست ئەنجامدراو مەرەکەبی پێویست دەستەبەر کراو بەسەرتەواوی لیژنەکانی هەڵبژاردندا دابەشکراو لەکاتی دیاریکراودا هەڵبژاردن ئەنجامدرا. ئامانجی سەرەکی هەڵبژاردن لەدوو مەبەستی سەرەکیدا بەدی دەکرا..

١ - پێکهێنانی پەرلەمانی کوردستانی عێراق.

٢ - هەڵبژاردنی ڕابەری بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد.

ئەو پارتانەی لە هەڵبژاردندا بەشداریان کرد بریتی بوون لە:

١ - پارتی دیموکراتی کوردستان.

٢ - یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، بەهاوپەیمانی پارتی سۆشیالیستی کوردستان.

٣ - بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان.

٤ - بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشوری.

٥ - پارتی کۆمۆنیستی عێراق – ڕێکخستنی کوردستان-

٦ - لیستی دیموکراتی مەسیحی.

دەرەنجامی هەڵبژاردن گەیشتە ئەو ئاستە پارتی دیموکراتی کوردستان ڕێژەی (٥٠,٦٨٪)و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان (٤٩,٣٢٪)ی دەنگەکانیان بەدەستهێنا، پاش بەیەکەوە گرێدانی لیستەکانی دیکە، هێشتا نەگەیشبوونە

ڕێژەی (٧٪)ی دەنگەکان.. پارتی‌و یەکێتی ڕێککەوتن لەسەر دابەشکردنی سەد کورسی پەرلەمان لەنێوان خۆیاندا، لەکاتێکدا پێنج کورسی بۆ لیستی مەسیحیەکانیش دیاری کرا.. دوا هەنگاوی هەڵبژاردن دیاریکردنی پۆستی رابەری بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردبوو، پێکهاتبوو لە:

١ - مەسعود بارزانی

٢ - جەلال تاڵەبانی

٣ - شێخ عوسمان عەبدولعەزیز

٤ - د. مەحمود عوسمان

بەڵام ڕێژەی دەنگی بەدەستهاتووی هیچ یەکێك لەو کەسایەتیانە نەگەیشتە ئاستی وەرگرتنی پۆستی رابەر، لەو رووەوە بە پێویست زانرا هەڵبژاردنی رابەری بزووتنەوەی کورد بۆکاتێکی دیاری نەکراو دوابخرێت. دوای هەموو ڕێکخستن‌و ئامادەکاریەك رۆژی ٤ ی حوزەیرانی ١٩٩٢ بەسەرۆکایەتی جەوهەر نامق سالم لە (پ. د. ك) پەرلەمانی کوردستان یەکەم کۆبوونەوەی خۆی گرێداو تیایدا بەسەرۆکایەتی(د. فوئاد مەعسوم - ی. ن. ك) حکومەتی هەرێمی کوردستان پێکهێنرا. هەردووپارتی سەرەکی بەیەکسان کردن‌و هاوبەشی دەسەڵات قایل بوون‌و پۆستی جێگری سەرۆکی حکومەت سپێررا بە (د. رۆژنوری شاوەیس – پ. د. ك ).. جگە لەوەیش تەواوی پۆستەکانی وەزارەتەکان لەنێوان هەردوولایەنی سەرەکیدا بەیەکسانی دابەشکران، لەگەڵ بەخشینی پۆستی وەزارەتێك بەپارتی کۆمۆنیست‌و پۆستێکیش بۆ بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشووری تەرخان کرا. یەکێك لەبڕیارە گرنگەکانی پەرلەمانی کوردستان لە ١٩٩٢/١٠/٤ بڕیاری دیاریکردنی چارەنووسی ئەو سەردەمە بوو لەسەر بنەڕەتی یەکگرتنی فیدراڵی لەچوارچێوەی عێراقێکی دیموکراتی فرەلایەنی بڕوادار بە تەواوی پەیماننامە نێودەوڵەتیەکان. دواترو لەهەڵێکی دیکەدا دەگەڕێینەوە بۆدەقی ئەو بڕیارە.

## لە هاوکاریەوە بەرەو ناکۆکی

ئەو شێوازی دابەشکردنە یەکسان و هاوبەشەی لەنێوان پارتی و یەکێتی دا هاتەکایەوە شوێنەوارێکی ناکارای لەسەر ڕاییکردنی کارە ناو خۆییەکانی حکومەت بەجێ هێشت و تەگەرەو بەربەستی فراوانی لەو بارەوە دروستکرد، جگە لەوەی وەك لە ڕووی زانستیەوە دەرکەوت ململانێ و ناکۆکی جێی هەماهەنگی و هاوکاری نێوان هەردوو پارتی سەرەکی گرتەوەو کاریگەری سەنگینی هەبوو بۆ سەر لایەنەکانی بەرەی کوردستانی و قوڵترکردنەوەی کێشەکانی نێوانیان. ئەوەی زیاتر بارودۆخەکەی ئاڵۆزکردبوو، وەزیری هەر پارتێك بریکارەکەی لەپارتەکەی دیکە دەبوو، کە دەبوو دەسەڵاتی هەر وەزیرو بریکارەکەی یەکسان بوایە.. ئەم ڕەوشە لە هەردەسەڵاتێکدا ناکۆکی و ململانێی فراوانتر دەخاتەوە، ئەمە بوو ململانێی نێوان هەردوو پارتی گواستەوە بۆ ناوپێکهاتەی حکومەت و وەك پەتایەك تەشەنەی کرد.. وەزیرو بریکارو باڵاترو خوارترو تەنانەت نێوان حکومەت و سەرۆکی پەرلەمان و جێگرە کەشی گرتەوە. دەسەڵاتی سەرۆکی هەردووپارت لەدەسەڵاتی سەرۆکی حکومەت و پەرلەمان بەهێزتر بوو، بەو هۆیەوە لەو پێکهاتانە خۆیان بەدوور گرتبوو، لەکاتێکدا هەردوولا لەکێشمەکێشی گەرمدا لە هەوڵی پەرەپێدانی ڕێکخستنەکانی خۆیان بوون و جگە لەبەرژەوەندی خۆیان بیریان لە شتێکی دیکە نەدەکردەوە. دیارە لەو حاڵەتەدا جموجووڵ و کارەکانی حکومەتیش ڕەنگدانەوەی حاڵەتی کاری پارتەیەتی بوون لە سەرگۆڕەپانەکە، لەو ئاستەدا بوو هەریەکێك لەو دوولایەنە سەربەخۆ لەگەڵ پارتە بچووکەکاندا پەیمانی دەبەست و هەندێ جاریش لەناکۆکیەکاندا نزیکدەبوونەوەو دەکەوتنە ناو بەربەرەکانێکانەوە.

پاش تێپەڕاندنی حەفتەیەك لەشەڕی نێوان (ی. ن. ك)و بزووتنەوەی ئیسلامی، ئەوەبوو لەئەیلولی١٩٩٣ شەڕی نێوان (پ. د. ك)و پارتی سۆشیالیستدا ڕوویداو هەندێ ناوچەی کوردستانی گرتەوە. لەم سنوورەدا بوو (پ. د. ك) داوای

گەڕانەوەی کورد بۆ جێ بەجێکردنی دەرەنجامە راستیەکانی هەڵبژاردن، یان سەرلەنوێ ئەنجامدانەوەی هەڵبژاردنی گشتی.

## کێشەو گرفتی خاوەنداریەتی

لەکێشە دێرین و چەق بەستووەکانی عێراق بەگشتی و کوردستان و ناوچە هەستیارەکانی وەك کەرکوك بەتایبەتی، خاوەنداریەتی زەوی و خانووبەرەیە، تا کاتی نووسینی ئەم دێرانەیش ئەو کێشانە وەك خۆیان بەهەڵواسراوی ماونەتەوەو لەتەواوی هەڵە رەخساوەکاندا تەواوی هەوڵەکان روو بە شکست بوونەتەوە، بەکورتی ستراتیژییەتی پەیڕەوکراوی رژێم لە ئاستی ئەو کێشانەدا بەجۆرێك رایی دەکرا، هەر هاوڵاتیەکی کورد لەلایەن حکومەتەوە بێ سەرو شوێن دەکرا، یان بە هەر هۆکارو بیانوویەکەوە دیار نەدەما، لە پێناوی هێنانەدی نەخشەو مەبەستەکانیدا، دیارنەبوونی ئەو کەسانەی لەرۆژنامەکاندا بلاودەکردەوە وەك راگەیاندنێك ماوەیەکی بۆ گەڕانەوەی دیاریدەکرد.. ئەگەر لەو ماوەیەدا دەرنەکەوتبا، تەواوی ماڵ و سامانی گوێزراوەو نەگوازراوەی ژێر دەستەدەکرد، لەدیدگای حکومەتەوە دیارنەمانی هەر هاوڵاتیەك بەوەلێکدەرایەوە پەیوەندی کردبێت بەلایەنە بەرهەڵستکارەکانەوە، بەڕاییکردنی ئەوکارانەو لەهەنگاوێکی دیکەداتەواوی ماڵ و سامانە دەست بەسەرکراوەکەی بەناوی پیاوێکی رژێمەوە تۆماردەکرد. لەگەڵ رووداني راپەڕینی ساڵی ۱۹۹۱و جێگیربوونی دەسەلاتی کوردی گەڕانەوەو دەرکەوتنەوەی کەسایەتیەکان، بەگوێرەی پسووڵەی فەرمی و بەلگەنامەکانی خاوەنداریەتی و سەلماندنی راستی، لەگەڵ سەرهەڵدانی چەندین کێشەیشدا مافی خاوەن مافەکان وەرگیرایەوەو سەرلەنوێ ماڵ و سامانیان بەناوە رەسەن و بنەڕەتیەکانی خۆیان تۆمارکرایەوە، بەلام هەندێ جار کێشەی خاوەنداریەتی هەر ماڵ و موڵکێکی تۆمارکراو بەناوی دووکەسەوە زیاتر گرژی و ئاڵۆزی تێدەکەوت و بێ چارەسەر دەمایەوە.. کێشەی خاوەنداریەتی

موڵکێك لەقەڵادزە کەوتە مەودای چارەسەری عەشایەری، کەسی داگیرکەر سەربە (ی. ن. ك)و خاوەنە بنەڕەتیەکەی سەربە پارتی دیموکراتی کوردستان، ئەو جۆرە چارەسەرە هۆکاربوو لە نانەوەی شەڕێکی ئەوتۆ لە نێوان هەردوو پارتداو بۆماوەی چەند ساڵێك هەموولایەن‌و پێکهاتەکانی کوردستانی عێراقی گرتەوە، لەهەموو لایەکەوە هێزەکانی پێشمەرگە کەوتنە پەلاماردانی بنکەو بارەگاکانی یەکتری، هەر پارت‌و لەلایەن خۆیەوە ئێرانیان بە هەڵگیرسێنەری ئەو شەڕو فیتنەیە خەتابارکرد. ڕووداوەکانی شەڕو کوشتار بەیەکجاری بەڕێوەبەرایەتیە مەدەنییەکان‌و دامەزراوە سیاسیەکانی پەکخست‌و بووە هۆی لاوازکردن‌و داڕووخاندنی توانای بەرگریکردن لەکوردستان‌و هەڵوەشاندنەوەی وەزارەتی پێشمەرگەو سوپای بەرگری کوردستان، کەلە یەکەم پێکهاتەی فەرمیدا لەبیست‌و نۆ هەزار جەنگاوەری سەربەپارتی‌و یەکێتی‌و پارتەکانی دیکەی ناوبەرەی کوردستانی، جگە لە بزووتنەوەی ئیسلامی پێك هاتبوو. ڕووداوەکانی شەڕی نێوان پارتی‌و یەکێتی گەورەترین مەترسی بوون بۆسەردوا ڕۆژی گەلی کوردو لەدەستدانی دەستکەوتەکانی. لەپێناوی ئاشتی‌و گەیشتن بەچارەسەری کۆتایی ناکۆکی‌و گرفتەکان لە ١٩٩٤/٥/٣دا مەسعود بارزانی سەرۆکی (پ. د. ك) لەدیدگای هەستکردنی بە بەرپرسیاریەتی پەیام‌و بانگەوازی ڕاگرتنی شەڕو ئاشتبوونەوەی بەم دەقەی خوارەوە ڕاگەیاند..

بەناوی خودای مەزن:

لەگەڵ پەرۆشیمان لەسەر ئاسایشی گەلەکەمان، هەست بەوەدەکەین چارەنووسی ڕوو لە مەترسیە، هەمان کات هەستکرد نیشتیمان بەوەی لەم ڕۆژانەی دواییا چەندین جار لەقەڵادزەو ڕانییەو سلێمانی، دەستدرێژی کراوەتە سەر بنکەو بارەگاو ئەندامان‌و لایەنگرانی پارتیمان‌و زیانێکی فراوانیان پێگەیاندون‌و ئازار دراون.. لەپێناوی بەربەست‌و ڕێگریکردن لەکارەساتی ناهەموارو دڵتەزێن، داواکارم هەموو لایەك خۆڕاگربن‌و هێمنی‌و ئاسایش

بپارێزن، لەگەڵ هەرچی زووتر راگرتنی شەڕو ئاگربەست، هەروەها دەخوازم سەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی بەئامادەبوونی هەردوو مەکتەبی سیاسی (پ. د. ك)و (ی. ن. ك) سبەینێ ١٩٩٤/٥/٤ کۆبوونەوەیەك گرێبدەن بەمەبەستی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوەو چارەسەرکردنی ئەو بارودۆخە نەخوازراوەی هاتووەتە پێشەوە، وەك سەلمێنراوە هەمیشە ئێمە بەرژەوەندیە تایبەتەکانمان لە پێناوی بەرژەوەندیە باڵاکانی گەلی کوردو کوردستاندا بەختکردووە، وا ئەمجارەیش لەو پێناوەو لەپێناوی پاراستنی ماف و دەستکەوتەکانی کوردا، واز لەمافەکانی خۆمان دێنین.. بەو بۆنەیەوە سوپاسی هەڵوێستی جوامێرانەو دەست پێشخەری هێزە سیاسیەکان و کەسایەتیە خێر خوازەکان دەکەم، کە ئەو ئەرکە مەزنەیان گرتە ئەستۆو پێشەنگبوون لەچڕکردنەوەی هەوڵەکانیان لەو پێناوەدا.

سڵاوو سۆزی خودتان لەسەربێت

مەسعود بارزانی

١٩٩٤/٥/٣

لەسەر داخوازیەکەی مەسعود بارزانی سەرۆکی (پ. د. ك) ڕۆژی دواتر ١٩٩٤/٥/٤ لەهاوینە هەواری سەلاحەدین کۆبوونەوە لەنێوان هەردوو مەکتەبی سیاسیدا گرێدراو گەیشتنە ئەم رێککەوتنەی لای خوارەوە..

١ - پێکهێنانی لیژنەیەکی هاوبەش لەنوێنەرانی پارتی و یەکێتی و رووکردنە ناوچەکانی سلێمانی و کەرکوك و رانییەو قەلادزە، بەنیازی هێورکردنەوەی بارودۆخەکەو کپکردنەوەی ئاگری شەڕەکە.

٢ - لیژنەکە بەتەواوی دەسەڵاتیەوە سەردانی دهۆك و زاخۆو ئاکرێ و دەوروبەری شاری دهۆك بکات و بەجۆرێك دەست بەسەر بارودۆخەکەدا بکێشێت شەڕ روونەداتەوە.

٣ – ئازادکردنی سەرجەم بەدیل گیراوانی هەردوولا.

٤ – هەرچی زووترو بێ دواکەوتن چۆڵکردنی تەواوی بارەگا دەست بەسەردا گیراوەکان لەلایەن هێزەکانی هەردوو پارتەوە.

٥ – گێڕانەوەی تەواوی بەڵگەنامەو پسووڵەو ئامێرو پێداویستیە ژێر چەپۆك خراوەکان بۆ بارەگاکانی هەردوولا.

٦ – کشانەوەی هێزە چەکدارەکانی هەردوولا بۆ بارەگا سەرەکیەکانیان، بۆ هیچ هێزێك نییە بەهیچ شێوەیەك لێدوان و باس لەو مەسەلەیە بکات، مەگەر تەنها بەرێنمایی سەرکردایەتی هەردوولاو لەکاتی پێویستدا.

لە ئەنجامی پێکهاتنی هەردوولا لەسەر رایکردنی گفتوگۆ لەپاریس، لە تەمموزی ١٩٩٤ کۆبوونەوەی هەردوولا گەیشتە ئەنجام.. بڕیاربوو فەرەنسوامیتەران ـی سەرۆکی فەرەنسا لەسەروبەندی مۆرکردنی رێککەوتننامەکە ئامادەبێت، بەڵام هەڵوێستی بەرهەڵستکارانەی حکومەتی تورکیا لە ئاستی کێشەکەداو فشار خستنە سەر حکومەتی فەرەنسا بووە هۆی بەشداری نەکردنی میتەران.. لەو هەڵوێستەدا تورکیا مەترسی لەوە دەکرد، بەشداریکردنی سەرۆکی فەرەنسا لەوەها کۆبوونەوەیەکدا رێ خوشکەر بێت لەدامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لە کوردستانی عێراقدا.. دیارە بەو هۆیەوە رێککەوتنەکە پێش ئەوەی رووناکی ببینێ رووبەڕووی شکست بوویەوەو هیچ توانایەك لەسەرگرتنیدا نەما، بەتایبەتی پاش یەکخستنی هەوڵەکانی دەوڵەتانی سوریاو ئێران و تورکیا لەئاستی ئەو مەسەلەیەدا، کەچی دواتر هەر تورکیا بوو فشاری دەخستەسەر هەردوو پارتی کوردی بەگفتوگۆ لەگەڵ بەغدا. لەجیاتی هێوربوونەوەی بارودۆخەکەو جێ بەجێکردنی بەندەکانی رێککەوتننامەکە، جارێکی تر لەکانونی یەکەمی ١٩٩٤ شەڕەکە بەرپاکرایەوەو هێزەکانی (پ. د. ك) بارەگای شەقڵاوەی(ی ـی. ن. ك) یان داگیرکرد. لەو بارەوە جەلال تاڵەبانی هوشیاری دەداتە (پ. د. ك) بەراگرتنی شەڕو دووبارە نەکردنەوەی ئەو کارو کردەوانە. لەم ئاستەدا مەسعود

بارزانی رووبەرووی ئەم هەڵوێستە دەنووسێت‌و دەڵێت (جگە لە تێکدان‌و داڕووخاندنی بارودۆخەکە هیچ بوارێکی دیکەتان نەهێشتوەتەوە). لەسەر زەمینەی واقعدا شەڕوکوشتار لەو پەڕی توندو تیژیدا رایی دەبوو، هەر لایەنێك لەهەوڵی دەستبەسەراگرتنی ناوچەی لایەنەکەی دیکەدا بوو، کەهۆکاری ناکۆکی بەردەوامی نێوان هەردوولایەنی ناکۆك بوو. لەوکاتە پڕ تەنگژەو ئاڵۆزەدا نامە گۆڕینەوە لەنێوان هەردوو سەرکردەدا نەدەوەستاو هەریەکەو لەلایەن خۆیەوە بەرپرسیاریەتی رووداوەکانی دەخستە ئەستۆی ئەوی دیکە. بەرانبەر بەشەڕو کوشتاری ناوخۆ لە کاتێکدا دەنگی نارەزایی جەماوەر بەرزبوویەوە، لەدەوروبەری هەولێر کوشتار لەچڵەپۆپەدا بوو، هەر لەوکاتەدا بەمەبەستی رزگارکردنی گەلی کوردو دەربازکردنی لەکارەساتی شەڕو کوشتاری زیاتری ناوخۆ، کەسایەتیە کۆمەڵایەتی‌و ئایینی‌و ئەکادیمی‌و سیاسیەکان کەوتنە ناوبژیوانی‌و هاتوچۆی بەردەوام لە نێوان هەردوولایەنی ناکۆکدا، دەرئەنجام هەوڵەکان هاتنە بەرهەم‌و ئاگربەستی لێ کەوتەوە.

## تورکیا سنوور دەبەزێنێ

دەبێ کوردەکانی عێراق خۆیان کێشەو بەڵاکانی سەرسەریان کەم بێت، وا تورکیا دژ بەبنکەو بارەگاکانی چەکدارانی (پ. ك. ك) لەناو خاکی کوردستانی عێراقدا دەستدرێژی‌و هێرشی بەربڵاودەکات‌و لەژێر ناوی کردەوەی (پۆڵا) وە زیاتر لە سی وپێنج هەزار سەربازی بە پشتیوانی چەکی سەنگین‌و فڕۆکەی جەنگی بومب هاوێژەوە خستوەتە ئەو هێرشەوە، کەئاوارەبوونی بیست هەزار هاوولاتی‌و کوشتن‌و زیان پێگەیاندنی سەدانی دیکەی لێکەوتوەتەوە، جگە لە زەرەرو زیانەکانی دیکە. مەبەست وئامانجی شاراوەی تورکیا لەم هێرشە سەربازیە، ئاراستەکردنی نامەیەکی کراوە بوو روو بە رابەرانی کوردو کوردستانی باشوور (کوردستانی عێراق).

## جارێکی تر هەڵگیرسانەوەی شەڕ

بەهۆی بەردەوامی گرژیو ئاڵۆزی نێوان)پ. د. ک)و (ی. ن. ک)و چارەسەرنەبوونی خاڵە ناکۆکی لەسەرەکان، ئاگربەست ئەوندەی نەخایاند، لەهەندێ پێشیلکاریو دەستێوەردانی دەوڵەتانی دراوسێ بەمەبەستی جۆراوجۆرو زیاتر بەتین کردنی ناکۆکیەکان ئاگری شەڕ جارێکی تر هەڵگیرسایەوەو پەلاماردانەوەی یەکتری لە جاران چڕتربوویەوە. لەم سەردەمە نوێیەدا هێزەکانی (ی. ن. ک) زیاتر بالآدەستو لەپێشڕەویدا بوونو دەستیان گرت بەسەر زۆربەی ناوچەکاندا.. دیاربوو مەترسی ڕوویکردبوویە(پ. د. ک)و ناچار بوو لە پێناوی دەرچوون لەو قەیرانە داوای هاوکاری لەحکومەتی بەغدا بکات، ئەوەبوو بەرە بەیانی ١٩٩٦/٨/٣١ هێزێکی مەزنی گاردی کۆماری بەتەواوی چەکە سەنگینەکانییەوەو بە پشتیوانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بۆ چەند کاتژمێرێك پەلاماری هەولێریانداو تەواوی بارەگاکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانیان ڕاماڵی، بەو جۆرە پارتی دیموکراتی کوردستان، پاش کشانەوەی هێزەکەی گاردی کۆماری هەولێری خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. کردەوەکە لە ناوچەکەدا چەند دەستکەوتێکی خستەبەردەستی ڕژێمو سەلمێنرا کە کوردستان بەشێکی دانەبڕاوە لە عێراقو لەکیانەکەی، لەگەڵ ئەوەیشدا هەستابە دەستگیرکردنی ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتیە بەرهەڵستکارە عێراقیەکانی نیشتەجێبووی ئەو شارە. هێزەکانی (پ. د. ک) لە ١٩٩٦/٩/٩ بەرەو شاری سلێمانیو شارۆچکەکانی دەوروبەری کەوتنە پێشڕەوی، بەهۆی کشانەوەی هێزەکانی یەکێتی بەرەو سنووری ئێران، بەئاسانیو بێ گرفت دەستیان گرت بەسەر تەواوی ناوچەکاندا. دواتر جەلال تاڵەبانی هێزەکانی خۆی ڕێکخستەوەو لەڕۆژی ١٩٩٦/١٠/١٢ لەدژە هێرشێکدا بۆسەر هێزەکانی (پ. د. ک) جگە لە هەولێر

زۆربەی ناوچە لەدەست چووەکانی بۆ ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی گێڕایەوە٥٧. دوای چەند هەوڵێکی دیکەی ناوخۆیی‌و دەرەکی رۆژی ١٩٩٦/١٠/٢٣ پارتی‌و یەکێتی گەیشتنە ئاگربەست‌و کۆتایی هێنان بەسێهەم سەردەمی شەڕو کوشتار، ئاگربەستی ئەم جارە، لەناوچەکەدا واقعێکی نوێی دوو ئیدارەیی خولقاند،

یەکەم: ئیدارەیەك لەبندەستی پارتی کە لە هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستان‌و بارەگای پەرلەمان‌و سەرۆکایەتی حکومەت، دەسەڵاتی ئەم حکومەتە، ئیدارەی هەولێرو دهۆك‌و خاڵی گرنگی سنووری برایم خەلیل رێڕەوی دەرەوە لەسەر سنووری تورکیاو رێڕەوی فیشخاپوری سنووری سوریای لەسەرە، گرنگی ئەم رێڕەوانە بۆ ئیدارەی هەولێر لەوەدا دەبینرێت، ئاوارە عێراقیە پەنابەرەکان لە ئەوروپاوە لەو رێڕەوانەوە دەگەڕێنەوەو سەردانی وڵات دەکەن.

دووەم: ئیدارەیەکی دیکە لە ژێر دەسەڵاتی یەکێتی دا پێك هێنراو شاری سلێمانی‌و شارۆچکەی کۆیەو شارۆچکەی چەمچەماڵی گرتبوویەوە. دیارە دوژمنانی کورد بەرژەوەندیان لە ئاشتی ناوخۆی کوردستاندا نەبووەو نییە، بۆیە حکومەتی بەغدا چەندین جار ئاماژەی دەدایە پارتی بەشکاندنی ئاگربەست‌و درێژەدان بە شەڕو کوشتار، لەکاتێکدا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەدەست پێشخەریەکدا پێشنیاری رێککەوتنی خستەپێش هەردوو پارتی ناکۆك‌و لە ١٩٩٦/١٠/٣١ رێککەوتنی ئەنقەرەی بەدوادا هات. بەڵام دیسانەوە بەهۆی هێرشی تورکیای رۆژی ١٩٩٧/٥/١٤ بۆ سەر هەرێمی کوردستان، بەبیانووی راوەدوونانی(پ.ك.ك) رێککەوتنەکە گرفتی تێ کەوت.

---

٥٧ هەروەك(پ. د. ك) بەپشتیوانی گاردی کۆماری هێرشی کردە سەر هەولێر، هەمانشێوە (ی. ن. ك)یش بەپشتیوانی و هاوکاری سوپای پاسدارانی کۆماری ئیسلامی ئێران ئەو هێرشەی ئەنجامدا. و.ك

(پ. د. ك) پێیوابــوو زەمینــەی خــەباتی (پ. ك. ك) خــاکی کوردســتانی تورکیایەو بوونی بنکەو بارەگاکانی لە کوردستانی باشوور تەنها پێشێلکردنی سەروەری هەرێمە نەیەو لەدەروونی هاولاتیانیشدا شوێنەواری خراپو ناکار بەجێ دەهێلێتو ناچاردەکرێن بە دابینکردنی خۆراكو شوێنی حەوانەوەو ئارامگای ئەندامانی ئەو پارتەو هەندێجار ناچارکردنی لاوانیان بەچەك هەلگرتن لەڕیزەکانیاندا، بەو هۆیەوە (پ. د. ك) تاڕاستێك لەو هێرشەدا بەشداری کرد. بێگومان بوونی بنکەو بارەگاکانی (پ. ك. ك) لەو ناوچانەدا لەهەرکاتێکدا دەبێتە بیانوو، تورکیا نەك جارێك چەندین جار سنوور ببەزێنێتو چەندین کارەساتی ناهەموار بەدوای خۆیدا رابکێشێت، ئەمە لەلایەك لەلایەکی دیکەوە.. وەك تێبینی دەکرێت تەماعکاری دێرینی تورکیا بەگرێدانی ناوچەکە بەخاکی خۆیەوە بەدوور نازانرێت، لەپاشە رۆژێکی نزیکداو لەگەڵ تێپەڕاندنی کات بنکەی سەربازی جێگیر دابمەزرێتو ببێتە واقعێکی بەزۆر سەپێنراو بەسەر خاکی کوردستانی باشووردا. لە ئاکامی هەموو ئەمانەشداو وەك جارانی پێشوو ئاگربەست درێژەی نەکێشا، لەسەر لەنوێ بەپشتیوانی چەکدارانی (پ. ك. ك) یەکێتی دژ بەپارتی ئاگری شەڕی هەلگیرساندەوە.

## ئاگربەستی جێگیر و بەردەوام

هەردوولایەنی بەشەڕهاتوو گەیشتنە ئەو راستیە بەناکۆکیو ململانێ کردنی یەکتر ناگەنە ئەنجام، ئەم هەموو کوشتارو کارەساتە ناهەموارانە جگە لەدەستدانو بە فیڕۆدانی تواناو دەستکەوتەکانی گەلی کورد بەرهەمێکی دیکەی نابێت.

ئەوە بوو دوای دەست بەرسەرداگرتنی هەولێر بەفەرمانی (جەلال تاڵەبانی) لە تۆربینەکانی دووکانو دەربەندیخانەوە کارەبا بڕاو ماوەیەکی زۆر شاری هەولێر لەتاریکی تەواودا دەژیا.

## سەرەتای رێککەوتنی هەمیشەیی

سەرەتای راگرتنی شەڕو ئاگربەست، رۆژی ١٩٩٧/١٢/٢١ بەدەست پێشخەریو نامەیەکی (جەلال تاڵەبانی) بۆ (مەسعود بارزانی) نوسی کە لەنامەیەکی شایستەو دەربڕی برایەتیو دۆستایەتیدا وەڵامی دایەوە. بەو هەنگاوە دواتر چەندین نامەی دیکە لە نێوانیاندا ئاڵوگۆڕ کرا. وەك پێویست لە خوارەوە دەقی نامەکان دەخەینە بەردەست..

## دەقی نامەکەی (جەلال تاڵەبانی) بۆ (مەسعود بارزانی)

بەڕێز مەسعود بارزانی سەرۆکی پ. د. ك

سڵاوێکی گەرم

لەپێناوی بەدی هێنانی ئامانجەکانو پارێزگاری کردنی بەرژەوەندیە گشتیەکانو جێگیربوونی ئاشتیو بەردەوام بوونمان لەسەر بەدی هێنانی دەستکەوتە سەرەکیەکانی گەلی کوردستانو دروست بوونی تەباییو برایەتی لەنێوان هەردووپارتو رێکخراوە کوردستانییەکانو جەماوەری گەلی کوردستانو بنبڕکردنی شەڕی ناوخۆ بۆ هەتاهەتاییو کۆتایی هێنان بەشەڕی کوردکوژی لەکوردستان، بەو هیوایەی ساڵی نوێ بکەینە ساڵی ئاشتیو رێککەوتنو سەربەخۆییو شادبوونمان بەدیموکراتی لە پێناوی هەموو ئەمانەدا، دەستی برایەتیو رێککەوتنتان بۆ رادەکێشین، لە پێناوی رێککەوتنێکی راستەقینەی گشتگیرو جێ بەجێبوونی ئەم ئامانجانەی لای خوارەوە..

١ - ریشەکێش کردنی هۆکارەکانی شەڕی ناوخۆ.

٢ - چارەسەرکردنی سیاسی راستەقینەو دادگەری هەمووکێشەکانو ئەو مەسەلانەی ناکۆکیان لەسەرە بەشێوازی ئاشتیو دیموکراتی.

٣ - یەکخستنەوەی حکومەتی هەرێمی کوردستان و سەر لەنوێ پێکهێنانەوەی بەڕێوەبەرایەتیەکان و ڕاپیکردنی کارو ئەرکەکان، لەڕێی حکومەتی سەردەمی گواستنەوەو کێشانی دەسەڵاتی بەسەر هەموو ناوچەکاندا.

٤ - هەستانی حکومەت بەڕەخساندنی سەردەمێکی گونجاوو لەبار، سەبارەت ئەنجامدانی هەڵبژاردن و دیاری کردن و دەستنیشان کردنی ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان، کەپێکهێنانی حکومەتی داهاتوو دەکەوێتە ئەستۆی، لەگەڵ بەردەوام بوون لەسەر چارەسەرکردنی تەواوی ئەو کێشەو گرفتانەی لەگەڵ حکومەتی عێراق و حکومەتی تورکیا هەن.

٥ - ئاسایکردنەوەی بارودۆخی شارەکانی هەولێرو سلێمانی و دهۆك و هەموو شارو شارۆچکەکانی دیکەی کوردستان و بوونیان بەشارو شارۆچکەی هەموان و ناوەندی چالاکیە سیاسی و کۆمەڵایەتی و حزبیەکان بێ هەڵاوێردن کردنیان.

٦ - دیاریکردنی سەردەمێکی گونجاو بەجێ بەجێکردنی هەموو ئەوخاڵانەی لەسەریان ڕێك دەکەوێن.

لەدەست پێشخەریەکدا (ی. ن. ك) لەلایەن خۆیەوە بڕیاریدا لەسەر :

یەکەم:

ڕاگرتنی تەواوی هێرشەکانی ڕاگەیاندن، لەماوەی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا.. بەهیوای کارکردنمان لەسەر دوا بڕیارو بەردەوام بوونمان وەك هۆکارێك لە سڕینەوەی شوێنەوارەکانی شەڕی ڕاگەیاندن و گەڕانەوە بۆ شیکارە بابەتی و زانستیەکان، لە ئاستی باس کردنی کێشەو ناکۆکیەکان و ڕاجیاوازەکانی نێوانمان، بەزاڵبوونی ڕەخنەی بنیادنەری تێکەڵ بەتێگەیشتنی برایانەو دەرخستنی ڕووی ڕاستی ڕووداوەکان، لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا ڕاستەوخۆ گێڕانەوەی وزەی کارەبا بۆ شاری هەولێر لەماوەی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا.

دووەم:

خسستنە بەردەستی ئەم پێشنیارانە :

١ - ڕاگرتنی شاڵاوەکانی بەناچاری ڕاگواستنی هاوڵاتیانو پێکهێنانی لیژنەیەکی هاوبەشو بەشداریکردنی کەسایەتیە نیشتمانپەروەرو کەسایەتیەکانی ناوپارتە کوردستانییەکان، بەمەبەستی گێڕانەوەی تەواوی ڕاگوێزراوانو کۆچکردوان بۆ نیشتەجێکانی پێشوویان.

٢ - هەرچی زووتر ئازادکردنی تەواوی بەدیلگیراوانو بەندکراوانی هەردوولا.

٣ - بەزووترین کات ڕاگرتنی شاڵاوی دەرکردنو بەدواداگەڕان دژ بە ئەندامانو لایەنگرانی هەردوولاو ئەندامان ولایەنگرانی پارتە هاوپەیمانەکانمان لەهەموو شوێنێکی کوردستان.

٤ - دەستەبەرکردنی سەربەستیو ئازادکردنی بڵاوکردنەوەی ڕاگەیاندنو چالاکیە سیاسیو کۆمەڵایەتیو حزبیەکان لەسەرانسەری کوردستاندا.

سێیەم:

بەئامادەبوونی نوێنەرانی دەسەڵات پێدراوی هەردوو مەکتەبی سیاسیو بەبەشداری بەڕێز عەزیز محەممەدو نوێنەرانی هەندێ لە پارتە کوردستانییەکانو دانانی میکانیزمێك بۆجێ بەجێکردنی ئەو خاڵانەی لەسەری ڕێکدەکەوین، کۆبوونەوەیەکی بەپەلەبکرێت

چوارەم:

بەم بۆنەیەوە پ. د. ك ئاگاداردەکەین..

١ - هەڵبژاردنی یەکێك لە ڕێککەوتنە مۆرکراوە بڕیار لەسەر دراوەکانی نێوان هەردوولا، وەك ڕێککەوتنی پاریسو ڕێککەوتنی دووەم، یان گەڕانەوە بۆ بڕیارەکانی ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستان.

٢ - گەڕانەوە بۆ پێشنیارە پێشکەشکراوەکانی ئەمەریکاو بەریتانیا، لەلایەن (ڕۆبەرت دویچ)ەوە بە هەردوولا.

٣ - پێشنیارەکانی هەردوو بەڕێزان ((عەزیز محەممەدو د. مەحمود عوسمان کە لەرێی ئەنجومەنی ئاشتیو تەبایی نەتەوایەتیەوە پێشکەش کرابوون.

**پێنجەم:**

١ - بەپێی رێککەوتنی نوێنەرانی هەردوو مەکتەبی سیاسی، دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو، بەدابەشکردنی داهاتی کوردستان بەسەر تەواوی فەرمانبەرانو پرۆژەکانی ئاوەدانیو پەرەپێدانو پێشکەش کردنی خزمەتگوزاریە پێویستەکانو گرنگیدان بەخێزانی شەهیدانو پێشمەرگەی.

٢ - والأکردنی رێگای بازرگانیو ئاسانکاری گواستنەوەو گەیاندنو هاتوچۆو سەردانی خزمو کەسو کاری هەردوولا. لەکۆتاییدا بە دیدو تێڕوانینی بەرپرسیاریەتیو نیشتمانپەروەری مێژووییەوە سەرنجتان بخەنە سەر نامەکەمان وچاوەڕێی وەلأمی کاراو دروستتانین، لەگەڵ ریزماندا.

جەلال تاڵەبانی

ئەمینداری گشتی ی. ن. ک

١/ رەمەزانی/١٤١٨ ک

# دەقی وەلاّمی مەسعود بارزانی

بەڕێز جەلال تاڵەبانی- ئەمینداری گشتی ی. ن. ك

سلاّوێکی گەرم

سوپاس بۆ نامەی بەڕێزتان لە ۱۹۹۷/۱۲/۳۱..هەروەك پێشتر لەڕێی بەڕێز عەزیز محەممەدەوە ئاگادارمان کردن، دواکەوتنمان بۆچەند رۆژێك لەوەلاّم دانەوەی نامەکەتان دەگەڕێتەوە بۆ بەستنی زنجیرە کۆبوونەوەیەکی (م. س)و سەرکردایەتی پارتیمان، لەگەڵ سەرەتای ساڵی نوێدا هاتنە گرێدان، گومانی تێدا نییە شەڕو کوشتاری ناوخۆ لەچەندین لایەنی جیاوازەوە مەزنترین زیانیان بەگەلەکەمان گەیاندووە، گەلی کوردمان پێویستی بەپێشکەوتنە،و ئاشتیو تەباییو رێککەوتن ریخۆشکەرن لەپێش چارەسەری دادوەرانەو شەرەفمەندانەی کێشەی گەلەکەمانو هێنانەدی ئامانجو خواستە رەواکانی لەچوار چێوەی نیشتمانی عێراقدا. ئێمە بەردەوامین لەسەر دەست پێشخەریەکانی هاوینو پایزی رابردوو، کەلە توانادا دەبوو زۆرێك لە ئێشو ئازارو نەهامەتیەکان کەم بکاتەوە، ئەگەر خاڵەشیاوو بەجێکانی نامەی ۱۹۹۷/۱۰/۱۳ تان پێش ئەو بەروارە بوایە، ئەم پرۆژەیەی ئێستا دەخەینە روو بەئامانجی کۆتاییهێنان بەبارودۆخی شەڕی مایسی ۱۹۹٤. پێش چوونە ناو کرۆکی پرۆژەکەوە، بەشیاوی دەزانین ئەوە دووپات بکەینەوە..

أ- لەگەڵ پێشوازیکردنمان لەتەواوی هەوڵە ئاشتیخوازیە ناوخۆییو دەرەکیەکان، جێ بەجێکردنی پرۆژەکە لە چوارچێوەی کردەوەی ئاشتی ئەنقەرەدا رایدەکرێت.

ب- دۆزینەوەی شێوازێکی گونجاوو دادوەرانە لەجێی ئەزموونی پەنجابەپەنجا.

ج- ڕێکەوتنە پێشوەکان مەرجدار بوون بەکاتو سەردەمی تایبەت بەخۆیان، سەر لەنوێ گەڕانەوە بۆیانو کار لەسەرکردنیان لەتوانادا نابێتو پێویست بەئاماژە پێکردنو هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی ناکات، وەك ئاماژەیەك مۆرکردنی ڕێککەوتنی پاریس، یان پەیڕەوکردنی بڕیارەکانی پەرلەمانو حکومەتی هاوبەش، لەکاتێکدا پێویست بوو بەهەردوو لامان هەوڵی تەواوبدەین لەسەر پێکهێنانەوەی حکومەتێکی دیکەی هاوبەش.

**قۆناغی یەکەم:**

١ - قەدەغەکردنی شەڕی ناوخۆو پابەندبوون بەئاگربەست وەك بنەڕەتی گونجاو شایستەی ڕاییکردنی هەنگاوەکانی، لەگەڵ چاودێری باری سەربازی ئێستا.

٢ - کۆتاییهێنان بەبوونی (پ. ك. ك) لەکوردستانی عێراقو دەستێوەردانی زیانبەخشی بێ بیانوو لەکاروباری گەلەکەماندا.

٣ - پابەندبوون بەبنەماکانی دۆستایەتی لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێ لەهەرێمەکەو مامەڵەکردنیان لەبازنەی یاسای نێودەوڵەتیو پاراستنی یەکێتیو سەروەری خاکی عێراق.

٤ - ریسواکردنی تیرۆرو ڕێگریکردنی پەنابردن بۆ توندوتیژی لەچارەسەرکردنی کێشەکانی کوردستان.

٥ - ڕاگرتنی شاڵاوی ڕاگەیاندن، کەهۆکاری سەرەکیە لەهەژاندنو بریندارکردنی هەستەکانو نەهێشتنی بڕوای هاوڵاتیان بەکردەوەی ئاشتی.

٦ - ئازادکردنی هەموو دیلو بەندکراوانو حوکمدراوان بەهۆکاری سیاسی.

٧ - ڕاگرتنی ڕاگواستنو بەزۆر دەرکردنی هاوڵاتیانو گەڕاندنەوەی کۆچ پێکراوان بۆشاروشارۆچکەو گوندەکانیانو پارێزگاریکردنیان، لەگەڵ پێکهێنانی لیژنەیەك لەهێزە سیاسیە کوردستانییەکان، بەبەشداری

نوێنەرانی {(پ. د. ك)و (ی. ن. ك)} بەمەبەستی چاودێری کردنی ئەوکارە.

٨ - خۆدوورگرتن و دەست وەرنەدانە کاری پرۆژەو دامەزراوە خزمەتگوزاریە گشتیەکانی وەك کارەباو بازرگانی و هاتوچۆی هاولاَتیان.

٩ - بەند نەکردن و زیندانی نەکردنی هاولاَتیان بەهۆکاری سیاسی.

١٠- پێکهێنانی لیژنەیەکی پسپۆڕو شارەزا بەمەبەستی بەدواداچوون و چاودێری جێ بەجێکردنی بڕیاری ژمارە (٩٨٦)ی ئەنجومەنی ئاسایش، لەپێناوی زیاتر خزمەتکردنی گەلەکەمان بەباشترین شێوە، هەمان کات پێکهێنانی لیژنەی هاوکاریکردن وهەماهەنگی پەرەپێدانی بوارەکانی تەندروستی و پەروەردەو وزە و.هتد.

١١- ڕێگریکردن لەهەرکارێکی ناڕەواو نادروستی دژبەیەك.. وەك ئاشکرایە کردەوەی ناپەسەندو نادروست هۆکارە لەتێکدان و لەبەریەك هەڵوەشاندنی کارە پەسەندەکان.

١٢- دەستەبەرکردن و مسۆگەرکردنی کاری هاتوچۆکردنی کەسایەتیەکانی (ی. ن. ك) بۆ دەرەوەی هەرێم و تێپەڕاندنیان لە سنووری زاخۆو میکانیزمێك بۆجێ بەجێکردنی کارەکان.

١٣- هەروەك لەماوەی سالاَنی ١٩٩١ بۆ ١٩٩٤ هیچ گرفتێکی داهات لەنێوان هەردوو لادا نەبووە، ئامادەین بەشدار ویارمەتیدەریش بین لەدەستەبەرکردن وپێدانی مووچەی فەرمانبەران، لەبەڕێوەبەرایەتیەکانی ژێردەسەلاَتی (ی. ن. ك) هەروەك لە کۆبوونەوەی ١٩٩٧/١٠/٦ لەلەندەن بڕیاردرا.

١٤- پێکهێنانی لیژنەی هەماهەنگی لەهەردوو (م. س)و بەبەشداریکردنی بەڕێز عەزیز محەممەد، بەمەبەستی بەدواداچوون و رایکردنی کارەکانی ڕێککەوتنەکە.

**قۆناغی دووەم:**

هەروەك تێبینی دەكەین جێ بەجێكردنی بڕگەكانی قوناغی یەكەمی لای سەرەوە، لەتوانادا دەبێت بە شێوەیەكی ڕاستو دروست بگەینە ئاستی دڵنیاكردنی خەڵكیو چاودێرانی كردەوەی ئاشتیو بروابوون بەیەكتریو هەموولایەنە پەیوەندیدارەكان تێدەگەن لەڕاستی ڕێڕەوی كردەوەكە، هەمان كات ئاسانكاری دەبێت بۆ گەیشتن بە قۆناغی دووەم، كەدەگونجێت بەسەردەمی ئاساییكردنەوەی گشتگیرو هەمە لایەنە ناوببرێتو ڕاییكردنیشی بەمجۆرەی خوارەوە دەبێت.

١ - گەڕانەوەی پەرلەمانتارانی (ی. ن. ك) بۆ پەرلەمانو دەست بەكار بوونیانو بەشداریكردنیان لەكارەكانیدا.

٢ - لەسەر بنەڕەتی دەرەنجامە تەواو ڕاستەكانی هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٢ پێكهێنانی حكومەت بۆ سەردەمی گواستنەوەو بەبەشداری كردنی هەموو لایەنە كوردستانییەكان.

٣ - دەستەبەركردنی ئازادی كاری سیاسیو ڕاگەیاندنو ڕێكخستن، بۆ هەردوولاو هەموولایەنو هێزە كوردستانییەكانی دیكە لەسەرانسەری كوردستانی عێراق، بێ بەرچاوگرتنی ئەو شوێنانەی هێزی سەربازیان تیادایە.

٤ - كۆكردنەوەی سامانو داهاتی كوردستان لەلایەن حكومەتەوەو تەرخانكردنی مووچەی فەرمانبەرانو ئەنجامدانی پرۆژەی پێویستو بەدەستهێنانی تواناكان.. لەگەڵ بەخشینی بەردەوامی بەكردەوەی ئاساییكردنەوەی بارودۆخەكە.

٥ - هەستانی حكومەت بەئەنجامدانی سەرژمێری گشتی.

**قۆناغی سێیەم:**

بەسەرپەرشتی نێودەوڵەتیو زەمانەتی هەرسێ دەوڵەتی سەرپەرشتیاری کردەوەی ئاشتی، حکومەتی سەردەمی گواستنەوە هەڵدەستێت بەئەنجامدانی هەڵبژاردنی گشتی، لەپێش گەلو رای گشتی دا هەردوولا بەڵێن دەدەن بە پابەندبوونیان بەدەرئەنجامەکەی. لیژنەی هەماهەنگیو هاوکاری باڵا بۆ هەرقۆناغێك سەردەمێك دەستنیشان دەکاتو گواستنەوە لەقۆناغێکەوە بۆ قۆناغی دواتر، پاش راپیکردن وتەواوبوونی کارەکانی قۆناغی پێشتر دێت. گومان لەوەدانییە خاڵی هاوبەشی زۆر لە پرۆژەکەدا دەبینرێنو هۆکاردەبن لەئاسانکاری لەبەردەم کردەوەی ئاشتیدا. لەکۆتاییدا هیواداریین نامە گۆڕینەوەو ئەم پرۆژانە، لەماوەی مانگی رەمەزانی پیرۆزو لەگەڵ دەستپێکی سەرەتای ساڵی نوێدا راکێشەری خێرو خۆشیو کردنەوەی دەرگای ئاسۆیەکی نوێ بن لەهێنانە بەرهەمی برایەتیو ئاشتی هەمیشەییو هەموو رۆڵەکانی گەلەکەمان بگرێتەوە.

لەگەڵ پاکترین سڵاوو رێزدا.

مەسعود بارزانی

١٩٩٨/١/١٤

# نامەی دووەمی جەلال تاڵەبانی

بەڕێز مەسعود بارزانی — سەرۆکی پ. د. ك

سلاوێکی گەرم

وەلامدانــەوەی نامــەی پێشوومان لــە بــەرواری ۱۹۹۷/۱۲/۳۱ بــە نامــەی ڕۆژی ۱۹۹۸/۱/۱۴ تانو لە ڕێی بەڕێز (عەزیز محەممەد)ەوە، جێی ڕێزو سوپاسمانە..

(م. س) بــە گرنگیــەوە ســەرنجی داو وردبینــی لەســەر کــردو لــە نــاوەڕۆکی گەیشت، یەکسانی لە بۆچوونی لەو جۆرەو یەکگرتنەوەی ژمارەیەك لە خاڵەکانی لەگەڵ پرۆژە تەواوکاریەکەمان مایەی بەختــەوەریمان بــوو، دەگونجێت بــە خــاڵی هاوبەش تۆماریان بکەینو بە هەردوولامان بکەوینە جێ بەجێکردنیان.

بە بــڕوای ئێــوە نــاوەڕۆکی نامەکــەمان پرۆژەیــەکی تــەواوکارو گونجاوو فــرە ڕەهەنــدە.. دەگرێــت وەك پــرۆژەی ئاشــتیو لــەپێناوی بەرژەوەنــدی گشــتی دا وەربگیرێت، بەتایبەتی ئێمــە وەك مەبەستمانە پەلەکردنــە لــەدانانی میکانیزمی گفتوگــۆو ســەپاندنی ئاشــتیو هێنانــەدی ڕێککــەوتنی هەمەلایــەنو گشــتگیر، هەمانکات وەك دەردەکەوێت ژمارەیەك خاڵی جیاوازو دژبەیەکی نێوانمان هۆکارە لەدوورکەوتنــەوەمان، لەگــەڵ ئەوەشــدا لەلایــەن خۆمانــەوە بــەبیرو هــۆشو دڵســۆزیەوە هەوڵمانــدا پرۆژەکــەمان لــەدەروازەی ڕێککــەوتنو برایەتیــەوە تێپەڕێنین.. بێگومــان ڕاکــەتان پەســەند دەکــەین، شــەڕی نــاوخۆ چ لــەناوەوەو چ لەدەرەوە زیانی بەگەلەکەمان گەیاندوە.. ئێمەش ڕامان وایــە ڕێککەوتنی پاریس بــەهاوکاری ژمارەیــەك لەدەوڵــەتانی مــەزنی جیهــانو کۆکبوونیــان لەســەر دامەزراندنی چوارچێوەی کیانی فیدراڵی دیموکراتی بۆ گەلی کوردستان، هەوڵێکی مێژوویی لەدەستچووی جەماوەری گەلەکەمان بوو. ڕوونو ئاشکرایە گەشەکردنو پێشکەوتنی کوردستان تــەنها بەئاشتیەوە نەبەسراوە، بــەڵکوو پارێزگــاریکردنو هێشتنەوەو گەشــەپێکردنو پــێش خستنی ئــەزموونی دیموکراتیمــان وابەســتەی

كردەوەكە دەبێت، بێگومان ئەویش بێ چارەسەری تـەواوی كێشـەكان نایەتـەدی.. لـەم ئاراستـەیەوە، لـەو بڕوایـەداین پابەنـدبوون بـە نـاوەڕۆكی ڕێككەوتنـەكانی پێشترەوە دەستەبەركەرو بەدیهێنەری ئامانجە زیندووەكان دەبن و لـەڕووی گرنگی مێژوویانەوە چارەسەری زۆرێك لـەو كێشانە دەكەن، ئەمـە لەلایـەك، لەلایـەكی ترەوە دووركەوتنەوە لەو ئاراستەیە چ لەلایەن ئێمەوە بێت یان لەلایـەن ئێـوەوە دەمانگێڕێتەوە بۆ خاڵی سەرەتایی و سەر لەنوێ دەستپێكردنەوەی كارەكان. وەك راسـتیەك هـەموان دەزانـین قەدەغـەكردن و ریسـواكردنی شـەڕی نـاوخۆ قەدەغـەكردن و ریسـواكردنی پەلكێشـكردن و راكێشـانی هێـزە دراوسـێكانی هەرێمەكەو بەشداریكردنیان لەشەڕی ناوخۆ، نەهێشتن و قەدەغەكردنی بوونی چـەكداری (پ.ك. ك)و بەسـتنی پەیوەنـدی دۆسـتایەتی لەگـەڵ دراوسـێكان و ریسـواكردنی تـیرۆرو كوشـتن و راوەدوونـان و فڕانـدن و زینـدانی كـردن، دەستەبەركردنی دیموكراتی لەسەرانسـەری هـەرێم و زۆر مەسـەلەی دیكـە، لـەو رێككەوتنانـەدا بڕابوونـەوە. لـەو دیدگایـەوە پێویسـتە بـەوردی لـەو مەسـەلانە بكۆڵینەوەو هەندێ لەو خاڵانەی لەئاستی بەرژەوەندی و دەستكەوتی پارتەیەتیدا دەوەسـتنەوە بخرێنـە لاوە.. لەگـەڵ ئەوەشـدا سـڕینەوەی ئـەو خاڵـە گرنگـە هاوبەشانە بەچاوترو كاندنێك رەوا نییە. لەگەڵ ئەم راستیانەی ئاماژەیان پێدرا باشترەبكەوینە پێكهێنانی لیژنەی باڵای هاوبەش لەهەردوو (م. س) بـە بەشـداری مامۆستا (عـەزیز محەممـەد)، نـەك هـەر تـەنها بەمەبەستی چاودێریكردنی ئـەو خاڵانەی لەسەریان رێكدەكەوین، بەڵكوو لەپێناوی گەیشتن بەچارەسەرێكی رەواو دادپـەروەری تـەواوی مەسـەلەو كێشـە هەڵواسـراوەكان. بـاوەك دوو پـرۆژەی پێشـنیاركراو، هـەردوو نامـەكانی (ی. ن. ك)و (پ. د. ك) ی بـەرواره‌كانی ١٩٩٧/١٢/٣١و ١٩٩٨/١/١٤ بخرێنـە ژێـر لێكۆڵینـەوەو هـەنگاونان بـەرەو جـێ بەجێكردنی خاڵە هاوبەشە هاتووەكان لەهەردوو پرۆژەكەو لیژنەی باڵا بیانكاتـە سەرەتای بەتینكردنی ئاشتی و هەنگاونان بەرەو رێككـەوتنی تـەواو.. هـەمان كات

لیژنەیەکی پسپۆڕی هاوبەش پێویستە، بەمەبەستی بە دواداچوونو جێ بەجێکردنی بڕیاری (٩٨٦)ی نەتەوە یەکگرتووەکانو باشترین ڕێگای خزمەتکردن بەجەماوەری گەلەکەمان.

بەڕێز مەسعود بارزانی: لە ڕاستیدا نامانەوێت وەلامی خالّ بەخالّی نامەکەتان بدەینەوە، بەجێی دێڵین بۆ لیژنەی بالا کەلە هەردوو (م. س) پێکدێت، یا بە شێوازێکی زانستیو بابەتی دەکرێت لە ڕۆژنامەو میدیاکاندا بەهێمنی لەسەریان بدوێن، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەم خالانەدا..

١ - بەهێزکردنی ئاشتیو گەیشتن بەڕێککەوتنی گشتی (خودیو بابەتی)، ئەوەیش وەستاوە لەسەر چارەسەرکردنی هەموو مەسەلەکانو نەهێشتنو بنبڕکردنی هۆکارەکانی هەلگیرساندنی شەڕی ناوخۆو دەستەبەرکردنی داخوازیەکانی جەماوەرو گرتنە ئامێزی داخوازیە ڕەواکانی هەردوولا. خوازیارین سوور بوونو پابەندبوونمان بەئاشتیو ڕێککەوتنەوە هاندەرو پاڵنەربێت لەسەر هەرچی زووتری چارەسەرکردنی کێشەکانو لەناوبردنو بنبڕکردنی هۆکارەکانی کوشتار، ئەمەیش ڕاو بۆچوونی هاوڕێکانمانن لەئەمەریکاییو بەریتانییەکانو هەمووپارتە کوردستانیو عێراقیەکانیش.

٢ - هێوربوونەوەو ئاگربەست مانای ئاشتیو ئاشتبوونەوەو ڕێککەوتن ناگەیەنێت، بەڵکوو تەنها هەنگاوێکی سەرەتایە، درێژەدانە بەم بارودۆخەی ئێستاو جێگیرکردنی بەم شێوازە پارمەتیدەری چەسپاندنی ئاشتی نابێتو ڕێگای ڕێککەوتنی گشتی بەتەماوی دەهێڵێتەوە، دیارە ئەوەیش نەك لای کەسانو لایەنەکانی دیکە، بەڵکوو پارتە هاوپەیمانەکانی ئێوەیش بەوەڕازی نابن، ئێمە هەموومان بەپارتیو یەکێتی شەوە خوازیارین کۆتایی بەم بارودۆخەبێتو بەو پەڕی دڵسۆزیو نیازپاکیەوە بۆتانی بسەلمێنین، ئەم بارودۆخەی شەڕ سەپاندوویەتیو سوپای دەوڵەتانی دراوسێ بەشداریان تیادا کرد، دەکرا لێیان دوورە پەرێزبوونیایە، بەشداریکردنو دەستێوەردانی ئەم

دەوڵـەتو ئـەو دەوڵـەتمان پووچـەڵکردباو ڕێگـەمان نـەدابا گەمەبـە چارەنووسمان بکەنو بەردەوامبن لەسووکایەتی پێکردنمان. ئاشکرایە سوور بـوونو بەتەنگەوە هاتنمان لەسەر ئاشـتی هانـدەرمان دەبێت لـە بـەردەوام بوونمـانو گەیشـتنمان بەچارەسـەری سیاسـی دادپـەروەرو دەرچـوون لـەم بارودۆخە هەنووکەییەو هەنگاونان بەرەو ئاسۆی ڕێککەوتنی سەرانسەری.

٣ - لەنامەکەتانـدا هـاتووە (ئـەو پرۆژەیـەی سـوودمەندبێت دەبـێ لەچوارچێوەی کردەوەی ئاشتی ئەنقەرە داچێ بـەجێ بکرێـت). لەڕاستیدا ئەم دەستەواژەیەمان بۆ ڕوون نەبوویەوە، هەروەك دەزانن کـردەوەی ئاشـتی ئەنقـەرە لەتشـرینی یەکـەمی ١٩٩٦ دەسـتپێکردو پابەنـدبوونی هـەموو لایەنەکانی ڕاگەیاند، (ئەمەریکاو تورکیاو نوێنـەرانی (ی. ن. كو پ. د. ك) کەچی دواتر پارتی لەکۆی (٢٢) بەنـد تـەنها پێـنج بەنـدی ڕاگەیاندنەکەی هەڵبـژاردو بەنـدە گـرنگو بنەڕەتیـەکانی دیکـەی ڕەتکـردەوە، ئێسـتا ئێـوە تـەواوی بەنـدە ڕاگەیـەنراوەکانی تشـرینی دووەمـی ١٩٩٦ ی ئەنقـەرەتان پەسەندکردووە).

٤ - ئێوە لەلایەن خۆتانـەوە داواکاری جێگرەوەیـەکی دادگـەرو ڕاستکارانەی شێوازی (پەنجا بەپـەنجا)ی شکست خـواردوون.. لەڕاسـتیدا تائێسـتا هـەردوو لامـان بـەو شـێوازە ڕازیـن، کەچـی ئێـوە قسـەو بـاس لەدەرەنجامـەکانی هەڵبژاردنی ١٩٩٢ دەکەن، ئێمـە لـەو بڕوایـەداین دەرەنجامـەکانی هەڵبـژاردن پڕاوپـڕ بـەمجۆرە هـاتوون.. لەکـەرکوكو سـلێمانیو هـەولێر (ی. ن. ك) زۆرینـەی دەنگـەکانی بەدەسـتهێناوە، بـەڵام (پ. د. ك) تـەنها لـەدهۆك زۆرینـەی دەنگـی بەرکـەوتووە، هـەروەك لـەکاتی خۆیـدا بـەڕێز (سـامی عەبـدولڕەحمان) دەریخسـت فڕوفێـڵو دەسـتێوەردانی ئاشـکرا لـە کـردەوەی دەنگدانـدا کراو لەکاتێکـدا زیـاتر لـە سـەدو پـەنجا هـەزار دەنگـدەر لەخـەڵکی سلێمانیو کەرکوك بێبەش کران.. ئەو دووپارێزگایە دەنگیان بـە (ی. ن. ك)

داوە.. هەروەك لە كۆبوونەوەی دووقۆڵیمان لەپێش لیژنەی باڵای بەرەی كوردستانیدا دەرئەنجامەكانی هەڵبژاردنتان بەرەواو راستكار لێكدایەوە، بۆ دەبێت وەك پێشتر ئەوەتان لاپەسەند نەبێت؟.

٥ - وەك تێبینی دەكرێت بێ دیاریكردنی كات دیاریكردنی سەردەمەكان لەبەیەك گەیشتن دوورمان دەخاتەوە، باشتروایە كاتی دیاریكراویان بۆ دابنرێت.

٦ - ئێوە داخوازی داماڵینی(پە. كە. كە) لەچەك دەكەن لە كوردستانی عێراقداو دانانی سنوورێك بۆ زیانەكانیان‌و دەستێوەردانیان لە كاروباری گەلەكەمان، بەشیاوی دەزانین وەك ئەركێك رای خۆمانتان سەبارەت بە بڕگانە بۆ دەربڕین. لەكاتی خۆیدا هەردوولامان لەسەر ئەو مەسەلەیە پێكهاتین، تەنها مایەوە چۆنییەتی چەسپاندنی، بەلای ئێمەوە چارەسەری ئاشتی‌و گرتنەبەری شێوازی سیاسی‌و بەرەزامەندی لایەنەكان لەرێی گفتوگۆوە بێتە كۆتایی.) پەسەندتر بوو، نەك شەڕو كوشتار یان شان بەشانی سوپای توركیا. ئێمە بڕوامان بەوە هەیە دەستەبەركردنی ئارامی‌و جێگیركردنی ئاسایشی هەرێمی كوردستان‌و تەنانەت سنوورەكانی توركیاو ئێرانیش وەك پێویست دەكەوێتە ئەستۆی حكومەتی یەكگرتووی كوردستانەوە.. ئەوكاتە ئەگەر (پە. كە. كە) لەو سنوورە دەرچوو، وەك ئێستا پابەندەو بەڵێنی نەبەزاندنی داوە، ئەوكاتە پەنادەبرێتە بەرهەمووﻻیەنە كوردستانییەكان‌و بەرێگا چارەی سیاسی‌و جەماوەری كێشەكان چارەسەردەكرێن، بەلاّم شەڕكردنیان بەهاوكاری سوپای توركیا كردەوەیەكی نادروست‌و ناڕەوایە، نەسوود بەخش دەبێت‌و نە (پە. كە. كە) یش لەناو دەچێت. بەتایبەتی ئەزموونی پارساڵمان سەلاندی ئەم شەڕە تەنانەت بەرژەوەندی حكومەت‌و گەلی توركیایشی تیادا بەدی ناكرێت، جگە لەوەی دەبێتە هۆكاری ئێش‌و ئازارو دەردی سەری‌و مەینەتی سەخت بۆجەماوەری كوردستان بەگشتی‌و جەماوەری بادینانی شەرەفمەند بەتایبەتی،

جگە لە بەجێ هێشتنی برینێکی قووڵ لەجەستەی کوردستان و بەکوردی کردنی شەڕەکەو کوشتنی کورد بە دەستی خودی کورد.

بەڕێز مەسعود بارزانی

بەبۆنەی هاتنی جەژنی رەمەزانی پیرۆزەوە، بەناوی خۆمەوە پیرۆزبایی لەسەرکردایەتی و کادران و ئەندامانی (پ. د. ك) دەکەم، بەم بۆنە پیرۆزەوە پێشنیار دەکەم هەرچی زووتر هەردوولامان زیندانیان و دیل و دەست بەسەرداگیراوان ئازادبکرێن و بڕیاری گەڕانەوەی ئاوارەو دەربەدەران بۆ ناو کەس و کاریان و بۆسەر ماڵ و موڵکی خۆیان رابگەیەنین، لەگەڵ پێکهێنانی لیژنەیەکی تایبەت لە ژێر چاودێری بەڕێز (عەزیز محەممەد)دا بەنیازی دەستەبەرکردنی ژیان و گوزەرانی ئەوانەو تەرخانکردنی قەبارەی زیانەکانیان و قەرەبووکردنەوەیان بەشێوەیەکی گونجاو لەو داهاتە فراوانەی لە ژێر دەستی پارتیدایە. لە کۆتاییدا هیواداریـن هەوڵ و کۆششی هەردوولامان و هەوڵی هاوڕێ و دۆستانی گەلەکەمان و هەموو خێرخوازو پارتە کوردستانی و عێراقیەکان بێهوودە نەبن و بەرهەمی باشیان لێبکەوێتەوە، هەمانکات هیواداریـن ئاڵ و گۆڕکردنی نامەکانی نێوانمان، سەرەتای پێکهێنانی هەردوو لیژنەکانی بالآو تایبەت بن و دەستبەجێ بکەونە کارەکانیان بۆچارەسەرکردنی تەواوی کێشەکان و دانانی میکانیزمی جێ بەجێکردن و پەلەکردن و جێ بەجێکردنی خاڵە هاوبەشە تەواو پێویست و گرنگەکان و بەدوایاندا چارەسەرکردنی خاڵەکانی دیکەیش.. بەڵکوو بەو هۆیەوە بتوانین خۆشی و شادی بگێڕینەوە بۆ ناو دڵ و دەروونی قارەمانانی گەلی کوردستان و بەجێگیرکردنی ئاشتی و دڵنیایی و خۆشەویستی و هاوکاری و بەختەوەریان بکەین. لەگەڵ رێزمدا.

جەلال تاڵەبانی

١٩٨٨/١/٢٦

# وەڵامی دووەمی مەسعود بارزانی

بەڕێز جەلال تاڵەبانی- ئەمینداری گشتی (ی. ن. ك)..

سوپای بۆ وەڵامدانەوەی نامەی ١٩٩٨/١/١٤ مان بەنامەتان لە بەرواری ١٩٨٨/١/٢٦.. وەك پێویست دەمانەوێت چەند تێبینییەك لەسەر هەندێ خاڵی هاتووی نامەی دواییتان دەربڕین، بەهیوای رووناکی خستنە سەر راستیە مێژووییەکانو دووپاتکردنەوەی هەوڵەکانمان لە دۆزینەوەی چارەسەری دادپەروەرانەی تەواوی کێشە هەڵواسراوەکان.

١ - تێبینی لەوە دەکەین ئەم نامەیە جۆرە کشانەوەیەك بێت لەناوەڕۆکی نامەی پێشووتان بە بەرواری ١٩٩٧/١٢/٣١ کە زیاتر دروستو بەجێتر بوو.

٢ - ئێمە لەگەڵ راکەی ئێوەداین، جێگیربوونی ئاستی گەیشتن بەڕێککەوتنی گشتی پەیوەستە بەچارەسەری دادگەرانەی کێشەکانو سڕینەوەی هۆکارەکانی هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆ. ئاشکرایەلامان هۆکاری سەرەکی کێشەکانو گرێدارکردنیان دەگەڕێتەوە بۆ بنەماکانی پەنابردنە بەر هێزی چەکداری لە گۆڕانکاری بارودۆخ لە چارەسەرکردنی کێشەی دەسەڵات لەکوردستان، لەکاتێکدا پەرلەمانو حکومەتی هاوبەش هەبوو. لەو بڕوایەداین لەماوەیەکی دیاریکراودا رەخساندنی زەمینەیەکی لەبارو دەستەبەرکەر دەبێت لەگەڕانەوە بۆ رای گەل لەرێگای هەڵبژاردنێکی ئازادی سەراسەریو سەربەستو بەپشتیوانیو زەمانەتی نێودەوڵەتی، لە پێناوی گەیشتن بە چارەسەری ریشەیی کێشەکان.. هەروەك لە پرۆژەکەی پارتیدا هاتووە.

٣ - بەڵێ شەڕو کوشتاری ناوخۆ رۆڵی کاریگەری بووە لە گەیشتن بەم بارودۆخە، دیارە بەرپرسیاریەتی دەکەوێتە ئەستۆی هەڵگیرسێنەری

شەڕەکەو ئەو لایەنەی دەست پێشخەری کردوە لەپەنابردنە بەرهێزی دەرەکی. پرۆژەکەمان بە شێوازێکی دیموکراتی رێك وپێك چارەسەرکردنی بارودۆخە ناسووکەییەکەی دەستنیشانکردووە.

٤ - گومان لەوەدانییە پاش هەموو رووداوەکانی چوار ساڵی رابردوو بەمەبەستی گەیشتن بە هەڵبژاردن کردەوەی ئاشتی بەرپاگرتنی شەڕ دەستپێکرد، کۆتایی هێنان بە هەر رێککەوتنێك‌و جێگیرکردنی، پێویستی تەواوی بەچاودێری‌و زەمانەتی تەواو هەیە. ئێمە دەبینین چاودێری سێ وڵات لە کردەوەی ئاشتی ئەنقەرەو پێشوازیکردن لە هەوڵ‌و کۆششە ناوخۆیی‌و دەرەکییەکان کاریگەری خۆیان بووە، هەمان کات ترس‌و بیمی رەواهەیە کە چارەنووسی هەر رێککەوتنێك بێ چاودێریکردن‌و زەمانەتکردنی، رووبەڕووی هەمان ئەو چارەنووسە دەبێتەوە کە رووبەڕووی رێککەوتنەکانی دیکەبووەتەوە. بەو هۆیەوە تێبینی دەکەین بەرژەوەندییە هەمەلایەنەکان‌و بەرژەوەندی خودی کردەوەی ئاشتی پێویستیان بەچاودێری‌و زەمانەت هەیە.

٥ - کاتی خۆی سەبارەت بەدەرەنجامی هەڵبژاردنەکانی ١٩٩٨ زۆر وترا، ژمارەکان ئەو راستییەیان سەلماند کە پارتی لە پارێزگای دهۆك لە (٨٦٪)ی دەنگەکانی مسۆگەر کردبوو، هەمانکات لە هەولێریش پارتی زۆرینەی دەنگەکانی بەدەستهێنا، نەك (ی. ن. ك)و پارتە هاوپەیمانەکانی. لەگەڵ ئەو هەموو فروفێڵ‌و ساختەکارییە گەورەیەشدا کەلە هەردوو پارێزگاکانی سلێمانی‌و کەرکوکدا کرا کەچی پارتی لەو دوو شوێنەدا نزیکەی لە (٣٠٪) دەنگەکانی بەرکەوت.. ئەوە بوو پارتە بەشداربووەکانی هەڵبژاردن جگە لە یەکێتی لەبەیاننامەیەکدا دەرەنجامی هەڵبژاردنەکانی ئەو دوو پارێزگایەیان رەتکردەوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەسەر ئاستی کوردستان پارتی زۆرینەی دەنگەکانی بەدەستهێنا، بەلام بەهۆی هەڕەشەکانی یەکێتی

بەهەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆ، ئێمە لەسەر بنەمای (نیوە بەنیوە) ڕازی بووین‌و مافی خۆمان کردە قوربانی ڕوونەدانی شەڕ، بەو هۆیەوە لای ئێمە پەسەندنییە پاش چوارکایەی شەڕو کوشتار جارێکی دیکە بگەڕێینەوە بۆسەر ئەو سیستەمە.

٦ - هیچ کاتێك ئێمە خوازیاری ئەوە نەبووین لە ڕێگای هێزەوە چارەسەری کێشەکان بکەین، بەڵام لەماوەی پێنج ساڵی ڕابردوودا (پە. کە. کە) سێ هێرشی مەزنی کردوەتە سەر ڕۆڵەکانی کوردستانی عێراق‌و هەمیشە ویستوویەتی لەڕێی هێزەوە دەسەلاتی خۆی بەسەر گەلەکەماندا بسەپێنێ، کۆتایی هێنانی دەسەڵاتی (پە. کە. کە) تەنها داخوازی ئێمە نییە، بەڵکوو داخوازی بەرەی کوردستانی‌و حکومەتی هاوبەش‌و لایەنە سیاسیەکانە لەپەرلەمانی کوردستان.. جگە لەوە پێش هەر داخوازی‌و هەوڵی هەر لایەنێکی دیکە، یەکێتی لەگەڵ حکومەتی تورکیا گەیشتە ڕێککەوتن لەئاستی سنووردارکردنی کردەوە نادروست‌و ناڕەواکانی (پە. کە. کە) لە کوردستانی عێراقدا. جارێکی تر دەڵێین جێگیربوونی سەربازی (پە. کە. کە) لە کوردستان دەبێت بێتە کۆتایی.. ئەگەر بە شێوازی ئاشتی ئەو داخوازیە هاتەدی زۆر باشترە، بەڵام تا ئێستا لەو بارەوە ئێمە هیچ ئاماژەیەکمان وەرنەگرتووە، بۆیە هیواداریین بەمەبەستی چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە لەلایەن ئێوەوە ئامادەکاری تەواو دەرکەوێت، گومان لەوەدا نییە خۆسەپاندن‌و جێگیربوونی (پە. کە. کە) لەسەر خاکی کۆردستان بۆماوەیەکی دوورو درێژ دەبێتە یەکێك لەهۆکارە سەرەکیەکانی بەردەوامی ئاژاوەو ئالۆزی.

٧ - لەگەڵ ئەوەدا تائێستا ئێمە لەلایەن خۆمانەوە زیاتر لەسەد زیندانیمان ئازادکردووە، جێی نیگەرانییە تازە بەتازە لەم ڕۆژانەی دواییداو لەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی دا دەست دراوەتە گرتن‌و زیندانیکردنی

لایەنگرانمان، ئێمە بەختەوەر دەبین ئەگەر لیژنەیەك بۆ ئازادکردنی تەواوی زیندانیانو دەست بەسەرکراوانی هەردوولا لەپارتە کوردستانییەکان پێکبهێنرێتو ئەرکی گێڕانەوەی دوورخراوانو راگوێزراوانو بەزۆر کۆچ پێکراوان، کە بەنزیکەی شەست هەزار هاوولاتی مەزندە دەکرێن بخرێتە ئەستۆی.. لەو بڕوایەداین ئەنجامدانی ئەم کارەو فراوانکردنی هێمنیو ئارامیو جێگیرکردنی زیاتری بارودۆخەکە پێش هەموو ئەو ئەرکو کارانە دێتو پێویستە جارێکی تر رووبەڕووی چەوسانەوەو ئێشو ئازار نەبنەوە. جارێکی دیکە پشتیوانی خۆمان لەسەر پرۆژەی پارتیمان لە ١٩٩٨/١/١٤و پرۆژەی یەکێتی لە ١٩٩٧/١٢/٣١ دووپات دەکەینەوە وەك دووپرۆژەی ئامادەی لێکۆڵینەوە لەسەر کردنیان لەلایەن لیژنەی پێشنیار کراوەوە، هەمان کات خوازیاری پێکهێنانی لیژنەیەکی هەماهەنگی هاوبەشین، تایبەت بە دواداچوونو جێ بەجێکردنی بڕیاری (٩٨٦)و لیژنەیەکی دیکەی هاوکاریو هەماهەنگی لەبوارەکانی تەندروستیو پەروەردەو وزەو.. هتد.
هەروەك لەپرۆژەکەماندا هاتووە، گەلەکەمان چاوەڕێو گوێ بیستی دیدو بۆچوونەکانی هەردوو لامانەو چاوەڕێی هەنگاوەکانمانە بەرەو رێگای ئاشتیو رێککەوتن.. وەك دەزانین کاتی دەست بەرکار بوونمانە.

لەگەڵ پاکترین رێزو سڵاومان

مەسعود بارزانی

١٩٨٨/٢/٣

کەسایەتی ناسراوو ناوداری کورد (عەزیز محەممەد) ئەمینداری گشتی (ح. ش. ع) لە ئاڵوگۆڕکردنی نامەکانی نێوان (پ. د. ك)و (ی. ن. ك) وپێکهێنانی لیژنە هاوبەشەکانی هەر دوولاو لەژێر چاودێری خۆیدا رۆڵی گرنگو کاریگەری گێڕاو لە ١٩٩٨/٢/١٢ یەکەم کۆبوونەوەی گرێدا، وەك لە خوارەوەو لە راگەیاندنی رۆژنامە نووسیدا ئاماژەی داوەتە دەرەنجامەکانی کۆبوونەوەکە:

## ڕاگەیاندنی ڕۆژنامەوانی

بەئامادەبوونی مامۆستای تێکۆشەر (عەزیز محەممەد) ئەمڕۆ پێنج شەممە ڕێکەوتی ١٢/ شوباتی ١٩٩٨ هەردووشاندی مەکتەبی سیاسی (پ. د. ك)و (ی. ن. ك) کۆبوونـەوە.. شـاندی پـارتی پێکهـاتبوو لـە بـەڕێزان (سـامی عەبـدولڕەحمان وجەوهەر نامق سالمو ڕۆژ نوری شاوەیس).. هەروەها شاندی یـەکێتی پێکهاتبوو لەبەڕێزان (کەمال فوئادو عومەری سەید عەلیو ئەرسەلان بایز). گرێدانی ئـەم کۆبوونەوەیـە بەمەبەسـتی داڕشـتنی نەخشـەی ئاشـتیو لێکۆڵینـەوە لەهـەردوو پرۆژەکـە بـوو، کـە نزیکـەی چـوار کاتـژمێری خایانـدو هـەردوولا لەسـەر ئـەم خاڵانەی خوارەوە پێکهاتن:

١ - پابەنـدبوونی هـەردوولا بەئاگربەسـتو جێگیرکردنـی وپـەیڕەوکردنی شێوازی گفتوگۆ لەچارەسەرکردنی کێشەکانو هـەڵگرتنو وەلانـانی شێوازی توندوتیژی لەچارەسەرکردنی تەواوی کێشە کوردستانییەکاندا.

٢ – پابەنـد بـوون بـەڕاگرتنی شـاڵاوەکانی ڕاگەیانـدنو پڕکردنـەوەی کەلێنـەکان، لـەپێناوی گێڕانـەوەی بـڕوا بـە یـەکتربوون لـەنێوانی هـەردوولا وسەرخستنی پرۆژەی ئاشتی، وەدەبێ تـەواوی لایەنـەکان ڕاگەیاندنـەکانیان لەبەرژەوەندی کردەوەی ئاشتیدا بەکاربێنن.

٣ - ئـازادکردنی تـەواوی بـەدیلگیراوانو زینـدانیان بـێ هـیچ مـەرجێكو لـە مـاوەی یـەك هەفتـەدا. هـەردوولا ڕێککـەوتن لەسـەر بەرنامـەی جـێ بەجێکردنی ئەم بڕیارەو دەستەبەرکردنی بەشێوەیەکی گونجاو.

٤ - ڕاگرتنی کردەوەکانی ڕاگواستنو دوورخستنەوەی هاوڵاتیـانو ڕازیبـوون لەسەر کردەوەی گێڕانەوەی تەواوی ڕاگوێزراوانو ئـاوارەبوان بـۆ ناوچـەکانی خۆیانو دەست هەڵگرتن لەماڵ وسامانی دەست بەسەرکراویان.

٥ - قەدەغەکردنی ڕاوە دوونانو گرتنی هاوڵاتیان بەهۆکاری سیاسی.

٦ - پێکهێنـــانی لیژنەیـــەك لەشـــارەزایانو پســـپۆڕان، بەمەبەســـتی

بەدواداچوون‌و جێ بەجێکردنی مەسەلە پەیوەندیدارەکان بەبڕیاری (٩٨٦)و لە هەفتەی داهاتوودا کۆبوونەوەی خۆی گرێ بدات.

٧ - پێکهێنانی لیژنەی هاوبەشی هاوکار لەئاستی دەستەبەرکردنی تەواوی خزمەتگوزاریە گشتیەکانی بواری تەندروستی‌و پەروەردەو وزە و.. هتد.

٨ – کارکردن‌و بەردەوام بوون لەسەر پێشکەش کردنی خزمەتگوزاریە گشتیەکان لەبوارەکانی وزەی کارەباو ئالۆوێرکردنی بازرگانی‌و جموجوولی گواستنەوەی هاولاتیان، هەردوولا بڕیاریاندا هەفتەی دوایی لیژنەی شارەزایان‌و پسپۆڕانی تایبەت بەجێ بەجێکردنی ئەوکارانە کۆبوونەوەی خۆیان گرێ بدەن.

٩ - بڕیاردرا لەسەر بەردەوامی دیدارەکانی هەردوولاو لەهەفتەی داهاتوودا لەکات‌و شوێنی دیاریکراودا کۆبوونەوەی دووەم گرێ بدرێت.

| | |
|---|---|
| سامی عەبدولڕەحمان | د. کەمال فوئاد |
| پ. د. ك | ی. ن. ك |

# بەشی دەیەم

## سەردەمی ئەمەریکا

دوا بەداوی کۆبوونەوە بەردەوام و یەك بەدوایەکەکانی لیژنەی هاوکاریو هەماهەنگی باڵای نێوان (پ. د. ك)و (ی. ن. ك) بەسەرۆکایەتی سەرپەرشتیاری پرۆسەی ئاشتی (عەزیز محەممەد).. لیژنەکە هەفتانەو هەرجارەو لەناوچەی ژێر دەسەڵاتی لایەنێکیاندا کۆدەبوویەوە، لەگەڵ کۆتایی هاتنی هەرکۆبوونەوەیەك، سەبارەت بەگەیشتنی ئاستی چۆنییەتی چارەسەرکردنی کێشە گرێدارو هەڵواسراوەکان، راگەیاندنێکی رۆژنامەوانی بڵاودەکرایەوە، لەهەمان کاتدا مەسەلەکە وابەستەی کاتو گرێدانی چەند کۆبوونەوەیەك کرابوو، تادواجار گەیشتن بەرێککەوتنی کۆتایی. هەروەك ئێستا لەو سەردەمەدایین کەبە سەردەمی ئەمەریکا ناسراوەو لەهەمووکاروبارێکدا ئامادەیی هەیە، وەك پێویست دەکرێت رێککەوتن و پێکهاتنەوەی هەردوولایەنی کوردی لەچاودێری ئەو دوور نەبێت.. لەو ئاراستەیەوە خاتوو (مادلین ئۆلبرایت)ی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا بەمەبەستی چارەسەرکردنی کێشە گرێدارەکانی نێوانیان بانگهێشتی هەریەك لە (مەسعود بارزانیو جەلال تاڵەبانی) بۆ واشنتۆن کرد.

ئەوەبوو رۆژی ١٩٩٨/٩/١٧ لەژێر چاودێری خاتوو (ئۆلبرایت)و ئامادەبوونی جێگری یاریدەدەری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری رۆژهەلاتی ناوەڕاست (دیڤد

وێڵش)) کە دواتر کرایە باڵوێزی ئەمەریکا لە میسر، کۆبوونەوەیەک گرێدراو هەردوولا گەیشتنە مۆرکردنی ڕێککەوتننامەی ئاشتی، کەبەڕێککەوتننامەی واشنتۆن ناوبانگی بڵاو بوویەوە.. وەك لەم دەقەی خوارەوەدا هاتووە.

## ڕێککەوتننامەی ئاشتی مۆرکراوی بەرواری ١٧ی ئەیلوولی ١٩٩٨ لە واشنتۆن

بەنوێنەرایەتی (پ. د. ك)و (ی. ن. ك) سوپاسی حکومەتی ئەمەریکاو وەزیر خاتوو (ئۆلبرایت) دەکەین، بەرانبەر بەئاسانکاری کردنیان لەگرێدانی زەنجیرەیەک کۆبوونەوەو دیداری دۆستانەی بنیادنەر، بەدرێژایی ئەم چەند ڕۆژەی رابردوو لێرە لەواشنتۆن. پارمەتیدانمان لەمەدای یەکگرتنەوەو ئاشتبوونەوەمان، بەرز دەنرخێنین و هاوکاریکردنیان لەخولقاندن و هێنانە بەرهەمی چوارچێوەی هاوکاری نێوانمان لەپاشە ڕۆژدا بەرزو مەزن رادەگرین. دیدارو گفتوگۆکانی بەرەو ڕێککەوتنی تەواوو ئاشتی هەمیشەیی، بۆ ئێمەی کوردو تورکمان و ئاشووریەکانی هەرێمی کوردستان دەستکەوتی مەزن و سوودبەخش بوون. هەمان کات بەگەرمی پێشوازی دەکەین لەهەوڵ و پەیوەندیە بەردەوامەکانی تورکیاو بەریتانیاو گرێدانیان بەکردەوەی ئاشتی و ڕێککەوتن و پێك هاتنەوەی ئێمە.. دووپاتی دەکەینەوە راوێژو پرس و راکردنمان لەگەڵ ئەنقەرەو لەندەن هاتنە بەرهەم و گفتوگۆکان لەسەرکەوتنی باش و بەرچاویان لێکەوتەوە. بەپێش چاوگرتن و پەیرەوکردنی رێنماییەکانی رێککەوتنی ئەنقەرەی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨، گفتوگۆو دیدارەکانمان لەواشنتۆن گرنگیان خستبوویە سەر چۆنییەتی چاکسازی و بەڕێوەبردنی هەرێمەکەو هەرسێ پارێزگاکانی باکوورو چارەسەرکردنی ناکۆکیە سیاسیە دێرینەکانمان، بەو هۆیەوە

لـە زۆر بـواری گرنگـدا دەربـارەی چۆنییەتی جێ بـەجێکردنی ڕێککەوتنـەکان یەکانگیرو تەباو کۆکین. لـەبارێکی تـرەوە دڵنیـایی دەدەیـن بـەپارێزگاری کردنـی یەکێتی خاکی عێراقو هەرسێ پارێزگاکانی دهۆكو هەولێرو سلێمانی بەبەشێکی گرنگی خاكو دەوڵەتی عێـراق دەزانـین. پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتانو یـەکێتی نیشتیمانی کوردستان، بەنیازی پاكو بێ هیچ مەبەسـتێك بـڕوادارن بەسـنووری دیـاریکراوی نێودەوڵـەتی عێـراقو پابەنـدن بـە پاراسـتنی لـە چاوچـنۆکانو تیرۆریسـتانو دوژمنـان. هـەردوولا لـە ئاسـتی بـەدیهێنانی مافـە سیاسـیو مرۆڤایەتیـەکانی گـەلی عێـراقو زامـن کردنـی مافـەکانی گـەلی کـوردو لـەپێناوی عێراقێکـی یـەکگرتووی دیمـوکراتو فرەلایـەن کاردەکـەنو بـەو ئاراسـتەیە هەوڵەکانیان

دەخەنـە گـەڕ، کەتیایـدا تـەواوی گـەلانی عێـراق لەسـەر بنـەڕەتێکی سیاسـی بڕیاری لەسەر بدەن.

دووپاتی دەکەینـەوە هـەردوو لایـەنی پـارتیو یـەکێتی پێکەوە بەگرنگیـەوە سەرنج دەدەنە بنیاد نانەوەی عێراقی نوێ لەسـەر بنـەمای فیـدرال کـەپارێزەری یەکێتی گەلی عێراقو یەك پارچەیی خاکەکەی دەبێت. ئێمـە لـەوە گەیشتووین ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا ڕێـز لـە ویسـتو تێڕوانینـی گـەلی عێـراق دەگرێـت، بـۆ ئێمـە هـەردوولامان شـەڕی نـاوخۆ ڕیسـوادەکەینو بـەڵێن دەدەیـن ڕێگـری بکـەین لـە ڕاکێشـانی هێـزە دەرەکیـەکانو دەسـتێوەردانیان لـەکاروباری کوردسـتان، هـەمان کـات لەئاسـتی چارەسـەرکردنی ناکۆکیەکانمانـدا توندوتیـژی وەلادەنـێین. لەڕوویـەکی دیکـەوە بەهـەموو تواناکانمانـەوە هەوڵـدەدەین ئـەوانـەی سـنووری یاسا پێشـێل دەکـەن سـەربە هـەر لایـەنو تـاقمو گروپێـك بـنو هـەر پاڵنـەرێکی سیاسـیان لەپێشـەوە بێـت، بدرێنـە دەسـتی یاسـاو دادگـایی بکـرێن، جـارێکی دیکـە دووپـاتی دەکەینـەوە هـەردەم دەبـێ عێـراق ملکەچی بڕیارەکـانی ئەنجومـەنی ئاسایشـی سـەربە نەتەوەیـەکگرتووەکان بێـتو پـەیڕەوی بڕیـاری

(٦٨٨)ی سەبارەت بەمافەکانی مرۆڤ بکات.

لەپێناوی ئاساییکردنەوەی بارودۆخی کوردستان و گەیشتن بە ڕێککەوتن و ڕێزگرتنی ئاگربەس و ڕاییکردنی کارو ئەرکەکان و ئاسان کاری لە هاتوچۆکردنی هاوڵاتیان بەئازادی، هەوڵەکانمان چڕتر دەکەینەوەو ڕێگریش دەبین لە لێدوانی ناکارو نادروستەکانی ڕاگەیاندن لە ئاستی پرۆسەی ئاشتی.

## سەردەمی گواستنەوەی دەسەڵات

لەپێناوی زامنکردنی داخوازیە ڕەواکانی گەلەکەمان لە هەرێمی کوردستانی عێراق و زامنکردنی مافە مرۆیی و سیاسیەکانی، هەردوولامان هەماهەنگ و پابەندەدەر دەبین لەسەر بەهێزکردنی پێگەی لیژنەی هاوکاری باڵا. بەتێکڕای دەنگ لیژنە بڕیارەکان رادەگەیەنێت و بارودۆخی گونجاوی ڕێککەوتنی نێوان پارتی و یەکێتی دەڕەخسێنێ و کارەکانی ئاساییکردنەوەی بارودۆخی (هەولێرو سلێمانی و دهۆك) بەڕێوەدەبات و سەر لەنوێ لەسەر بنەڕەتی دەرەنجامی هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٢ بەڕێوە بەرایەتیە یەکگرتووەکان و ئەنجومەنی یەکگرتوو ڕێکدەخاتەوەو جارێکی تر دەسەڵاتی بەسەر تەواوی بەرهەم و داهاتەکاندا دەکێشێتەوەو لە بەڕێوەبردنی هەرێمەکەدا بەکاردەهێنرێت، دواهەنگاوەکانی لیژنەی باڵا سەرپەشتیارو ڕێکخەری هەڵبژاردنی نوێ و هاوکارو هەماهەنگی ئەو وەزارەتانە دەبێت خزمەتگوزاریە گشتیەکان لە ناوخۆی هەرێمی کوردستان بە خەڵکی پێشکەش دەکەن. لەئاستی ڕاپەڕاندنی کارو ئەرك و چالاکی وەزارەتەکاندا، پارتی و یەکێتی بوودجەی پێویست تەرخان دەکەن.. لە بڕیارێکیدا (پ. د. ك) گواستنەوەی بڕی داهاتی پێویست و جیاوازی خزمەتگوزاریە مرۆییەکانی لەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی خستە ئەستۆی خۆی. لەئەنجامی کێشەو ناکۆکیە پێشوەکاندا، لیژنەی باڵا هەڵدەسێت بەجێبەجێکردن و ڕاییکردنی سەر لەنوێ

کاری نیشتەجێکردنەوەی خەڵکانی بەناچار کۆچ پێکراوو راگوێزراوان و بەجێهێشتنی ماڵ و سامانەکانیان، لەپارێزگاکانی دهۆک و هەولێر و سلێمانی و گەڕاندنەوەی ئەو ماڵ و سامان و کەلوپەلی لەدەست چوویان، یان قەرەبوو کردنەوەیان. بەهاوکاری و هەماهەنگی لیژنەی بالآ پارتی و یەکێتی رێگری دەکەن لە هەر پێشێلکاری و بەزاندنی سنوورەکانی ئێران و تورکیاو بەربەستکردنی جموجووڵی تیرۆریستان لەو سنوورانەوەو دزەکردنیان بۆ ناوخاکی هەرێمی کوردستان، لەلایەکی دیکەوە هەرسێ لا هاوکار دەبن لەقەدەغەکردن و رێگریکردنی (پە. کە. کە) لەبەرپاکردن و دانانی هەر بنکەو بارەگایەك لەناو خاکی هەرێمی کوردستان، لەگەڵ هەڵگرتن و نەهێشتنی بارەگاو پەناگاکانیان لەناوچەکەداو رێگەنەدانی بەنانەوەی ئاژاوەو بشێوی و شێواندنی ئاسایش و ئارامی هەرێم و دزەکردن بۆ ناوسنووری تورکیا. لەماوەی سێ مانگی داهاتوودا، لیژنەی هاوکاری بالآ دەکۆشێت حکومەتی کاتی هاوبەشی هەرێم دابمەزرێنێت و ئەنجومەن بڕوای پێببەخشێت.

## بەڕێوەبەرایەتی هاوبەش

لەماوەی سێ مانگی پێکهێنانیدا ئەنجومەن لەتەلاری خۆی لە هەولێر یەکەم کۆبوونەوەی گرێدەدات و بەدوایدا کۆبوونەوەکانی داهاتووی لە سلێمانی و دهۆك دەبەستێت، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە روون بکرێتەوە ئەندامانی ئەنجومەنی نوێ هەمان ئەو ئەندامانە دەبن بۆ پەرلەمانی ساڵی ۱۹۹۱ هەڵبژێررابوون. دوابەدوای گرێدانی کۆبوونەوەی یەکەم، دەبێت ئەنجومەن دەسەڵاتی تەواو بدات بەهەموو ئەو بڕیارانەی لە لیژنەی بالآو لە حکومەتی هەرێمەوە دەردەچن. لەکاتی پێویستدا ئەنجومەنی کاتی بەبڕیارێك ئەرکی زیاتر دەخاتە ئەستۆی لیژنەی هاوکاری بالآ، وەك ئەرکی یەکخستنەوەی پەیوەندییەکانی هەرێم لەگەڵ کۆمەڵگای نێودەوڵەتی و چەند کارێکی هاوچەشنی دیکە. لە پێناوی زامن کردنی کارەکانی

هەڵبژاردن لە هەرێم و لەپێناوی ڕاکێشانی دەستی یارمەتی لە ئاساییکردنەوەی بارو دۆخی هەولێرو دهۆك و سلێمانی، لیژنەی باڵاو ئەنجومەن دەتوانن هێزێکی ئاسایشی هاوبەش لە یەکێتی و پارتی و تورکمان و ئاشووری یەکان دابمەزرێنن، وە لە داهاتوودا حکومەتی نوێی هەرێم دەتوانێت بڕیار بدات لەسەر کردەوەی دیکەو هەنگاونان بەرەو یەکخستنەوەی پێکهاتەو ڕێکخستنە باڵاکانی پێشمەرگەی کوردستان.

دوای هەڵبژاردنی داهاتووی پێشنیارکراو، ئەنجومەنی نوێی هەرێم جێگای ئەنجومەنی کاتی دەگرێتەوەو بەبڕواخستنەسەر هێزی هەڵبژاردەی هەموو پارتێکی بەشداربووی پەرلەمانی کوردستان حکومەتی نوێی هەرێم پێکدەهێنێ. لەگەڵ بەخشینی دەسەڵات بەحکومەتی هەرێم، ئەنجومەن و حکومەت لەماوەی سێ ساڵ لە دەسەڵاتدا دەمێننەوە.

## هاوبەشی لەداهاتەکاندا

بەهۆکاری بوونی جیاوازی لەداهاتی تەواوی ناوچەکاندا، تائەوکاتەی حکومەتی نوێی کاتی هەرێم دادەمەزرێت، بەشێوەیەکی بەردەوامی ڕێك و پێك بڕی خەرجی پێویستی ئەو وەزارەتانەی خزمەتگوزاری گشتی پێشکەش دەکەن، لەناوچەکانی (پ. د. ك) دەگوازرێتەوە بۆ ناوچەکانی (ی. ن. ك). لیژنەی هاوکاری باڵا بەڕاوێژ لەگەڵ وەزارەتەکانی باج و دەرامەت و دارایی بەرپرسیاردەبن لەدیاری کردن و تەرخان کردنی بەرهەم و دەرامەت و دابەشکردنی بەسەر تەواوی بەڕێوەبەرایەتیەکانی هەرێمدا، لەگەڵ دامەزراندنی حکومەتی کاتی هاوبەش بەرپرسیاریەتی کۆکردنەوەو دابەشکردنی هەموو داهاتەکان دەکەوێتە ئەستۆی. بە لێبوونەوە لە کردەوەی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێی هەرێم، وەزارەتی باج و دەرامەتی هەرێم جگە لەوەرگرتن و کۆکردنەوەی داهاتە هەمەچەشنەکان لەگەڵ ئەوەشدا دراوی کۆکراوە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی

حکومەتی هەرێم‌و بەپێی رێنمایی‌و بڕیاری ئەنجومەن لە خزمەت کردندا بەکاردەهێنرێت.

## بارودۆخی هەولێر و دهۆک و سلێمانی

پەرلەمان‌و لیژنەی هاوکاری باڵا هەڵدەسن بەکاری ئاسایی کردنەوەی بارودۆخی هەولێرو دهۆك‌و سلێمانی‌و شارەکانی دیکە، ئەگەر لیژنە بەشیاوو گونجاوی زانی بۆ زیاتر ئاسانکاری دەتوانێت داوای یارمەتی ناوبژیوانی نێودەوڵەتی بکات. پێویستە بەئەندازەیەکی باش بارودۆخی ئەو شارانە ئاسایی بکرێتەوە تاله توانا دابێت هەڵبژاردنێکی ئازادو دادوەر بێتەدی.

## هەڵبژاردن

ئەنجومەنی کاتی‌و لیژنەی باڵا بەرپرسیار دەبن لە رێکخستنی هەڵبژاردنی ئازادو بێگەرد، بەبڕواخستنە سەر زانیاری‌و ئامارە راگەیەنراوەکانی سەبارەت بە ژمارەی دانیشتوانی هەرسێ پارێزگاکانی باکوور، بەلەبەرچاوگرتنی دابەشبوونی رەگەزی‌و ئایینەکان لەناوچەکەدا، کەدەبێت لەماوەی شەش مانگی پاش پێکهێنانی ئەنجومەنی کاتی (سەردەمی گواستنەوە(ئەنجومەنی هەرێم پێکبهێنرێت‌و تیایدا رێژەی ئەندامانی له کوردو تورکمان‌و ئاشووری‌و کلدانەکان دیاری بکرێت. ئەگەر لەکاتی خۆیدا یارمەتی نێودەوڵەتی نەگونجا، ئەنجومەنی کاتی‌و لیژنەی باڵا بەبڕواخستنە سەر زانیاریەکانی بەردەستیان‌و بەڕاوێژکردنی پسپۆڕان‌و شارەزایانی نێودەوڵەتی‌و بڕواخستنە سەر راستترین‌و رەواترین ژمارەی دانیشتوان، بەتەنها کردەوەی سەرژمێری بەڕێوە دەبەن. بەمەبەستی وەرگرتنی یارمەتی‌و راهێنانی چاودێرە خۆجێ یەتیەکان، ئەنجومەنی کاتی‌و لیژنەی هاوکاری باڵا دەتوانن لە بەڕێوەبردنی پرۆسەی هەڵبژاردندا بانگهێشتی چاودێرانی نێودەوڵەتی بکەن.

## بارو دۆخی هەرێمی کوردستان

بڕیـــاری (٦٨٨)ی ئەنجومـــەنی ئاسایشـــی ســـەربە نەتەوەیـــەکگرتووەکان بەگرنگیەوە دەڕوانێتە ئێش‌و ئازارو مەینەتیەکانی گەلی عێراق بەگشتی‌و ئێش‌و ئازارو مەینەتیەکانی گەلی کورد بەتایبەتی. دیارە ئەگەرەکانی چەوساندنەوەو سـەرکوتکردنی گـەلی کـورد بەسـاڵی ١٩٩١ ی سـاڵی دەرچـوونی ئـەم بڕیـارەوە نەگیرساوەتەوە، بەڵکو ئەوەی جێی سەرنج‌و رامانە ساڵی رابـردوو بڕیـار نووسـی تایبەتی سەربەنەتەوە یەکگرتووەکان‌و لێپرسراوی کاروباری عێـراق، راپـۆرتێکی پێشـکەش کـرد، تیایـدا چـەندین بەڵگـەی بەهێزدەداتـە دەسـت سـەبارەت بـە ئەنجامدانی چەندین رووداوی لە سێدارە دانی بەکۆمەڵ لەبەندیخانەکانی عێراق، ئەمـەو جگـە لەبـەردەوام بـوونی رژێـم لەسـەر سیاسـەتی پاکتـاوی رەگـەزی‌و دەرکردنـی کوردو تورکمـان لەکـەرکوك‌و شـارەکانی دیکـەو دەسـتگرتن بـە سـەر تـەواوی سـامان‌و مـاڵ‌و موڵکیانـداو بەخشـینیان بەکەسـانی بەرەگـەز عـەرەبی هاوردەو نیشتەجێکراو لـەو شـارانەدا. لەسـەر رۆشـنایی هەرەشـە بەردەوامـەکان، بەسوپاسەوە ئێمە خۆمان بەمنەتباری راکێشانی دەستی پارمەتیەکانی کۆمـەڵگای نێـو دەوڵـەتی دەزانـین، بـەدابینکردنی گـەل‌و پـەل‌و پێداویسـتیە مرۆییـەکان‌و هەوڵدان لە ئاستی دووبارە نەبوونەوەی رووداوە دڵتەزین‌و پڕلە ئازارەکانی ساڵی ١٩٩١و جارێکی تر روونەدانەوەی هێرشـە سـەخت‌و مەترسـیدارەکانی ساڵانی ١٩٨٧ و١٩٨٨. نکـوولی لـەوەیش ناکرێـت، بەرنامـەی تایبـەت بەنەتـەوە یـەکگرتووەکان (نەوت بەرانبەر بەخۆراك) کاریگەریەکی مەزنی هەبوو لە سووك کردنـی تـەنگی ژیان‌و بـارودۆخی نالـەباری مرۆیی گـەلی کوردستانی عێـراق...لەگەڵ ئەوەیشدا پێشوازی گەرم دەکەین لەبەردەوامی بەرنامەکەو ئـەو بەشـە هاوکاریـە تایبەتـەی بـۆ هـەرێمی کوردسـتانی عێـراق تـەرخان کـراوە، خوازیـارین لـە پێنـاوی هەماهەنگی‌و هاوکاری باشـترو زووتـر گەیانـدنی پارمەتیـەکان، لەپاشـە رۆژێکـی نزیـك دا نووسـینگەی تایبـەت بـەکردەوە مرۆییـەکان لـە بارەگـای (Ecosoc)

دابکرێتەوە. دیسانەوە هیواداریین لەئەگەری راگرتنی (بەرنامەی نەوت بەرانبەر بەخۆراك) لەلایەن رژێمی عێراقەوە، نەتەوەیەکگرتووەکان بەردەوام بێت لەدابینکردنی پێویستیە ئابووریەکانی کوردستانی عێراق، کەبەوە بەشێکی گەورەی مەینەتیو نەهامەتیەکانی گەلی کورد چارەسەردەکرێن. هەریەك لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو کۆماری تورکیاو بەریتانیا لە رێی کردەوەی چاودێریکردنی باکوورەوە پارمەتیدەر بوون لە پاراستنی ناوچەکە، لەبەرئەوەیە داوا لەوانو لەلایەنەکانی دیکەی کۆمەلگای نێودەولەتی دەکەین، لەپێناوی پاراستنی ئاسایشی ناوچەی کوردستان زیاتر بەئاگاو چاوکراوە بن.. ئەوە لەبەرچاو دەگرین، ئەو رێکخراوە ناحکومیانەی لەهەرسێ پارێزگاکانی باکوور چالاکیەکانیان ئەنجام دەدەن، بەئەندازەیەکی دیار لەو دابڕانو دوورەپەرێزیەی تێیدابوون دەرچوون، بەچەندین رێگاو هۆکاری فراوان دەستی هاوکاریو یارمەتیان بۆمان راکێشاوە.

## دیدارەکانی داهاتووی نێوان سەرۆکی پارتیو سکرتێری یەکێتی

بەپێی رێککەوتنی هەردوو سەرۆكو سکرتێری پارتیو یەکێتی، لای کەمی دوومانگ جارێك لەناوەوە یان لەدەرەوەی کوردستان، لە شوێنێکی پێشتر دیاریکراو کۆدەبنەوە.

لەچاوەڕوانی رەزامەندی حکومەتەکاندا، بەو هیوایەی یەکەم دیدار لە ئەنقەرەو دووەم دیدار لە لەندەن بێتەکۆتایی. بێگومان دیداری یەکەم لە ئەنقەرە دەبێت، لەگەلّ ئەنجامدانی گفتوگۆو راگەیاندنی بڕیاری هاوبەش لەئاستی بنبڕکردنو رامالّینی تیرۆر دیارە جێبەجێکردنی ئەو بڕیارەش بە بەرپاکردنو دانانی پاسەوانانی توندوتۆلّو تو کمە دەکرێت لەسەر سنووری

عێراق. دوای دیدارو کۆبوونەوەی ئەنقەرەدا کۆبوونەوەی لەندەن دێتە پێشەوە، تیایدا لەکێشەو گرفتە پەیوەندیدارەکانی بارودۆخی هەولێرو دهۆك و سلێمانی دەکۆڵرێتەوەو پاریدەدەر دەبێت لەسەر جێگیرکردنی میکانیزمی بەئەنجامگەیاندنی هەڵبژاردنی ئازادو دادپەروەرو بێگەرد.

| جەلال تاڵەبانی | مەسعود بارزانی |
| --- | --- |
| یەکێتی نیشتیمانی کوردستان | پارتی دیموکراتی کوردستان |

شایەت

دیڤدوێلش

جێگری پاریدەدەری وەزیری دەرەوە

واشنتۆن

## دیاریکردنی کاتەکان

لە١٨/تشرینی یەکەم —یان پێشتر لەوکاتە.. پارتی دیموکراتی کوردستان مانگانە هەڵدەستێت بە پێشکەشکردنی یارمەتی دارایی پێویست بەو وەزارەتانەی لەناوچەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان خزمەتگوزاری پێشکەش دەکەن.

* ١٥/تشرینی یەکەم..دەستبەرکاربوونی نیشتەجێکردنەوەی خەڵکانی کۆچکردوو لەئاکامی کێشەو ناکۆکیەکانی رابردوو، وە بڕیاردان‌و رازیبوون لەسەر گێڕانەوەی سامان‌و دارایی‌و کەل‌و پەلەکانیان، یان قەرەبووکردنەوەیان لەلایەن پارتە بەرپرسەکانەوە.

* ١/تشرینی دووەم -..ڕاوێژی هاوبەش لەگەڵ حکومەتی تورکیا- هاوکاری‌و هەماهەنگی نێوان وەزارەتەکانی کاروباری مرۆیی- دیاریکردنی ئەو داهات‌و

داراییەی لەلایەن (پ. د. ك)ەوە پارمەتی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی (ی. ن. ك) ی پێدەدرێت.

* ١٥/ تشرینی دووەم..پێشکەشکردنی راپۆرتی مەودای پێشکەوتن لە نیشتەجێکردنەوە. - یەکخستنەوەی وەزارەتەکانو دابەشکردنی داهاتو بەرهەم٥٨.

بەبۆنەی مۆرکردنی رێککەوتننامەکەی نێوان (پ. د. ك)و (ی. ن. ك) .. نووسەری ئەم کتێبە دوونامەی پیرۆزبایی ئاراستەی هەردوو رابەری کورد (مەسعود بارزانیو جەلال تالەبانی) کرد، ئەوانیش بەدوو سوپاس گوزاری وەلامیان دایەوە، کەئەمەی لای خوارەوە دەقی وەلامەکەی (جەلال تالەبانی)یە..

یەکێتی نیشتیمانی کوردستان

لەندەن

١٩٩٨/١٠/٥

برام: رەجائی فاید

زۆربەگەرمی سوپاسی سۆزی برایانەتان دەکەم، هیوادارم وەك هاورێیەکی گەلی کورد پێشوازی شیاوو گونجاوتان لێبکرێت، تکام ئەوەیە جوانترینو رازاوەترین سلاوم بگەیەنە تەواوی خۆشەویستانم لەخەلکی میسر لەگەل هیوای تەمەندرێژیتان

براتان

جەلال تالەبانی/لەندەن

---

٥٨ - مەکتەبی ناوەندی راگەیاندنی (پ. د. ك) .

## ئامادە سازی شەڕ

هاوکاتی هەڵکشانی هەڕەشەکانی ساڵی ٢٠٠٢ی ئەمەریکا دژ بە عێراق، چالاکیو گەرمو گوڕی کەوتە پەیوەندیەکانی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو کوردو هێزە بەرهەڵستکارە عێراقیەکانو کەوتنە راوێژکردنو لێکۆڵینەوە سەبارەت بەوەی ئەم هێزانە چ پشتیوانیو یارمەتیەکی ئەو شەڕەو رێکخستنەوەو یەکگرتنەوەی ماڵی عێراقی سەردەمی دوای رووخانی چاوەڕوانکراوی رژێمیان لەدەستدایە، لەکاتێکدا ئەمەریکا سەرگەرمی ئامادەکردنی شانۆی کردەوەکانی شەڕی داهاتوویە.. هەروەك دیارە شانۆکە باکووری تورکیاو لە باکووری عێراقیشەوە کوردەکان دەگرێتەوە، نابێ ئەوە فەرامۆشبکرێت تورکیا بەهۆی ئەو مەسەلەیەی کەبەمەسەلەی موسڵ ناسراوە بەرانبەر بەکوردەکانی عێراق هەستیاریەکی تایبەتی هەیە، تەنانەت (بولەند ئەجەوید)ی سەرۆك وەزیرانی پێشوو لەسەرەتای هەڵبژاردنی ساڵی ٢٠٠٢ بە راشکاویو بێ پەردە رایگەیاند. موسڵو کەرکوك ئەمانەتن لەگەردنی حکومەتە یەك لەدوایەکەکانی عێراق، ئێستاکاتی وەرگرتنەوەیان هاتووە. دیارە مەسەلەی بەشداریکردنی تورکیا لەشەڕی چاوەڕوانکراودا مەترسیەکی یەکجار گەورەی دەبێت بۆ سەرکوردەکان.. کەدواتر دەچینە ئەو باسەوە. لە روانگەی ئەم خۆسازدانەوە دەتوانین سێ تێبینی بکەین..

یەکەم- بەتینکردنو بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان کوردەکانو هێزە بەرهەڵستکارە عێراقیەکانی دیکە.

دووەم- رێکخستنەوەو یەکانگیرکردنەوەی ماڵی کورد.

سێیەم- هەڵوێستی تورکیا لەناوچەکەو کاردانەوەی بەرانبەر بەو مەسەلەیە.

## یەکەم: پەیوەندی لەگەڵ هێزە بەرهەڵستکارەکان

لەو کاتەی زۆر لەحکومەتی ناوەندی لەبەغدا، کوردەکان بەسەربەخۆیی خۆیان بەڕێوە دەبەن، ناوچەی کوردستان بووەتە پەناگایەکی بەهێزی بەرهەڵستکارانی عێراق‌و هاوڵاتیانی ئاسایی، لەکاتێکدا ژینگەی ماددی‌و سیاسیان لێ بەرتەسککرابوویەوەو بەناچاری ڕێگای کۆچیان بەرەو ئەوروپا گرتبوویەبەر.. پاش جووڵانی سۆزو خۆشەو یستیان بۆ عێراق نیازی دیدارو گەیشتن بەکەس‌و کار، هەرێمی کوردستان ئارامترین‌و لەبارترین ناوچە بوو بۆ گەیشتن بەو مەرامە.. هەمان شێوە پەناگایەکی هێمن‌و خاڵی بە یەکگەیشتنی دەستەبەرهەڵستکارەکان‌و لانەی کۆبوونەوەکانیان بوو، بەڕێوەچوونی کۆبوونەوەکان لەسەرخاکی عێراق واتایەکی بەرزی دەروونیان دەبەخشی. لەکاتێکدا هەندێ دەستەو گروپی بەرهەڵستکار لەدەرەوە پەنایان گرتبوو، بەبەرهەڵستکارانی ناو (ئوتێل‌و دژەسەنگەر) ناوزەد کرابوون، هەمان کات بەرهەڵستکارانی رژێمی بەغدا لەسەر خاکی عێراق لەکوردستان تەواوی چالاکیەکانیان ئەنجام دەدا، دیارە ئەوە هۆکاربوو هەمیشە بەدیدو گیانی ڕێزەوە سەرنجەکانیان بخەنەسەر گەلی کورد. لەبەر ئەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان سەرگەرمی خۆ ئامادەکردنی شەڕبوو، جگە لە دەستەو هێزەبەرهەڵستکارو هێزە بەرگری کەرە عێراقیەکان کەسی دیکەی بەدەستەوە نەبوو لە پاشە ڕۆژی عێراقدا ڕۆڵی خۆی ببینێ، بۆیە هەر لەسەرەتاوە کەوتە هەوڵی کۆکردنەوەو یەکخستنی ریزەکانیان‌و هاوکاریکردنی نێوانیان.

لە لێدوانێکی بۆ رۆژنامەی (ئەلحەیات)ی لەندەنی لە (١١/١٠/٢٠٠٢) دا مەسعود بارزانی وتی: (پ. د. ك) لەبازنەی لایەنە بەرهەڵستکارە عێراقیەکاندا ڕۆڵی خۆی گێڕاوە، هەمان کات ڕۆڵی تایبەتی خۆی هەبووە، بەلام لەو بڕوایەدانیم بەرهەڵستکاران پێش لێدانی رژێم ڕۆڵ‌و کاریگەریەکی ئەو تۆیان بووبێت، بەڵکوو دوای ئەو لێدانە ئەو رۆڵەیان سەری هەڵدا.

لەوەڵامی پرسیار سەبارەت بەبەستنی کۆنگرەی هێزە بەرهەڵستکارەکان لە ئەوروپا (مەسعود بارزانی) وتی: (ئامانج دیاریکردنی پاشە ڕۆژی عێراق‌و چۆنییەتی شێوازی جێگرتنەوەی رژێم بوو، دیدو پێشنیاری ئێمە لەو کۆنگرەو کۆبوونەوانەدا سەبارەت بە پاشەڕۆژی عێراق دیدێکی تایبەت بوو بەسیستەمی فیدراڵی، کەبەڕای ئێمە باشترین‌و لەبارترین چارەسەرە بۆ تەواوی کێشەو گرفتە ناوخۆییەکانی عێراق). لەلێدوانێکیدا بۆهەمان ڕۆژنامە لە (٢٠٠٢/١٠/١٨) جەلال تالەبانی دەڵێت: (ڕۆڵی ی. ن. ك یەکخستنی ریزەکانی بەرهەڵستکاران بوو، ئەمەیش لەبیروبۆچوونی ئەمەریکادا چەسپی بوو، بەو هۆیەوە پەیوەندی توندو تۆڵ‌و باشمان هەبوو لەگەڵ هەموو لایەنەکانی وەك – کۆنگرەی نیشتمانی یەکگرتووو کۆمەڵەی چوارلایەن‌و ڕێکخستنەکانی دیکەی بەرهەڵستکاران. لەڕاستیدا دەربارەی گۆڕانکاری‌و ڕۆڵی ئایندەی هێزە بەرهەڵستکارەکان.. ئەمەریکاهیچ دەربڕینێکی نەبووە. بەمەزندەی من تائەم ساتەوەختیشە بڕیارێکی لەو جۆرەنەدراوە، کێ بەشداریدەکات یان ڕۆڵی دەبێت.. ئەگەری گۆڕانکاری لەچەند سیناریۆیەکداو ئەگەری داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئەمەریکیەکانەوە دەبینم، گومانی تێدانییە پاش داگیرکردنیشی وەك چۆن لەیابان مانەوە هەمان شێوە لە عێراقیشدا دەمێننەوە، بەبێ ئەوەی بەرهەڵستکارانی عێراق‌و (ی. ن. ك)و هیچ لایەنێکی دیکە ڕۆڵی ئەو تۆیان پێ ببەخشرێت.. ئەوەندە هەیە لە سیناریۆیەکدا هەمان ڕۆڵی ئەفغانییەکان لەمامەڵە کردنی بەرهەڵستکاراندا لە عێراق دووبارە دەبێتەوەو چەند مەرجێکیان لەسەر دادەنرێت).

لە درێژەی لیدوانەکەیدا پاش گەڕانەوەی لەواشنتۆن – تالەبانی- وتی: (ئەمەریکیەکان ئەوەیان نەشاردەوەو بەئێمەیان ڕاگەیاند، بەرهەڵستکاران هێزی بنەڕەتی‌و جێی بڕواو متمانەیانەو بەپیاوانی پاشەڕۆژو ڕابەرایەتی دەسەلات‌و حکومەتی داهاتووی عێراقیان دەناسن).

ماوەیەکی کەم پێش ڕوودانی شەڕ بەئامادەبوونی نوێنەری سامی ئەمەریکا بالۆیز (زەلمای خەلیل زاد) بەرهەڵستکارانی ڕژێمی بەغدا، لە لەندەن کۆنگرەیەکیان گرێداو هەردوو پارتی سەرەکی کوردی ڕۆڵی گرنگو دیاریان گێڕا، تیایدا بڕیار لەسەر سیستەمی فیدراڵی درا، وەك پەیوەندی هەرێمی کوردستان بە حکومەتی ناوەندی پاشەڕۆژی بەغداوە. دوا بەدوای کۆنگرەی لەندەن کۆنگرەی هاوینە هەواری سەلاحەدینی بارەگای (پ. د. ك) گرێدرا، بەو هەنگاوە ئەمەریکا لەگەڵ باوەڕهێنانیدا دڵنیاییدا کە بەکردەوە بزووتنەوەی کورد ڕابەرایەتی تەواوی دەستەو تاقم ولایەنە بەرهەڵستکارەکانی عێراق دەکاتو پاشە ڕۆژی ئەو ولاتە لەڕۆڵی کارای ئەو بزووتنەوەیەدا خۆی دەبینێتەوە.. وەك لە خوارەوە دیاریکراوە.

بزووتنەوەی کورد پێشەنگە لە ڕابەرایەتیکردنی دەستەو لایەنە بەرهەڵستکارە عێراقیەکاندا.

وەك بەشێك لە خاکی عێراق هەرێمی کوردستان بەخشرا بە بەرهەڵستاران بەمەبەستی ئەنجامدانی چالاکیەکانیانو کۆبوونەوەکانیان.

بزووتنەوەی کورد وتەبێژی فەرمی بەرهەڵستکاران بوو، لەو ئاراستەیەوە بیرو بۆچوونەکانی دەخستەپێش هەموان.

بزووتنەوەی کورد ڕەزامەندی لایەنە بەرهەڵستکارەکانی لە ئاستی داخوازی سیستەمی فیدراڵیو پەیوەندی بەحکومەتی ناوەندی پاشەڕۆژەوە بەدەستهێنا.. هەر چەند پاش گەیشتن بەدەسەڵات گۆڕانکاری لە هەڵوێستی هەندێك لایەندا ڕوویدا.

## دووەم: ڕێکخستنەوەی ماڵی کورد

هەرچەند ڕێککەوتنی ١٩٩٨/٩/١٧ نێوان (پ. د. ك)و (ی. ن. ك) لە واشنتۆنو لە ژێر چاودێری (مادلین ئۆلبرایت) وەزیری دەرەوەی ئەمەریکادا مۆرکرا، کەچی هێشتا پەیوەندی نێوان (پ. د. ك)و (ی. ن. ك) لە جێی خۆیدا دەبزوێتو وەك دوو دەسەڵاتو دوو بەڕێوەبەرایەتی ناوچەکە بەڕێوە دەبەنو تەنانەت سنووری نێوانیشیان هەڵنەگیراوەو دوو ئاڵای لەیەك جیاوازیشیان هەڵکردووە. لەگەڵ مانەوەی هەستیاری لە نێوانیاندا، ڕاستە شاڵاوی توندی ڕاگەیاندن ڕاگیراوەو باردودۆخەکە لە پێکدادان قوتاربووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا توندڕەوی لە هەڵوێستیاندا نەڕەوییوەتەوە، هەرلایەنەو لۆمەی هێشتنەوەی باردودۆخەکە دەخاتە ئەستۆی ئەوی دیکە. لەو ئاستەداو لە چوارچێوەی زەمینەسازیو خۆئامادەکردنی ڕووبەڕووبونەوەی ڕووداوەکانی داهاتوو، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کەوتە هەوڵی یەکخستنەوەی هەردوو بەڕێوەبەرایەتیەکەی هەولێرو سلێمانی، یان لانی کەم خولقاندنی زەمینەی هاوکاری لە نێوانیاندا. لە لێدوانیدا بۆ ڕۆژنامەی (ئەلحەیات) ڕۆژی ٢٠٠٢/١٠/١١ (مەسعود بارزانی) دەڵێت: (لەڕێی گەڕانەوەی لە واشنتۆنەوە ڕۆژی ٩/٧ بەڕێز (جەلال تاڵەبانی) سەردانی کردین، پێکەوە ڕێککەوتین لەسەر نەهێشتنو هەڵگرتنی کۆسپەکانو کارکردن لەسەر جێبەجێکردنی ڕێککەوتنی واشنتۆن، لەگەڵ ئەوەیشدا چوار لیژنەی لێکۆڵینەوەو جێبەجێکردنی کارەکان بۆ پێش گرێدانی کۆنگرەی چوارەم لەم مانگەدا پێکهێنران. زیاتر بەهۆی ئەمو مزاویبوونی گۆڕانکاریەکانو نەزانینی ڕووگەیانو لەهەستکردنمان بەبەرپرسیاریەتی لەپێش گەلەکەمانداو بەهیوای یەکخستنەوەی ماڵی کورد، بەپێویستم زانی سەردانی برای بەڕێزمان (جەلال تاڵەبانی) بکەم. دواتر لە ڕۆژی ٢٠٠٢/٢/١٨ لە هەمان ڕۆژنامەدا (جەلال تاڵەبانی) هاوکاری نێوان یەکێتیو پارتی بە دەست پێشخەری کوردیو هەوڵو کوششی کوردی دووپاتکردەوەو

دەڵێت: (جێی شانازیو خۆش حاڵیمانە رێككەوتنو لەیەك گەیشتنو نزیكبوونەوەمان دووربووە لە دەستێوەردانی دەرەكی ئەمەریكیو بەریتانیو توركی، بەڵكوو بەویستی خودی كورد هاتووەتە بەرهەمو بووەمایەی رەزامەندی فەرمی ئەمەریكا، لەكاتێكدا ئێمەو واشنتۆن لە ئاستی كێشەكاندا یەك راو یەك دەنگین، هەمان كات لەپشتیوانیكردنی ئەمەریكا بەئەندازەیەك بەدەرنەبوو)

پەرلەمانی كوردستان لەبارەگای خۆی لە هەولێر رۆژی ٢٠٠٢/١٠/٤ بە سەرۆكایەتی (د. رۆژنوری شاوەیس)و بەئامادەبوونی بەرێزان (مەسعود بارزانیو جەلال تاڵەبانی) كۆبوونەوەی یەكبوونو یەكخستنەوەی گرێدا.. لەو كۆبوونەوەیەدا خاتوو (دانیال میتەران)ی هاوسەری سەرۆكی لە دنیا دەرچووی فەرنسا (فەرەنسوا میتەران) ی دۆستی گەلی كورد ئامادەبوو هەردووسەركردەی كورد (بارزانیو تاڵەبانی) لەدوو وتاری دۆستانەی پرسۆزدا دەرگای وتووێژەكانیان بۆ سەرۆكو ئەندامانی پەرلەمان واڵا كرد. ئەنجومەن بەكۆی دەنگ بڕیاری رەزامەندی لەسەر رێككەوتنی واشنتۆنی ساڵی ١٩٩٨ راگەیاندو ئەركی جێبەجێكردنی هەرچی زووتری بەندەكانی رێككەوتنەكەی دیاریكرد. وەك پێویست ئەنجومەن بەهەلوەرگرتن لەكاتو ساتی كۆبوونەوەی یەكبوون، بەم دەقەی خوارەوە برووسكەی پیرۆزبایی لە (كۆلن پاوڵ) ی وەزیری دەرەوەی ئەمەریكا پێگەیشت..

٤ ی تشرینی یەكەمی ٢٠٠٢

بۆ كۆبوونەوەی هاوبەشی پەرلەمانی كوردستان لەئاستی كۆبوونەوەی هاوبەشی ئەنجومەنەكەتان (پەرلەمانی كوردستان) پیرۆزبایی خۆمانتان ئاراستە دەكەین، لەپێناوی گەیشتن بەم وێستگەیە رێگایەكی دوورو درێژو هەندێك كات قورسو گرانتان بڕی.. دەبینین لە هۆڵی ئەنجومەندا پێكەوە دادەنیشنەوە، لەودیدگایەوە، هەستدەكەین ئەم یەككرتنەوەیەتان پابەندبوونتانە لەبەدیهێنانی

ئاسایش‌و خۆشگوزەرانی‌و ئازادی بۆسەرجەمی عێراقیەکان، ئەگەر لەنیشتیمانی خۆتاندا بێت کە ئێوە نوێنەرایەتی دەکەن، یان لەخاکی عێراقدا.. بێگومان هێنانەدی حکومەتێکی پەرلەمانی، کارێکی هێندە ئاسان نییەو بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان پێویست بە قوربانیدان دەکات. ئەم دانیشتنە مێژووییە سەلماندی تاچ ئاستێك ئێوە هەست بە کرۆکی ڕاستیەکان دەکەن.. بەو هەنگاوەتان‌و بەقوربانیدانتان توانیتان بەرەو چارەسەرکردنی کێشەکانتان ببنەوەو بەسەر ستەمەکانی ڕابردوودا تێپەڕن.. ئەوەیش لە ئەمڕۆدا دیارە کەوەك دەستەیەکی دڵسۆزو ڕاوێژکاری لەیەکگەیشتوو کۆبوونەتەوە. بەبڕوای ئێمە ڕێگای بەردەستتان ڕێگایەکی سەخت‌و ناهەموارو گرانەو لەم خەباتەتاندا هیوای پاشەڕۆژێکی گەش‌و پرشنگدار بۆ ناوچەکەتان‌و بۆ عێراق دەبینرێت.

من هاندەرتانم لەسەر بەردەوام بوونتان لەتێپەڕاندنی ئەم ڕێگایەو بەهەمان گیانی لێبووردەیی‌و یەکێتی‌و یەکسانییەی ئێوەی گەیاندوەتە ئەم وێستگەیەی ئەمڕۆ کاربکەن. لەگەڵ شانازی کردنم بە ئێوەوە، بەهاوپەیمان‌و هاوبەشی ویلایەتەیەکگرتووەکانتان دادەنێم لەشەڕی دژەتیرۆردا.. بەڕاستی ئێوە بەشدارن لەدیدو بۆچوونەکانمان لەئاستی پاشەڕۆژی عێراقێکی یەکگرتووی دیموکراتی‌و پارێزراو بە یەکێتی خاکی هەرێمایەتیتان‌و لەدامەزراندنی حکومەتێك ڕێز لەدەسەڵاتی یاساو مافی هەموان بگرێت. داواکارم لەپەروەردگاری مەزن ئەزموونەکەتان بڵاوببێتەوە تا ئەو ڕۆژەی بەچاوی خۆمان ببینین کە تیایدا عێراقیەکان یەکدەگرن‌و ڕزگاریان دەبێت‌و ئاسوودەیی‌و سەربەخۆیی،و خۆشگوزەرانییەك کەشیاویانە بەدەستی بێننەوە.

کۆلن پاوڵ

وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا

لەلایەن خۆیەوە ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانی عێراق بەم جۆرە وەڵامی نامەکەی (کۆلن پاول)ی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکای دایەوە:

(بەڕێز کۆلن پاول)

وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا – واشنتۆن D.C –

بە بەختیاریەوە ڕێزو سوپاسی بێ پایانمان ئاراستەی بەڕێزتان دەکەین سەبارەت بەو نامە پڕسۆزەی ئاراستەی کۆبوونەوەی مێژوویی و هاوبەشی پەرلەمانی کوردستانتان کردبوو.. دیارە دەقی نامەکەتان هاندەرمانە لەسەر چالاککردنی کارەکانمان و گوڕو تین دان بەو ڕەوشە دیموکراتیەی بەتەواوی تواناوە پێوەی پابەندین.. دڵنیابن ئەوندەی لەتوانامانـدا بێت لە پێناوی پتەوکردنی پایەی ئەنجومەنی یەکگرتوودا هەوڵەکانمان دەخەینەگەڕو تواناکانمان یەکدەخەین.. لەڕاستیدا نامەکەتان زیاتر زیندوکردنەوەو چالاکی خستە ناخمان، نەك هەر لە رووی دانناننتان بە خەبات و تێکۆشانی لە مێژینەی رەوای گەلەکەمان و وەستانتان لەگەڵمان دژبە چەوساندنەوەو لەپێناوی هێنادی دیموکراتی لەهەرێمەکەماندا. نامەکەتان دڵنیا بەخشە لەسەر هاوکاری و پشتیوانی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە خواست و مافە رواکانمان و خەباتمان لە پێناوی بنیادنانی عێراقێکی دیموکراتی و فرەلایەنی یەکگرتووی دامەزراو لەسەر بنەمای دەستووری و کارکردن لەسەر چەسپاندنی سەروەری یاسا و ڕێزگرتن لەمافەکانی مرۆڤ. گومان لەوەدانییە ئەم دیدو لەبەر چاوگرتنەتان ڕۆڵی کارای دەبێت لەسەر پاشەڕۆژی نیشتمانەکەمان، جگە لەوە هۆکارێکە لەسەر بزواندنی ویست و هەستی کوردەکانی عێراق و کاریگەری سەرناخیان، هەمان کات پشتیوانیتان زیاتر پاڵنەرمان دەبێت زیاتر هەوڵەکانمان چڕبکەینەوە لە پێناوی هێنانەدی زیاتر سەربەستی و ئازادی گەلی عێراق بەگشتی، کە مەخابن ئەو بەدیهێنانە زۆر دواکەوت. ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان وەك دامەزراوێکی

هەڵبژێرراوی گەلی کورد لە عێراق، شانازی دەکات بە راپەڕاندنی ئەرك‌و رۆڵی خۆی لەدەست پێشخەریدا وەك پێشەنگ لەدامەزراندنی حکومەتێکی بەرپرس لە زامن کردنی دەوڵەتی یاساو بنیادنانی کۆمەڵگایەکی مەدەنی سەربەخۆ لەگەڵ تەشەنەکردنی دادپەروەری تیایدا. تەواوی ئەندامانی ئەنجومەن هەست بەو راستیە دەکەن، یەکبوون‌و یەکخستنی گوتاری سیاسی‌و هاتنەدی ئامانجە هەنووکەییەکان لەم کاتەدا گرنگی مەزنیان دەبێت، پابەندبوونمان بەکارو ئەرکی هاوبەش، هەڵقوڵاوی ناخی هەموانەو بەدیهاتنی ئامانجەکانیش لەئاکامی هەوڵ‌و تێکۆشان‌و ماندووبوونی هەموو پارتەکانە، لەپێناوی کۆکردنەوەو کۆدەنگی لە پەرلەمانی کوردستان‌و کارکردن بۆ هەرچی زووتر گەیشتن بەجێبەجێکردنی رێککەوتننامەی واشنتۆن. لەکاتێکدا بەرەو پاشە رۆژێکی گەشی پڕ لە ئەگەر دەبینەوە، سەر لەنوێ پشتیوانی‌و هاوکاری ویلایەتە یەکگرتووەکان دەکەین لە شەڕی دژبە تیرۆرو بەتەواوی تواناکانمانەوە دژ بەو لایەن‌و کۆمەڵانە دەجەنگین هەڕەشە لە دیموکراتی‌و ئازادی دەکەن. جارێکی دیکە بەرانبەر بەپارێزگاریکردنی ئەزموونی کوردستانی عێراق سوپاس‌و پێزانینمان ئاراستەی گەل‌و حکومەتی ئەمەریکا دەکەین، گەورەترین هیوامان لەوەدایە بتوانین ئەم ئەزموونە لەخزمەتی بەرژەوەندی کوردو تورکمان‌و کلدانەکاندا بێت‌و پێگەی بەهێزترو رۆڵی کاریگەر بێت لە گۆڕانکاریەکان‌و لەهێنانەدی عێراقێکی ئازادو دیموکرات‌و یەکگرتوو.

د. رۆژنوری شاوەیش

لەبری تەواوی ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان

کۆبوونەوەی هاوبەشی یەکبوون، یەکەم کۆبوونەوەی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانە، پیرۆزمەندیو پشتیوانی تەواوی پارتە کوردیەکانو لایەنە بەرهەڵستکارە عێراقیەکانو چەندین کەسایەتی عەرەبیو نێودەوڵەتی بەدەستهێنا. لایەنە پەیوەندیدارەکان بڕیاریاندا کۆبوونەوەکانی داهاتووی ئەنجومەن بەسەرۆکایەتی (د. رۆژنوری ئاوەیس)و (د.کەمال فوئاد) لەبارەگاکانی هەردووپارت لە سلێمانیو هەولێر گرێدەدرێن.

## دیداری لووتکەو لووتکەی دیدار

لەژێرئەم ناونیشانەدا رۆژنامەی (الأتحاد) ی زمانحاڵی (ی. ن. ك) لەسەرووتاری خۆیدا دەڵێت.. (دیداری رۆژی شەممەی رابردووی نێوان بەڕێزان (مام جەلالو مەسعود بارزانی) سەرۆکی (پ. د. ك)و بەئامادەبوونی هەردوو (م.س) ی یەکێتیو پارتی لە هاوینەهەواری دووکان کۆبوونەوەیەکی گرنگ گرێدرا، گرنگی دیدارەکە لە زیاتر قووڵبوونەوەی ئەو بڕوایەوە هات، کەلە ئەیلولی ١٩٩٨و لە رێککەوتنی واشنتۆندا بنیادنراو بەسەردانە بەردەوامەکانی (مام جەلال) لە هاوینە هەواری سەلاحەدینو کۆبوونەوەکانی لیژنەی بالآی ئاشتی هاوبەشی هەردوولا بەهێزکرا.. بەتایبەتی مۆرکردنی رێککەوتننامەی لەیەك گەیشتن (تفاهم)ی سەرەتای ئەیلولی ٢٠٠٢ ی کاتی سەردانەکەی بەڕێز (مام جەلال) بۆ سەلاحەدین، زیاتر پاڵنەری بەرەوپێشبردنی مەسەلەکان بوو. لەسەر ئەو بنەڕەتەو بەنیازی پەلەکردن لە جێبەجێکردنی رێککەوتنی واشنتۆن، چوار لیژنەی پسپۆ رو شارەزا پێکهێنرانو بەکردەوە کارەکانیان ئەنجامدا. نکولی لەوە ناکرێت دیدارو سەردانە بەردەوامەکان رێخۆشکەربوون لە پێش زیندووکردنەوەی کاری ئەنجومەنو دەستپێکردنەوەی کۆبوونەوەکان بۆ سەردەمێکی نوێ کەبەسەردەمی گواستنەوە ناسرا. بڕیاربوو بە ئامادەبوونی

هەردوو بەڕێزان (بارزانیو تاڵەبانی) یەکەم کۆبوونەوەی پەرلەمان گرێبدرێت. دیارە گرێدانی ئەو کۆبوونەوەیە راگەیاندنی چوونە ناوسەردەمێکی نویٚ بوو، نەك تەنها لە نێوان (پ. د. ك)و (ی. ن. ك) دابەڵکوو لەچوونە ناو سەردەمێکی دیکەی خەباتو تێکۆشانی عێراقیەکانو رزگاربوون لە چنگی دکتاتۆرییەتو بەدیهێنانی دیموکراتی. دەبیٚ ئەوەیش لەیادنەکرێت، کۆبوونەوەی ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستان راگەیاندنی خۆناساندن نییە، بەڵکوو رێکخراوێکی عێراقیە لە هەڵگرتنی بەرپرسیاریەتی بەرانبەر بەپاشەڕۆژی عێراق. لەگەڵ بەردەوامی پیلانگێڕانی دوژمنانی گەلەکەماندا، ئەزموونی کوردستان لەسەر رێڕەوی بەرزو مەزنی خۆی بەردەوامەو لە گەشەکردندایە، بەدڵنیاییەوە دەبێتە ئەزموونێکی عێراقیو بەویەڕی شانازیەوە پشتیوانی لێدەکرێت. دەکرێت لەم ئاستەدا هەڵوێستەیەك بکەینو لەوە بگەینو بزانین پیلانەکانی رژێمی عێراقو دوژمنانی دیکەمان گۆڕانکاریەکانی سەرگۆڕەپانی کوردستان بەچ ئاقارێکدا دەبەن.. لەکاتێکدا لەوە گەیشتووین رژێمی بەعس ئاسوودەییو خۆشگوزەرانی بۆ ئێمەی کورد نەویستووەو لەئێستاو داهاتوویشدا لەسەر ئەو دوژمنکاریەی بەردەوامدەبێتو لە مێژیشەوە گەمە بەچارەنووسمان دەکاتو لەئاستێکی نزمدا سەرنجمان دەدات. ئەزموونی ساڵانی رابردوو خۆڕاگریو ئارامگرتنی گەلەکەمانی لە ئاستی نەهامەتیەکاندا سەلماندووەو لە ئێستایشدا خۆڕاگرە لە جارێکی دیکەی هەڵگرتنەوەی بەرپرسیاریەتی لەبنیادنانەوەی ئەو بارە کۆمەڵایەتیەی دکتاتۆرییەت لە ریٚی چەو ساندنەوەو تیرۆرو ترساندنەوە ریشەکێشی کردبوو. دیارە ئەرکێکی سەنگینی لەم چەشنە لەگەڵ ویستی کۆمەڵگای نێودەوڵەتیو یارمەتیو هاوکاری راستەوخۆی دۆستانی گەلەکەمانو داکۆکی کەرانی ئازادیو دیموکراتیو گوروتین دانە توانای یارمەتیدان لەسەر بنیادنانەوەی ئەو کۆمەڵگایانەی تێوەگلاوی دەستی دکتاتۆرییەتن. لەڕاستیدا ئەستەمە بنیادنانەوەو پێشکەوتنو گەشەکردنی هەر کۆمەڵگایەکی ژێرچنگی

دکتاتۆرییەتە دەوڵەمەندەکانی خاوەن داهاتو دارایی بە هێزی وەك عێراقدا دەبینرێت بێتەدی. بەم بۆنەیەوە لێرەدا سوپاسی خۆمان ئاراستەی ئەولایەنانە دەکەین، پاراستنی ناوچە رزگارکراوەکانمانیان گرتە ئەستۆو سوپاسی هاوڕێ نێودەوڵەتیو هەرێمایەتیو ئەو عێراقیانەیش دەکەین، لەچوارچێوەی عێراقی دیموکراتیو فیدراڵدا پشتیوانی خواستەکانی جەماوەری کوردستان بوون لە بنیادنانی دەزگاکانی هەرێمدا.. لەگەڵ ئەوەدا ئەزموونەکەمان بووبە هێمای عێراقی پاشەڕۆژ، بەتەواوی توانامانو دوور لە خۆباییبوون، لە چوارچێوەی ستراتیژییەتی عێراقی یەکگرتوودا، پشتیوانی زیاتری دۆستایەتیو بەرژەوەندیە هاوبەشەکانمان، بەرەو بنیادنانی عێراقی دیموکراتو فیدراڵ. لە کۆتاییدا بەم بۆنەیەوە پیرۆزباییتان لێدەکەین هیوای سەرکەوتن بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان دەخوازین لەکارەکانیدا، هەروەها خوازیارین لەپاشەڕۆژێکی نزیکداو بەلەئامێز گرتنی هەموو رەنگەکانی کۆمەڵگای کوردستانی، ئەنجومەن روخسارو سیمای خۆی بگەیەنێتە تەواوکاری)[٥٩].

## سێیەم: هەڵوێستی تورکیا و کاردانەوە بەرانبەر بەناوچەکە

هەڵوێستی تورکیا بەرانبەر بەتورکمانی عێراقو داکۆکیکردن لەسەریانو پارێزگاریکردنیان، بەتایبەتی هەڵوێستی لەمناستی کەرکوك، دەستێوەردانی سەربازی لەناوچەکەدا بەبیانووی راوەدوونانی جەنگاوەران (پە. کە. کە)و هەڵکەندنی بنکەو بارەگاکانیان، وەهەڵوێستی لەهەر گۆڕانکاریەکی سیاسی لە کوردستانی عێراقو کاریگەریو رەنگدانەوەی بۆ سەر بارودۆخی کوردەکانی تورکیا، لەبەر ئەوەبوو هەزاران لێکدانەوەیان بۆ دەکرا، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە دەبوو بەرەی باکوور لەڕێی خاکی تورکیاوە والآبکرایەو لەو بارەوەو پلایەتە یەکگرتووەکان گفتوگۆی لەگەڵ ئەنقەرە ئەنجام بدایەو لەبەشێکیدا

---

[٥٩] رۆژنامەی (الأتحاد) زمانحاڵی (ی. ن. ك) رۆژی ٢٠٠٢/١٠/٤.

باس‌و خواس لە بەشداریکردنی هێزەکانی تورکیا بکرایە لەو بەرەیەدا، بەڵام ئەو نیازە لەلایەن کوردەکانی عێراقەوە بەتوندی بەرپەرچ درایەوە، بەو هۆیەوە مەسەلەکە لە نێوان بەشداریکردنی سەربازی تورکیاو بەشداری نەکردنیداو لەنێوان کاردانەوەکانی کورد دا مابوویەوە. لە لێدوانێکیدا بۆ ڕۆژنامەی (ئەلحەیات)ی لەندەنی ڕۆژی ٢٠٠٢/٢/١٨ (جەلال تاڵەبانی) ڕایگەیاند (کوردەکان هیوایان بەرزە بەوەی، ئەمەریکیەکان ڕێگردەبن لە ئاستی دەستێوەردانی تورکیاو هەر وڵات‌و لایەنێکی تر لەکاروباری کوردستانی عێراق). لەوەڵامی پرسیارێك دەربارەی چاوەڕوانیکردن لەدەستێوەردانی هەرێمایەتی وتی: (ناکرێت بەیەکجاری‌و بەشێوەیەکی ڕەها چاوەڕوانی بکەین، ئەگەر تورکیا ئەو هەنگاوەی نا، دەکرێت ئێرانیش هەمان هەنگاو بنێت‌و بەپێچەوانەشەوە، ئەوەیش لەسەر ئەمەریکیەکان وەستاوە، ئەگەر ڕێگریان کرد لەپێشیاندا، هیچ لایەکیان بەو کردەوەیە هەڵناستن). لەمەودایەکی دیکەداو لە هەماندیمانەدا (تاڵەبانی) وتی: (ئێمە داخوازی هەڵوێستمان لەئەمەریکیەکان کرد، وەلامیان ئەوەبوو کە ڕێگا بەهیچ دەستێوەردانێکی دەرەکی نادەن).

سەرۆکی دەستەی ئەرکانی هێزە شەرکەرەکانی ئەمەریکا جەنەراڵ (ڕیتشارد مایرز) لە دیدارەکەدا ئێمە پرسیارمان لە هەڵوێستی تورکیاکرد.. لەوەیش دڵنیای کردین کە تورکیا لە نیازی ئەو هەوڵەدا نییە، ئەوەندەی لە مەبەست‌و نیازی ئەمەریکیەکان گەیشتووم دژبە هەردەستێوەردانێکی هەرێمایەتی لە کاروباری عێراق دەوەستن، ئەوان لایان ڕوونە، هەر جۆرە دەستێوەردانێك دەبێتە هۆی شەڕی ناوخۆ‌و خولقاندنی گێروگرفت بۆ سەردەمی دوای ڕژێمی سەدام، دیارە ئەوەیش لەبەرژەوەندی ئەواندا نابێت). هەمان کات لە لێدوانی ڕۆژی ٢٠٠٢/١٠/١١ ی (مەسعود بارزانی) بۆ ڕۆژنامەی (ئەلحەیات)و لەوەڵامی پرسیاردەربارەی هەڵوێست‌و ڕۆڵی تورکمان دەڵێت (ئێمە هیچ هەستیاریەکمان بەرانبەر مافەکانی تورکمان نییە، وەك ئێمە هاووڵاتی عێراقین‌و برامانن.. مافی خۆیان بۆ

دەستەبەرکراوە، هیچ بیانوویەك بۆ تورکیا نەماوە ناوی لێبنێت داکۆکیو بەرگریکردن لێیانو بتوانێت دەست بخاتە کاروباری کوردستانی عێراق، لەلایەن خۆمانەوە بە هیچ دەست تێوەردانێکی هەرێمایەتی رازی نابین، ئەگەر دەستێوەردان روویداو دەستدرێژی کرایە سەرخاكو ولاتمان، بێگومان بەتەواوی توانامانەوە بەرگری لەخۆمان دەکەین، دیارە ئەوەیش مافی سروشتی خۆمانە).

لەوەلامی پرسیاری رۆژنامەکەدا سەبارەت بە نووسینێکی رۆژنامەی (خەبات)، تیایدا هاتووە (کوردستانی عێراق گۆڕستانی سوپای تورکیا دەبێت) بارزانی وتی: (ئەوە وەلامێك بوو بەرانبەر لێدوانەکانی سەباحەدین شکماك ئۆغلو ی وەزیری بەرگری تورکیا، کە باکووری عێراقی بەئەمانەتێك ناوبردو تورکیا بۆی هەیە لەچوارچێوەی سنووری پەیمانە نیشتمانییەکانیدا دەستی تێکێشی).

لەیدارێکی دیکەی بەڕێز (بارزانی)دا لەگەڵ کەناڵی ئاسمانی (C.N.N) ی تورکی سەبارەت بەپەژارەو ئەندێشەکانی ئەو ولاتە لەرووداوەکانی کوردستانی عێراقو مەترسیەکانی لەبەرپاکردنی دەوڵەتی سەربەخۆ، وەلامی چەندین پرسیاری دایەوەو وتی:(هەموو ئەم قسەو باسانە جگە لەئەندێشە هیچی ترنین، ئەوەی ئێمە پێی هەستاوینو ئەنجامانداوە، لەچوارچێوەی سنووری عێراق دەرنەچووە، لەو بارەوە بەرنامەی روونو ئاشکرامان هەیەو لەهەوڵی بنیادنانی عێراقێکی دیموکراتیو فرە لایەنو پەرلەمانی فیدرالیداینو بەوئاراستەیە کار دەکەین، نەرێگامانداوەو نەداوای سەربەخۆییو جیابوونەوەشمان کردووە.. بەپێچەوانەوە، ئێمە دژ بەو پارچە پارچە بوونەی عێراقین کەبوومتە ئەندێشەی ئەوان، ئەوەی داخوازی ئێمەیە هەڕەشە نییە بۆ تورکیا، بەڵکوو زیاتر رێز لەسەروەریو ئاسایشی ئەم ولاتەو بەرژەوەندیەکانی دەگرین و ناگونجێت ببینە سەرچاوەی هەڕەشە بۆی.. ئێمە لەجێی تورکیا بووینایە بەگشتی دەستی هاوکاریو یارمەتیمان بۆ گەلی عێراقو بەتایبەتی بۆ گەلی کورد رادەکێشا.. ئێمە لەلایەن خۆمانەوە لەگەشەکردنو پێشکەوتنی هیچ گەلێکی ناوچەکە مەترسیمان

نییە، بەڕای من بەهەر ئەندازەیەك ڕێزی بەرانبەر بگرێت، بەهەمان ئەندازە یارمەتیدەر دەبێت لە بەهێزكردنی باری ئاسایش‌و سەربەخۆیی‌و پارێزەری بەرژەوەندیە هاوبەشەكانی گەلانی ناوچەكە دەبێت). لەوەڵامی پێداگری كوردەكان لەسەر كەركوك‌و ناوهێنانی بە پایتەختی كوردستان بارزانی دەڵێت: (یەكەم لەوەناگەم پەیوەندی كەركوك بە توركیاوە چیە.. كەركوك شارێكی عێراقیە، بەگەڕانەوە بۆ سەر ژمێری ساڵی ١٩٥٧ ی عێراق‌و خۆدوور ڕاگرتن لە مەبەستی سیاسی ئەوەی سەلماندووە كوردەكان زۆرینەی دانیشتوانی كەركوك پێك دەهێنن، هەموان دەزانین پاش ئەو سەرژمێریە، لەڕێی چەوساندنەوەو سەركوتكردن‌و گرتن‌و دەركردن‌و دوورخستنەوەی دانیشتوانی لەخەڵكی كوردو هێنان‌و نیشتەجێكردنی خەڵكانی دیكەی نامۆ تیایدا، بەردەوام هەوڵی چڕ دراوە لەسەر گۆڕانكاری سروشتی نەتەوایەتی لەو شارەدا. ئەگەر گرنگی كەركوك لەنیازو ئەندێشەی خەڵكانی تردا ئەوەبێت لەسەر دەریای نەوتە، بۆئێمە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت كە هێمای ئەو هەموو ستەم‌و چەوساندنەوەو نەهامەتیانەیە كەبە سەر گەلەكەماندا سەپێنراوە، ئێمەلە ڕەسەنایەتی ناسنامەی كەركوك ناكۆڵینەوەو دان بەوەشدا دەنێین كە شارێكی عێراقیەو كوردو توركمان‌و عەرەب‌و كلدان‌و ئاشووری تیایدا دەژین‌و پێویستە هەموان لەسامانی نەوتی كەركوك بەمافی خۆیان بگەن‌و سوودمەندبن‌و بەیەكسانی بەسەر هەمواندا دابەش بكرێت. هەروەها سەبارەت بەپێشنیاری دەستنیشانكردنی كەركوك بەپایتەختی كوردستان پێشنیارێكەو لەبازنەی پرۆژەیەكدایە دەكرێت باس‌و خواسی لەسەربكرێت، ئەوەی لامان جێی قسەو باسێك نییە ناسنامەی كوردستانی بوونی كەركوكە). بەرانبەر بەهەڕەشەكانی توركیا (بارزانی) وتی: (لەلایەن هەندێ لێپرسراوانی توركیاوە لێدوانی هەست وروژێنەرو هەڕەشە ئامێزكراوە، نەك لەلایەن ئێمەوە.. خوازیارین لە جێگیركردنی ئاسایش‌و ئارامی ناوچەكەدا توركیا هەماهەنگ‌و هاوكارمان بێت، نەك زیاتر گرژكردن‌و

ئالۆزکاندنی بارودۆخەکەو پاڵنان بە مەسەلەکانەوە بەرەو رووبە رووبوونەوەی سەربازی، هەموو خەڵك و ئێمەیش خاك و کەرامەت و پیرۆزمەندی خۆی لا خۆشەویستە، ئەگەر ئەو خاك و کەرامەت و پیرۆزمەندیە کەوتە بەرهێرشی بێگانەو داگیرکرا دەستەوسان و لە دوورەوە تەماشای ئەو پێشیلکاریانە ناکرێت.. بەدڵنیاییەوە ئەگەر دیمان سوپایەك خاکمان داگیردەکات، مافی رەوای خۆمانەو بەرگری لەخۆمان دەکەین. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا لەو بڕوایە دانین تورکیا هەنگاوی لەو جۆرە بەرەو داگیرکردنی وڵاتمان بنێت، بەڵکوو زیاتر چاوەڕێی پارمەتیەکانی دەبین لەبنیادنانەوەی وولاتمان وکارکردن لەسەر جێگیرکردن و بەهێزکردنی ئاسایش تیایداو لەبەرژەوەندی هەردوو گەلی عێراق و تورکیا دەستی هاوکاری و پەیوەندی دۆستانەمان بۆ درێژ بکات).

کۆبوونەوەی شوباتی ٢٠٠٢ ی پەرلەمانی کوردستان لە هەولێر، داوای کرد لە واشنتۆن لەسات وکاتەکانی هێرشی هێزەکانی ئەمەریکاو هاوپەیمانانی بۆ سەر عێراق رێگری بکات لەهەر دەستێوەردانێکی تورکیا بۆسەر کوردستان، پەرلەمان لەراگەیاندنی بەیاننامەیەکدا داوای لەویلایەتە یەکگرتووەکان و هاوپەیمانانی دیکەی کرد رێگا نەدەن بەتورکیاو هەر دەوڵەتێکی تر بێنە خاکی هەرێمی کوردستانەوە.. لەوبارەوە سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان وتی: (داوامانکردووە ئەمەریکا دەسەڵاتی خۆی لەرێگری کردنی هێزە هەرێمیەکان لەپەلاماردانی ناوچەکەمان بەکاربێنێ.. لەگەڵ رێزگرتنمان لەسنووری دەوڵەتانی ناوچەکە تواناداریشین لە پارێزگاریکردنی سنوورەکانی کوردستان و هیچ کات بەدەستێوەردانی ئەو دەوڵەتانە لەکاروباری ناوخۆمان رازی نابین). رۆژنامەی (ئەلسە فیر) ی لوبنانی رۆژی ٢٠٠٢/٢/٢٦ دا زیاتر تیشکی خستبوویە سەر راپۆرتەکەی پەرلەمانی کوردستان و لەوتارێکیدا دەڵێت: (لەروو بەرووبوونەوەو روودانی شەری خوێناوی نێوان سوپای تورکیاو جەنگاوەرانی کورددا مەترسی راستەقینە دەکرێت.. روودانی شەرێکی لەم جۆرە تەگەرە دەخاتە پێش

ئامادەکاریەکانی ئەمەریکا لە کردنەوەی بەرەی باکوورو هێرشکردنە سەر بەغدا.. بەو هۆیەوە ویلایەتە یەکگرتووەکان و تورکیا وتووێژەکانیان چڕترکردەوەو یادداشتی لەیەك گەیشتنیان پێکەوە مۆرکرد.. بەو پێیە بەرەی باکوور لەڕێی خاکی تورکیاوە دەکرێتەوەو تیایدا پانزە هەزار سەربازی تورکیا بەتەواوی چەك و تفاقی جەنگیەوە بەشداری هێزەکانی ئەمەریکا دەکات. بەمەبەستی رایکردنی ئەو کردەوەیە، کەشتیە جەنگیەکانی هێزی دەریایی ئەمەریکا بەتەواوی تفاقی جەنگی و پێداویستیەکانی لەشکری دەیەمیەوە گەیشتنە بەندەری (میرسین)و (ئەسکەندەرونە)، لەچاوەڕێی گەیشتنی تەواوی ئەو لەشکرە لە ویلایەتی تەکساسەوە لەڕێی ئاسمانییەوە لەنگەریانگرت.

(عەبدول لەتیف سیفیر)ی جێگری سەرۆك وەزیرانی تورکیا لە لێدوانێکی دەڵێت: (بڕیار وایە لەماوەی چەند سەعاتی داهاتوودا پەرلەمانی تورکیا سەبارەت بە رێگەدان بەبلاوبوونەوەی هێزەکانی ئەمەریکا لەخاکی تورکیادا هەڵوێست وەربگرێت).

هەمانکات رۆژنامەی (حورییەت)ی تورکی ئەوەی پشتڕاست کردەوە کەتورکەکان و ئەمەریکیەکان بەپێی ئەنجامدانی وتووێژی چەند هەفتەی رابردوو چەند خاڵێکی جیاوازیان تێپەڕاند، بەلام ئەمە پێش گەیشتنی گفتوگۆکان بەپلەی کۆتایی لە ئاماژەیەکی هەمان رۆژنامەدا هاتووە: (هەردوولا لەسەر داماڵینی چەکی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە باکووری عێراق گەیشتنە رێککەوتن). لە ئەنجامی دزەکردنی باس و خواسی یادداشتی لێك گەیشتنی نێوان تورکیاو ویلایەتە یەکگرتووەکان، جۆرە بشێوی و ئاڵۆزیەك کۆمەڵگای کوردستانی عێراقی گرتەوە. لەلێدوانی لێپرسراوێکی کورددا هاتووە دەڵێت: (تورکەکان سنوور دەبەزێنن و تێدەپەڕن، بەلام بەسەرلاشەکانماندا)[٦٠].

بڕیاری لەناکاوی رۆژی ٢٠٠٣/٣/١ ی پەرلەمانی تورکیاو رێگری لە کردنەوەی

---

(٦٠) لێدوانێکی بەڕێز مەسعود بارزانی . و.ك

بەرەی باکوور لەرێی خاکی تورکیاوە، لەگەڵ رەوینەوەی مەترسیەکاندا کاریکردە سەر دەروونی کوردەکانو هەناسەی ئاسوودەییو هێوربوونەوەیان هەڵکێشا. ئەوندەی نەخایاند کردنەوەی بەرەی تورکیاو بەشێوازێکی دیکە، سەرلەنوێ مەترسیە دەرونییەکانی دانیشتوانی هەرێمەکەیان نوێکردەوە.. بەرانبەر بەدەستکرانەوەی لەسەر باکووری عێراق، تورکیا ئاسمانی وڵاتەکەی لەپێش پەروازی فڕۆکە ئەمریکیەکاندا کردەوە[٦١] بەمە سەرلەنوێ پەژارەی دەستێوەردانی سەربازی سەری هەڵدایەوە. لەهەوڵی دەربازبوون لەو قەیرانە ئاڵۆزە (جەلال تاڵەبانیو نێچیرڤان بارزانی) سەردانی ئەنقەرەیان کردو لەگەڵ لێپرسراوانی تورکدا کۆبوونەوەو کێشەی دەستێوەردانی ئەو وڵاتەیان لەکاروباری کوردستانو پەیوەندیەکانیان خستەبەر باسو لێکۆڵینەوە. پاش تێگەیشتنو دڵنیابوون لەنیازەکانی حکومەتی تورکیا بەرانبەر بە کوردستان ناچاربوون بەگەڕانەوە[٦٢]. سەردانی باڵوێزی ئەمەریکا (زاڵمای خەلیلزاد) بۆهەولێری پایتەختی کوردستان، جارێکی تر پەنجەرەی رووناکی بەرووی تەنگژەکەدا کردەوەو هەر جۆرە رێککەوتنێکی دژ بەکوردستانی عێراقی رەتکردەوە، هەمان کات لەسەر رۆشنایی لێدوانەکانی ئەوجارەی سەرۆکی ئەرکانی سوپای تورکیا، هەر جۆرە دەستێوەردانێکی لەکاروباری کوردەکانی عێراق بە دوور زانی. (مەسعود بارزانی) لەلایەن خۆیەوە دوالێدوانی سەرۆکی ئەرکانی تورکیای بەکاراو لەبار لێکدایەوەو پێداگری زیاتری کرد لەسەر بەرپاکردنی پەیوەندیەکانی کوردو تورکیاو پابەندبوون لەسەر پارێزگاری کردنی بەرژەوەندیەکانی سەبارەت بەوە (بارزانی) بەدڵنیاییەوە دەڵێت: (لێدوانەکانی باڵوێز خەلیلزادمان بیستو لەوە گەیشتین سوپای تورکیا بە نیاز نییە بێتە

---

(٦١) رۆژنامەی (ئەلحەیات) ی لەندەنی ٢٠٠٣/٣/٢١

(٦٢) سەرچاوەی پێشوو ٢٠٠٣/٣/٢٢

خاکی کوردستانەوە)[٦٣]. لەدیمانەی ٢٠٠٣/٤/٤ یدا لەگەڵ ڕۆژنامەی – ئەلشەرق ئەلئەوسەت (الشرق الأوسط)دا بارزانی وتی: (لە ئەنجامی دوا سەردانی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا بۆ ئەنقەرەو وتووێژی لەگەڵ بەرپرسیانیدا، پێدەچێت لەمەسەلەی دەستێوەردانی تورکیا لەکاروباری هەرێمی کوردستان، حکومەتی تورکیا پاشگەزبووبێتەوە، بێگومان ئەمەیش کارێکی باشەو پێشوازی لێدەکەین.

## ڕۆڵی کورد لەشەڕدا

پاش وەلانان و سڕینەوەی بیرۆکەی بەرەی باکوور، بیر لەبەکارهێنانی ئاسمانی تورکیا لەتێپەڕکردنی فڕۆکەکان کرایەوە. پێشتر لەکاتی شەڕی لەگەڵ ئێران بەمەبەستی ئاسانکاری گەیاندنی پارمەتی سەربازی بە بەرەکانی شەڕ، حکومەتی عێراق هەستا بەدامەزراندن و نۆژەنکردنەوەو فراوانکردنی فڕۆکەخانەکانی : -

١ - فڕۆکەخانەی بامەڕنی – سەربە پارێزگای دهۆکی نزیک بەسنووری تورکیا.

٢ - فڕۆکەخانەی هەریر – لە پارێزگای هەولێر.

٣ - فڕۆکەخانەی بەکرەجۆ – لە پارێزگای سلێمانی نزیک بەسنووری ئێران.

ئەوەبوو دواتر لە شەڕی ڕزگاری عێراقدا ئەندازیاران و پسپۆڕانی ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەستان بەچاکسازی کردن و پینەکردن و پەرەپێدانی ئەو فڕۆکەخانانە، تابەئاسانی پێشوازی لە فڕۆکە جەنگیەکان بکەن، کەهەڵگری چەك و جبەخانەو پێداویستی سەربازین.. ئەم هەوڵانەی ئەمەریکا کردنەوەی بەرەیەکی سنووردار بوو، لە پێناوی سەرقاڵ کردنی هێزە

---

[٦٣] سەرچاوەی پێشوو ٢٠٠٣/٢/٢٩

سەربازیەکانی عێراق لەکاتی پێویستدا.

لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردایەتی کورد هاوکاری‌و یارمەتی بەردەوامی پێشکەش بەهێزەکانی هاوپەیمانان دەکردو ڕێوشوێنی حەوانەوەو نیشتەجێکردنی دەستەکانی کارگوزاری‌و بەڕێوەبردنیان لەشارۆچکەی (عەنکاوە)ی مەسیحی نشینی نزیکی هەولێر بۆ دەستەبەرکرد).

لەلایەکی ترەوە هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان خۆیان بۆ ڕۆژانی داهاتوو سازو ئامادە کردبوو. کۆتایی هەفتەی دووەمی شەڕ، بەم جۆرە بەرەو ناوچەی باکوور (کوردستانی عێراق) جموجووڵ‌و چالاکی تێکەوت‌و کۆتایی بەسیناریۆکە هێنا، هاوکاتی بۆردمانی خەستی پێگەو سەربازگەکانی ڕژێم‌و کاریگەری گورزی فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانی ئەمەریکا، سوپای عێراق لە ژێر گورزە کوشندەکانی پێشمەرگەی کوردستان لەسەر هێڵە سنووریەکانی هەرێم کشانەوە. هەفتەیەك پێش رووخانی رژێمی بەعس، لەپێش کۆمەڵێك هاوڵاتی دەرکراوو کۆچپێکراوو راگوێزراوانی خەڵکی کەرکوك (مەسعود بارزانی) رایگەیاندو وتی: (گەڕانەوەتان بۆ کەرکوك‌و ناوچەی نیشتەجێکانی پێشووتان نزیك بووەتەوە، پێویستە لەسەرتان، بەتەواوی چاودێری‌و پارێزگاری لەبەها مرۆییەکان‌و ئاکارو رەوشتی بەرزو مەزنی کوردایەتی بکەن‌و پەنا نەبەنە بەرکار وکردەوەی توندوتیژی‌و تۆڵەسەندنەوەو وروژاندن‌و برینداركردنی هەستی کەسانی تر، بۆ زیاتر دڵنیابوونتان، حکومەتی هەرێم هەموو ئاسانکاریەکی گەڕانەوەی ئێوەی گرتووەتە ئەستۆ، هەمان کات رێگرە لەڕوودانی هەر کردەوەیەکی توندوتیژی‌و ئاژاوە نانەوە).

(بارزانی) خەڵکی دەرکراوی کەرکوك بەتایبەتی‌و خەڵکی کوردستانی بەگشتی دڵنیا کردەوەو وتی: (ئەگەر پێشتر سامانی عێراق لە کڕینی چەك‌و کەرەسەی سەربازیدا خەرج کرابێت، لەسەردەمی نوێدا دەبێتە سامانی گەل‌و بەسەر تەواوی چین‌و توێژەکانی گەلی عێراقدا دوور لە جیاوازی ئایینی‌و

ڕەگەزی‌و ناوچەگەری دابەش دەکرێت، جگە لەوەیش هەر عێراقیەك لە ئەنجامی سیاسەتە چەوتەکانی ڕژێم کەوتبێتە بەر شالاوی دەرکردن‌و ڕاگواستن، قەرەبووی زیانەکانی دەکرێتەوە. لەڕاپۆرتێکی ڕۆژنامەی (ئەلشەرق ئەلئەوسەت)ی ڕۆژی ٢ی نیسانی ٢٠٠٣ دا هاتووەو نووسیویە: (ژمارەی دەرکراوان‌و ڕاگوێزراوانی کەرکوك‌و دەوروبەری، بەنزیکەی نیومیلۆن کەس مەزندە دەکرێت، هەرچەند دەگونجێت لەدیاریکردنی ئەو ژمارەیەدا زیادە ڕۆییەك کرابێت، بەلام دەبێ لێکۆڵینەوەی تەواوی لەسەر بکرێت). لەگەڵ هەڵکشان‌و داکشانی بارودۆخەکەیشدا هێشتا مەترسی‌و دڵەڕاوکێی هاتنی هێزە سەربازیەکانی تورکیا بۆ کوردستان نەڕەوی بوویەوە، لەکاتێکدا دەنگۆی نیازەکان لەهاتنە ناوکوردستانی ئەو هێزانە جۆراوجۆرو جیاواز بوون، بەلام سەرچاوەکانی سوپای تورکیا هەرکردەوەیەکی لەو جۆرەیان دایە دواوە. ئەو هەولانەی پێشتر لەسەر گەیشتنی هەزار سەربازی تورکی بۆ ناو خاکی کوردستانی عێراق بلاوکرابوونەوە، لەگەڵ کەوتنەوەی مەترسیدا، گیرو گرفت‌و ناکۆکیەکان پەرەیان سەندو گەیشتنە ئاستی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کوردەکاندا.. سەرلەبەیانی ١٣ی نیسان- (جیف هون)ی وەزیری بەرگری بەریتانیا بەزاندنی سنووری هەرێمی کوردستانی لەلایەن سوپای تورکیاوە ئاشکراکرد.. هەمان کات لەگرنگی مەسەلەکە کەم دەکاتەوەو دەڵێت: (مەسەلەکە پەیوەندیدارە بەڕێککەوتنی نێوان ڕژێمی عێراق‌و حکومەتی تورکیاوە، کە هێزێکی بچووکی سوپا بەمەبەستی پاراستنی سنوورەکانی خۆی سنووری هەرێمی کوردستانی بەزاندوە).

لەپەرە سەندنێکی دیکەدا کێشەی بەزاندنی سنووری باکوورو هاتنە ناوەوەی هێزەکانی تورکیا چەندین ڕەهەندی نێودەوڵەتی گرتووەتە خۆی..(یوشکافیش)ی وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیا ئەوەی ڕوونکردەوە ئەگەر تورکیا بیەوێت خۆی بەشەڕی باکووری عێراقەوە خەریك بکات، حکومەتەکەی ناچاردەبێت

بەکشاندنەوەی فڕۆکەکانی جۆری (ئەواکس) کەلە چوارچێوەی هێزی ئاسمانی پەیمانی ناتۆدا چاودێری ئاسمانی سەر تورکیا دەکەن. هەروەها سەبارەت بەو مەسەلەیە رۆژی ٢٠٠٣/٤/١٤ لێپرسراوێکی پلە بەرزی پەرلەمانی روسیا وتی: (بلاّووکردنەوەی هێزەکانی تورکیا لە باکووری عێراقدا بە جۆرێك تەشەنەدەکات مەترسیەکەی ناوخاکی تورکیایش دەگرێتەوە).

هاوکاتی ئەم پەرەسەندنانە (عەبدولآ گول)ی وەزیری دەرەوەی تورکیا لە لێدوانێکدا دەڵێت: (ئەو چۆڵەوانییەی لە باکووری عێراقدا کەوتوەتەوە، وەك راستیەك گۆڕاوە بۆ سەربازگەی چالاکی تیرۆریستیو ئێمەی ناچارکردووە بچینە ئەو ناوچەیەو چۆڵەوانییەکە پڕبکەینەوە). هەواڵەکان ئەوەیان دەرخستووە تەنگژەو هاتنی سوپای تورکیا بۆ باکووری عێراق، پێکهاتنی لیژنەی هەماهەنگیو هاوکاری نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانو تورکیاو هەردوو پارتی سەرەکی کوردی (ی. ن. ك)و (پ. د. ك) ی لێکەوتەوەو سلوپی نزیك بە سنوور کرایەبارەگا.. لەگەڵ وەرگرتنی دەسەڵاتی تەواوداو لەکاتی پێویستدا لیژنەکە بڕیاردەر دەبێت لەسەر هاتنە ناوەوەی هێزە تورکیەکان، بەتایبەتی لەکاتی ئەگەری روودانی کارەساتێکی مرۆیی، یان روودانی هەڕەشەی تیرۆریستی دژبە تورکیا، یان هەر مەسەلەیەکی پەیوەندیدار بەچارەنووسی کەمینەی تورکمان.

## پێنج بەرەی کوردی

لەگەڵ بەردەوامیو تێپەڕاندنی رۆژانی شەڕدا، هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان دژ بە هێزەکانی سوپای عێراق لەپێنج لاوە بەرەکانیان کردەوە..

بەرەی یەکەم – هێزەکانی (پ. د. ك) لەدهۆکەوە بەناحیەی فایدەدا کەوتنە پێشڕەویو هێرشیان کردە سەر سەربازگەو سەنگەرەکانی موسڵو دەوروبەری.

بەرەی دووەم – هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان لە هەولێرەوەو بەتێپەڕبوونیان بەشارۆچکەی ئاسکی کەلەکدا هێرشیانکردە سەرپێگەو

سەنگەرەكانی پێشەوەی سوپای عێراق لەموسڵو دەوروبەریدا.

**بەرەی سێیەم-** هێزەكانی (ی. ن. ك) لەڕێی شارۆچكەی چەمچەماڵەوە پەلاماری سەربازگەكانی سوپای عێراقیانداو لەماوەیەكی كورتدا دەستیان گرت بەسەر كەركوكو دەوروبەریدا.

**بەرەی چوارەم-** لەلایەكی ترەوە هێزەكانی (پ. د. ك) لە قوشتەپەی نزیكی هەولێرەوە هێرشیانكردە سەر تەواوی پێگەو سەربازگەو سەنگەرەكانی پێشەوەی سوپای عێراقو لەماوەیەكی كورتدا گەیشتنەشاری كەركوكو لەتەواوی دامو دەزگا سیخوڕیو سەربازیەكان پاكسازی كرا.

**بەرەی پێنجەم-** هێزەكانی (ی. ن. ك) لەڕێی سەرەكی مەندەلیو خانەقینەوە هێرشیان كردەسەر بەغدای پایتەختو لەماوەیەكی دیاریكراوداو لەگەڵ پاكسازی كردنی ڕێگای سەرەكیو پانتایی ناوچەكە گەیشتنە جێی مەبەست.

نكوولی لەوەناكرێت هێزەكانی پێشمەرگەی كوردستان لەسەر قالكردنو پەشۆكاندنی هێزە بەزیوەكانی ڕژێمدا ڕۆڵی گرنگو مەزنیان گێڕاو بەشداریەكی بەرچاویان هەبوو لەهەرەس پێهێنانو داڕووخاندنی ڕژێمی دیكتاتۆری بەعس لە ۱۹ ی نیسانی ۲۰۰۳دا.

## پەیوەندیەكانی كوردو عەرەب ڕووبەڕووی مەترسی دەبنەوە

لەگەڵ هەرەسهێنانو داڕووخانی خێراو لەناكاوی ڕژێمو هەڵتەكاندنی بنەڕەتی سەرەكی دەوڵەت، بارودۆخەكە لەباربوو لە شێواندنی پەیوەندیەكانی نێوان كوردو عەرەب،هەمان كات هەڕەشەیەكی گەورەیش بوو لەسەر چارەنووسی حكومەتی دوای ڕژێمی بەعس. ئەوەبوو لەڕووداوی ڕۆژی ۲۰۰۳/٤/۱۰ی شاری كەركوكو ڕۆژی ۲۰۰۳/٤/۱۱ی شاری موسڵ ڕەنگی دایەوە..

مەترسی زیاتر لەوەدا بەدی دەكرا، ڕۆژی پێنج شەممە ۲۰۰۳/٤/۱۰ لەكاتێكدا هێزەكانی (ی. ن. ك)و خەڵكی دەركراوو كۆچپێكراوی شاری كەركوك

بەئۆتۆمۆبیلی گەورەو بچووك کۆمەڵ کۆمەڵو لەپڕێکدا خۆیانکردەوە بەشارەکەیاندا هەرچەند لە رێککەوتنی پێشتردا لایەنە کوردی یەکان کەرکوکیان بەهێڵی سوور دەستنیشان کردبوو، بەلاّم هەڵچوونی بارودۆخەکە پاڵنەربوو لەوەی پێشمەرگەکانی (ی. ن. ك) بێ کێشەو گرفت دەست بکێشێن بەسەر زۆربەی ناوچەکانی شارەکەدا.

کوردەکان لە ئاستی رووبەڕووبوونەوەی مەسەلە پەیوەندیدارەکان بە کەرکوك‌و موسڵ نەخشەو پلانێکی ئەوتۆیان لەبەردەستدا نەبوو. لە لێدوانی بەرپرسێکی کورددا هاتووە دەڵێت: (هەرچەندمافی خۆمانە وەك عێراقی رووبکەینە هەر شارێکی عێراق بەلاّم لەم کاتو هەلومەرجەدا، (پ. د. ك) لەنیازیدا نییە هەستی تورکەکان بهەژنێت). هەفتەیەك پێش رووخانی رژێم (بەرهەم صالح)ی سەرۆکی حکومەتی سلێمانیو (دواتر جێگری سەرۆك وەزیرانی عێراق) دڵنیاییدا لەمەودای کردنەوەی بەرەی باکوور هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان ناچنە ناو شاری کەرکوك.

لێرەدا پرسیارێك سەر هەڵدەدات – ئەم هەڵوێستە کتوپڕەی کوردەکان لەئاستی چوونە ناوکەرکوك چی بوو؟ دیارە ئەوان لە هەستیاری شارەکەو مەترسیەکانی تورکیاو کاردانەوەی لەسەر ناوچەکە شارەزایی تەواویان هەیەو دەزانن چی دەبێت ئەگەر پەلاماریاندا.

لێرەدایە هەست بەوە دەگرێت ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ چوونە ناو کەرکوك رەنگی سەوزیان بە کوردەکان بەخشیبێت، یان لای کەمی خۆی لەئاستیدا وێڵو بێئاگا کردبێت.. لەم میانەدا هێزەکانی (ی. ن. ك) بەهەڵکردنی ئالاّی سەوزو بەرزکردنەوەی وێنەی (تاڵەبانی)و هێزەکانی (پ. د. ك) یش بە بەرزکردنەوەی ئالاّی زەردو وێنەی (مەلا مستەفا بارزانی)و چەکدارەکانی بەرەی تورکمان بەئالاّی شینەوە خۆیان کرد بە شاردا، هەر لایەنەو هەوڵی سەلماندنی خۆی لەو شارەدا دەدا.. ئەوەی نەخوازراو بوو نانەوەی ئەوبشێوی‌و ئاژاوە گێڕیە

بوو خەڵکانێکی زۆر کەوتنە پەلاماردانی بەڕێوەبەرایەتی باری شارستانی کەرکوك‌و سووتاندنی تەواوی تۆمارگەکانی، ئەم کردەوەیە گومانێکی ئەوتۆی دروستکردو لەخۆیدا بوو بەو پرسیارە (ئایا دەبێت ئەو کردەیە دەرەنجامی بەعەرەبکردن‌و سڕینەوەی ناسنامەی نەتەوەییەوە سەری هەڵدابێت؟).

بەتێپەڕاندنی ماوەیەکی کەم بەسەر تەواوی کردەوەکەدا رقی کۆن‌و نوێی تورکیای بزواندەوەو بێ لێکدانەوەو چاوەڕوانی، پەرلەمانی تورکیا بە ئامادەبوونی سەرۆکی ئەرکان کۆبوونەوەیەکی تەنگەتاوی گرێداو لەوێدا رایگەیاندو وتی: (جێی رەزامەندی نییە هێزەکانی پێشمەرگەی کورد بچنە شارێکی دەوڵەمەندی پڕ لە نەوت‌و تیایدا بمێننەوە، هەرچەند ئەگەر ئەو هێزانە لەخۆڕاو بەبێ نەخشەو بەرنامە رێزی بەوکردەوەیە هەستابن، هەردەبێ بکێشنەوە، مانەوەی بەردەوامیان لای ئێمە کارێکی نادروست‌و ناپەسەندە)[٦٤].

ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا زوو لەهەڵوێستی تورکیا گەیشت‌و بەپەلە لەپەیوەندیەکدا ئەنقەرەی هۆشیارکردەوە، لەو رووەوە (عەبدوڵا گول)ی وەزیری دەرەوەی تورکیا دەڵێت: (بەنیازی جێگرتنەوەی هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان ئەمەریکا هێزەکانی خۆی دەنێرێتە کەرکوك).. هەروەها رایشیگەیاند (لەسەر پێشنیاری ئەمەریکاو رەزامەندی ئەوان پێکهاتن بەناردنی چەند چاودێرێکی سەربازی بۆشاری کەرکوك.. تابەکردەوە جێگرتنەوەی ئەو هێزە کوردیانەمان بۆ بسەلمێنرێت).

دوابەدوای راگەیاندنەکەی (گول) لایەنی کوردی لە ئاستی بارودۆخەکە هەڵوێستی خۆی وەرگرت، هەر ئەو رۆژە لێپرسراوێکی (ی. ن. ك) رایگەیاندو

---

(٦٤) دیدی کەسانێکی کاریگەری سەربازی سوپای تورکیا بەرانبەر بەکورد و مەسەلەی کەرکوك، جگە لەوە دەستێوەردانە لەکاروباری گەل و وڵاتێکی دیکە، هەمانکات هەڵوێستی ناخی رەگەز پەرستێکە نوقوم بووی هزری تۆرانیزمی و کەمالیزمی دژبە کورد و خاکی کوردستان. و.ك

وتی: (بەهۆی هەستیاری سەردەمەکەو فشاری تورکیا بۆسەر واشنتۆن، دەسەڵاتی شاری کەرکوك بەهێزەکانی ئەمەریکا دەسپێرین و تیایدا دەکێشینەوە). هەمان کات سەرۆکی حکومەتی بەڕێوەبەرایەتی سلێمانی جووڵەی چوونە دەرەوەی هێزە کوردیەکانی لە شارەکەدا ڕاگەیاند.. هەروەها فەرماندەی مەیدانی هێزەکانی (ی. ن. ك) مام ڕۆستەم – لەلێدوانێکیدا کشانەوەو چوونەدەرەوەی هێزەکانی لەو ڕۆژە یان لە ڕۆژی دوایدا دووپاتکردەوە. کێشەی مانەوە لە شاری کەرکوك لەلایەکەوە هەڕەشەیەکی ئاشکرابوو لەسەر پاشە ڕۆژی پەیوەندیەکانی نێوان کوردو عەرەب و لەلایەکی ترەوە هەژاندن و ئاڵۆزکردنی هێزەکانی تورکیای بەدوای خۆیدا ڕادەکێشاو دەبوویە بیانووی پەلاماردان و بەزاندنی سنوورو دەست وەردانە کاروباری باکوور (کوردستان). وەك دەرکەوت، لەگەڵ باڵادەستی و توانا بەرزەکانی دوێنێداو لەوکات و ساتە هەستیارو غەمناکەدا تەم و مژێکی چڕ باڵی بەسەر شاری موسڵ دا کێشابوو، کەچی لەتەواوی شارەکانی دیکەی عێراق هێمن ترو ئارام تر دەبینرا..

لەکاتێکدا پاشا گەردانی بەرزترین ووشە بوو بۆیان، خەڵکی بێ چارەو پەل وپۆ شکاوو بێ دەسەڵات، نیگای پڕ لەپەرژارەو گیانی بێدەنگیان خستبوویە سەر شارە سووتاوەکەیان.. لەو لایشەوە ئاوێنەی تۆڕو کەناڵە ئاسمانییەکان سەرگەرمی تۆمارکردنی دیمەنەکان و گواستنەوەو گەیاندنیان بوون بە جیهانی دەرەوە.. تەواوی تەلارو باڵاخانەو دامەزراوە دەوڵەتیەکان بەتینی ئاگر تاودرابوون و دووکەڵی خەستیان کەشکەشانی گرتبوو، شاری جوانی موسڵ ڕەشاوی لێ دەتکا. لەوکاتە ناسکەدا ئاژاوەگێڕان و تاڵانچیان بە هەلومەرگرتن لەبارودۆخەکە دەستیان گرت بەسەر بانکی ناوەندی و تەواوی پارەو نەختینەکانی ناویان برد. ئەو کارەساتە دڵتەزێنە ڕووداوەکانی کۆتایی پەنجاکانی سەدەی ڕابردووی هێنایەوە یاد کە (عەبدولوەهاب شەواف) دژبە دەسەڵاتی (عەبدولکەریم قاسم) کوودەتای موسڵی بەرپاکردو لەچەندین دیمەنی تراژیدیدا شکستی خوارد.. لەوکاتەدا بوو

هێزە چەکدارەکان بە پۆشاکی کوردییەوەو بەدیمەنی پێشمەرگە وە هاواریاندەکرد (پێشمەرگەیە ڕزگارکەری سامانی بانکی ناوەندی لەچنگی تالآ نچیان). ئەو چەکدارانە بەدەم تەقەکردنەوە بەسەر خەڵکەکەدا خۆیان گەیاندە ناو بانکی ناوەندی موسڵ، جەماوەر لەو باوەڕەدا بوو ئەم تاقمە چەکدارە بانك ڕزگار کەرن‌و ئاسایش‌و ئارامیش دەگێڕنەوە..

کەچی ئەوەی ڕوویدا پێچەوانەی هەموو ڕاستیەکان بوو، هەتا بۆیان کرا سندووقە پارەو نەختینەکانیان بە کۆمەڵ‌و سەرشان گەیاندە دەرەوەو لەچاوتروکاندنێکدا توانەوەو دیارنەمان. پیاوێکی نزیك لە کامێرای کەناڵێکی ئاسمانییەوە هاواریکرد پێشمەرگە دزن پارەی بانکیان بە تاڵان برد. ئەو دیمەنانەی بەجیهاندا پەخش دەکران، تەنها مانایەکیان دەبەخشی گوایە هێزی پێشمەرگەی کوردیستان بەتاڵان بردنی بانکی ناوەندی موسڵ هەستاوەو دەستدرێژی کردوەتە سەر ئەو شارە.

بێگومان ئەو جۆرە بانگەشەو دروشم‌و بیرو بۆچوونانە بەئاشکراو بە ئەنقەست وەك پیلانێك دژ بە پێشمەرگەی کوردستان‌و زڕاندنی ئابڕووی ڕێکخرا بوو، بەو مەبەستەی لەڕێی کەناڵ‌و میدیاکانەوە ئابڕووی پێشمەرگە لەکەدار بکەن. ئامانجی سەرەکی لەو جۆرە پیلان‌و بیرکردنەوەیە تەنها لێدانی کوردو تێکدان‌و درز خستنە ناو پەیوەندیەکانی هەردوو گەلی کوردو عەرەب‌و تێکدانی یەکێتی‌و یەکپارچەیی گەلی عێراق.

وەك گەڕان بەدوای ڕاستیدا، ئایا تالآنکردنی بانکی ناوەندی موسڵ بە پۆشاکی کوردی تایبەت بە پێشمەرگەی کوردستان.. لە ڕاستیدا هێزی پێشمەرگە بوون؟!!.. دیارە نەخێر.. ئەوە لە ڕەفتارو هەڵسوکەوتی ڕۆڵە دڵسۆزو بەنەمەکەکانی گەلی کوردەوە زۆر دوورەو بەهیچ شێوەیەك ئەوانە نەچووبوونە ناو ئەو شارەوە، بەڵکوو تەنها وەك چاودێر لەسەر بارودۆخەکە لەدەرگاکانی شار بەرەو ناوەوە تێپەڕیان نەکردبوو، سەرکردایەتی کورد بەوە نەیدەویست جارێکی

تر ئەزموونی تاڵی رۆژانی رابردووی كەركوك دووبارە ببێتەوە.

سەبارەت بەدەست كێشانی پێشمەرگەی كوردستان بەسەر شاری كەركوكدا، سەرۆكی (پ. د. ك) مەسعود بارزانی دانی بەوەدانا چوونە ئەو شارە هەڵەیەكی دیارو لەبەر چاوبوو، روودانی دزیو ئاژاوە گێڕی تیایدا پابەند نەبوونی هەندێك بوو بەو رێككەوتنەی پێشوەخت كرابوو[٦٥].

لەڕاستیدا رێنماییەكانی سەبارەت بە نەچوونە ناوشاری موسڵو مانەوە لەقەراغەكانیدا فەرمانێكی دروستو گونجاو بوو، ئەوە بوو لەكاتو سەردەمی كردەوەكانی دزیكردن وتاڵانییەكاندا پەیامنێری كەناڵێكی ئاسمانی چەند دیمانەیەكی لەگەڵ هاولاَتیانیدا ساز كردبوو.. هەموان خوازیاری ئەوە بوون بەمەبەستی پاراستنی هێمنیو ئاسایشی شارەكەیان (مەسعود بارزانی) هێزەكانی پێشمەرگەیان بۆ بنێرێت..

بەلاَم (بارزانی) دەیزانی ئەگەر هێزەكانی بنێرێتە ناوشاری موسڵ چ ئاژاوەو دژایەتیەك بەرپادەبێتو رووبەڕووبوونەوەی چەكداریشی بەدوور نەدەزانی، بەو هۆیەوە رێگایەكی تری گرتەبەر.. كەلەلایەن خۆیەوە پێشنیاری كردەلای سەرۆكی خێڵ (شەممەر)ی مەزنترینو بالاَ دەست ترین خێڵی عەرەبی ناوچەكەو داوای لێكرد رازی بێت بەدابینكردنو پاراستنی ئارامیو ئاسایشی شاری موسڵ، بەدانانی سێ هەزار جەنگاوەر لە هێزەكانی پێشمەرگەی كوردستانو دانانیان لە ژێر فەرمانو رابەرایەتی راستەوخۆی ئەودا كاری پێویست ئەنجام بدەن.. دواتر ئەو تاوانبارانەی بە پۆشاكی كوردیەوە بانكی ناوەندی موسڵ یان تالاَنكردبوو دەستگیركرانو بۆهەموو لایەك روون بوویەوە لەچەكدارەكانی رژێمی رووخاو بوون، لەپێناوی پاراستنی بەرژەوەندیەكانی حكومەتی بەغدا وەك دەستەی چەكداری كوردی ناوچەی كوردستان چەكداركرابوون، كەبەلێكدانەوەی كوردەكان بە (جاش) ناوەزەدە كرابوون.

---

(٦٥) سەرچاوە (الأهرام العربي )– ٢٦/٤/٢٠٠٣

بەگرتنەبەری ئەم ڕێگایە توانرا ئەو ئاگرە خەفەبکرێت کە هەڕەشەیەکی کاریگەربوو لەتێکدانی پەیوەندیەکانی نێوان کوردو عەرەب.

## کوردەکان و دەوڵەتی نوێی عێراقی پاش ڕووخانی ڕژێم

دوابەدوای داڕووخانی ڕژێمی بەعس لە ٢٠٠٣/٤/٩ بە ئامانجی قسەو باس لە پاشەڕۆژی سیاسی عێراقی نوێو سەر لەنوێ بنیادنانەوەی، بەهەموو سەنگو قورسایی خۆیانەوە کوردەکان رووپانکردە بەغداو لەبواری قسەکردنو باسو خواسی ناوچەکەیان، لەچوارچێوەی عێراقی فرەلایەندا خوازیاری پەیڕەوکردنی سیستەمی فیدراڵی بوون لەپەیوەندیەکانیان بە حکومەتی ناوەندەوە.. لەگەڵ دەرخستنی هەندێ بیرو بۆچوونو هەوەس وئارەزووی جیاخوازانەی هاوڵاتیانی ئاسایی، یان لای هەندێ نوخبەی سیاسیو رۆشنبیر، نکوولی ناکرێت لەو ئاستەدا سەرکردایەتی کورد بەناسنامەی نیشتمانی عێراقیەوە پابەندەو دوورە لەو بیرو بۆچوونە جیاخوازیە.

رۆژی ٢٠٠٣/٤/٩ بە بۆنەی ڕووخانی ڕژێمو رزگاربوون لە دەسەڵاتی دکتاتۆری (مەسعود بارزانی) بانگەوازێکی ئاراستەی تەواوی برا عەرەبە خێڵەکیەکانی دراوسێی گەلی کورد کرد، تیایدا پابەندبوونی خۆی وگەلی کوردو پارتی دیموکراتی کوردستانو هێزو پارتە نیشتیمانییە کوردیەکانی نوێکردەوەو بەڵێنیدا بەپارێزگاریکردنو بەهێزکردنی پەیوەندیەکانی نێوان هەردوو گەلی کوردو عەرەب، وەك لەبانگەوازەکەدا هاتووە.. (ئەی برایانی هاوبەش لەیەك نیشتمان -کە نیشتیمانی عێراقە-، پابەندبوونی خۆم بە ئامۆژگاریو رێنماییەکانی فەرماندەی خودالێخۆشبوو -مستەفا بارزانی-و بەڕێنماییەکانی پەرلەمانی کوردستانو بەرنامەو ڕێبازی (پ. د. ك) نوێ دەکەمەوەو بەبۆنەی رزگاربوونمان لەچنگی دکتاتۆرییەتو ستەم، پیرۆزبایی لە خۆمو ئێوەو لەهەموو عێراقیەکان دەکەم، روو دەکەمە کوردو عەرەبو تورکمانو هاوڵاتیانی تری

ناوچەکەو داخوازیم ئەوەیە بەگیانی برایەتیەوە پارێزگاری ئاشتیو پێکەوەژیانو یەکێتی نیشتمانمان بەهێز بکەینو رێگربین لەگێرە شێوێنیو هەموو هەوڵێکی تێکدەرانە لەهەر لایەنو کۆمەڵو دەستەیەکەوە بێتو هۆکاربێت لەنانەوەی ئاژاوەو دروستکردنی کێشەو خستنەوەی دووبەرەکیو تێکدانی ریزەکان، برایان ئێمە هەموومان لەرابردووو ئێستاو لە چەندین سەدەوە پێکەوە ژیاوینو یارمەتی دەری یەکتر بووین، ئەمرۆ هەلێکی مێژوویی گرنگ هاتوەتە پێشەوە داتوانین سەرلەنوێ وولاتمان بنیاد بنێنەوەو پاشەرۆژێکی باشتر بۆ نەوەکانی داهاتوومان بێنینەدی.. تائێستا جیاوازی سیاسیمان لەگەڵ رژێمە پێشووەکاندا بووە، بەتایبەتی لەگەڵ رژێمی رووخاوی بەعسدا، ئاشکرایە سالانی دەسەلاتداری ئەو رژێمە لەنانەوەی دووبەرەکیو لە دەرکردنی کوردەکان لەسەر زێدی خۆیانو راگواستنیانو دوورخستنەوەیان لەشارو شارۆچکەو گوندو خاكو کێلگەکانیانو نیشتەجێکردنی عەرەبی خێڵەکی لە جێیاندا نکوولی نەکرد، بەدرێژایی ماوەی ئەم چارەکە سەدەیەی دوایی تێکۆشاوین لە پێناوی هەلگرتنو لادانی ئەو گۆرانکاریە نامۆیەی لە ناسنامەی نەتەوایەتیو باری مێژوویی ناوچە بەرفراوانە کوردیەکاندا کرا.. بێگومان ئەم شێوازە رەگەزپەرستیە گەلی کوردی تووشی چەندین گرفتی زۆر تاڵو بارودۆخی پر لەئێشو ئازارکرد.. خەمو ئەندێشەی بنەرەتیمان هەلگرتنو لادانو سرینەوەی ئەو بارودۆخە نامۆیەو گەرانەوەی دانیشتوانی راگوێزراوو کۆچپێکراو بوو بۆسەر ماڵو موڵك وخاكو خانوەکانیان.. سوپاس بۆ پەروەردگاری مەزن، ئەو رۆژە هاتەدی.. جگە لەوەی دەرمخست بۆ هیچ کوردێك نییە ئەگەر بێ لایەنە یان لە هەر پارتو لایەنێکی سیاسی کوردیدا، دەستدرێژی بکاتە سەر هاولاتیانی عەرەبو پەلاماری هەر گوندو نیشتەجێیەکی خێڵە رەسەنە عەرەبیەکان بدات، هەمان کات رێگا بە هیچ کوردێك نادرێت دەستدرێژی بکاتە سەرماڵو گیانو سامانو شەرەفمەندی هیچ هاولاتیەکی عەرەب لە هەر گوندو شارۆچکەو شارێکی سەرەکیدا بێت.. جێی

داخ و پەژارەو بێزاریمانە کە سانێکی کورد دەستدرێژیان کردوەتە سەر هەندێ گوند نشین و شار نشینی بێدەسەلات، بەرانبەر بەو هەڵوێستە نامرۆییانە نارەزایی و دلگرانی خۆمان رادەگەیەنین و هەمان کات دڵنیاییش دەدەین لە نێوان ئێمەدا هیچ پەناگاو ئارامگایەك بۆ ئەوانە نییەو ئارەزوومەندین هەرچی زووتر بناسرێن و لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکرێت و سزای یاسایی تەواویان بەسەردا بسەپێنرێت و ببنە پەند بۆ هاوچەشنەکانیان. رایدەگەیەنین هەر برایەکی عەرەب مافی خۆیەتی بەرانبەر بەهەر دەستدرێژیەك بەرگری تەواو لەخۆی بکات، تاکەسانی دیکە نەتوانن تایبەتمەندیەکانی و خاك و شەرفمەندی پێشێل بکەن. داواکارین بەدەستیگرکردنی هەردەستدرێژکارێك و دانی بەدەستمانەوە، تابتوانین بەسزای تەواوی خۆی بگەیەنین و ریسوای بکەین.. ئێمە دووپاتی دەکەینەوە هەردەم پێداگری تەواو دەکەین لەسەر پابەندبوونمان بەپاراستنی گیانی برایەتی و هاوکاری نێوان کوردو عەرەب لە ناوچەکەداو جێگیرکردنی ئاسایش و پاراستنی هێمنی و ئارامی تیایدا، هەردەم ئامادەی وەلامدانەوەو جێبەجێکردنی هەر جۆرە داخوازیەکین لە بەرژەوەندی گشتی و بنیادنانەوەو ئاوەدانکردنەوەی نیشتیمانی هاوبەشمان - عێراق - دابێت).

ئاسوودەو سەرفرازی لای یەزدان بن

براتان مەسعود بارزانی[٦٦]

ئەم نامەیە لە ئەنجامی دەستدرێژی کردنە سەر ئەو عەرەبانەوە هات لەلایەن هەندێ لەو کوردە دەرکراوو راگوێزراوانەوە کرا بوویە سەریان، لە کاتێکدا دەیانویست بگەڕێنەوە سەر شوێنە پێشوەکانی خۆیان.

---

[٦٦] رۆژنامەی (الزمان) ٢٠٠٢/٤/١٥ – لە رۆژنامەی برایەتیەوە وەرگیراوە.

بەستنى كۆنگرەى ناوەڕاستى مانگى نيسانى ٢٠٠٢ ى نوخبە سياسيەكانى عێراق لە شارى ناسريە، بەتەواوى سەنگو توانايانەوە كوردەكان بەشداريان تياداكرد.. هەروەها بەبەشداريكردنى لايەنە بەرهەڵستكارەكان كۆنگرەى سەلاحەدين بەسترا.. لەسەر بڕيارى كۆنگرە، شەش ئەندام لە رابەرانو پياوانى سياسى دياريكران بەدامەزراندنى حكومەتى عێراق دواى سەدام حسەين، كەتيايدا جەلال تاڵەبانىو مەسعود بارزانى نوێنەرايەتى كورديان دە كرد.

چاودێران تێبينى دەكەن، سەركردايەتى كورد لە خۆسازدانو پشتيوانيكردنو هاوكاريكردنى حكومەتى داهاتوو لەسەر خۆكاريكردووە[٦٧].

لەسەر ئاستى شەقامى كوردى زۆربەى دانيشتوانى كوردستان لەگەڵ راگەياندنى پشتيوانيكردنيان لە دامەزراندنى حكومەتى فيدراڵ لەبەغدا، خوازيارى رەوشى سەربەخۆيى ئێستاى هەرێمو مانەوەى پێشمەرگەى كوردستانو نوێنەرايەتى ئاسايى لە حكومەتى ناوەنديدا پارێزراو بێت. بەئامادە بوونى (مەسعود بارزانىو جەلال تاڵەبانى) ژمارەيەك لەسەركردەو رابەرە ديارەكانى پارتو بزووتنەوە سياسيەكان لە عێراق رۆژى ٢٠٠٣/٦/٩ پەرلەمانى كوردستان بەسەرۆكايەتى (د. رۆژنورى شاويس) دانيشتنى خۆى گرێدا، تەواوى ئامادەبوان لەوتارەكانياندا ئەزموونى ديموكراتىو رۆڵى پەرلەمانى هەرێميان لە بڕياردانى چارەنووس سازى يەكێتى نيشتمانىو سەلماندنو جێگيركردنى برايەتى كوردو عەرەب بەرز نرخاند. لەڕوويەكى ديكەوە بەشداربوان داواكاربوون لەنەهێشتنو هەڵگرتنى ئەو كۆسپو كێشانەى لە سەردەمى رووخانى رژێمو رزگاركردنى عێراقەوە سەريان هەڵداو خوازيارى هەرچى زووتر پێكهێنانى حكومەتى كاتى سەردەمى گواستنەوە بوون.

---

(٦٧) رۆژنامەى (الشرق الأوسط) ٢٠٠٢/٥/٢٨

## بەرزی و جیاوازی پلەو پایەی کوردەکان

بەچەند هۆکارێک و لەناکاوێکدا کوردەکان لەڕیزی پێشەوەی دیمەنی عێراقیدا دەرکەوتن.. ئەزموونی چەند ساڵەی بەڕێوەبردنی ناوچەکەیان دوور لەدەسەلاتی بەغدا، لە ساڵی (١٩٩١)ەوە تا رووخانی رژێم و توانایان لە رێکخستن و ئەنجامدانی هەڵبژاردنی سەرکەوتووی پەسەندکراوی لایەنە هەرێمی و دەرەکییەکان پاڵنەری سەرکەوتنیان بوون، جیا لەمانەیش سەرکردەکانی کورد توانیان تۆڕێکی کاریگەری چالاک لە دروستکردنی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ هێزە هەرێمی و نێودەوڵەتی و رێکخراوە فەرمی و رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیدا پێکبهێنن. هەروەک ئاشکرایە لەو ماوەیەدا کوردەکان تاکە لایەنێک بوون هێزی چەکداریان ببێت، کەلە هێزی پێشمەرگەی کوردستاندا بەدەردەکەوت. لەپێکهێنان و دامەزراندنی دام و دەزگاکانی دوای رووخانی رژێمدا کوردەکان پۆست و پلەو پایەی بەرز و جیاوازیان لە دەسەلاتدا بەرکەوت، بەتایبەتی لەپێکهێنانی ئەنجومەنی حوکمدا لە کۆی پێنج کورسی دووکورسیان بەرکەوت کە مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی بەڕێوەبەرایەتیان گرتە دەست. کوردەکان بەم جۆرەی لای خوارەوە پۆستەکانی حکومەتی عێراقیان گرتەدەست..

پۆستی جێگری سەرۆک کۆمار خرایە ئەستۆی سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان (د. رۆژنوری شاوەیس).

پۆستی جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران درابە ((د. بەرهەم ئەحمەد ساڵح)ی سەرۆکی حکومەتی (بەڕێوەبەرایەتی) سلێمانی.

پۆستی سەرۆکی ئەرکانی سوپای نوێی عێراق درابە ژەنەراڵ (بابەکر زێباری).

پۆستی سەرۆکایەتی لیژنەی باڵای کۆنگرەی ئامادەکاری نیشتمانی عێراق سپێررا بە (د. فوئاد مەعسوم)ی بەرپرسی نووسینگەی پەیوەندییە دەرەکییەکانی

(ی. ن. ك)، کە نوێنەرایەتی هەموو پێکهاتەو ڕەوتە سیاسیە جۆراو جۆرو نەتەوەیی‌و مەزهەبیەکان دەکات.. دواتر سەرۆکایەتی کۆمەڵەی کاتی نیشتمانی پێ سپێررا.

## کۆنگرەی ئاشتبوونەوەی نیشتمانی

وەك ئەوەی کوردەکان هاوولاتی‌و نیشتمانپەروەری عێراقین‌و پاشەڕۆژی ولاتەکەیان لاگرنگە، لەو چوارچێوە یەدا (مەسعود بارزانی) تەواوی پارت‌و گروپ‌و دەستەو سەرکردە سیاسیەکانی عێراقی بانگهێشتی کۆنگرەی ئاشتبوونەوەی نیشتمانی کرد بۆ هەولێر، پێشتر کۆنگرەی گشتی ئاشتبوونەوەی نیشتمانی‌و لەژێر دروشمی (ئاشتبوونەوەی نیشتمانی ڕێگامانە بەرەو ئاشتی کۆمەلایەتی) ڕۆژانی ٢٦و ٢٧ی ئازاری ٢٠٠٤ لە هەولێر کۆنگرەی ئاشتبوونەوەی نیشتمانی گرێدراو بەمشێوەیەی لای خوارەوە بەیاننامەی کۆتایی ڕاگەیاند.

(لەسەر بانگهێشتی بەرێز مەسعود بارزانی‌و لەژێر دروشمی - ئاشتبوونەوەی نیشتمانی ڕێگامانە بەرەو ئاشتی کۆمەلایەتی‌و بنیادنانەوەی عێراق - ڕۆژانی ٢٦و ٢٧ی ئازاری ٢٠٠٤ کۆنگرەی گشتی ئاشتبوونەوەی نیشتمانی لە هەولێر گرێدرا.. لەووتاری کردنەوەی کۆنگرەکەدا بەرێز بارزانی رایگەیاند..

(ئاشتبوونەوەی نیشتمانی پێویستی تەواوی رووبەڕووبوونەوەو لەدژوەستانی ستەم‌و کارە دژوارەکان‌و ئەوکێشە کەڵەکەبوانەیە عێراق‌و گەلەکەیان بەرەو گێژاوی چەندین کارەساتی ناهەموار راکێشاوە، هەمان کات بەبیرو هزری نوێ‌و میکانیزمی نوێوە پێویستی تەواوی هەنگاو نانمانە بەرەو پاشەڕۆژو بنیادنانەوەی عێراقی نوێ).

لەووتارەکەیدا بارزانی داواکارە بەشداربوان بەگیانی برایەتی‌و زۆر بەراشکاوی‌و پێکەوە لە دارشتنی بەرنامەیەکی دیموکراتی بەدیهێنەری ئاشتبوونەوەی نیشتمانی‌و بەمیکانیزمی نوێوە لەسەر ئاستی عێراق کاربکەن.

دوا بەدوای وتاری کۆنگرە هەریەك لە ئەندامانی ئەنجومەنی حوکمو وەزیرەکانو نوێنەرانی پارتە سیاسیەکانو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیو نوێنەرانی خێڵەکانی ناوچە جۆراوجۆرەکان لەعێراق، وتارەکانی خۆیان بەدەرخستنی بیروڕاو بۆچوونەکانیان لەپێش کۆنگرەدا خوێندەوە.

بەمەبەستی هینانەدی پرۆسەیەکی بنەڕەتی لە هێنانەدی حاڵەتی پێکەوە ژیانو ئاشتبوونەوەی کۆمەڵایەتی لەنێوان پێکهاتە جیاجیاکانی عێراقدا، کۆنگرەی ئاشتبوونەوەی نیشتمانی، بە نوێنەرایەتی ڕەوتە سیاسیو پێکهاتە کۆمەڵایەتیو ئایینیو مەزهەبیەکان زیاتر لە (٦٠٠) کەسایەتی لەخۆ گرتبوو. لە پێناوی بەدیهێنانی ئامانجەکانی کۆنگرە لە ئاشتبوونەوەی نیشتمانیو دیاریکردنی میکانیزمی سەرلەنوێ بنیادنانەوەی عێراق، سێ لیژنەی لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون لە ئەندامانی کۆنگرە هەڵبژێرران، لەگەڵ دەستبەکاربوونیان، ئەندامانی لیژنەکان بەتەواوی سەربەستیو بەڕاشکاوی خاڵە پەیوەندیدارەکانی سەبارەت بەچۆنییەتی هێنانەدی ئاشتبوونەوەی نیشتمانیان خستە بەرباسو لێکۆڵینەوە. لەگەڵ گەیشتنیان بەکۆمەڵێك پێشنیارو ڕێنماییو دوای تەتەڵەکردنی کارەکانیان، بەڕاپۆرتێك بەرزیان کردەوە بۆ کۆنگرەو بڕیار لە سەردانیان. گفتوگۆو باس وخواسەکانی کۆنگرە باروودۆخێکی کاراو بەرچاوڕوونیان لەخۆگرتبوو، کە تێکڕا دەربڕی پابەندبوونی خەڵکی عێراق بوون بە لێکۆڵینەوەو گەڕان بەدوای هۆکارەکانی بەهێزکردنی ڕەگەزەکانی یەکێتی نیشتمانیو خاڵەکانی بەیەکگەیشتنو هەڵوەشاندنەوەو وەلاخستنی هەر جۆرە ناکۆکیەك لە نێوان ڕۆڵەکانی گەلی عێراقدا. لای بەشداربوان، گرێدانی کۆنگرە لەسەر بانگێشتی برایانی کوردو لەسەر خاکی کوردستان، ماناو واتای قووڵی نیشتمانی خۆی هەبوو، ئەو لایەنو ڕەگەزانەی لەماوەی دەسەڵاتی ڕژێمە سیاسیە بەدوایەك هاتووەکاندا تووشی جۆرەها چەوساندنەوەو ستەمو سەرکوتکردن بوو بوونو مافەکانیان پێشێل کرابوو، عێراق لە ناخیاندا بنچی

داكوتاوەو وەك نیشتمانی هەموان سەرومرە بەسەر برینەكانیدا. ئەمڕۆ ئەو هەلە مێژووییەمان لە پێشدا رەخساوە بتوانین لەسەر بنەڕەتی هاوبەشیی و دادپەروەریی و یەكسانیی و بێ جیاوازیكردن لەنێوان پێكهاتەكانیدا سەر لەنوێ عێراق بنیادبنێینەوە، دەبێ ئەوە لەیادنەكرێت لەم كاتەدا عێراق بەرِووی هەموو هەڵبژاردنەكاندا كراوەتەوە، دەبێ بەشێوازێك بنیادبنرێتەوە هەموان لەنامێزیدا بە ئاسوودەیی سەرەوت بگرن و هۆكارو میكانیزمە نوێكان وەڵام دەرەوەی كێشە مێژووییە بەرپاكراوەكان بن.. ئەگەر لە ڕێی تێگەیشتنی نوێ و دیدو بۆچوونی نوێی سەردەمیانەوە نەچینە ناو واقعەكەو ژیانی ئاسوودەیی و بەختەوەری بۆ خۆمان دروست نەكەین گونجاو بێت لەگەڵ دیدگای عێراقیەكاندا، هیچ كات لە تواناڎا نابێت بتوانین لە توونی ستەم و زۆرداریی و ئاسۆی تەسكی بیركردنەوەدا دەرچین و بگەینە جیهانێكی پڕ لە خۆشەویستی و لێبوردەیی و كرانەوە.

لە دیدگای كۆنگرەوە ئاشتبوونەوەی نیشتمانی قۆرخ نەكراوەو سنووردارێش نییە بەهیچ دەستەو لایەن و پێكهاتەیەكی دیاریی و جیاواز لەلایەنێكی دیكە، بەڵكو گشتگیرە بەخوێندنەوەی یەكتر و پابەندبوونە بەتەواوی ئەرك و مافە مێژوویی و شارستانییەكانەوە.

لێرەوەیە ژیانی نوێ سەر دەردێنێ و دەبێتە سەرەتای دامەزراندنی چەرخێكی نوێ و بەرپاكردن لەبنیادنانەوەی نیشتمان، دوور لەستەم و زۆرداریی و پەرتەوازەبوون، كەجگە لەوە گەلی عێراق شتێكی دیكەی لێ بەرهەم نەهێناوە. لەپێناوی زیاتر داكوتاندنی ریشەی نیشتمانپەروەری و بەهێزكردنی گیانی برایەتیی و یەكگرتنی ریزەكانی گەلی عێراق بەتەواوی پێكهاتەكانییەوەو لەپێناوی كاراكردنی میكانیزمی ئاشتبوونەوەی نیشتمانیدا، كۆنگرە گەیشتە ئەم دەرەنجامانەی لای خوارەوە..

١ - پێكهێنانی لیژنەی تایبەت بەدواداچوونی بڕیارو رێنماییەكانی كۆنگرەو پەلەكردن لەدامەزراندنی ئەنجومەنی ئاشتبوونەوەی نیشتمانی، چاودێر

بێــت بەســـەر لیژنـــەکانی پارێزگاکـــان و هەرێمەکانـــدا.. بەمەبەســـتی پارمەتیـــدان و هاوکـــاریکردنی دام و دەزگـــا فەرمیـــە دیاریکراوەکـــان و ڕێکخراوەکانی کۆمـەڵگای مـەدەنی و تـەواوی لایەنـە کاریگـەرەکان. دەکرێـت ئەنجومـەن هەسـتێت بەداڕشـتنی بەرنامەیـەکی ڕوون و ئاشـکرا بـەنیازی بەرجەستەکردنی کردەوەی ئاشتبوونەوەی نیشتمانی، بەسوود وەرگـرتن لـە ئەزموونی ئەو گەلانەی بەم ئەزموونەی ئێمەدا تێپەڕبوون.

٢ - خوازیـارین دام و دەزگاکـانی کۆمـەڵگای مـەدەنی، بەشـداری بکـەن لـە لیژنەکانی ئاشتبوونەوەدا، بەتایبـەتی لەهـەر دوو لیژنـەکانی ئاشـتبوونەوەو دام و دەزگاکـانی کۆمـەڵگای مـەدەنی لـە پێنـاوی کـاراکردنی هـەنگاوەکانی بنیادنانەوەی کۆمەڵگای عێراق وەك خۆبەخش بەشداربن.

٣ - پێویستە لە ئاستی کردەوەی ئاشـتبوونەوەی نیشـتمانی لـە بەرژەوەنـدی لاوەکی و بەرژەوەندی تاکدا کۆنەکرێتەوە.. بەڵکوو ڕاهێنـان و مەشق بکرێـت لە مەسەلەی یەکترخوێندنـەوەو بـەدیهێنانی دادپـەروەری و یەکسانی و قایـل بـوون بەهەمـەڕەنگی و ڕێگـرتن لـە سـەپاندنی تایبەتمەنـدی ڕۆشـنبیری و شارستانی.

٤ - لـە پێنـاوی دووبـارە نەبوونـەوەی ئـەزموونی ڕەوایەتیـدان بەکوشـتن و سـەپاندنی سـزا لەسـەر کەسـانێك لەسـەردەمی ڕژێمـی ڕابـردوودا دەسـتیان لەخوێنی عێراقیەکان سوور بووە، بەپێویستی دەزانـین بەمـەرجی یـەکلایی کردنەوە ئـەم مەسـەلەیە بخرێتـە ئەستۆی دادگایـەکی تایبـەت، هـەمان کـات دەرکردنـــی یاســـای قەرەبووکردنـــەوەی قوربانیـــان، یـــان کەســـانی لـــە دوابـەجێماویان بەپێویسـت دەبیـنین، لەگـەڵ بەرچـاوگرتنی ڕێگەنـەدان بەکـەس و کـاری قوربانیـان و زیـان لێکـەوتوان بـەبێ گەڕانـەوە بـۆ دادگـای تایبـەت وەك تۆڵـە سـەنلنەوە مـافی خۆیـان وەربگرنـەوە، بـە ئەنجامـدانی هەرکارێکی لەو جۆرە، لەرێی پاساوە لەهەموو مـافێکی (مـاددی و مەعنـەوی)

بێبەش بکرێت.

٥ - لەدیدگای کۆنگرەوە مانابنەڕەتیەکانی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق بۆ سەردەمی گواستنەوە، هەنگاوێکی کارایە لەپێشەوە چوونی بنیادنانەوەی عێراقێك هەموان لە خۆ بگرێت، یارمەتیدانو پشتیوانیکردنو کۆبوونەوە لەدەوری، بەرەگەزێکی گرنگ دادەنرێت لەرەگەزەکانی یەکێتی نیشتمانیو ئاشتبوونەوەی سەرتاسەری.

٦- چرکردنەوەی هەوڵەکان بۆ دۆزینەوەی چارەسەری زانستی گونجاوی کێشەو گرفتی ئەو کەسانەی لەکارەکانیانو فەرمانگەکانیان لادراونو دوورخراونەتەوەو لەسەر چاوەی ژیان بێبەشکراون.

٧ - کۆنگرە نارەزایی خۆی لەئاستی هەموو شێوازێکی تیرۆر دەردەبرێتو بەتوندی دژی هەرکردەوەیەکی توندوتیژی دژبە ژنانو زیان گەیاندن بە منداڵانو هاولاتیانی مەدەنی بێ تاوانو دژ بە ماڵو سامانی گشتی دەوەستێت، با لە پشتی هەر ناوو دروشمو پەردەیەکدا خۆی حەشار دابێت.. هەمان کات کۆنگرە بەپەرۆشەوە دەڕوانێتە بڵاوبوونەوەی دیاردەی تۆڵە سەندنەوەو کوشتنی هەڕەمەکیو بە توندی ریسوای دەکات، خوازیارە رێگا بدرێت لە گرتنەبەری رێڕەوی خۆیدا یاسا سەروەر بێت.. دیسانەوە لەگەڵ دانە پاڵی مۆرکو شەقڵی سیاسی لە سەر تاوانباران،کۆنگرە دەخوازێت تەواوی هێزە سیاسیو کەسایەتیو دامەزراوەکان دەنگی نارەزایی توندی خۆیان لە ئاستی ئەو کردەوانە بەرزبکەنەوەو ئاسانکاری نەکەن لەگەڵ ئەنجامدەرانیاندا.

٨ - کۆنگرە بە گەشبینیو هیواوە دەڕوانێتە گواستنەوەی سەروەری بۆ عێراقیەکان لە حوزەیرانی داهاتوودا، داواکارە هەموو عێراقیەکان لە پێناوی هێنانەدی ئەم پرۆسە مەزنەدا هەوڵو تواناکانیان یەك بخەنو هاوکار بن لە ئامادەکردنی هۆکارو پێداویستیەکانی هەنگاوەکانی داهاتوو، لە

پێناوی گەیشتن بەنووسینەوەی دەستووری هەمیشەیی و گەیشتن بەهەڵبژاردنی ئازادو بێگەردو بەرهەم هێنەری حکومەتێکی نیشتمانی هەڵبژێرراو، عێراق ببات بەرەو دامەزراندنی سیستەمێکی پەرلەمانی دیموکراتی فیدراڵی یەکگرتووو رابەرایەتی بکات

٩ - کۆنگرە داوا لە هەموو دەوڵەتانی ناوچەکەو بەتایبەتی دەوڵەتانی هەرێمەکە دەکات بێ دەست تێوەردانی هیچ لایەنێك، لاپەڕەیەکی نوێ لەگەڵ واقعی عێراقدا بکەنەوەو رێز لەویستی گەلەکەی و چارەنووسی و دیاری کردنی سروشتی دەسەڵات و رێکخستنی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری بگرن. هەروەها کۆنگرە دەخوازێت دراوسێکان لە رووی پاراستنی سنوورو بەرپاکردنی پەیوەندی دۆستایەتی بنیادنراو لە سەر رێزگرتن لە یەکترو لە پارێزگاریکردنی بەرژەوەندییە هاوبەشەکان و هاوکاری تەواوی دامەزراوە نیشتمانییە تایبەتیەکان بکەن.

١٠ - کۆنگرە داواکارە لەتەواوی دامەزراوە پەروەردەیی و مەدەنییەکان دژایەتی کەری بیری خۆسەپاندنی تۆتالیتیاری بن و کار بکەن لە سەر بلاوکردنەوەی راستی و بنەماکانی لێبووردەیی و بە هێزکردنی گیانی برایەتی و خوێندنەوەی یەکترو رێز لە یەکترگرتن و خۆ رۆشنبیرکردن بە چەمکەکانی دیموکراتی و رزگاریخوازی.

پەیرەوکردنی ئەمانە زەمانەتێکە جارێکی تر ژان و ناسۆرە پڕ لە ئێشەکانی رابردوو دووبارە نەبنەوە ئاشتبوونەوەی کۆمەڵایەتی و بنیادنانەوەو گەشەکردن لە عێراقدا جێگیر بێت و چاودێری بکرێت[٦٨].

کۆنگرەی ئاشتبوونەوەی نیشتمانی، بە شێوازێکی زانستیانە تیایدا کوردەکان عێراقیبوونی خۆیان سەلماندووەو سیمایان هەڵگری غەم و پەژارەو ئەندێشەکانی گەلی عێراقن.

---

(٦٨) شوێنی (پ. د. ك) لەسەر تۆڕی ئەنتەرنێت.

نووسەری ئەم دێڕانە نامەیەکی بەرز نرخاندنی ئەو هەنگاوەی ئاراستەی بەڕێز (مەسعود بارزانی) کردووە، بە هیوای تەواوەوە چاوەڕێی زیاتری لێدەکات..

لە لایەن خۆیەوە بەڕێزیان بەم نامەیەی خوارەوە وەڵامی داوەتەوە.

پارتی دیموکراتی کوردستان

سەرۆك

بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

برای ئازیز مامۆستا رەجائی فاید..... سلاوێکی گەرم

بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە نامەکەی ۲۰۰٤/٦/۲۱ تانم پێگەیشت،

سوپاسی هەستی برایانەتان دەکەم و هیوای بەردەوامی تەندروستی خۆت و خێزانە بەڕێزەکەتان دەخوازم.. من لەگەڵ رای ئێوەدام سەبارەت بە مەترسیداری ئەورووداوانەی عێراقیان پیادا دەگوزەرێت، بانگهێشتم بۆ کۆنگرەی (دیالۆگی عەرەبی کوردی) شوباتی رابردوو لە هەولێرو دواتر گۆڕینی بۆ کۆنگرەی ئاشتبوونەوەی نیشتمانی مەترسی کردنم بوو ئەم رووداوانە پاشەڕۆژی عێراق بەرەو توونی ناکۆکی تایفەگەری و رەگەزی ببەن..

ئەوەبوو کەلێی کەوتەوە، تەواوی هەوڵم دەخەمە گەڕ لە پێناوی کوژاندنەوەی ئەو فیتنەیەی دوژمنانی عێراق ئەگەر لەدەرەوە یان لە ناوەوە نەخشەیان بۆ کێشاوە...... سلاوی گەرمم بۆ هاوڕێیانی میسرو تەواوی رێزو خۆشەویستی منیان پێبگەیەنەو دڵنیایان بکە من هەمیشە لەگەڵ گەلەکەم و نیشتمانەکەم و عێراقی یەکگرتوو دیموکراتیدام.

هەمیشە برای ئازیزی

مەسعود بارزانی

۲۰۰٤/٦/۲۲

# یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی سەردەمی گواستنەوە دەستکەوتە بەدیهاتووەکانی کورد

لەسایەی سەردەمی گواستنەوەی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق،کوردەکان دەستکەوتی گرنگ و مەزنیان بەرکەوت، وەك پێویست دەکرێت ئەو بەندانەی لە یاسای سەردەمی گواستنەوەدا سەلمێنراون،

لە دەستووری داهاتووی عێراقدا بە هەردوو ئەنجومەنییەوە، ئەنجومەنی نیشتمانی کاتی و ئەنجومەنی هەڵبژێراویش و لەهەمان چوارچێوەدا کاریان پێبکرێت و بخرێنە خزمەتی ئەو ئامانجانەی لەپێناویدا هاتوونەتەدی، هەروەك لەیاساکەدا دیاری و دەستنیشان کراوە، سەرانی کورد بەکەمتر لەسیستەمی فیدراڵی رازی نەبوون و داکۆکیان لەسەر دەقە یاساییە دیاریکراوەکان دەکرد[٦٩].

لێرەدا بەپێی ئەم خاڵ بەندیەی خوارەوە دەستکەوتە یاساییەکانی کورد دەردەکەون..

١ – فیدراڵی:

وەك لەماددەی چوارەمدا هاتووە (سیستەمی دەسەڵات لەعێراقدا کۆماری ئیتیحادی (فیدراڵی) دیموکراتی فرەلایەن دەبێت، تیایدا دەسەڵات لەنێوان حکومەتی فیدراڵی و حکومەتە هەرێمیەکان و پارێزگاکان و شارەوانییەکان و بەڕێوەبەرایەتیە خۆجێیەکاندا دابەش دەکرێت، سیستەمەکە لەسەر بناغەی هۆکاری جوگرافی و مێژووییەکان و جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان دادەمەزرێ.

---

[٦٩] ڕۆژنامەی (الوطن السعودی) ٢٠٠٤/٤/٦

٢ - زمانی کوردی:

وەك لەماددەی نۆهەمدا هاتووە (زمانی عەرەبیو زمانی کوردی پێکەوە زمانی فەرمی عێراق دەبن. بازنەی دەرکردنو بڵاوکردنەوەی رۆژنامەی فەرمی (الوقائع العراقیە) بەهەردوو زمان ئاخاوتنو دەربڕینو بوارە فەرمیەکانی وەك ئەنجومەنی نیشتمانیو ئەنجومەنی وەزیرانو دادگاکانو کۆنگرە فەرمیەکان، بەهەر زمانێك لەو زمانانە دەگرێتەوە، لەگەڵ مۆرکردنی بەڵگە نامە فەرمیەکانو نامەگۆڕینەوەو راگەیاندنو دەرکردنی بەڵگەنامە فەرمیەکان بەهەردوو زمان.. مافی عێراقیەکانیش لەدامەزراوە پەروەردەییو فێرکاریە حکومەتیەکاندا لەسەر بناغەی رێوشوێنی پەروەردەیی دابینکراوە. بەپێی رێنمایە پەروەردەییەکان خوێندن لە قوتابخانەکان لەهەر بوارێکی دیکەدا بنەماکانی یەکسانی بیانگرێتەوە، وەك (دراو – گوزەرنامە – پوول)

٣ - بارودۆخی ئێستای کوردستان:

وەك لەمادەی پەنجاو سێدا هاتووە.. (ناساندنو دانپیادانان بەحکومەتی هەرێمی کوردستان وەك حکومەتی فەرمی ئەو خاکانەیە تا ٩/ئازاری/٢٠٠٣ پارێزگاکانی دهۆكو هەولێرو سلێمانیو کەرکوكو دیالەو نەینەوا لەلایەن ئەو حکومەتەوە بەڕێوەدەبران.. زاراوەی حکومەتی هەرێمی کوردستان وەك لەم یاسایەدا هاتووە (ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانو ئەنجومەنی وەزیرانو دەسەڵاتی قەزایی لەهەرێمی کوردستان دەگرێتەوە). - لەمادەی پەنجاوچواردا هاتووە.. (حکومەتی هەرێمی کوردستان بەدرێژایی ماوەی گواستنەوە لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکانی خۆی بەردەوام دەبێت، وە لە لایەن حکومەتی (فیدرال)یەوە خەرجی فەرمانبەرانو کارو ئەرکەکانی بەڕێوەبردنی دابین دەکرێت. بەپێی ئەو رێوشوێنەی ئێستا کاری پێکراوە، هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆو هێزەکانی پۆلیس سەر بەدەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەردەوام دەبن لەگەڵ دانانی ئەو رەسمو باجەی لەناو هەرێمەکەدا هەیە.

٤ - چارەسەرکردنی پاکتاوی رەگەزی:

وەك دەرکەوتووە یاسای پاکتاوی رەگەزی، بەگشتی کوردەکان و بەتایبەتی شاری کەرکوکی فەرامۆش نەکردووە، وەك لەدەقی مادەی پەنجاو هەشتدا هاتووە.. (حکومەتی سەردەمی قۆناغی گواستنەوەی عێراق بەتایبەتی دەستەی بالآی چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکانی موڵکایەتی و خانووبەرەو هەر لایەنێکی دیکەی پەیوەندیدار، هەرچی زووتر دەستبەکاردەبن لە ئەنجامدانی کارەکانیان لەپێناوی هەڵگرتن و لادانی ئەو ستەمکاریەی رژێمی پێشوو هۆکاریان بووەو بووەتە هۆی گۆڕینی دیموگرافیای چەند ناوچەیەکی دیاریکراو، لەنێوانیاندا کەرکوك لەرێی گواستنەوەو دوورخستنەوەی خەڵکانێك لەشوێنی نیشتیەجێبوونیان، لەرێی راگواستنی زۆرەملێ و نیشتەجێکردن و جێگیرکردنی خەڵکانی نامۆو غەوارە بەناوچەکەو بێ بەشکردنی دانیشتوانی رەسەنی لەکارکردن و هەروەها لەرێی راستکردنەوەی باری نەتەوەییەوە).

٥ - مافی بەرگرتن و بەرپەرچدانەوە (حق النقض - الفیتو)

سەبارەت بەرەشنووسی دەستووری هەمیشەیی لەبڕگەی (ج) ماددەی شەست و یەکەمدا هاتووە - (راپرسی بەسەرکەوتوو دەژمێررێت و رەشنووسی دەستوور پەسەندکراو دادەنرێت، ئەگەر زۆربەی دەنگدەرانی عێراق رازیبوون لەسەری و ئەگەر دوولە سەر سێی دەنگدەرانی سێ پارێزگا یان زیاتر پەسەندیان کرد). رستەی دوایی مقۆمقۆو دەمەقاڵەیەکی زۆری لێکەوتەوە، بەمافێك لێکدرایەوە کەتەنها کوردەکان دەگرێتەوە، کەلەپارێزگاکانی دهۆك و هەولێرو سلێمانی و بەشەکانی دیکە پێکهاتووە.. بەو مانایە کوردەکان ئەو مافەیان هەیە رێگری بکەن لەدەقێکی دەستووری لە پاشەرۆژدا لەگەڵ خواستەکانیان یەکنەگرێتەوە. وەك ئاشکرایە ئەوەی یاسای بەرێوەبەرایەتی قۆناغی گواستنەوەی دیاری کردووە، لەدەستکەوتەکان بۆ کورد جێبەجێکراوە،

تائەم سەردەمە دەسەلات و پەیوەندیەکانیان لەسەر ئاستەکانی ناوخۆو

دەرەوەو دۆخی دەسەڵات بەسەر هێزەکانی ئاسایش‌و پۆلیس‌و دانانی رەسم‌و باجی ناو خۆو سنووری جوگرافی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستان وەك خۆی ماوەتەوە.. هەروەها لەرێی یاساوە زمانی کوردی هەنگاوێکی باشی بەرەو پێشەوە نا، پاش گرێدانی کۆنگرەی نیشتمانی گواستنەوە، کەهەڵبژاردنی کۆمەڵەی نیشتمانی کاتی لێکەوتەوە تێبینی کرا لە:

٦ - نووسینی ناوی کۆنگرە بەهەردوو زمانەکانی کوردی‌و عەرەبی لەسەر رووبەری هۆڵەکە بەم شێوەیە:

کۆنگرەی نیشتیمانی – بەغدا – ئابی ٢٠٠٤

المؤتمرالوطني – بغداد – أب ٢٠٠٤

٧ - وەك تێبینی دەکرا نەخشەی عێراق لەسەر لیستی هەڵبژاردن بەم شێوەیە سێ رەنگی لەخۆ گرتبوو (سوور لەسەرەوە، سپی لە ناوەڕاست‌و سەوز لە خوارەوە، کەدەربڕین بوو لەئاڵای کوردستان.

٨ - ئەندامانی کورد سووربوون لەسەر دەست پێکردنی وتارەکانیان بە وشەی (بەیانیت باش).. لەلایەکی ترەوە هەوڵەکانی راستکردنەوەو سڕینەوەی شوێنەوارەکانی پاکتاوی رەگەزی‌و کێشەی نیشتەجێبوون، پێش دەرچوونی یاساکەو دوای دەرچوونیشی رایی دەکران، لەو پێناوەدا چەندین کێشەو ناکۆکی‌و بەیەکدا هەڵپڕژان روویاندا. بەڵام سەبارەت بەمافی بەرگرتن‌و هەڵوەشاندنەوە (الفیتو)، چاوەڕوان دەکرا رۆژانی داهاتوو، لەکاتی دەنگدانی گشتی لەسەر دەستووری هەمیشەیی توانای جێبەجێکردن‌و یەکلاییکردنەوەی ئەو مەسەلەیە دەرکەوێت.

# هەڵبژاردە دۆڕاو و لەدەست چووەکانی کورد

لەپەندی پێشینانو وتەبەنرخەکانی کورد هەمیشە دەووترێنەوە، وشەی (دۆڕاو)ە.. هەوڵدەدەین لەهەڵدانەوەی لاپەڕەکانی مێژوودا لەواتای ڕاستو دروستی ئەو وتەیە بگەینو هەندێك لەو ڕووداوانە هەڵبژێرین ئەو ووتەیە دەیانگرێتەوە..

## ١ - شەڕی چالدێران

لەکاتێکدا دەسەلاتدارانی (ئالی عوسمان) لەهەوڵی دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتێکی بەربلاودابوون، هەمان کات سەفەویەکان دەوڵەتی خۆیان دامەزراندو ناوچەی کوردستانی عێراق، کە بەویلایەتی شارەزوور ناسرابوو، خستیانە ژێرچنگی خۆیان. دیارە سوڵتانەکانی عوسمانی هەستیان بەمەترسی سەفەویەکان دەکرد بۆسەر ئیمپراتۆرییەتەکەیان، لەدوو مەسەلەی گرنگدا کەوتنە هەوڵو تەقەلای دڵدانەوەو ڕاکێشانی کوردەکان بۆلای خۆیان..

**یەکەم:** لایەنی مەزهەبی- بەو لێکدانەوەیە زۆربەی کوردەکان چەشنی سوڵتانەکانی ئالی عوسمان لەسەر مەزهەبی سوننە بوون.

**دووەم:** بەرانبەر بەکوردەکان سیاسەتی (شا ئیسماعیل)ی سەفەوی لەدژایەتی کردنی تورکەکاندا دەبینرا، کەبەتوندی هەر ڕەگەزێکی تورکی ڕەتدەکردەوەو کردبوونییە ژێردەستەی خێڵە تورکمانە شیعەمەزهەبەکان. ئەمانە هۆکاربوون لەشەڕی دژبە سەفەویەکاندا میرە کوردەکان بەتەواوی هێزە خێڵەکیەکانیانەوە خۆیان بخەنە پاڵی سوڵتان سەلیمی یەکەمو پشتیوانی تەواوی لێ بکەن، کەبوونە هۆی سەرکەوتنی مەزنی عوسمانییەکان بەسەرسەفەویەکاندا. ئەوندەی نەخایاند دوا بەدوای گەڕانەوەی سوپاکەی سوڵتان لەشەڕگەکانیدا، تورکانی عوسمانی دەستیان دایە دژایەتیکردنی میرە کوردەکان وبەپەندکردنیانو بەرتەسککردنەوەی دەسەلاتیانو ناچارکردنیان بەکەوتنە ژێر چاودێریو

دەسەڵاتیان.. بەو نیازەی هێزەکانی خۆیان لەگێژاوی چاودێریکردنی ناوچە کورد نیشینەکان دووربکەونەوەو ئەو ئەرکە بخەنە ئەستۆی خودی کوردەکانەوە. لەوەرگرتنی پاداشت لە ئالی عوسمان، بەسەر دەستی سوڵتان سەلیم دا شەڕی چاڵدێران تا دەگاتە دەسەڵاتی تورکان بە یەکەم شەڕی دۆڕاوی کوردەکان دەژمێررێت.

## ٢ - کوودەتای لاوانی تورکیا

لەگەڵ هەرەسهێنانی دەسەڵاتی عوسمانیدا ساڵی ١٩٠٨، بەمەبەستی بەرهەڵستی نەکردن لەداخوازیە نەتەوایەتیەکانیان، کوردەکان پشتیوانیکردنی خۆیان بۆ بزووتنەوەی تورکیای نوێ دەربڕی، بەتایبەتی لەکاتێکدا دییان رژێمی نوێ هاو سۆزە لەگەڵیانداو گرنگی دەدەن بە کێشەکەیان. لەپێناوی بەهێزکردن‌و جێگیرکردنی پێگەی خۆیان تورکەکان کەوتنە هەوڵی راکێشانی هەموو رێکخراوە سیاسیەکان بەلای خۆیاندا.. سۆزو ئاوڕدانەوەی تورکان گەیشتە ئەو ئاستە لەهەڵبژاردنەکاندا هاوکاری‌و پارمەتی تەواوی (عەبدولقادری کوڕی شێخ عوبەیدیلای نەهری) رابەری شۆڕشی ساڵی ١٨٨٢ بکەن‌و بەسەرۆکی پەرلەمانی تورکیا هەڵی ببژێرن. مەسەلەکە تەنها بەوەشەوە نەگیرسایەوە، بەڵکوو پشتیوانی تەواو لەدامەزراندنی ناوەندە سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیریە کوردیەکان‌و لەدەرکردنی رۆژنامەی کوردی کرا. ئەمەبووە سەرچاوەی راکێشانی خەڵکانێکی زۆرو پەیوەندیکردنیان بەو ناوەندانەوەو بەردەوام فراوانبوون‌و گەشەکردنیان.

لەگەڵ تێپەڕاندنی کاتدا لیژنەی (ئیتیحادو تەرەقی) لەکوودەتای نیسانی ١٩٠٩ دا دەسەڵاتی تورکیای گرتە دەست. هەرلەسەرەتاوە گێرەو کێشەو گرفت‌و ناکۆکی لەنێوان کوردە نەتەوەییەکان‌و (ئیتیحادو تەرەقی) سەری هەڵداو بەردەوام لە پەرەسەندندا بوون، تاگەیشتە ئەو ئاستە رژێمی نوێ فەرمانیدا بە هەڵوەشاندنەوەو قەدەغەکردنی ناوەندە سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیریەکانی

کوردو گرتنی سەرکردەو رابەرەکانیان‌و بەندکردنیان. ئەمەش جارێکی تر بوویە هەڵبژاردەیەکی دۆڕاو لە هەڵبژاردەکانی بزووتنەوەی کوردایەتی.

## ٣ - بەبڕواخستنە سەر پشتیوانی و یارمەتیدانی ماددی و مەعنەوی یەکێتی سۆڤیەت.

لە ٢٤ ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦ (قازی محەممەد) دامەزراندنی کۆماری مەهابادی لەکوردستانی رۆژهەلاّت (ئێران) راگەیاند. دامەزراندنی کۆماری مەهاباد هیواو ئاواتی نەتەوەی کوردی بەسەربەخۆیی کوردستان بەخشی، بەهۆی پشتیوانی‌و هاوکاری ناوچە کوردنشینەکانی دیکەوە ئەوەندەی نەخایاند کۆماری نوێ کەوتە گەشەکردن‌و کۆبوونەوەی جەماوەری لەدەوریدا. ماوەیەکی کەمی خایاند رێککەوتنی نێوان – ستالین‌و رۆزفلت‌و چەرچڵ‌و شای ئێران – مۆرکراو بووە هۆی راگرتنی یارمەتیەکانی سۆڤیەت لە کۆماری کوردستان‌و هێرش‌و پەلاماری توندی سوپای ئێران بۆسەر ناوچەکەو رووخاندن‌و گەیاندنی سەرکردەکانی بەپەتی سێدارە. ئەمەیش گرەوێکی دیکەی دۆڕاوی کوردەکان بوو.

## ٤ - پشتبەستن بە ئێران

لەمەودای وەرگرتنی یارمەتی‌و پشتیوانیکردنیدا، بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە کوردستانی عێراق، جارێکی تر بڕواو متمانەی خستەوە سەر ئێران، لەکاتێکدا هەمان ئێرانە لەناوخۆی ولاّتەکەی خۆیدا بزووتنەوەیەکی هاوتای بزووتنەوەکەی کوردستانی عێراق سەرکوت دەکات. لەپێناو زیاتر توندکردنەوەی شەڕ لەسەر رژێمی بەغداو بەرزکردنەوەی توانا جەنگیەکانی هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان لەبەرەکانی پێشەوە، حکومەتی ئێران خاکی ئێرانی وەك بەرەی دواوە بەڕوویاندا کردەوە، لەوێوە تەواوی هاوکاری پێداویستی سەربازی

لەچەك‌و تەقەمەنی‌و جل‌و بەرگی تایبەت‌و خۆراك دەگەیەنرایە بارەگاکانی جەنگاوەرانی کورد.. بەردەوام کۆمەك‌و هاوکاریەکانی ئێران لەپەرە سەندندابوون‌و دواتر گەیشتە پلەی پشتیوانی راستەو خۆی سەربازی‌و خەرجکردنی مووچەی هێزەکانی پێشمەرگە بەدراوی ئێران.

لەناکاوێکدا ئێران پشتی کردە شۆڕشی کورد، وەك لەبەشەکانی پێشوودا بەدرێژی باسی لێوەکرا، ئەوە بوو لە ئەنجامی ڕێککەوتنی جەزائیری نێوان شاو سەدام حسەین لە ۱۹۷۵/۳/۷ بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردو شۆڕشەکەی رووبەڕووی شکست‌و داڕووخانێکی سەخت بوونەوە.. کەگرەوێکی دۆڕاوی دیکەی لە مێژووی کورددا تۆمارکرد.

## ٥ - پشت بەستن بە ویلایەتە یەکگرتووەکان-

زۆرجار لە گرەوەکانیدا بزووتنەوەی کورد پشتی بەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەستووەو لەهەموو جارێکدا دۆڕاندنی گرەوەکان دەرکەوتووە.

لەو رووەوە سەرکردەی ناسراوی کورد (مەحمود عوسمان) لە کۆنگرەی کانوونی دووەمی/۲۰۰۳ ی لەندەن وتی: (مەترسی لەوە دەکەم لە ناوەڕاستی ڕێگادا ئەمەریکا وازمان لێ بێنێت‌و پشتمان تێ بکات). لێرەدا بە کورتی گرەوە دۆڕاوەکانی کورد لەگەڵ ویلایەتەیەکگرتووەکان دەخەینەڕوو.

### أ - ڕێککەوتنی جەزائیر

لە کاتێکدا لەڕێی حکومەتی ئێرانەوە کۆمەك‌و یارمەتیەکانی ئەمەریکا دەگەیشتنە کوردستان، بزووتنەوەی کورد هەستی بەکەم کردنەوەی لەناکاوی ئەو کۆمەك‌و یارمەتیانە کرد، بەتایبەتی چاوی بڕیە ئەو رۆڵەی لە نێوانی عێراق‌و ئێراندا گێڕای، لەکاردانەوەو هەڵوێستیدا (بارزانی) نامەیەکی گرنگی ئاراستەی بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا کردو تیایدا داوای بەردەوام بوونی کۆمەکیەکانی

لێکرد. وەك دواتر روون بوویەوە، ساڵی ١٩٧٤ (تالب شەبیب)ی نوێنەری هەمیشەیی عێراق لە رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان لەگەڵ (هنری کیسنجەر)ی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا کۆبوویەوەو لە پێناوی چاککردن‌و ئاساییکردنەوەی پەیوەندییە دووقۆڵییەکانی عێراق‌و ئێران چەند مەرجێکی خستە بەردەست، بەدوای ئەو کۆبوونەوەیەدا دیدارو کۆبوونەوەکان بەردەوام بوون، تا لە ئەیلولی/١٩٧٤ دا لە ئەستەمبوڵ دیدارێکی نهێنی لەنێوان (سەعدون حەممادی) وەزیری دەرەوەی عێراق‌و (عەباس عەلی خەلعەتبەری) وەزیری دەرەوەی ئێران رێکخراو دواتر کۆبوونەوەی بەناوبانگی جەزائیری نێوان هەردوو وڵاتی لێکەوتەوە، کە هەوڵەکانی کیسنجەر لە مۆرکردنی ئەو رێککەوتننامەیە رۆڵی مەزنی گێڕا.

سەبارەت بەو مەسەلەیە (مەسعود بارزانی) دەڵێت: (مەزنترین‌و کاریگەرترین تەڵە کە لە هنری کیسنجەرەوە هات، ئەگەر هەڵوێستی ئەو نەبوایە هەڵوێستی شای ئێران لەو ئاستەدا نەدەبوو رێگابدات فێڵ لە ئێمە بکرێت، ئەو ئاسۆرو کارەساتە ناهەموارەی دوای ساڵی ١٩٧٥ بەسەرکوردا هێنرا بەر پرسیاریەتی دەکەوێتە ئەستۆی (کیسنجەر). ساڵی ١٩٩٢ کاتێك لەسەردانی ئەمەریکادا بووم، (کیسنجەر) داوای رێکخستنی دیدارمی کرد، بەهۆی هەڵوێستی نالەبارو مامەڵەی نادروستیەوەو بێ لەبەر چاوگرتنی ئەو کارەساتە پڕ لەمەینەتی‌و ناسۆرەی بەسەر کورددا هات، بەو هۆیەوە نەم دەتوانی ئەو هەمووە لە بیربکەم داخوازیەکەیم دایە دواوەو بەبینینی رازی نەبووم).

لەهەڵوێستە سەیرو سەرنج راکێشەکانی چارەنووس ئەوەیە، ئەو کەسەی ساڵی ١٩٩٢ رازی نابێت بە دیداری کەسێك کە لە ساڵی ١٩٧٥ ئەو کەسە بەدیداری باوکی رازی نەبووە...... بەشی یەکەمی گرەوی دۆڕاو یان خەیانەتکاری ئەمەریکا بەرانبەر بە کوردەکان گەیشتە کۆتایی.

**ب - لە کاتێکدا ساڵی ١٩٨٨ هەڵەبجە کیمیاباران کرا**

هەڵەبجەییەکان لەهاتو هاواری فریاگوزاری دابوون خوازیاربوون جیهان بەهانایانەوە بێت، لەوکاتەدا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئێرانی بە ئەنجامدەری ئەو کردەوەیە خەتابارکرد.

**ج - راستەوخۆ دوای کۆتاییهاتنی شەڕی رزگارکردنی کوەیت ساڵی ١٩٩١**

گەلی عێراق بەبەشداری کوردەکان دژ بە حکومەتەکەیان راپەڕین.. لەم راپەڕینەدا بڕوای تەواو خرایە سەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا وەك دوژمنی سەرسەختی بەغدا. ئەوەی روویدا پێچەوانەی چاوەڕوانییەکان بوو.. لە راستیدا رووداني ئەو شێوازەی راپەڕین لە لێکدانەوەکانی ئەمەریکادا نەبوو، بۆیە رێگای لە پێش سوپای عێراقدا کردەوە کەلەسەر کوتکردنو کپ کردنەوەی راپەڕینەکەدا تانكو فڕۆکەکانی بەکاربهێنێت. خەڵکی سەرانسەری جیهان لەبەرجەستەبوونی کۆچو رەوی ملیۆن کەسی کوردەکان بەرەو تورکیاو بڕینی شاخەسەختو پڕلە بەفرەکانو نەهامەتیەکانیان بەئاگاهاتنەوەو بەدیار دیدیانەوە بەزیندوویی کارەساتە پڕئێشو دڵتەزێنەکانیان بۆ دەگوازرانەوە، ئەوەیش بوو بەبەشێك لە هەڵبژاردەی نوێی دۆڕان. لەو ساتەوەختانە بەدواوە کوردەکان دوور لە دەسەڵاتو زەبرو زەنگی بەغدا لەنیمچە سەربەخۆییدا دەژین، بەتایبەتی پاش سەپاندنی پەناگای ئارام بۆ باکووری هێڵی ئاسۆیی (٣٦) کەتا ئێستایش لەکردەوەکەیاندا بەهاوکاریو یارمەتیەکانی ئەمەریکا پشت ئەستوورن.

## ئایا گرەوو بڕوای ئەم جارەیان ئاسوودەیان دەکات؟

پرسیاری پێویست لێرەدا ئەوەیە.. ئایا لە جیاتی ئەو هەزرە باوەی لە گرەوەکانی کورددا بەگرەوی دۆڕاو ناسراون، ڕێگایەکی تر لەپێشیاندا بەدی دەکرا؟.. یان دەبوو هیچ گرەوێك نەکەن؟.. یا لە شەڕی چالدێران کەلەسەر خاکی ئەوان ڕوویداو قوربانییەکانیان لەهەردوو لایەنی بەشەڕ هاتوو زیاترو فراوانتر بوون، ڕێگایەکی تری جێگرەوەیان لەپێشدا بوو؟.. وەیان ئەو توانایەیان هەبوو لە نێوان ئەو دووهێزەدا وەك تەماشاکەر بێلایەن بوونایە؟.. بێ دوو دڵی هەڵوێستی لەو جۆرە ئەگەر ئەستەم نەبووبێت، لە خۆیدا زۆر گران‌و سەنگین‌و نالەبار بووە. ئەگەر کۆماری مەهاباد بۆ ئەو سەردەمەی بارودۆخی ناوچەکەو کوردستان پشتی بەیەکێتی سۆڤیەت نەبەستایە، دەبوو چ هەڵبژاردەیەکی تری لەپێشدابوایە؟.. دەکرا تەنها هەڵبژاردە هەنگاو نەنان بوایە لەسەر ڕاگەیاندنی ئەو کۆمارە.. دیارە لەو هەلومەرجە ڕێگا چارەیەکی دیکە نەبوو، جگە لە بڕوا خستنە سەر هێزێکی دەرەکی.. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو سەردەمە جگە لە یارمەتی‌و پشتیوانی سۆڤیەت لە کۆماری مەهابادو کۆماری ئازەربایجان هیچ هێزێکی دیکەی یارمەتیدەر نەدەبینرا. بەڵام دوای بەیەکگەیشتنی بەرژەوەندییەکانی نێوان زلهێزەکان، کوردەکان‌و کۆمارەکەیان بوونە قوربانی. ئەگەر کوردەکان لە ڕاپەڕینەکەی مانگی ئازاری ١٩٩١ دا دژ بە ڕژێمی بەغدا پشتیان بە کۆمەکەکانی ئێران‌و ئەمەریکا نەبەستایە، جگە لە خۆبەدەستەوەدان‌و دانانی چەك‌و ڕازیبوون بە مەرجەکانی بەغدا ڕێگایەکی تریان هەڵ دەبژارد ؟.. بۆئەو بارودۆخە ناهەموارو نالەبارە جگە لە ئێران هیچ هێزێك نەبوو پشتیوان‌و پەناگایان بێت.

هەروەك ساڵی ١٩٧٥ ئامانجەکانی ئێران لە مۆرکردنی ڕێککەوتنی جەزائیر هاتنەدی‌و کوردەکان بوونە قوربانی لەو ڕێگایەدا، هەمان مەسەلە ساڵی ١٩٩١

دووبارەبوویەوە. مەسەلەكە بەتەنها بەو ئەندازەیە لەدۆڕانـدنی هەڵبژاردەكـەدا نەدەبینـرا، بەو ئەندازەیە لەخیانەتكاریو گەڕان بەدوای بەرژەوەندیەكاندا بەدی دەكـرا، بەتایبـەتی لەجیهانێكـدا تـەنها بەرژەوەندیـەكان حـوكمی دەكـەن. هـەمان مەسەلە بەسـەر پەیوەندیـەكانی رابـردووی بزووتنـەوەی كـوردو حكومەتـە یـەك بـەدوا یـەك هاتووەكـانی عێراقـدا دەسـەپێت، لەگـەڵ گەیشتنی هـەر رژێمێكیـان بەكورسـی دەسـەڵات بەرژەوەندیـەكان روویـان دەداو ئەوندەیشـی نەدەخایانـد پشتیان دەكردە بزووتنەوەكەو داخوازیەكانی وەهەر لەنوێ بەلێژایی ناكۆكیەكاندا دەچوونەوە ناو ناكۆكی چەكداری.

# کۆتایی

## هیواوئاواتی کورد لەنیوان بەدیهاتن و بەدینەهاتندا

لەگــەڵ رەوایەتیــدان بەخواســتەکان‌و پاریــدەدانی بــارودۆخ بــە جێبــەجێکردنیان، هــەرتاکێك‌و هەرکۆمــەڵێك مــافی ئــەوەی هەیــە خــاوەنی خواستەکانی بێت، بەمەرجێك لەسەر حیسابی کەسی تر نەبێت‌و بزانرێت ئەو کەسانە لەسەنگەری بەرژەوەندیەکانیاندا خۆیان حەشارداوە.. لێرەدایە لە ئاستی دیاریکردنی توانای جێبەجێکردن یان جێبەجێنەکردنیان هێز رۆڵی سەرەکی دەگێرێت.

وەك ئاشکرایە دوورترین مەودای خواستەکانی کورد (تاك – کۆمەڵ – سەرکردایەتی) لەهەر ناوچەیەکی کوردستان، گەیشتنە بەمافی چارەنووس‌و بەرپاکردنی کوردستانی گەورە. شاراوە نییە چەندین کۆسپ‌و تەگەرەو تەنگژەی مەزنی خودی (الذاتی)و دەرەکی‌یە ئەندازەیەك لە توانای بەدیهێنانی ئەو خواستانە کەم دەکەنەوەو جێبەجێبوونیان لەپاشە رۆژێکی چاوەڕوان کراودا ئاستەم دەبێت. ئایا یەکگرتن لە نێوان بەشی (کوردستانی باشوور) کەبەرەو سەربەخۆیی تەواو دەڕوات‌و بەشێکی دیکە هێشتا لە پێناوی مافە رۆشنبیریەکانی‌و ناساندنی ناسنامەی نەتەوایەتیدا دەکۆشێت کارێکی گونجاوە؟..

ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە، ئایا لەژێر سێبەری هاوکێشەو بەرژەوەندیە نێودەوڵەتیەکانو لاوازی خودی کوردیدا ئەو خواستانە سەردەگرن ؟.. لەکاتێکدا سەرکردەکانی کورد هەستیان بەو راستیە کردووەو خواستەکانیان لەچوارچێوەیەکی گونجاندن لەگەڵ هەلومەرجە نێو دەوڵەتیەکەدا دیاری کردووە. دەزگاکانی هەواڵو میدیاکان بلاّویانکردەوە کۆمەڵێك لەچالاکانی کورد بەناوو ئیمزای زیاتر لەملیۆن نیوێك کوردی عێراقەوە لیستێکیان پێشکەش بەرێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان کرد بوو لە ژێر ناوی (پارێزگاکانی باکوور خوازیاری سەربەخۆیی کوردستانی عێراقن).. سەبارەت بەو داخوازیەی کوردەکان، پرۆفیسۆر (نوائیر مان)ی مامۆستای زانکۆی نیویۆرکو پارمەتیدەری عێراقیەکان لە دانانی یاسای بەرێوەبردنی دەوڵەتی عێراقی سەردەمی گواستنەوە دەڵێت: (سەرجەمی کوردە ئاساییەکان ئارەزوومەندی بینینی کوردستانن بەسەربەخۆیی.. هەمان کات سەرکردایەتی کوردو فەرماندەکانی هەستیان بەوەکردبوو بەشێکن لە واقیعی عێراق، لەو دیدگایەوە بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی (فیدراڵی) یان بەگونجاوترو لەبارتر دەزانی٧٠).

نووسەری ئەم دێڕانە دەری خستووە ساڵی ١٩٧٧ لەدیداری یەکەمی لەگەڵ (جەلال تاڵەبانی) سکرتێری (ی. ن. ك) سەبارەت بەمافەکانی گەلی کورد وتوویەتی: (ئێمە کوردستان دابەش ناکەین،کاتێك چاومان کردوەتەوە بەم شێوەیە هەیە کەدیومانە، لەگەڵ تێپەڕاندنی کاتو سەردەمدا هەرکۆمەڵو بەشێکی ئەم کوردستانە تایبەتمەندی خۆی وەرگرتووەو لەبەشەکانی دیکە جیاوازترە، لەسەر هەر کۆمەڵو بەشێکی پێویستە کێشەکانی خۆیان تێکەڵ بە هیچ بەشێکی دیکە نەکەن.. بەبیرم دێت لە پایتەختێکی ئەورووپاوە بانگهێشتی کۆنگرەیەکی قوتابیانی کورد کرام، ئەو کاتە دروشمێکمان بەرزکردبوویەوە نووسرابوو (بژی کوردستانی سەربەخۆی دیموکراتی یەکگرتوو).. پرسیاری رای

---

٧٠ - شوێنی پ. د. ك لەسەر تۆڕی ئەنتەرنێت.

منیان لە ئاستیدا کردو وەڵامم ئەوەبوو – دروشمێکی جوانەو جێبەجێکردنی لەتوانای مندا نییە، فەرموون ئێوە جێبەجێی بکەن).

دواتر وتی: (قسە باجی لەسەر نییە). دیارە سەرکردایەتی کورد بەبیروبۆچوونی دروستەوەو لەسنووری تواناکانیدا ئەرکی گرتووەتە ئەستۆی، ئەگەر بەو جۆرە هەڵسوکەوت نەکات، لەگەڕان بەدوای ئەستەمدا، مافەکانی بزردەکات. سەرکردەکانی کورد لە مێژەوە هەستیان بەو راستیە کردووەو دەزانن لەسەر دەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر جیاوازی دەکەوێتە تواناکانەوەو گۆڕانیان بەسەرداديێت‌و هیچ شتێك لەدنیادا نییە وەك خۆی لە دۆخێکدابمێنێتەوە.

بەلێکدانەوەی خۆیان، ئەوەی لەم هەلومەرجەدا بەدەستهێنانی گونجاوە فیدراڵیەتی کوردستانە لە چوارچێوەی عێراقی یەکگرتووی فرەلایەندا. وەك هیواو ئامانجی سەرەکی، کوردەکان هەمیشە بە پارێزەوە دەڵێن: (ئێمەیش وەك هەموو گەلانی دیکەی سەرزەمین بڕوای تەواومان بەمافی چارەنووسمان هەیە). لەم دیدگایەوە دوای هاتنی یەکێك لە مادەکانی یاسای بەڕێوەبەرایەتی سەردەمی گواستنەوە کوردەکان سەرکەوتنیان بەدەستهێناو بەهیوان لە دەستووری هەمیشەیشدا هەمان مادده بەهەمان دەق بسەپێنرێت‌و جێگربکرێت.

لە کردەوەی بنیادنانەوەی دەوڵەتی عێراقی دوای رووخانی رژێم، هەڵوێستی سەرکردایەتی کورد هەر لە کۆنگرەی ناسریەو بەشداریکردنی لەهەر هەنگاوێکی راوێژکارانەو هەرکردەوەیەکی دەستەو کۆمەڵە عێراقیەکان‌و بەشداریکردنی راستەوخۆی لە ئەنجومەن‌و حکومەتی سەردەمی گواستنەوەو بەشداری‌و پشتیوانی کردنی تەواوی لە راپیکردن‌و ئەنجامدانی هەڵبژاردن بەڕوونی دیارە. بەهۆی توانای بەرزی سیاسی‌و ئەزموونی دوورو درێژیان، لەکاری پارتایەتی‌و رێکخستن‌و لەرێی تۆڕێکی تۆکمەی پەیوەندیان بەدەوڵەتان‌و رێکخراوە نێودەوڵەتی‌و هەرێمیەکان‌و توانای بەرزی هێزی پێشمەرگەی کوردستان‌و ئابووری سەربەخۆی بەهێزو شارەزایی لەبەڕێوەبردنی ماوەی زیاتر لەدوانزە

ساڵی ناوچەکەیان و شارە زابوونیان لەبواری هەڵبژاردنی گشتی، نرخاندنی هەنگاوەکانیان لەلایەن ڕێکخراوە نێودەوڵەتی وهەرێمیەکانەوە، هەموو ئەمانە هۆکاربوون کوردەکانی عێراق کاریگەرترین و گرنگترین ڕۆڵ بگێڕن لە پێش بردن و پەرەپێدانی ڕێڕەوی سیاسی عێراق. هەروەك بڕیاردرا باس و خواسی مەسەلەی کورد دوابخرێت بۆ کۆتایی ساڵی (٢٠٠٥)و بۆ دوای بڕیاردان لەسەر دستوورو پێکهێنانی پەرلەمانی هەمیشەیی، بەرانبەر بەوە پێویستە کوردەکان زۆر بەوریایی و هۆشیاریەوە ڕووبکەنە پرۆسەی هەڵبژاردن و بەشداربن لە ئەنجومەنێك پشتیوان و هاوکاربێت لە بەدیهێنانی فیدراڵی و چارەسەرکردنی مەسەلەی کەرکوك بەو نیازە بیکەنە پایتەختی فیدراڵیەتەکەیان.. وەك دەرکەوتووە بەهیچ شێوەیەك ئامادەنابن سەودا لەسەر کوردستانی بوونی بکەن. لەلێدوانێکیدا (مەسعود بارزانی) رایدەگەیەنێت – ناوچەی کوردستان لەناوچەکانی دیکەی عێراق ئارامترە، بەو هۆیەوە لە جێبەجێکردنی یاسای تەنگەتاوی (قانون الطوارئ) هەڵاوێر دراوە. لەپێناوی دەستەبەرکردنی ئاسایش و بەڕێوەبردنی کارو ئەرکەکانی حکومەت و دوورکەوتنەوە لەو تەنگژەو نائارامیەی ناوەڕاست و باشووری وڵاتی بەغداوە بگوازرێتەوە بۆ کوردستان.. ئەگەر ئەو پیشنیارە جێبەجێکرا لەوانەیە کوردستان ببێتە ڕاکێشەرو ئاراستەکەری عێراق و دەبێتە حاڵەتی هەماهەنگی و پشتیوانیکەری خواستەکانی ئێستای کورد.. کەلە دوو خولگەدا خۆی دەبنێتەوە.

یەکەم: دەرچوون لە پەراوێز خستنی رابردوویان و بەشداربوونیان لە دەسەڵاتی نوێی عێراق، بەشێوازێکی گونجاو لەگەڵ قەبارەی قوربانییەکانیان و ڕۆڵی ڕابەرایەتیکردنیان لە کۆکردنەوەو یەکخستنی ئەو هێزە بەرهەڵستکارە عێراقیانەی دواتر بوونە حوکمڕان و دەسەڵاتی وڵاتیان گرتەدەست. وەك لە ڕاستیدا دوای ڕووخانی ڕژێم، ئەو ئامانجە هاتەدی، بەم جۆرە کوردەکان زۆر بەباشی لەوە گەیشتوون ئەوەی بۆیان هاتبوویە دی لەپەنای هەڵوێستی عێراقیدا

بەحاڵەتێکی کاتی دەبینرا، بۆیە پێویستە دەستکەوتە هەنووکەییەکانیان لەرێی پەرلەمانی هەڵبژێرراوو دەستووری هەمیشەییەوە بکرێنە یاساو جێگیربکرێن.

دووەم: وابەستە بەپەیوەندی (فیدراڵی) ناوچەکەیان بە حکومەتی ناوەندییەوە لەبەغدا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە لای کوردەکان کەمترین ئاستی مافەکانیانەو دەبێ سنووری ئێستای ناوچەکەیان فراوانتربکرێت‌و ئەو ناوچانە بگرێتەوە بە کوردستانی دەزانن، بەتایبەتی پارێزگای کەرکوك‌و ئەو ئەوناوچانەی دەکەونە سنووری پارێزگاکانی موسڵ‌و دیالەوە. لەم بارەوە بێ پێچ‌و پەنا (مەسعود بارزانی دەڵێت: (ئەوانە فیدراڵی بۆ کورد رەوا نابینن‌و دەیدەنە دواوە، ئەوانەن دەبنە هۆکاری دابەش بوونی عێراق). وەك تێبینی دەکرێت لە دووتۆی ئەم لێدوانەدا هەڕەشەی جیابوونەوە ئاشکراو دیارە.

هەمان کات (جەلال تاڵەبانی)یش بەهەمان ماناو بەدەقێکی تر هەڕەشەکە دووبارە دەکاتەوەو دەڵێت: (ئەوەی کوردەکان داوای دەکەن، هەمان ئەو داواکاریانەن لەدوانزە ساڵی رابردوودا جێگیرکراون، ئێمە بەکردەوە وازمان لەمەسەلەی سەربەخۆیی کوردستان هێناوە بۆئەوەی ببین بەپارچەیەك لەعێراق). بیروڕای جیاخوازی‌و هەڕەشە بەو ئاراستەیە هیچ کات لەحەزرو خواستی سەرکردایەتی کوردو بزووتنەوەکەیدا نەبووەو نەشخراوەتە بەرنامەوە. لەم هەلومەرجەی ئێستادا بیرۆکەیەکی فتوو پێچکراوی کوردەکان هەلوکات بوو لەگەڵ سەرهەڵدانی هەمان بیرۆکەو باس‌و خواس لێکردنی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی. (هنری کیسنجەر)ی وەزیری پێشووی دەرەوەی ئەمەریکا لە لێدوانی بۆ تۆڕی C.N.N لە ٢٠٠٤/١٢/٢٦ بەم جۆرە قسە دەکات‌و دەڵێت: (نابێت ئەمەریکا بەهەیمەنەت‌و دەسەڵاتی شیعە لە عێراقدا رازی بێت، گەیشتنی کاروبار لە ئاستی هێشتنەوەی یەکپارچەیی عێراق لەبەرژەوەندی ئێمەدا نییە، لەو بارودۆخەدا دەبێ لێکەرێین لە جیاتی سەپاندنی دەسەڵاتی ئاینی بەسەر تەواوی عێراقدا هەر کۆمەڵێکی نەتنی دژکارو رکەبەر، حکومەتی تایبەت بەخۆی بەرپا

بکات). وەك دەرکەوتووە لەم کاتو سەردەمەی ئێستادا خواستی کورد لە سنووری فیدراڵیو فراوانکردنی سنووری ناوچەکەو بەشداری کاراو بەهێز لەدەوڵەتی عێراقدا ماوەتەوە. شاراوە نییە هەندێ لایەنی ناوخۆ دژ بە خواستەکانی گەلی کورد دەوەستنو بەمەترسیان دەزانن بۆسەر پاشەڕۆژی ئاسایشی عێراق، بەتایبەتی لەکاتێکدایە هەمان شێوەی ئەوان لەناوچەکانی دیکە دەنگی داخوازی فیدراڵی بەرزبووەتەوە.

لەئەدەبیاتی کوردیدا کەرکوك بە (دڵی کوردستانو قودسی کوردستان) ناسراوە، تەواوی بەڵگەنامەو قەباڵەو دەستیاوە مێژووییەکان بە ڕەهایی کوردستانی بوونی کەرکوك دەسەلمێنن، گەلی کورد بەهیچ بەهایەك بە گۆڕانکاری باری کەسیەتی دانیشتوانی ئەوشارەو هیچ شوێنێکی دیکەی کوردستان قایل نابێت. بەردەوام تورکیا دژ بەخواستو ویستی کورد لەمافی فیدراڵیو مەسەلەی کەرکوك دا دەوەستێتو هەڕەشەی پەلاماردانی کوردستان دەکات لەکاتی پێویستدا. ئەزموونی چوونە ناو کەرکوکی هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان پاش رووخانی رژێمو کشانەوەی لەژێر کاریگەری فشارو هەڕەشەی تورکیادا، بەڵگەن لەسەر بەجێهێنانی هەڕەشەکانی لەهەرکاتو ساتێکدا. دیارە هەرهەنگاوێکی لەو چەشنە ئەگەر دوێنێ ئەستەم بووبێت، ئێستا کارێکی گونجاوە، لەگەڵ گوزەرانەدنی کاتدا ئەگەر دوێنێ نەهاتبێتە دی لەگەڵ تێپەڕاندنی کاتو چۆنییەتی پەرەسەندنی ڕووداوەکاندا هەر جۆرە هەڕەشەو دەستێوەردانێك جگە لەوە جێی ڕەزامەندی نابێت بەر پەرچیش دەدرێتەوە. ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە داخوازیەکانی کورد لە عێراق، لەسەرەتاوە خوازراوە کە لەمەودای تواناداگرنگی بدرێت بەناوچەکەیانو دەرهێنانی لەو پەراوێز خستنەی لە سێبەریدا دەژیانو ڕاکێشانی دەستی ئاوەدانیو بووژاندنەوە بۆی.. هەر چەند جێبەجێکردنو هێنانەدی ئەو داخوازیانە لەو سەردەمەدا ئەستەمو گران دە بینرا، بەڵام بۆ سەردەمی نوێو پەرەسەندنی ڕووداوو گۆڕانکاریەکانی

بزووتنەوەی کوردو قوربانیدانی فراوانتر، خواستەکانیش زیاتر پەرەیان سەندو جێبەجێکردنیشیان لەبارترو گونجاوتر بوو. ئەوەبوو لەو هەلومەرجەدا داخوازیەکان بەرەو مافی رۆشنبیری‌و دواتر ئەو ئۆتۆنۆمیە راستەقینە بوو بەخواست‌و لەپێناویدا تێدەکۆشان، لەگەڵ ئەوەدا جێبەجێکردنی ئەستەم نەبوو، کەچی بەدیهاتنی سەخت‌و گران دە بینرا. کوردەکان لەگەڵ حکومەت کەوتنە گفتوگۆو بەرهەمەکەی راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ ی ئازاری ١٩٧٠ ی لێکەوتەوە.. دواجار دەرکەوت حکومەت لە جێبەجێکردنی بەندەکانی بەیاننامەکە نکولی دەکات‌و هەنگاوەکان لەگەڵ گیانی بەندەکان‌و کرۆکی ئۆتۆنۆمیە بڕیار لەسەر دراوە کە یەك ناگرنەوەو جیاوازی دیارو ئاشکرایان تیادایە، سەر لەنوێ شۆڕش بەرپاکرایەوە. حکومەت لەوەگەیشت لە بواری سەربازیدا سەرکەوتوو نابێت، ناچاربوو بەرانبەر کۆتاییهێنان‌و سەرکردنی بزووتنەوەی کورد، رێککەوتنی جەزائیر مۆربکات.. لەهەلومەرجی نوێدا حکومەتی بەغدا شانازی بەسەرکەوتن‌و هێزو توانای خۆیەوە دەکرد، بۆیە دەستیدایە سەرزەنشتکردن‌و تانەو توانج گرتنە دامەزراوەکانی ئۆتۆنۆمی، کەدەبوو لەژێر ئەوسێبەرەدا رووبەرووی شکست ببێتەوە. ئەوندەی نەخایاند سەرلە نوێ بزووتنەوەی کورد راپەڕیەوەو ناوی (بێچوەکانی قەقنەس لەخۆڵەمێشی سووتاودا سەر دەردێنن) مان بەسەریاندا سەپاند. کوردەکان لە خەباتیاندا ئازاری زۆریان چەشت‌و هەموڵی زۆریانداو خوێنی زۆریان رشت‌و گوندەکانیان خاپوورکران‌و خەڵکانی کۆمەڵ کۆمەڵ دەربەدەرکران.. لە کۆتاییدا پشتێنەی پاراستنی ئاسایش‌و دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتی ناوچەکە دانرا.. لێرە بەدواوە خواستی کوردەکان رووبکردە فیدراڵی.. کە خواستێکی پێشکەوتووترە لەئۆتۆنۆمی.. لەوانەیە هەندێك هەبن ئەو هەنگاوە بەپێش وەختی جیابوونەوەی راستەوخۆ لێکبدەنەوە. لەگفتوگۆیەکماندا لەگەڵ (د. رۆژنوری شاوەیس) ی سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان‌و دواتر جێگری سەرۆك کۆماری عێراق، لەتەلاری پەرلەمان ساڵی

٢٠٠٢، لەوەڵامی پرسیارێك لەجیاتی پێداگرتنی کوردەکان لەئاستی فیدراڵی وەك دواهەنگاو بەرەو جیابوونەوە، گەڕانەوە بۆ کرۆکی بەیاننامەی ١١/ئازارو گۆڕانکاری کردن‌و پەرەپێدان‌و پێش بردنی بەرەو ئۆتۆنۆمی راستەقینە شیاوترو گونجاوتر نەدەبوو؟..

لەوەڵامدا وتی.. (لە راستیدا ئێمە هیچ بڕواو متمانەیەکمان بەحکومەتی عێراق نەماوە، زۆر جارو لەسەر زۆرشت رێك دەکەوێت‌و دواتر پاشگەز دەبێتەوە، لەگەڵ ئەوەدا ئێمە زەمانەتی نێودەوڵەتیمان پێویستە، دەبی عێراقیش ناوی خۆی لەنەتەوەیەکگرتووەکاندا بەدەوڵەتی فیدراڵی تۆماربکات، تاببێتە زەمانەتێکی دیکە بۆ ئێمە). پێش ئەو رووداوە گرنگانەی حکومەتیان رووخاندو دەسەڵات کەوتە دەستی بەرهەڵستکاران لە عێراقدا (د. رۆژ) گواستیەوە بەغداو پۆستی جێگری سەرۆك کۆماری پێ سپێررا. بەو مانایە کوردەکان بەرێوەبردنی وڵاتیان کەوتە ئەستۆ، لەم ئاستەدا مەسەلەی بڕوا پێویستی بەچاو پێداگێڕانەوەو پێداچوونەوە هەیە. دەگەڕێینەوەو دەڵێین خواستی کورد کوردستانی گەورەیە، تەنها شتێك رێگرە لە هێنانەدی ئەو خواستە هاوکێشە نێودەوڵەتی‌و هەرێمیەکانەو لەپێش هەموویاندا تورکیاو ئێران وتا ئاستێکیش سوریا.. ئەگەر لەپێناوی قایل کردنی لایەنێك‌و دڵنیاکردنەوەی لایەنێکی تردا بەهەرشێوەیەك لە شێوەکان هاوکێشەکان چارەسەرکران، یان بەهۆی مامەڵەکردنێك لێرەو لەوێ‌و لەگەڵ ئەم یان ئەویتر، بەتایبەتی ئێستا ئێمە لەسەردەمێکدا دەژین سەردەمی مامەڵەکانی ئەمەریکایە.. ئەگەر ئەوە رووبدا دەکرێت خواستی کورد بەجیابوونەوەو بەرپاکردنی کوردستانی سەربەخۆ لە عێراق بێتەدی‌و ئەوەیش بەدوور نازانرێت.. بەڵام ئەگەر سەرنجی رەوشی بەشەکانی دیکەبدەین هێشتا زۆریان لە پێشدایە.. هەمان کات دەگونجێت لەماوەیەکی نزیکدا ئەستەم ببێتە توانایی‌و گونجان.

پرسیار ئەوەیە.. ئێمە چیمان کردووە؟ ئایا دەتوانین کارێك ئەنجام

بدەین؟.. یان ئەوە ئەستەمە.. ئەستەمە..

چەند بەدوای پرسیارێك وێڵبووم وەڵامم دەست نەکەوت.

## سوپاس و پێزانین

¤ پڕ بەدڵ سوپاس و پێزانینم پێشکەش بەهاوڕێی ئازیزم بەڕێز مامۆستا (حەکیم مەلا صالح) دەکەم بەدرێژایی ماوەی وەرگێڕانی ئەم کتێبە بەبەشەکانیدا چوویەوەو چەندین تێبینی و ڕێنومایی پێبەخشی، نزای تەمەن درێژی بۆ دەکەم.

¤ سوپاسی بێ پایانی (مەڵبەندی ڕۆشنبیری هەورامان) دەکەم بەتایبەتی هاوڕێی ئازیزو خۆشەویستم مامۆستا ئەیوب کوێخا ڕۆستەم، کەئەرکی تایپکردنی کۆمپوتەری گرتە ئەستۆ.

¤ سوپاس و پێزانینم بۆ خانمی بەڕێز خاتوو (ئیلهام حمەکریم) کارمەندی کۆمپیوتەری مەڵبەندی ڕۆشنبیری هەورامان و هەستانی بە کۆمپیوتەرکردنی وەرگێڕانەکەم.

¤ زۆر سوپاسی بەڕێز(کامل محمد) ئەکەم کە ئەرکی دیزاینی بەرگ و ناوەرۆکی گرتە ئەستۆ.

لە پەروەردگاری مەزن دەخوازم هەردەم ئاسوودەو بەختەوەربن

وەرگێڕ

٢٠٠٨/١٠/١

وەك ئاشكرایە دوورترین مەودای خواستەكانی كورد (تاك - كۆمەڵ - سەركردایەتی) لەهەر ناوچەیەكی كوردستان، گەیشتنە بەمافی چارەنووس و بەرپاكردنی كوردستانی گەورە. شاراوە نییە چەندین كۆسپ و تەگەرەو تەنگژەی مەزنی خودی (الذاتی)و دەرەكی بە ئەندازەیەك لە توانای بەدیهێنانی ئەو خواستانە كەم دەكەنەوە و جێبەجێبوونیان لەپاشە رۆژێكی چاوەڕوان كراودا ئاستەم دەبێت. ئایا یەككرتن لە نێوان بەشی (كوردستانی باشوور) كە بەرەو سەربەخۆیی تەواو دەڕوات و بەشێكی دیكە هێشتا لە پێناوی مافە رۆشنبیریەكانیو ناساندنی ناسنامەی نەتەوایەتیدا دەكۆشێت كارێكی گونجاوە؟.. ئەمە لەلایەك، لەلایەكی دیكەوە، ئایا لەژێر سێبەری هاوكێشەو بەرژەوەندیە نێودەوڵەتیەكان و لاوازی خودی كوردیدا ئەو خواستانە سەردەگرن ؟

ئاراس

٢٠٠٠دینار